نووسینی: نیلسۆن ماندێلا

# گەشتە دوورەکەم لــــە پێناوی ئـــازادیدا

وەرگێڕانی: شێرزاد هەینی

کوردستان - هەولێر

2005

**ناوی کتێب: گەشتە دوورەکەم لە پێناوی ئازادیدا**

- نووسینی: نیلسۆن ماندێلا
- وەرگێڕانی: شێرزاد هەینی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن: ١٢٣
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٣٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب - ٧ - (١١٠)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**هەولێر - پشت رۆژنامەی خەبات**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١**

# ناوەڕۆک

**پێشکەشی**:

ئەم کتێبەم بە هەر شەش منداڵم، مادیبای بێ سەروشوێن و گەورەکیژی بێ سەروشوێنم **ماکازیوی** و ماگاتۆی کوڕم و کیژەکانم **ماکازیوی** و زینانی و زیندزی، ئەوانەی شانازی بە خۆشەویستیان دەکەم چونکە هاوشانم بوون. هەروەها هەر بیست و یەک نەوەکەم و هەر سێ منداڵەکانیان، کە ژیانیان پڕ دڵشادی و سەرفیرازی کردم، هەروەها پێشکەشە بە هاوڕێ و برادەرو هاووڵاتییانی خوارووی ئەفریقیا، کە خۆم بە خزمەتکاریان دەزانم، ئازایەتی و خۆڕاگری و خۆشەویستیان بۆ وڵات –هەتا ئێستاش– سەرچاوەی سۆزو هێزی من بووە.

**«نێلسۆن ماندێلا»**

# پێشەکی چاپە ئینگلیزییەکەی

بەسەرهاتی ئەم کتێبە دوورە، وەک بۆ خوێنەران روون دەبێتەوە، سەرەتای نووسینم دەگەڕێتەوە بۆ نووسینەکانی نهێنیم لە گرتووخانەی دوورگەی روبین، ئەم کتێبە رووناکیی نەدەبینی، ئەگەر هەردوو هاوڕێی خەبات و تەمەنم ولتر سیسولو و ئەحمەد کاترادا، لەگەڵ ماندوونەبوانەو بیرەوەرییەکانیان نەجوولاندبایەو هانی نووسینیان نەدابام. دەسەڵاتداران کە دانە ئەسڵییەکەیان دۆزییەوە زەفتیان کرد، دانەکە دەستنووسی خۆم بوو. هەردوو هاوڕێم ماک ماهاراج و عیسو شیبا دەوری ئازایانەیان بینی لە کۆپیکردن و رزگارکردنی بۆ دەرەوەی گرتووخانەکە، کە لە ساڵی ١٩٩٠ ئازادبووم، لە دەرەوە دەستم بە نووسینەوەی کردەوەو تەواوم کرد.

رۆژانەی دەرەوەی زیندانم پڕ کاروبەرنامە بوو. رۆژانە کاتی زۆر کەمی نووسینم هەبوو، بۆیە قەرزاری ئەو هەموو هاوڕێ و برادەرانەم کە یارمەتی تەواوکردن و سازدانی ئەم کتێبەیان دام، بۆ هەموویان رێز و سوپاسی قووڵم هەیە، بە تایبەتی هاوڕێم ئەحمەد کاترادا، کە چەندین کاتژمێر بۆ پێداچوونەوەو راستکردنەوەو شرۆڤەکردنی تەرخانکرد.

سوپاسم بۆ بەڕێز ریدچارد ستینگل، کە هاوکاری ئامادەکردنی دانە ئینگلیزییەکەی دام، هەروەها یارمەتی گرنگی بۆ پێداچوونەوەی بەشەکانی یەکەم و راستکردنەوەی و نووسینی بەشەکانی ترم دا. ئەو کاتژمێرانەم لەبیرە، کە بەیانیان زوو پێکەوە لە دەڤەری ترانسکای پیاسەمان دەکرد و باسی بەشەکانی کتێبەکەو رووداوەکانمان دەکرد. دەمەتەقێ و دانیشتنە درێژەکانی بارەگای حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بە جۆهانسبێرگ و لە ماڵەکەم لە هوتن لە بیرە. حەزم دەکەم ماری بفاف بکەم کە لەم کارەدا یارمەتی ریدچاردی دا. بە بەڕێزو گەورەیی باسی ئامۆژگاری و هاندانەکانی فاتیمە میر و بیتر ماگوبانی و نادین گوردیمار و ئەزکیل مفاهلیلی دەکەم.



با لە بیر نەچێ و سوپاسی هاوڕێکانم لە نووسینگەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بکەم، کە بە هەموو شێوەیەک هاوکارم بوون بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە. بە تایبەتی باربرا ماسیکیلا، کە توانی کارەکەم بۆ بەرنامەڕێژ بکات. هەروەها ئیقبال میر چەند کاتژمێرێ بێ ژمارەی بۆ کارە یاسایی و بازرگانیەکانی ئەم پرۆژەی تەرخانکرد، هەروەها سوپاسی سەرنووسەر ویلیام فیلیپس لە دەزگای (لیتل براون) بۆ بڵاوکردنەوە دەکەم بۆ پڕۆژەی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە لەسەرەتای ١٩٩٠ و دواییش بە دانە ئینگلیزیەکەی دا چۆتەوە. کە لەم کارەدا گوردن بافلین و ستیف شنایدەر یارمەتییان دا. سوپاسی مامۆستا گایل گیرهارت دەکەم کە لە رووداوەکانی دانە ئەسڵییەکەی و مێژووییان کۆڵییەوە.

# بەشی یەکەم

## گوڵە ڕەشەکەی بەهار

پاش بڕیارەکەی دادگا نەگەڕامەوە ماڵێ، هاوڕێکانم کەوتنە ئاهەنگ و خۆشی. بەڵام من دڵنیا بووم کەوا دەستەڵاتداران هەر بۆیان بگونجێت دەستی خۆیان دەوەشێنن، من ئەوەم بۆ ئاسان نەکردن. پێش ئەوەی هەردوو بڕیارەکەی قەدەغەکردنی کارکردنم لەسەر دەربچێت، خۆم شاردەوە، ئامادەیی خۆم وەرگرت و گەڕامەوە حەشارگەکەی جارانم لە جۆهانسبێرک، ئەم شەوەم لەسەر سەرینێکی ناخۆش بە ناڕەحەتی رابوارد. گوێم لە دەنگی هەر سەیارەیەک دەبوو وام دەزانی سەیارەی پۆلیسن و بۆ گرتنم هاتوون.

بەرەو پۆرت ئەلیزابیت بەڕێکەوتم، ولتر و دوما بۆ بە رێ کردنم هاتبوون، لەوێش گوفان ئەمبیکی و ریموند مهالابا پێشوازییان کردم و باسی شێوەی کاری نوێ نهێنیمان کرد. لە ماڵی دکتۆر ماسلاباتر دانیشتین، ئەو لەسەر حەواندنەوەی من جارێکی تر دوو ساڵ زیندانیان بۆ بڕاندبۆوە. هەروەها لە ماڵێکی دڵنیا و ئەمین دیدارێکم لەگەڵ سەرنووسەری ڕۆژنامەی ئازادیخوازان، پۆرت ئەلیزابیت گۆست مۆرنیگ کرد. لە دیدارەکەدا باسی بیرۆکەی کۆنگرەی نیشتمانی گشتیمان کردو دواییش چەند ڕۆژنامەی تریش بیرۆکەکەیان پەسەند کرد. هەروەها سەردانی پاتریک دەنکانی سەرنووسەرو خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی ئازادیخوازانەی هەفتانە، کۆنتاکتم کرد. دەنکان دامەزرێنەری حیزبی ئازادیخوازان و پێشەنگی کەسایەتی سگیەکان بوو کە بەشداری لە هەڵمەتی ڕووبەڕووبوونەوەکانی کرد. هەر ئەم ڕۆژنامەیە بە بەردەوامی هێرشی دەکردە سەر حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بەوەی گوایە سیاسەتەکەی لەلایەن شیوعییەکانەوە دادەڕێژرێت. کە دەنکانم بینی، وتی: ڕاپۆرتەکانی دادگایی خیانەتەکەتم خوێندەوە. منیش هەموو رامانە هەڵەکانی سەبارەت بە حیزبم بۆ ڕاست کردەوە، بەڵێنیشی دا هەڵوێستی ناڕەوای



ڕۆژنامەکەشیان ڕاست بکاتەوە. هەر ئەو شەوە چەندین پیاوانی کەنیسەم لە کیپ تاون بینی. ئەم دیدارەم لە بیر ناچێت، لەم دیدارەدا، نوێژ و سەلاوەتەکانی قەشەکەم لە هزردا چەسپاو، تا ئیمڕۆش لە ساتە ئەستەم و تەنگاوەکاندا بە هانامەوە دێن. سەلاوەتەکە بە سوپاس بۆ خودا، بۆ ئەو خێرو چاکەو ڕەحمەتەی بە ئادەمیزادی بەخشیوە، دەستی پێکرد. دوایی قەشەکە ئەوەی بە بیر خودا هێنایەوە کە چینێکی خوداپەرست گوزەرانیان لە چینێکی تر باشترە، وەک ئەوە وایە خودا کەمتر بایەخیان پێبدات. هەروەها قەشەکە وتی:

لە خودا داوا ناکەم ڕەشەکان ڕزگاریان بێت، چونکە ڕۆژێک دێ خۆیان جڵەوی حوکمیان دەکەوێتە دەست . ئامین.

لە ئوتێلەکەدا چاک خزمەتکراین، منیش کە دەرچووم سوپاسی خاوەنە ملەوەنەکەی ئوتێلەکەم کردو لەگەڵ جۆرج بیگ، ئەندامی دامەزرێنەر لە ڕێکخراوی میللی ملەوەنە ئەفریقییەکان بە تەواوبوونی ودوارۆژی گەشتەکەم لە کیپ تاون لە ئوتێل دەرچووم. خاوەن ئوتێلەکە کە منی ناسی حەزی کرد زۆرتر شتم لەسەر بزانێت. بۆیە وتی: ئێمەی ملەوەنەکان دەترسێن لەژێر سێبەری حکومەتی ئەفریقییەکان لە ئیمڕۆ زۆرتر زولمان لێ بکرێت. ئەو کارمەندێکی چینی مام ناوەندییەکان بوو، هاموشۆی ئەفریقییەکانی کردبوو، بۆیە لێیان دەترسا. ئەم بۆچوونە زۆر لە لایەن ملەوەنەکانی کیپ تاون دەردەبڕا. ئەگەرچی من ماوەیەکی کەم مامەوە، بەڵام سەرەتاکانی بەڵگەنامەی ئازادیم بۆ شرۆڤەکردو، بۆم ڕوونکردنەوە کەوا ئێمە دژایەتی نەژادپەرستی دەکەین، ئەرکی هەموو خەباتگێڕێکە لە هەموو بوارێکدا کێشەی خۆی بۆ خەڵک ڕاڤە بکات.

ڕۆژی دوایی بەشداری کۆبونەوەی نهێنی لیژنەی ڕاپەڕاندنی حیزب بووم، دیدارەکە، سەرکردایەتی بزاڤی گۆنگرە لە دێربان بۆ باسکردنی ئەگەری سازدانی خۆپیشاندانێک لە ماڵەکان. یان مانگرتنێکی گشتی و ڕێپێوان کرا. هاوڕێیانی بیرۆکەی مانگرتنەکە وتیان: ئێمە ستراتیژیەتی مانگرتن و یاخیبوونمان هەر لە ساڵی ١٩٥٠ پەیڕەو کردووە و ئاکامی نەبووە و باوی نەماوە، حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی وا جەماوەر پەیدا دەکات، بۆیە پێویستە بوارێکی کاریگەرتر و زیندووتر بدۆزینەوە. بژاری تریش کە من لەگەڵی بووم زۆرتر پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر دوژمن و هیچیشیان لە دەست نایێت بیکەن، وتم: جەماوەر بڕوا بە هەڵمەتەکانمان دەکات و تێگەیشتوون ئێمە سەرشێت نین و دووچاری مەترسییان ناکەین. لە شاربفیل سەرەڕای ئەوەی هەڤاڵانمان ئازایەتی و نەبەردی بێ وێنەیان نواند بواریان بە دوژمن دا تەقە لە خەڵک بکەن. من لەگەڵ

خۆپیشاندانی ماڵەوەم. دەمزانی لەسەرانسەری وڵاتدا خەڵک لە خەباتی ئاشتیانە بێورە ببوون و هیوایان بەو خەباتە نەمابوو. من وام دەبینی کەوا ستراتیژیەتی نەگۆڕمان لە نەمانی نەخشەدانی گشتی بە یەکجاری سنووردار نەکەین و دەمزانی کاتی گونجاو وپێویستمان بۆ نەخشەدانانی تەواو لەبەر دەستدا نییە. بڕیاری مانگرتنی ماڵەوەمان دا.

کارکردنی نهێنی پێویستی بە گۆڕینی مەزن هەیە لە نەفسییەتی ئادەمیزادا. هەموو نەخشەو پیلانێک، هەر چەند گەورەو گچکەش بێ، جولەو بایەخی دەوێت، بۆیە مەزندەی نیەتی خراپ بکرێتەوە، لەهەموو شتێ گومان هەبێت. ئەگەر لە کەسێکیش خۆی نەنوێنێت، با لە قالبی کەسایەتی نوێ و پوختدا خۆی بنوێنێت. ئەوەش بۆ کەسی پیاوی رەش لە خوارووی ئەفریقیا زەحمەت نینە، ئەو کەسەی لە ژێر سێبەری جوداخوازیی نەژادپەرستی و لە ژیانێک نێوان شەرعییەت و ناشەرعییەت و، لە نێوان ئاشکراو نهێنی دا بژییت. مرۆڤ لە خوارووی ئەفریقیادا، بەس رەش بێت، بڕوا نەکردن بە هەموو شتەکان دەگەیەنێت، وەک ئەوەیە لە ژیاندا بە نهێنی بژییت.

وام لێهات عاشقی شەو بووم، رۆژانە لە کونەکەمدا خۆم دەشاردەوە و شەوانیش دەکەوتمە جولەو کارکردن. زۆربەی چالاکییەکانم لەناو جۆهانسبێرگ بوو. بۆ کاتی پێویستیش دوور دەکەوتمەوە. هەر بۆم بگونجابایە لە شوقە چۆڵەکان و ماڵی بە تاڵی برادەرەکانمدا، تەنیا و دوور لە دیدی خەڵک دەمامەوە، ئەگەرچی خۆم لە بنەڕەتدا کابرایەکی تێکەڵ و حەزم بە خەڵک بوو، بەڵام هاوکات حەزیشم لە تەنیاییش دەکرد، لەوێشدا بەرنامەم دادەڕشت و زۆرتر بیرم دەکردەوە. تەنیایی زۆر زەحمەتە و بەرگەگرتنی ئەستەم بوو، بۆیە سۆزم بۆ ژنەکەم وخێزانەکەم دەجوولا.

گرنگترین شت لە کاری نهێنی ئەوەیە بتوانی لە پێش چاوان دوورکەویەوە، مرۆڤ دەتوانێ خۆی وا نیشان بدات دوور لە دیتن بێت و، زوو هەستی پێنەکرێت. سەرکردە کۆشش دەکات لەبەر چاوان دیاربێت، بەڵام خەڵکی راونراو بە پێچەوانەیە. کە کەوتمە ناو خەباتی نهێنی، لە رێگادا سەرم نەوی دەکردو بە نەرمی دەدوام و بە سگمەمم دەهات، حەزم دەکرد ئارەزووەکانم بشارمەوەو هێمنترو لەسەر خۆتر بووم، پرسیارم نەدەکردو نەدهاتمە وەڵام هەتا پرسیارم لێ نەکرابایە. ردێنم نەدەتاشی و قژم نەدەبڕی، خۆم لە کەسایەتی شوفێر و چێشتلێنەر و باخچەچی دەنواند، جلی کرێکاری، یان فیتەریم لەبەر دەکردو چاویلکەی بێ چوارچێوەی ناسراو بە ماتزاوایم لەچاو دەکرد. ئۆتومبێلێکم هەبوو و شەپقەی شوفێرانیشم لەسەردەکردو بەوەش ئاسنتر دەجوولام.



لە مانگەکانی یەکەمی راونانمدا لە لایەن پۆلیسەوە، رۆژنامەکان زۆر بایەخیان بە چالاکییەکانم دا، راپۆرتەکانی لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکان بە درێژی باسی جولەو شوێنەکانی منیان دەکرد، لە رێگا گشتییەکاندا زالگەیان بۆ گرتنم دادەناو هەموو جارێ پۆلیسەکان بە مەراقەوە دەگەڕانەوە. رۆژنامەکان، نازناوی گوڵە رەشەکەی بەهارییان لێنام، ئەم نازناوەش چەواشەی پاڵەوانی رۆمانی بارەنە ئەکزی ناسراو بە گوڵە قورمزییەکەی بەهار بوو، کە لە رۆژانی شۆڕشی فەرەنسیدا ئازایەتی زۆری نواند و نەکەوتە دەستی دوژمنانی.

بە نهێنی بە ناو هەموو وڵاتا گەڕام، لە کیپ تاون، لەگەڵ موسڵمانەکان مامەوەو لە ناتال لەگەڵ کرێکارانی شەکر و لە پۆرت ئەلیزابێت، لەگەڵ کرێکارانی کارگەکان و لە چەندین شاردا بەشداری کۆبوونەوە نهێنییەکانم کرد. ئەفسانەی گوڵە رەشەکەم بە پەیوەندییە تەلەفۆنییە گشتییەکان دەبوژاندەوە و هەواڵەکانم بە رۆژنامەکان دەگەیاندو چیرۆکی دروستکراو و هەڵبەستراوم لەمەڕ چالاکی و پلانەکانم دەگەیاند و گاڵتەشم بە ناچاپۆکی و بێدەسەڵاتی پۆلیسیش دەکرد، کە دەرەقەتم ناهێن. لە شوێنی جیاوازو لە ناکاوا دەردەکەوتم و ئەوەش گاڵتەکردن بوو بە پۆلیس و مایەی شادومانی و دڵشادیش بوو بۆ جەماوەرەکەم. چیرۆکی سەرسوڕهێنەر بوو خەیاڵی زۆر لەسەر ژیان و ئەزموونی کاری نهێنیم بڵاوکرایەوە، چیرۆکەکان لە لایەن خەڵکەوە زۆرتر جوان و نەخشینتر دەکران، بە بێ ئەوەی کەس بزانێت و چەند جارێک لە لایەن تۆڕی پۆلیس رزگارم ببوو، جارێکیان لەناو ئۆتومبێلەکەمدا بووم کە لە ترافیک لایتێکدا راوەستابووم کەوتمە تەنیشت ئۆتومبێلی عەقید سبینگلری بەرپرسی ئاسایش لە ویتووترزاند، کە راوکردنی گوڵە رەشەکەی بە نێچیرێکی بایەخدار دەزانی. ئەو دەمە بە شەپقەیەکی کرێکارانە و بەدلەیەکی فیتەری و چاویلکەی ئاساییەوە بووم نیگای لە من دەکرد. ئەو چەند ساتەی تا گڵۆپە سوورەکە کوژایەوە، بە چەند سەعاتێکم زانی.

رۆژێکیان لە چەقی رێگادا لە جۆهانسبێرگ چاوەڕێی برادەرێکم دەکردو شەپقەی شوفێرییەکەم لەسەربوو، بینیم پۆلیسێک بەرەو من رێ دەکات. منیش بواری خۆدزینەوەم نەماو هاتە بەرامبەرم و بە سڵاوی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی سڵاوی لێکردم و رۆیشت. ئەو سڵاوەی ئەو پۆلیسە دڵنیای کردم، کەوا پۆلیسە ئەفریقییەکان سۆزیان بەرامبەرمان هەیەو، بۆ دۆزەکەیان دڵسۆزن. ئەفسەری پۆلیس بە دزییەوە پەیوەندی بە وینی دەکردو وردەکاری پلانی گرتنمی پێ رادەگەیاند. بە چرکەوە پێیانی دەووت: ئامۆژگاری ماندێلا بکە رۆژی چوار شەممە نەچێتە

ئەلیکساندرا، چونکە شوێنەکە لە لایەن پۆلیسەوە دەپشکندرێت. لە ڕۆژانی خەباتا، زۆر جار پۆلیس دووچاری ڕەخنە دەبنەوەو هەڕەشەی توندیان لێ دەکرا، بەڵام ئەوان کاری نهێنی زۆر گەورەیان بۆ بزاڤەکە ڕادەپەڕاند. من بە ئەنقەست ئاکارم بە شپرزەیی دەنواند، جلوبەرگم هەر نارێک و شێواو بوو، پۆلیس وێنەیەکی بە ڕیشی منیان بۆ ناسینم دابەشکرد، بۆیە برادەرانم ئامۆژگاریی زۆریان کردم ڕیشی خۆم بتاشم، لەبەر ئەوەی من لە ڕیشەکەم ڕاهاتبووم، بۆیە هەر نەمتاشی. ئەگەرچی ئەو ماوەیە لە خۆشاردنەوەکان و خۆگۆڕینەکانا سەرکەوتنم بەدەستهێنا، بەڵام لەلایەن برادەرانەوە زۆر ئاگادار دەکرامەوەو گلەیی زۆریشم لێ دەکرا. جارێکیان لە دەڤەرێکی دووری جۆهانسبێرگ کۆبوونەوەم هەبوو، کە چوومە ئەو ماڵەی قەشەیەک و برادەران بۆ ئەو کۆبوونەوەیە سازیان کردبوو، کە لە دەرگاکە چوومە ژوورەوە پیرەژنی خاوەن ماڵەکە هەر کە منی بینی دەرگاکەی بە ڕووما داخست و وتی: بڕۆ دەرەوە پێویستمان بە دەم و چاوی تۆوە نییە. هەموو کاتم بۆ مانگرتنەکەی ماڵەوەم لە ٢٩ی مایۆ/مایس تەرخان کردبوو، هەر لە خۆئامادەکردنەکەدا دیاربوو، کە دەتەقێتەوەو شەڕێکی دژوار لە نێوان حکومەت و بزاڤی ڕزگاریخوازان ڕوو دەدات. لە کۆتایی مانگی مایۆدا حکومەت لە سەرانسەر وڵاتا هێرشی کت و پڕی بردە سەرماڵی سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن، کۆبوونەوەکان قەدەغە کران و چاپکراوەکانیش دەستیان بەسەردا گیرا، حکومەت لە ڕێگای پەرلەمانەوە چەند بڕیاری دەرکرد. بەپێی بڕیارەکان پۆلیس بۆی هەیە تاوانبار بە بێ کەفالەت دوازدە ڕۆژ بگرێت. سەرۆک وەزیران ڕایگەیاند هەر کەسێ -هەتا ڕۆژنامە لایەنگیرەکانیش- پشتیوانی مانگرتنەکە بکات، وەک ئەوەیە یاری بە ئاگر بکەن. ئەوەش نیەتی خراپی و وەحشییەت و توندی ئوسلوبی حکومەتی دەگەیاند، حکومەت داوای لە کارگەکان کرد پێویستییەکانی مانەوەی کرێکاران لە کارگەکان بڕەخسێنن، ئەوەش بۆ ئەو بوو، تا بۆ مانگرتنەکە ناچار نەبن بگەڕێنەوە ماڵەکانیان. دوو ڕۆژ پێش مانگرتنەکە حکومەت گەورەترین خۆپیشاندانی ساز کرد، ئەوەش نیشانەی هێزی دەسەڵات بوو لەسەردەمی ئاشتی، لەوەتی شەڕە، سوپا گەورەترین داواکاری و ئامادە باشی نیشان دا، مۆڵەتی پۆلیسان ڕاگیراو، یەکە سەربازییەکان لە دەروازەکانی شارا دابەشبوون، دەبابەکانی ساراسن هادرە لە شەقامی دەڤەری ڕەشنشینەکانی شارا کەوتنە جولە، هلیکۆپتەرەکان پەیتا پەیتا دەنیشتن و دەستە دەستەیان دادەبەزاند، شەوەکەشی بە ڕووناکی لە سەربانانیان دەڕوانی.

ڕۆژنامە ئینگلیزییەکان هەواڵی هەڵمەتەکەیان چەند ڕۆژ پێشتر بڵاوکردەوە، بەڵام لە کاتی



مانگرتنەکەدا هەرەسیان هێنا و داوایان لە خەڵک کرد ڕوو لە شوێنی کارەکانیان بکەنەوە، دووبارە و دیسان حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی دەوری تێکدەریان بینی و هانی خەڵکیان دا مان نەگرن و لە ماڵەکانیان بێنە دەرەوەو سەرکردایەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بە ترسنۆک ناساندو گلەییشیان ئاراستەکرد. بەم هەڵوێستەیان سەرسام بووین، ئێمە دژی ڕەخنە نەبووین و ڕەخنەشمان قەبووڵ بوو، بەڵام وەستانیان دژی مانگرتنەکەو هاندانی خەڵکەکە بۆ هەرەسیان، خزمەتی دوژمنی دەکردو بەس.

لە کاتی مانگرتنەکەدا دەبوایە لە ماڵێکی ئاسودە لە سیتو دیدارم لەگەڵ سەرکردایەتی لە جۆهانسبێرگ هەبوایە، لەبەر چاوی پۆلیسان نەبم و دوور بم، بە ناو شاری کلیبتونی بێ پاسەوان و چاودێری گوزەرم کرد. کە لە ڕێگادا بووم، لە شەقامێکی لاچەپدا ڕووبەڕووی خاڵێکی پشکنینی پۆلیس هاتم و پۆلیسێکی سپی داوای ڕاگرتنی ئۆتومبێلەکەی کردم، منیش هەمان جلوبەرگەکەی جاران و شەپقەی شوفێریم لەسەر بوو، لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەموچاوی کردم و لەجیاتی پۆلیسە ڕەشەکان ئۆتومبێلەکەمی ورد ورد پشکنی، پاشان داوای مۆڵەتی لێخوڕینی لێکردم و منیش بە لێبوردنەوەو وتم: لە ماڵەوەم لەبیر چووەو بە هێمنییەوە ژمارەی مۆڵەتی دەستکارییکراوم دایە دەستی و تەماشای کردو فەرمووی لێکردم ڕۆیشتم.

لە ڕۆژی ٢٩ی مایۆدا، ڕۆژی مانگرتن لە ماڵەوە، سەدان هەزار هاوڵاتی بە نەچوونیان بۆ سەر کارو لە ماڵەکانیان وەک مانگرتن نەهاتنە دەرەوە کارو گلەییان لە دەست دا. لە دێربان کرێکارە هیندییەکان لە کارگەکانیاندا دەرچوون، لە کیپ تاونا هەزارەها کرێکاری ملەوەن نەژاد لە دژایەتی حکومەت لە ماڵەکانیان نەهاتنە دەرەوە، لە جوهانسبیرگ نیوەی کرێکارو فەرمانبەرەکان لە ماڵەکانیاندا مانەوەو لە پۆرت ئەلیزابیتیشدا ڕێژەکە بەرزتر بوو. بۆ ڕۆژنامەکان وتم: جەماوەرێکی ئەستوور بە پیر بانگەوازەکەمان هاتن و ستایشی مەزنترین و دەگمەنترین دژایەتی میللەتم دەرحەق بە حکومەت کرد. نارەزاییەکە، لە یادی کۆمارا لە لایەن سپییەکانا دەنگی دایەوە.

ڕاپۆرتی زۆرمان بە دەست گەیشت، تێدا ئاماژەیان بە هاوسۆزی بەرینی جەماوەر بە مانگرتنەکەدا کردبوو، سەرەڕای ئەوانە بە ئامانجەکەی ڕازی نەبووین و، هیوامان بە زۆرترین بەشداری میللی هەبوو. لەو ڕۆژەدا گەیاندنی هەواڵەمان ئاسان نەبوو، هەواڵە ناخۆشەکان خێراتر دەگەیشتن، هەر چەند ڕاپۆرت زۆرتر دەگەیشتن، زۆرتر ڕەشبین دەبووم و بڕوام بە پشتیوانی جەماوەر ساردتر دەبوو. ئەم ئێوارەیە ورەم دابەزی و هەستم بە بێزارییەکی زۆر کردو لە دوانێکمادا لەگەڵ

بنیامین بوگراند بۆ رۆژنامەی راند دێیلی میل وتم: رۆژانی خەباتی ئاشتیانە کۆتایی هات و باوی نەما. لە رۆژی دووەمی مانگرتنەکەدا و پاش دەمەتەقێیەک لەگەڵ هاورێیەکانمدا بڕیاری شکاندنی مانگرتنەکەمان دا، لە بەیانی هەمان رۆژدا لە شوقەیەکی هێمنداو لە یەکێک لە دەڤەری گەڕەکی سپییەکاندا بە رۆژنامەنووسانی خۆمان و جیهانیم راگەیاند کەوا مانگرتنەکە بە سەرکەوتنێکی بێ وێنە ئەنجام درا، هەروەها ئەوەشم نەشاردەوە کەوا بڕوام بە هەڵاتنی شەفەقێکی نوێ لە خوارووی ئەفریقیادا هەیەو بە روونی وتم: ئەگەر حکومەت بەرپەرچی خەباتی ئاشتیانەمان بە هێز بداتەوە، ئەوە ئێمەش ناچارین ئسلوبەکەمان بگۆڕین، ئێمە بڕوامان وایە کەوا وەرزی سیاسەتی ئاشتیانە کۆتایی هات.

لێدوانەکە ترسناک بوو، ئەوەم چاک دەزانی، بۆیە پێش ئەوەی لەلایەن رێکخستنەوە دراسەت بکرێت، لیژنەی راگەیاندن بە توندی رەخنەی لە لێدوانەکەم گرت. پیاو هەندێ جار ناچارە لەبەر دوودڵی رەهەندی رێکخستن قسەی وا لێ بکات. هەر لە سەرەتای ساڵانی ١٩٦٠ەوە لەناو رێکخستندا گفتوگۆ لەسەر توندوتیژی و بەکارهێنانی هێز هەبوو. لە ساڵی ١٩٥٢ بۆ یەکەم جار لەگەڵ ولتر سیسولو دەمەتەقێم لەسەر کێشەی خەباتی چەکداری کردبوو، دووبارە پرسم پێی کردبوو هەردووکمان کۆک بووین لەسەر ئەوەی پێویستە ئاسۆیەکی نوێ بۆ کارکردن بدۆزینەوە، حیزبی شیوعیش بە نهێنی، کادیرەکانی بۆ خەباتی چەکداری، بیرۆکەی دانانی باڵێکی سەربازی رێکخستبوو. بڕیارمان دا بابەتی چەکداری لەناو لیژنەی کارا باس بکەم.

ئەوەشم لە حوزەیرانی/ یۆنیۆی ١٩٦١دا کرد. هێشتا دەستم بە قسەکانم نەکردبوو کە موسا کوتانی سکرتێری حیزبی شیوعی و بە هێزترین ئەندامی لیژنەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لێم هاتە زمان و هێرشێکی توندی کردە سەرم و بەوە تاوانباری کردم کەوا بابەتەکە وەک پێویست دیراسەت نەکراوەو بیری وردی لێ نەکراوەتەوە. هەروەها کوتانی وتی، من لەبەرامبەر پلانەکانی حکومەت پاشەکشەم کردو رامانەکانم ئیفلیج بوون و بەناچاری و بەزمانێکی شۆڕشگێڕانە هاتە دوان و وتی: هێشتا وەسیلە کۆنەکان بەکارن ئەگەر هزرو خەیاڵمان ورد بەکاربهێنین. ئەگەر بەو رەهەندەی ماندێلا بڕۆین، ئەوا میللەتی بەستەزمان بە دەستی حکومەتەوە دووچاری کۆمەڵکوژی دەکەین.

موسا بەهێزەوە قسەی دەکرد، ولتریش بەرگری لێ نەکردم، هەستم کرد پێشنیارەکەم ناپەسەندە و لێی پاشگەزبوومەوە، دوایی لەگەڵ ولتردا قسەم کردو، نائومێدی و رەشبینی خۆمم بۆ ئاشکرا



کردو گلەییشم لێکرد کە هاوبیرم نەبوو و پشتیوانی لێنەکردم. بەپێکەنینەوە وتی: ئەگەر پشتیوانی تۆم کردبایە، دەبوومە ئەو گەوجەی بەتەنیا دژایەتی رەوە شێرێک بکات. ولتر دیپلۆماسییەکی زۆرزان و فێڵباز بوو، پێش ئەوەیماڵئاوایی لەیەکتری بکەین وتی:

بوارم بدە، دیدارێکی تایبەتیت بۆ لەگەڵ موسا بۆ ساز دەکەم و لەوێ تێڕوانینەکەتی تێبگەیێنە. بە راستی دیدارەکە سازکراو یەک رۆژی تەواو دانوستانمان کرد. شێلگیرانەو بە وردی هۆکارەکانی بڕوا بوونم بە بواری بەکارهێنانی هێزو توندیم بۆ شرۆڤە کرد، ئەو پەندە ئەفریقییەم بە بیرهێنایەوە کە دەڵێت:

هێرشێکی توندی ئاژەڵێکی درندە بە دەستی بێ چەک ناگەڕێتەوە. موسا شیوعییەکی کۆن بوو، بۆیە وتم: هەڵوێستی ئێوە لە هەڵوێستی حیزبی شیوعی کوبی بە سەرکردایەتی باتێستا دەچێت، هەر دەیووت هێشتا کاتی راپەڕین نەهاتووەو سووبوو لەسەر قسەکانی لینین و ستالین، بەڵام کاسترۆ چاوەڕێی نەکردن و راپەڕی و سەرکەوت، بە روونی و شێلگێرانە بە موسام وت: بە تەمای وەک لە کتێبەکانا نووسراوە، راپەڕین و شۆڕش را بێت، ئەوە زەحمەتە بە چاوی خۆتا نایبینیت، رامانەکەت وەک حیزبەکەت سڕبووە، ئەو حیزبەی جاران ناسراو و باوەڕپێکرابوو. هەروەها پێم وت: خەڵکەکە دەستە دەستە خۆیان چەکدار دەکەن و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی تاکە رێکخراوە دەتوانی رابەرایەتیان بکات، ئەگەر جاران دەمانووت جەماوەر پێشمان کەوتووە، ئیمڕۆ بە راستی وا جەماوەر بە پێشمان کەوتووە. پاش یەک رۆژی تەواو لە دانوستانمان، موسا وتی: بەڵێنی هیچت پێ نادەم، ماندێلا، دەتوانی بابەتەکە لە پێش لیژنەکەمان باس بکەیت و با مەسەلەکە رێچکەی ئاسایی خۆی وەرگرێت. پاش هەفتەیەک لیژنەی راپەڕاندن کۆبۆوەو مەسەلەکەم لەوێ باس کرد، ئەمجارە موسا بێدەنگ بوو و قسەی نەکرد، ئامادەبوان پێشنیاریان کرد مەسەلەکە پێشکەشی لیژنەی راپەڕاندنی گشتی بکەین، کە بڕیارە لە دێربان ببەسترێت، تەماشای ولترم کرد، بینیم دڵشاد و بە خەندەیە. وەک هەموو کۆبوونەوەکانی تری ئەوسای لیژنەی راگەیاندنی گشتی لە ترسی چاوی پۆلیسان بە شەو و لە دێربان بەسترا. لەم کۆبوونەوەیەدا کە بۆ باسکردنی مەسەلەکە، هەستم بە تەنگەژە دەکرد، چونکە چاکم دەزانی پێشەوا لوتولی کە لە کۆبوونەوەکەدا بەشداری دەکات ئەوەیش پابەندی ئەخلاقی هەیە بۆ بەکارهێنانی هێز. لەکۆتایی دادگاییەکەی خیانەتدا بەڵێنمان دابوو، کەوا حیزب هەتا سەر توندو تیژی بێت. ئەمەش تازە بوو، بۆیە لە باسکردنی بەکارهێنانی هێز لەو کاتەدا دوودڵ بووم. ئەو رامانەشم وەک وەسیلەیەک

نەدەزانی، کە بۆ کاتی پێویست و گونجاو بەکاریبهێنم. سەبارەت بە رامانم بۆ ئاشتی وەک خەبات، بەپێچەوانە تێدەگەیشتم، ئەوەم بە وەسیلە دەزانی و هەر کاتێ بمەوێت دەستی لێ بەردەدەم.

لەم کۆبوونەوەیەدا وتم: دەوڵەت بێجگە لە بژاری سەربازی هیچ هێزی تری بۆ نەهێشتینەتەوە. هەلەو دووره لە رەوشت، ئەگەر میللەتەکەمان دووچاری رووبەرووی چەکی دەوڵەت بکەین و هیچ بژارێکیان بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئاراستە نەکەین، ئاماژەشم بەوەکرد کەوا میللەت خۆیان ئاشتیان هەڵبـژاردبوو و ئێستاش ئێمە بلێین ئەوا هێز بەکاردێنین. پرسیارم کرد، باشتر نییە میللەت ئاراستەی ئەو هەنگاوە بکەین بۆ بەکاهێنانی هێز وەک چۆن بڕوامان هەیە کەوا میللەت دووچاری زولم و چەوسانەوە هاتووەو با بەگژیاندا بچینەوە. ئەگەر ئیمڕۆ ئێمە جڵەوی بزاڤەکە نەگرینە دەست، ئەوا لە دوارۆژدا دەبێ بەدواییدا رابکەین و دەستمان نایگاتێ.

سەرەتا پێشەوا لوتولی لەگەڵ رامانەکانما نەبوو، ئەو هێزی بە تاکە تاکتیک نەدەزانی، بەڵام ئێمە سووربووین و بڕوام دەکرد ئەویش لە ناخیدا تێدەگەیشت کە من راستم. بۆیە لە دواییدا گەیشتە ئەو بڕوایە کە دواچارە هەڵمەتی سەربازییەو بەس. یەکێک لە ئامادەبوان وتی: رەنگە پێشەوا ئامادە نەبێ بۆ ئەم وەڵامە. بەڵام ئەو بە توندی وەلامی دایەوە و وتی: ئەگەر یەکێک وا دەزانێ من دژی هەڵگرتنی چەکم، با بێت مریشکەکانم بدزێت، ئینجا بۆی روون دەبێتەوە...!!

بە رەسمی لیژنەی راگەیاندن بڕیاری کاتی لەسەر بڕیارەکەی لیژنەی کار دا، پێشەوا لوتولی و چەند کەسی تر وتیان ئێمە مامەڵە لەگەڵ ئەو بڕیارە دەکەین بەو چاوەی حیزب هەر گفتوگۆشی لەسەر نەکردبێت. ئەو نەیدەویست دۆستانی خەباتمان، ئەوانەی ئاشکرا نەبوونە دووچاری مەترسیان بکات. ئەو لەسەر ئەو بۆچوونەبوو کەوا بزاڤە سەربازییەکە قەوارەیەکی سەربەخۆو جیاوازی هەبێت، بەڵام پابەندی حیزب بێت و دەسەڵاتی لەسەر هەبێت و لە راستیشدا دەستەیەکی سەربەخۆ بن، ئەوەش خەباتەکەمان دەکاتە دوو لایەنی جیاواز، هەموو بە بێ دڵەڕاوکێ هەڵوێستەکەی پێشەوایان پەسەندکرد. ئەو و کەسانی تریش لەگەڵ ئەوەدابوون کەوا بەرنامە نوێیەکەی خەبات نەکەنە بیانوو بۆ ئەوەی حیزب واز لە ئەرکە سەرەکییەکان و وەسیلە کۆنەکانی خەبات بێنێت، چونکە ئەوەیان حیزب دووچاری رووخانی ناوەوەی دەکات و خەباتی چەکدارانە بەتایبەتی لە قۆناخە سەرەتاییەکانیدا گلەیی یەکەم نەبووە لە بەرنامەی بزاڤەکەدا.

بۆ شەوی دوایی کۆبوونەوەیەکی هاوبەش لە دێربان لەسەر ئاستی لیژنەکانی راپەراندن بەسترا.



حیزبی کۆنگرەی هیندی و کۆنگرەی میللی ملونەکان و یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی خوارووی ئەفریقیاو کۆنگرەی دیموکراتخوازەکانیش تێدا بەشدار بوون. ئەگەرچی ئەم رێکخراوانە وا راهاتبوون کەوا لەسەر بڕیارەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی رازی بن، بەڵام ئەمجارە گومان هەبوو هاورێیە هیندییەکانمان بە توندی دژی بەکارهێنانی هێز راوەستن. سەرەتا دیدارەکە ساردبوو، پاشان پێشەوا لوتولی هاتە دووان و وتی:

ئەگەرچی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بڕیای بەکاهێنانی هێزی داوە، جا لەبەر ترسناکی بابەتەکە، داوا دەکەم هاورێیان لەم دیدارەدا دووبارە و سەرلەنوێ شرۆڤەی بکەنەوە، گومان لەوەش دا نەبوو، کەوا پێشەوا بە تەواوی و بە باشی بۆ خەباتی تازە نەیسەلماندبوو. لە هەشتی ئێوارەدا دیدارەکە دەستی پێکرد، هەر لە سەرەتادا کەشەکەی ئاڵۆزبوو، سەرلەنوێ بابەتەکەم گێڕایەوە، زۆربەی ئامادەبووان دوورەپەرێزییان راگەیاند، یوسف کاچالیا و دکتۆر نایکر لێم پاڕانەوە کە واز لەو بۆچوونە بێنم، چونکە حکومەت بزاڤی خەباتەکە لە رەگ و ریشەوە دەردەهێنێت. دجی ئان سینگ ئەو قسەزان و وریایە، هاتە دووان و هێشتا وشەکانی لە مێشکیدا دەزرنگایەوە، کە وتی:

خەباتی ئاشتیانە شەرمەزاری نەکردوین، بەڵکو ئێمە خەباتەکەمان شەرمەزارکردووە. منیش وەڵامم دایەوەو وتم:

لە راستیدا خەباتی ئاشتیانە شەرمەزاری کردووین چونکە بوارێکی بۆ نەرەخساندوین بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو توندو تیژییەی کە حکومەت دەرحەقمان دەیکات و، هیچیشی بۆ گۆڕینی زۆرداران نەکردووە. هەتا درەنگانی شەوەکە قسەمان کردو هەستم کرد ئێمە پێشکەوتنێکمان بە دەست هێناوە. زۆربەی سەرکردە هیندییەکان بە سۆزەوە باسی کۆتایی سەردەمی ئاشتیان کرد. لەناکاودا، ئام دی نایدوی ئەندامی کۆنگرەی هیندی ل خوارووی ئەفریقیا بە هەڵچوونەوە وتارێکی پێشکەش بە هاورێیە هیندییەکانی کردو وتی: لە راستیدا ئێوە لە زیندان دەترسن، وایە یان نا..؟؟

هەر کەسێ کە لە کەرامەتی درا، ئەگەری بەرگری و بەرهەڵستی لێدەکرێت. دیسان مشت و مڕو گفتوگۆ دەستی پێکردەوە، بەیانییەکەی بڕیاراندا پڕۆژەیەک بۆ دامەزراندنی باڵێکی سەربازی جیا لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ئامادە بکەم. بە مەرجێک خەباتی رەسمی حیزب هەر ئاشتی بێت، ئازادیشیان کردم بۆ هەڵبژاردنی هەر کەسێ بۆ یارمەتی دانم، بۆ سازکردنی ئەم رێکخستنە. باڵەکەش هەر لە ژێر سێبەرو دەسەڵاتی رێکخستنی دایکدا بمێنێتەوە. ئەم هەنگاوە

گۆڕانێکی گرنگ بوو لە مێژووی حیزبدا. ئەو حیزبەی پەنجا ساڵە هەر بڕوای بەکاری ئاشتی هەبووە و دژی توندو تیژیش بووە ئەمەش سیاسەتی نەگۆڕو بێ مشت و مڕی حیزب بووە. بەڵام حیزب لەمەودوا ڕێکخستنی زۆر دەگۆڕێت و گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەردا دێت. هەنگاومان بەرەو ڕێگایەکی تازەی پڕ مەترسی نا، ڕێگاکەش، ڕێگای بەکارهێنانی هێزی ڕێکخراو بوو، دیارە کەوا ئێمە نازانین و دیاریش نییە ئاکام و چارەنووسەکەی بەرەو کوێمان دەبات. ئەرکی دامەزراندنی سوپایەکەیان خستە ئەستۆی من، منێک سەربازیم نەکردبێت و بەشداری شەڕێکم نەکردبێت و گوللەیەکیشم بە ڕووی دوژمنا نەتەقاندبێت. ئەو ئەرکە بۆ ژەنەراڵەکانیش گران و زەحمەتە، ئەدی بۆ ساوایەکی وەک من.

ناومان لە ڕێکخراوە نوێیەکەمان نا ئومخونتو وی سیزوی ئەمکا ناوەکە بە ناوە ئەفریقیەکەی «ڕمی نەتەوە»ی دەگەیاند. ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەفریقییەکان چەند سەدە بە ڕم ڕووبەڕووی داگیرکەرە سگپییەکان بوونەتەوە بۆیەش نیشانەی ڕمیشیان هەڵبژارد.

ڕێکخراوی «ئەمکا» لاری نەبوو لە وەرگرتنی سەربازی سپی وەک چۆن حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ئەندامی سپیشی وەردەگرت، یەکەم سەرباز کە وەرگیرا جوسلوفو بوو، ئەویش، پاش ولتر سیسولو و منی سەرۆک، بەو بووە سێیەمین سەربازی ڕێکخراوەکە. بە هۆی جو توانیمان چەندین ئەندامی حیزبی شیوعی وەرگرین، ئەوانیش توانیان چەندین نەبەردی وەک پچڕاندنی هێڵەکانی تەلفۆن و پەیوەندییە حکومییەکان ئەنجام بدەن. هەروەها جاک هود جسونمان وەرگرت کە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا بەشداری کردبوو و هەروەها ڕستی بیرنستاتیمانیشمان وەرگرت، هەردووکیان ئەندامی حیزب بوون. بەڵام جاک ئەندامی کۆمەڵەی سبرینگبوکی جەنگاوەرانیش بوو و یەکەم شارەزای تەقینەوەی ڕێکخراوەکەشمان بوو، ئەرکی ڕێکخراوەکەمان ئەنجامدانی هێرشی چەکدارانەی هەمەجۆر بوو دژی حکومەت. شێوە و جۆری هێرشەکانمان دەست نیشان نەکرد. بڕیاری جێبەجێکردنی نەبەردییەکانمان لە ڕوانگەی زۆرترین زیان بە دەوڵەت و کەمترین قوربانی پەسند کرد. لە ئەرکەکەمدا دەست بەکاربووم، من یەک فەرمانم پێ جێبەجێ دەکرا، ئەویش خوێندنەوە و قسەکردن بوو لەگەڵ کەسە بە ئەزموونەکان، خەمی گەورەم ئەوەبوو بنچینە سەرەکییەکانی شۆڕش دیار بکەم، کتێبێکم دۆزییەوە بابەتی بەسوود و دەوڵەمەندی بۆ ئەم مەبەستە تێدابوو. زۆرم لە سەر چەکداری و پارتیزانی خوێندەوە، کۆششم بۆ ئەوەبوو وەڵامی پرسیارە سەرەکییەکانی دامەزراندن و ڕێکخستنی هێزێکی پێشمەرگانە بدۆزمەوە، مەرجە باش و گونجاوەکانی شەڕی



پارتیزانی چین و پێویستییەکان کامەن ...؟

چۆن دەکرێت هێزێکی شەڕکەر دامەزرێنین و چۆن پەروەردە و نمایشیان بکەین ... ؟؟ چۆن و بە چی چەکداریان بکەین و سەرچاوەی پشتیوانی پێویست لە کوێوە بێنین. بایەخی زۆرم بە سەرچاوەکان دەدا، ڕاپۆرتەکەی بلاس ڕوکای سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی کوبیم خوێندەوە، کتێبەکە لە ساڵانی کارکردنی لە ڕێکخراوێکی قەدەغەکراو لە سەردەمی باتیستا دەدوا. کتێبی کوماندوی دینیس رایتز لە سەر وەسیلە نایاساییەکانی شەڕ دەدوێت کە ژەنەراڵە بوێرەکان لە شەڕیان دژ بە بەریتانیا پەیڕەویان کردبوو خوێندەوە. کتێبەکانی تیشی گیڤارا و ماوتسی تونگ و فیدل کاسترۆم لە هەر کوێیەک دەستکەوتبایە دەمخوێندەوە. لە کتێبی نایابی ئادگارسنوی ناسراو بە ئەستێرەیەکی سوور لە ئاسمانی چیندا، بینیم کەوا چۆن رامان و داڕشتنە شۆڕشگێڕییە نائاساییەکەی دەوری گەورەی بینیوە لە سەرکەوتنە مەزنەکەیان، کتێبی شۆڕشی میناحین بیگنم خوێندەوە، سەرکردایەتی کردنی پارتیزانییەکەی لە دەڤەرێک بوو وەک خوارووی ئەفریقیا شاخ و دارستان بووە. ئەم کتێبە هانی دام بەردەوام بم. زۆر پەرۆشی ئەوەبووم بزانم گەلی حەبەشە چۆن شەڕیان دژی مۆسولینی کرد، حەزم دەکرد بزانم دەستە پێشمەرگەکان، شەڕیان لە کینیا و جەزائیر و کامیرۆن و چالاکییەکانیان چۆن ئەنجام دەدا.

مێژووی کۆنی خوارووی ئەفریقیام خوێندەوە، مێژووی پێش هاتنی پیاوانی سپی و پاش هاتنیانم ورد خوێندەوە، شەڕەکانی نێوان سپی و ڕەشەکان و شەڕی نێوان سپیەکان خۆیان و، شەڕەکانی ناوخۆی نێوان ڕەشەکانیشم ڕاڤە کرد. ڕووپێوی وردی ناوچەکانی پیشەسازی و هێڵەکانی گەیاندن و پەیوەندییەکانم کرد، نەخشەکانی کەرتی هەموو وڵاتم کۆ کردەوە و شرۆڤەی خاکی ناوچە و هەرێمەکانم ورد ورد کرد.

لە ٢٦ی یۆنیۆی ١٩٦١ و لە ڕۆژی جەژنی ئازادیدا بەیانێکم لە حەشارگە تایبەتیەکەی خۆمدا بڵاوکردەوە، تێیدا دەوری کۆمەڵانی خەڵکم لە مانگرتنەکەی ماڵان بەرز ڕاگرت و، باسی ئازایەتیم کردن. دووبارە داوای کۆنگرەیەکی نیشتمانی دەستووری گشتیم کرد، هەروەها ئەوەم دووپاتکردەوە کەوا هەڵمەتی هاوکاری نەکردن لەگەڵ حکومەت رادەگەیێنین و هەڵمەتەکەش سەرانسەری وڵات دەگرێتەوە ئەگەر دەوڵەت کۆنگرەکە بۆ دەستوور ساز نەکات، لە بەیانەکەدا وا هاتبوو: ئاگادارم کەوا پۆلیس بۆ گرتنم دەگەڕێت و فەرمانیان پێیە، جڤاتی کاری نیشتمانی ئەمەی چاک شرۆڤە کردووە و هوشیاری کردوومەتەوە کەوا خۆم نەدەمە دەستیان و ئاگاداری خۆم بم، منیش

ئامۆژگارییەکەم پەسند کردووە و خۆم نادەمە دەست و دانیش بە حکومەت نانێم، زانایانی سیاسەت بڕوایان وایە کەوا بەدواچوون بۆ شاهێدی و تەسلیم بوون بە پۆلیس کارێکی ساویلکانە و تاوانیشە.

بواری ترسناک و زەحمەتم زۆر بە باشتر زانی لە دانیشتنی ناو زیندانا، ژن و مناڵ و دایک و براکانم جێهێشت و لە ناو وڵاتا هەڵاتووی دەستی یاسا بووم. وازم لە کارەکەم هێناو وەک زۆربەی زۆری هاونیشتمانانم بە برسیەتی ژیام. بڕیارم دا هاوشانی میللەتەکەم شەڕی حکومەت بکەم، چی دەکەن. شەڕیان دەکەین بست بە بست تا سەرکەوتن ... ؟؟ ئایا دێنە پاڵ ئێمە، یان لەگەڵ حکومەت دەبن، شەڕی حکومەت دەکەن بۆ نەمانی چەوسانەوەی میللەتەکەم و هاتنە دی ئاواتەکەمان ...؟ یان بەرامبەر ویستەکانی میللەت بێدەنگ و دەستە وەستان دەبن. ئەمجارە دۆزەکە، دۆزی مردن و ژیانە ... !! من وا ئەم ڕێگایەم هەڵبژارد، نە خۆم تەسلیم دەکەم و نە خوارووی ئەفریقیاش جێدەهێڵم. ئازادی تەنیا بە زەحمەت و قوربانی و دژایەتی و رووبەڕووبوونەوە دەست دەکەوێت، خەبات ژیانمە و لە کۆڕی خەباتا بەردەوام دەبم بۆ ئازادی هەتا مردن. لە مانگەکانی بەرایی خۆشاردنەوەکەمدا چەند هەفتەیەک لە مارکتستریت لەگەڵ خێزانێکدا ژیام. لە بیرباو لە شوقەیەکی یەک ژووری لەگەڵ ولفی کودیس لە گەڕەکێکی سپی نشینەکان لە ناوەڕاستی جوهانسبیرگ مامەوە. ولفی ئەندامی حیزبی کۆنگرەی دیموکراتخوازان بوو، رۆژنامەنووس بوو لە رۆژنامەی نیو ئایدج، لە باکووری ئەفریقیا و ئیتاڵیادا بەشداری شەڕی دووەمی جیهانیشی کردبوو، سوودی زۆرم لە زانیارییە سەربازییەکان و ئەزموونەکانی شەڕ و دیدە تایبەتیەکانی وەرگرت. لە سەر پێشنیاری ئەو کتێبی شەڕی ژەنەرالی رووس کارل فون کلوسیفیتزمم خوێندەوە. کتێبەکە رامانێکبوو لەسەر پەیوەندی شەڕ بە دبلۆماسیەت و چۆن ئەویش لقێکە لە دبلۆماسیەت و هەستم کرد زۆر ئاوێتەی بووم و خۆم لە ناویدا دۆزییەوە. پشتم بە ولفی بەستا بۆ پەیداکردنی کتێبی خوێندنەوەم، ئێستاش دەڵێم بە داخەوە هەموو کاتەکانی ئەوم بۆ خۆم وەرگرتبوو، بەڵام ئەو ناسک و بەڕێز بوو و هەستم نەکرد لێم بێزاربێت. نزیکەی دوو مانگ لەسەر سەرینێکی گەڕۆک لە شوقەکەی ولفی مامەوە. رۆژانە و لە پشتی پەردە داخراوەکانا هەر خەریکی خوێندنەوەو سازکردن و پلاندانان و نەخشەدانان بووم. شەوانە بۆ دیدارەکانم دەردەچووم. بەیانیان لە کاتژمێر پێنجدا رادەبووم و جلەکانی وەرزشم لەبەردەکرد و بۆ ماوەی یەک سەعات و لە یەک شوێندا وەرزشم دەکرد، ئەویشم هێنایە رێ و پێش دەرچوونی بۆکارو بۆ یەک سەعات لەگەڵ منا



وەرزشی دەکرد.

سەربازانی «ئەمکا» دەستیان بە راهێنانی تەقینەوە کرد، شەوێکیان لەگەڵ ولفیدا چووینە مەیدانێکی شار، لەوێ بە تەقاندنەوەی دینامێت قوڕی تایبەتی دروستکردنی کەرپووچیان دەردەهێنا. دەرچوونەکەم مەترسیشی لەسەر بوو، بەڵام سوور بووم لەسەر دیتنی یەکەم ئەزموونی تەقینەوەی ڕێکخراوەکەمان، جاک هود جسون قۆدییەکی مشت نتریتا گلیسرینی هێنا، ئەم ماددەیە خێرا دەتەقێتەوە. بە قەڵەم جافێک ئامێرێکی تەقینەوەی دروستکردبوو، شەوەکە ئەنگوستەچاو بوو، ئێمە تەنیا لایتێکی بچووکی دەستیمان پێبوو، کە جاک لە ئامادەکردنەکە تەواو بوو، ماوەیەک دوورکەوتینەوە و سی چرکە ماوەکە بەرەو دابەزین ڕوچوو، پاشان تەقینەوەکە بوو و خۆڵی فڕێ دایە هەرچوار دەوری خۆی. ئەزمونەکە بە سەرکەوتوویی کۆتایی هات. کە تەواوبووین هەموومان سواری ئوتومبێلەکانمان بووین و بەرەو شوێنەکانمان گەڕاینەوە.لە بیریا هەستم بە دڵنیایی دەکرد، گەرچی مەڵبەندەکە سپی نشین بوو و پۆلیسیش روویان لەو دەڤەرە نەدەکرد، بەڵام من لە ژوورەوە دەرنەدەکەوتم. بە رۆژ خەریکی خوێندنەوە بووم. شیرم لە پەنجەرەکەمدا دادەنا تا بە گەرمی خۆر ببێتە ماست. زۆر حەزم بە ماست دەکرد، کوسا بەم ماستەیان دەووت ئەماسی و دەیانووت یەکێکە لە خواردنە باشەکان بۆ لەشی ئادەمیزادو سوودیشی زۆرە. ئامادەکردنیشی زۆر ئاسان بوو، هەر هیچی نەدەویست، شیرەکە لەبەر با و لەبەر خۆرا دابنێیت خۆی دەترشێت و دەبێتە ماست، ویستم ولفی رازی بکەم تامی بکات، کە تامی کرد بێزی بۆوە. ئێوارەیەکیان لەگەڵ ولفیدا دانیشتبووین و ئاخاوتنمان گەرم بوو لە پشتی پەردەکە و لە دەرەوە گوێم لێبوو دوو لاوی رەش بە زمانی زلوە قسەیان دەکرد، لەبەر ئەوەی پەردەکە داخرابوو، بۆیە لێم دیار نەبوون. بە ولفیم وت، بێدەنگ بە. گوێم لێبوو، یەکێکیان بە هاوڕێیەکەی دەووت: کێ شیری ئێمەی بردیتە ئەم پەنجەرەیە ...؟؟ ئەوەی تر بە سەرسامیەوە، وتی:

تۆ باسی چی دەکەیت، نیازت لەم قسەیە چییە ...؟؟

– تەماشاکە، لە بەرامبەرمان دیارە، چۆن گەیشتیە وێندەرێ ...

گفتوگۆکە تەواو بوو و کەشەکە هێمن بۆوە، دیاربوو گەنجەکە زیرەک بوو و دەیویست بڵێ، ئەم کارە ئیشی پیاوی سپی نییە و هەر ئەوان ئەماسی دەزانن، چۆن پیاوی رەش گەیشتۆتە دەڤەری سپینشینەکان ...؟؟ لە بەر ئەمە بە باشم زانی شوێنەکەم بگۆڕم وروو لە حەشارگەیەکی تر بکەم.

لە جوهانسبیرگ لە ماڵی دکتۆرێک مامەوە، شەوانە لە ژووری خزمەتگوزاری ماڵەکە دەخەوتم

و ڕۆژانەش لە ژووری خوێندنەوەکەشیدا کارم دەکرد، ڕۆژان ئەگەر میوانێک هاتبایە، زوو بەرەو باخچەکەی پشتەوە رام دەکرد و خۆم دەکردە باخچەچی. دوو هەفتەش لە ناتال و لە گوندێکی بچووکی سەر کەناری نزیک دوربان لەگەڵ چەند خێزانی رەشدا لە گوندی تونگات لە کێڵگەیەکی شەکردا مامەوە. هەروەها لە کەپرێکی بچووکیش ژیام، لێرەش خۆم بە پسپۆڕی کشتوکاڵی ناساند. کە لە لایەن حکومەتەوە بۆ نرخاندنی زەوی و زار هاتووم.

ڕێکخستن چەند ئامێرو کەرستەی تایبەتی بۆ دەستەبەرکردم، ڕۆژانە خۆم بە تاقیکردنەوەی خاک وئەزموونەکانی بەسەر دەبرد، خۆ سەرم لەو کارانە دەرنەدەچوو کە ڕۆژانە خەریکیان بووم. بڕوام وابوو نەمتوانیبوو خەڵکی گوندەکە چەواشە بکەم. خەڵکەکە، کە زۆربەیان جوتیار بوون، کەسانی سادە و وریا بوون لە شاردنەوە و پاراستنی نهێنییەکان. کەسیان لە کەسایەتی منیان نەپرسی، بە تایبەتی پاش ئەوەی چەند کەسی سیاسی ناسراو و بە ئۆتۆمۆبێلی تایبەتی هاتنە سەردانم. شەوان هەر سەرقاڵی کۆبوونەوەبووم و ڕۆژانەش دەخەوتم. دیارە ئەوەش کاری پسپۆڕی کشتوکاڵ نییە. گەرچی من سەرقاڵی کاری زۆر بووم، بەڵام هەستم بە ئاوێتەبوون و سۆز کرد لەگەڵ ئەو خەڵکە. ڕۆژانی یەک شەممەوان دەچوومە کەنیسە و گوێم لە وتارەکانی قەشەکە رادەگرت و چۆن کتێبی پیرۆزی پێشکەش دەکرد. کە کاتی ڕۆیشتنم هات چوومە خزمەت پیاوێکی بە تەمەنی گوندەکە بۆ ئەوەی سوپاسی بکەم بۆ میوانداری و ناز و پەروەردەو چاودێرییەکەیان بەرامبەر بە من پیاوەکە وتی: کوڕە گەنجەکە زۆر بەخێر بێیت، تکایە بوارم بدە پرسیاری ئەوەت لێبکەم، پێشەوا لوتولی چی لە تۆ دەویست ... ؟ منیش لە وەڵامدا وتم:

وا باشترە، خۆت ڕاستەوخۆ ئەو پرسیارە لەو بکە، چونکە من ناتوانم لەجیاتی ئەو ئەم وەڵامە بدەمەوە، بەڵام وا دیارە دەیەوێت خاکمان وەرگرێتەوە و مەلیکەکانمان هێزو دەستەڵاتیان وەرگرنەوە و خۆمان بڕیاری چارەنووسی خۆمان بدەین، وەک چۆن حەز دەکەین و چۆنمان دەوێت بژین. ئەویش لە وەڵامدا وتی: باشە ئەو هەموو شتانە بە بێ سوپا چۆن دێتە دی. ویستم بە پیرەکە بڵێم، وا من خەریکم سوپایەک دامەزرێنم، بەڵام خۆم گرت و قسەم نەکرد. قسەکانی پیرەمێردەکە ورەی بەرز کردم، هاوکاتیش هەستم بە نیگەرانی و ترس کرد، وا دەرکەوت مەبەست و بەرنامەکەم ئاشکرا بووە و دەبێ بڕۆم و سەر بۆ شوێنێکی تر هەڵگرم. کەلوپەلەکەم هەڵگرت و لەم گوندە هێمن و ئارامەش ڕۆیشتم.

لە مانگی ئۆکتۆبەردا ئێستگەی ئەمجارەم باخچەی لیلیزلیف بوو، باخچە بە لەوەڕەکە لە



دەڤەری ریڤۆنیای باکووری جوهانسبیرگ بوو. شوێنەکە لە دێرێکی قەشان دەچوو، ریڤۆنیا بریتی بوو لە چەندین باخچەی بچووک بچووک، بۆ بەکرێدانیش پارچە پارچە کرابوون، خانووەکە لەسەر یەک لەو پارچە زەوییانە دروستکراو بوو. بزاڤەکەمان بۆ شاردنەوەی کادیرانی کڕیبوو کە دەکەوتنە ناو کاری سیاسی بە نهێنی. خانووەکە کۆن بوو و پێویستی بە دەستکاری هەبوو و کەسیشی تێدا نەدەژیا. من بە ناوی چاودێری خانوەکەو تا خاوەنە بەڕێزەکەی دێت و تەسلیمی دەکەمەوە، لێی دانیشتم. ناوی خۆم نا دێڤید موتسامای، ناوەکەش ناوی مەعمیلێکی کۆنی نووسینگەی پارێزەریم بوو. وەک پیاوە ڕەشەکان قاتێکی شینم لەبەر کرد، بە ڕۆژ خانووەکە پڕ وەستا و کرێکار دەبوو، هەموویان خەریکی چاککردنەوە و بۆیە کردنی خانووەکە بوون و هەروەها بەشی تریشیان بۆ زیاد دەکرد، بڕیارەکەمان وا بوو، ژووری بچووکی تێدا دروست بکەین. دیارە ئەوەش بۆ ئەوە بوو تا زۆرترین ژمارەی خەڵک بگرێت. کرێکارەکان هەموویان ئەفریقییەکانی دەڤەری ئەلیکساندرا بوون، منیان بە ناوی شاگرد، یان بە ناوی کوڕەکە، بانگ دەکرد. ئارەزوویان نەبوو لە ناوم بپرسن. خواردنی بەیانیان و چام بۆ ئامادە دەکردن، بۆ کاری تایبەتی ناو باخچەکەیان دەناردم، یان شوێنێکیان پێ پاک دەکردمەوە و پاشماوەکانیان پێ فڕێ دەدام.

ڕۆژێکیان بۆ چا خواردنەوە بانگم کردن و، لە سەر سینییەکەدا کوپە چا و شیر و شەکرم بۆیان دانابوو. بۆم ڕاگرتن و هەر کەسە و بەشی خۆی دەبرد. یەکێکیان لە شەکر هەڵگرتنەکەدا دوا کەوت و هەر خەریکی قسەکردن بوو بۆیە من سینییەکەم دوورخستەوە و بردمە پێش یەکێکی تر، ئەویش منی ڕاوەشاند و وتی:

– شاگردەکە، نابی بڕۆیت و بگەڕێوە ...؟ خەڵکی وا هەیە نموونە، بۆ کۆمەڵگای ئەفریقی دادەڕێژێت، منیش ئەم دیمەنە پەسند دەکەم. لە ڕاستیداو لە هەموو کاتێکدا ئەفریقییەکان لە نێو خۆیاندا بە یەکسانی تەماشای یەکتری ناکەن. پیشەسازی دەورێکی گرنگی بینی بۆ فێرکردنی کەسی ئەفریقی بۆ هەستکردن بە چینی بەرز لە کۆمەڵگای سپییەکانا. لە پێش کرێکارەکانا وەک خزمەتکارێکی چینی خوارەوە تەماشا دەکرام. لە بەر ئەوەی بێ پیشە و بێ بازرگانیم. بۆیە دەبێ بە چاوی کەم و بە بێزەوە تەماشام بکرێت. دیاربوو جوان دەورەکەی خۆمم بینیبوو، بۆیە کەسیان گومانی کەسی تری لێ نەدەکردم، من هەر ئەو کەسەی جارانم. کرێکارەکان شەوانە هەموویان دەگەڕانەوە ماڵەکانیان منیش بە تەنیا دەمامەوە و لەو تەنیاییەدا تامێکی خۆشم وەردەگرت. جارجاریش بۆ کۆبوونەوەکانیش دوور دەکەوتمەوە و شەوانەش درەنگ دەگەڕامەوە. کە دەگەڕامەوەش

جوان چاوم دەگێڕا و ترسم هەر هەبوو. حەقم بوو، چونکە من لەوێ بە ناوی خوازراو و بە ناشەرعی دەژیام. شەوێکیان بە ڕاستی ترسام و وام بۆ هات کەوا کەسێک بە دزە هاتۆتە باخچەکە و زۆریشی بۆ گەڕام، بەڵام هیچم بەر چاو نەکەوت. خەڵکی شۆڕشگێڕ، ئەوەی کاری نهێنی بکات قەت خەوی قوولی لێ ناکەوێت. پاش چەند هەفتەیەک ڕیمۆند ئەمهلابا لە بورت ئەلیزابیتەوە هاتە باخچەکە، ڕیمۆند لە پیاوە دێرینەکانی سەندیکاکانی کرێکاران و ئەندامی لێژنەی ڕاگەیاندنی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە کیپ تاون وئەندامی حیزبی شیوعی بوو. یەکەم کەس بوو لە هەڵمەتەکانی بەربەرەکانیدا گیرا، لە لایەن حیزبەوە وەک سەربازە یەکەمەکانی بزاڤی «ئەمکا» دەست نیشانکرابوو، لەگەڵ سێ ئەندامی ترا کاروانەکەی کە ولتر سیسولو لە ساڵی ١٩٥٢ بۆ کۆماری چینی میللی دەستی پێکرد بوو، تەواوی بکات. ڕیمۆند دوو هەفتە لەگەڵمدا مایەوە و گەڵاڵەی کێشەکانی حیزبی لە کیپی خۆرهەڵات بۆ کردم، بۆ داڕشتنی کتێبی پەیڕەو و پرۆگرامی بزاڤی «ئەمکا» پرسم پێکرد. هەروەها لە داڕشتنی کتێبەکەدا جوستوفو و رستی بیرنستاین هاوکارییان کردم. کە ڕیمۆند ڕۆیشت، مایکل هارمیل بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵما مایەوە، ئەویش یەکێک بوو لە کەسایەتیە سەرەکییەکانی باڵی نهێنی حیزبی شیوعی و ئەندامی دامەزرێنەری کۆنگرەی دیموکراتخوازان و نووسەریش بوو لە گۆڤاری لیبیراشن. مایکل ڕووناکبیرێکی داهێنەر بوو، خەریکی کاروبارەکانی پەیوەست بە سیاسەتەکانی حیزبی شیوعی بوو، بۆیە بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە پێویستی بە شوێنێکی هێمن و ئارام هەبوو. بە ڕۆژ خۆم لە مایکل دوور دەخستەوە، ئەگەر وام نەکردبایە، خەڵکەکە گومانیان لێ دەکردم. چونکە گونجاو نەبوو، خزمەتکارێکی ڕەشی وەک من چۆن هاوشان و هاوڕێی پیاوێکی سپی وەک مایکل دەکات. شەوانە کە کرێکارەکان دەچوونەوە، هەردووکمان بە جووتە دەکەوتینە دووان لەسەر پەیوەندی نێوان حیزبی شیوعی و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و گفتوگۆیەکانمان چەند سەعاتی دەخایاند. شەوێکی درەنگ لە کۆبوونەوەیەکدا دەگەڕامەوە، وەک شەوانی تر دەبوایە چاک لە دەرگا و پەنجەرە و گلۆپەکان دڵنیابم و، گومانی ئەوەم لەسەر نەبێ کە لە جەرگەی ڕیڤۆنیا پیاوێکی ڕەش دەژیت، هەستم کرد لە ماڵەکەمدا تروسکاییەک هەیە و دەنگی رادیۆش بەرز کراوەتەوە و دەروازەی سەرەکیش لەسەر پشتە، کە بە ژوورێ کەوتم، بینیم، مایکل لەسەر سەرینەکەی لە شیرینە خەودایە، بەم پشتکردنەوەو ئەو بێ خەمیەی لە ترس و گومان منی شڵەژاند و بە ئاگام هێنا و وتم: چۆن دەخەویت و گلۆپەکانت داگیرساوە و دەنگی رادیۆیەکەت بەرزیشە ...؟!!



کە بە ئاگا هات، توورەیی پێوەبوو و وتی: بۆت نییە لەم شیرینە خەوەمدا بەئاگام بێنیت، دەبوایە ئەوەیان بۆ بەیانی هەڵگریت ...!!

منیش بە نەخێر وەڵامم دایەوە و هوشیارم کردەوە کەوا مەسەلەکە پەیوەندی بە ئاسایش هەیە و دواخستنی لەسەر نییە. پاش ماوەیەکی کەم ئارسەر گولدۆیتش و خێزانەکەی هاتنە ناو خانووە سەرەکییەکە و منیش گواستمەوە ناو یەکێک لە ژوورەکانی خزمەتگوزاری، کە تازە تەواو ببوون. هاتنی ئەو لە رووی ئارامییەوە دڵنیایی بە شوێنەکە بەخشی. ئەویش هونەرمەندێکی نەخشەساز بوو، ئەندامی کۆنگرەی دیموکراتخوازان بوو، یەکێک بوو لەوانەی زوو پەیوەندی بە بزاڤی «ئەمکا» وە کردبوو، پێشتر لە لایەن پۆلیسەوە ئاگادار نەکرابۆوە و چالاکییەکانی گومانی لەسەر نەبوو. ئارسەر لە ساڵی ١٩٤٠ لە فەڵەستین لە ڕیزەکانی باڵی سەربازی بزاڤی نیشتمانی جوولەکە لە فەڵەستین ناسراو بە بالماخ شەڕی کردبوو. شارەزاییی لە شەڕی پارتیزانی هەبوو، زۆر وردەکاری کە من لێیان شارەزا نەبووم. فێری کردم و لەم بوارەدا یارمەتی زۆری دام. هەروەها کەسایەتیە ڕووخۆشەکەی ئارسەر دڵشادی و کراوەیی بە کێڵگەکە بەخشی.

دوا کەس کە پەیوەندی بە کێڵگەکە کرد جیللیمان بوو. ئەویش پیرێکی ڕووخۆش و جوان ڕەفتار بوو، دۆستی دێرینی بزاڤەکە بوو، بۆ سەرپەرشتی کێڵگەکە هاتبوو، لە سیخوخونیلانەوە چەند کرێکاری گەنجی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و، باخچەکەیان رازاندەوە و کردیانە شتێکی تری نایاب. جیللیمان ئەندامی حیزب نەبوو، بەڵام کابرایەکی دڵسۆز و چالاک بوو لە کارەکەیدا. نانی بەیانی و ئێوارانم بۆ ئامادە دەکردو هەروەها کابرایەکی کەریم و چاپووک بوو، پاشانیش ژیان و وەزیفەکەی بۆ یارمەتی دانم خستە مەترسی.

کاتە خۆشەکانی ڕۆژانی باخچەکە، ئەوانە بوون کە ژن و منداڵەکانم بە سەردان دەهاتنە لام. پاش ئەوەی خێزانەکەی پۆلدریتش لە کێڵگەدا جێگیر بوون، هەموو پشووەکانی هەفتە وینی دەهات و، وریایانە دەجووڵایەوە. هاوڕێیەک لە ماڵەوە دەیبردە شوێنێک و لەوێشەوە هاوڕێیەکی تر بۆ باخچەکەی دەهێنا. لە دواییەکاندا خۆی سواری ئۆتۆمۆبێلەکەی دەبوو و لە ترسی چاودێری و بەدواهاتندا، چەند جار ڕێگاکەی پێچ پێچ دەکرد و دەسووڕایەوە و، دەهات. هێشتا پۆلیس سۆراخی هەموو چالاکییەکانی نەدەکرد. سەیرەکەش لەوەدابوو، ئەو پەنایانەی لە باخچەکەدا بۆمان ڕەخسابوو لە ماڵەکەی خۆماندا بۆمان نەڕەخسابوو. منداڵەکان هەر خەریکی یاری و خۆشی بوون. ئەگەرچی ماوەکەی ئەم شوێنە دڵڕفینە کورت بوو،، بەڵام هەستمان بە دڵنیاییەکی خۆش دەکرد.

وینی ئەو تفەنگە هەواییەی کە لە ئورلاندو کڕیبووم بۆی هێنابووم، من و ئارسەر بۆ ڕاهێنان و ڕاو بەکارمان دەهێنا. ڕۆژێکیان سێرەم لە چۆلەکەیەکی سەرداریَ گرت و ژنەکەی ئارسەر کە لە دوورەوە نیگای دەکرد، کە گوللەکەم تەقاند، یەکسەر وتی بە داخەوە نەتپێکا، بەڵام هێشتا ڕستەکەی جوان لە زاردا نەهاتبووە دەرەوە چۆلەکە لەسەر دارەکە کەوتە خوارەوە، منیش وەک شانازییەک بە ڕاوچییەتی باشم ئاوڕێکم دایەوە و خۆم دەرهێنا، بەڵام بولی کوڕی تەمەن پێنج ساڵان فرمێکسی باراند و پرسی:

– بۆ ئەم چۆلەکەت کوشت، ها ... دێڤید، ئیمرۆ دایکی خەمبار دەبێت.

یەکسەر شانازییەکم بۆ شەرمەزاری گۆڕا و، هەستم کرد ئەو منالە زۆر لە من زیاتر هەستی مرۆڤایەتی تێدایە. ئەوەش بۆ کەسێک بە نیاز بێت پێشڕەوایەتی سوپایەکی ساوا بکات و بچێتە ناو مەیدانی شەڕێکی فیداکارانە، هەستێکی نامۆیە. بۆ پلانی داهاتووی بزاڤی «ئەمکا» دانوستان لە سەر چوار تەوەر کرا، کە لە بوواری چەکداری پەیرەو بکرێت. ئاژاوە و تەخریب، پارتیزانی، تیرۆریستی، شۆڕشی ئاشکرا. شۆڕشی سەرتاسەری بۆ سوپایەکی ساوای وەک سوپاکەی ئێمە ئاسان نەبوو. تیرۆریش ئاکامی ناشایستەی لێ دەکەوێتەوە و هاوکارییە میللیەکەشی لاواز دەبێت. بۆیە شەڕی پارتیزانی ئەگەری گونجاو بوو. لەبەر ئەوەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هێشتا لە بڕیاری بەکارهێنانی هێز دوودڵ بوو، بۆیە باشترین شێواز ئەوەبوو پەیڕەوی ئاژاوە وتەخریب بکەین. چونکە لەم شێوازەدا زیانی گیانی کەمتر دەکەوێتەوە.

لەبەر ئەوەی تەخریب خوێنی تێدا نارژێت، هیواش زۆرترە ئاشتبوونەوە لە نێوان نەژادەکانا بسازێت. ئێمەش نەماندەویست، دوژمنی خوێن لە نێوان نەژادی ڕەش و سپیەکانا دروست بێت. دیارە کەوا دوژمنداری لە نێوان ئەفریقییەکان و ئینگلیزەکان پاش تێپەڕبوونی پەنجا ساڵیش بە سەر شەڕی بویری هەر ماوە. ئاکامەکەی دەگاتە کوێ ئەگەر ئێمە شەڕێکی تری ناوخۆمان بەرپاکرد ...؟ هەروەها پرۆسەکانی تەخریب کەمترین کادیریان دەوێت و بە ژمارەیەکی کەم ئەنجام دەدرێن. ستراتیژیەکەش ئەوەبوو: کەوا هێرش بکرێتە سەر دامەزراوە سەربازییەکان و ئیستگەکانی سازکردنی وزەی کارەبا و هێلەکانی تەلەفۆن و تۆڕەکانی گەیاندن. ئەمانەش هەر هێزە سەربازییەکانی دەولەت شل و شەکەت ناکەن و، بەلکو ترسیش دەخەنە ناو ئەندامانی حیزبی نیشتمانی دەستەلاتدار و سەرمایەدارە بێگانەکان و ستونی ئابووری دەولەت دەهەژێنن. بڕواشمان وابوو، ئەم کارانە حکومەت ناچار دەکات دانوستانمان لەگەلّ بکەن و، لەسەر مێزی گفتوگۆدا



لەگەڵمانا دانیشن. ڕێنمایی توندمان بۆ ئەندامانی «ئەمکا» دەرکرد، کەوا نابێ بە هیچ شێوەیەک زیانی گیانی هەبێت. خۆ ئەگەر ستراتیژیەتی تەخریبەکە ئاکامی نەبێت، ئەوا هەنگاو بەرەو شەڕی پارتیزانی و تیرۆریزم دەهاوێژین.

هەڵکەوتە و نەخشەی ڕێکخستنی بزاڤی «ئەمکا» وێنەی کۆپی ڕێکخستنی دایک بوو ... سەرکردایەتی باڵا لە سەرووی بەرزی ڕێکخستنە و سەرکردایەتی هەرێمەکانیش لە هەرێم و دەڤەرەکاندا لە دوایاندا دێن و پاشانیش سەرکردایەتی و شانە ناوچەییەکان دێن. لە سەرانسەری ولاتا سەرکردایەتی ناوچەیی دامەزرا، هەرێمی کیپی خۆرهەلات پەنجا شانەی تێدا دامەزرا، سەرکردایەتی باڵا ئەرکی ئامانجە گشتییەکان و دیارکردنی ئوسلوبەکان و چاودێری ڕاهێنان و دابینکردنی گرتە ئەستۆ. سەرکردایەتیەکانی ناوچەکانیش لە چوارچێوەی سیاسەتی سەرکردایەتی باڵا ئامانجەکانیان دەست نیشانکرد. هەموو ئەندامانی بزاڤی «ئەمکا» لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکان بۆیان نەبوو چەک هەڵگرن و داواشیان لێکرا بە هیچ شێوەیەک گیانی هیچ کەسێ نەکەوێتە مەترسی. یەکەم تەنگوچەڵەمەی دووچارمان هات، دووڕوویی گوێڕایەڵی نێوان «ئەمکا» و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بوو. سەربازەکانمان زۆربەیان ئەندامی حیزب بوون و لە لقەکاندا چالاکی زۆریان ئەنجام دەدا. بەڵام لەبەر «ئەمکا» و کارەکانی وازیان لە چالاکییەکانی ناوچەکانیان هێنا. سکرتێری لقەکان هەستیان بە ئامادەنەبوونی زۆر لە ئەندامەکانیان دەکرد. ڕەنگە دەمەتەقێیەک لەم جۆرە لە نێوان سکرتێری لقەکەو ئەندامە ئامادەنەبووەکان رووی دابێت وەک:

– بۆچی دوێنی شەو لە کۆبووەنەوە ئامادە نەبوویت ...؟

– لە کۆبوونەوەیەکی تردا ئامادە بووم ...!

– ئامادەی چ کۆبوەنەوەیەک بوویت ...؟

– ناکرێت پێت بڵێم ...!! من سکرتێری لقم وناتوانی پێم بڵێیت ...؟ بەم جۆرە لقەکە بۆی ئاشکرا دەبوو کەوا ئەندامەکەیان ئەندامە لە بزاڤە نوێیەکە و ئەوەش وای کرد دووانەیی لە گوێڕایەڵی پەیدا بێت. بۆیە پاش ماوەیەک لەسەر لێشێوان و خراپ لەیەک تێگەیشتن، بڕیارماندا سکرتێری لقەکان لە ئەندامانی بزاڤی «ئەمکا» ئاگادار بکەینەوە. لە ڕۆژێکی فێنکی مانگی دیسمبەردا، لە باخچەکەی لیلیزلیف دانیشتبووم، لە ڕادیۆدا بیستم، پێشەوا لوتولی لە پایتەختی نەرویژ ئۆسلۆ خەلاتی نۆبلی ئاشتی بەرکەوتووە و حکومەتیش مۆری دەرچوونی دە ڕۆژی لە

پاسەکەی نەداوە بۆ سەفەری وەرگرتنی خەڵاتەکە. من و هەموومان بەم ڕووداوە دڵشادبووین، پێش هەموو شتێک، ئەوەیان دان پێنانە بە خەباتمان و دەستکەوتێکە بۆ خەباتی پێشەوا لوتولی وەک مرۆڤ و سەرکردەی ئەم خەباتە. دانی ئەم خەڵاتەش دان پێنانی خۆرئاوایە بە خەباتەکەمان و سەلماندنیشە کەوا ئێمە چەندین ساڵە خەباتی شەرعی و ئەخلاقی دەکەین و وڵاتانی گەورەش بە رەوا باسی ناکەن. ئەم خەڵاتە زەبرێکی کوشندەش بوو لە ڕووی حیزبی نیشتمانی دەستەڵاتدار کە بە ناحەق، دەزگاکانی ڕاگەیاندن پێشەوا لوتولی- یان بە دەستی تێکدەرانە و بەپلانی شیوعییەکانیان دەناساند بۆ دژایەتیکردنی خوارووی ئەفریقیا. هەروەها خەڵاتەکە ئەو بۆچوونەی ئەفریقییەکانی لە دەست داوەشاندن، کە دەیانووت: خەڵاتەکە هێمایەکی تری بۆگەنی لیبرالییەکانە لە خۆرئاوا و پاڵپشتی سپیەکانە لە خوارووی ئەفریقیا. کە خەڵاتەکە ڕاگەیاندرا، پێشەوا سێ ساڵی قەدەغەی سیاسی لە پێنج ساڵەکەی سەری لە شاری ستانگری هەرێمی ناتال بەدەست بەسەری گوزەر کردبوو و لەبەر ژانە دڵ و لاوازی بیرکردنەوەی، تەندروستی خراپ ببوو. بەڵام بەخشینی ئەم خەڵاتە تان و گوڕی پێبەخشی و ئێمەشی وەک خۆی شادومان کرد. ڕێزگرتنی پێشەوای حیزب لە کاتێکی گونجاو و شیاو بوو، هاوکات لەگەڵ ئەم بۆنەیەدا، بۆنەیەکی تر ڕاگەیاندرا کە لە پرشنگ و ڕاستگۆیی خەڵاتەکەی دا. پاش ڕۆژێک لە گەڕانەوەی پێشەوا لە ئۆسلۆ، دامەزراندنی «ئەمکا» ڕاگەیاندرا. لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٦ی کانونی دووەم/ دیسێمبەردا، ئەو ڕۆژەی سپییەکان لە خوارووی ئەفریقیادا یادی ڕۆژی دینگانیان دەگێڕا، سەرکردایەتی باڵای بزاڤی «ئەمکا» فەرمانی دا، ئیستگەکانی سازکردنی وزە و نووسینگە حکومییەکانیان لە جوهانسبیرگ و بورت ئەلیزابێت و دوربان بتەقێننەوە. لەم پرۆسەیەدا، بە هەڵە، پیاوێکی بزاڤەکە کوژرا، ئەویش بوترس مولیفی بوو، ئەویش بووە یەکەم سەربازی بزاڤەکەمان کە لە مەیدانی خەباتا بکوژرێت. کوشتن لە شەڕدا ڕاستییەکی تاڵە، بەڵام چارەش نییە. هەموو سەربازانی «ئەمکا» دەیانزانی دووچاری قوربانی دەبنەوە و سەر و ماڵیان دەکەوێتە مەترسی. لە کاتی تەقینەوەکەدا هەزارەها بەیانی دامەزراندنی بزاڤی «ئەمکا» لە سەرانسەری وڵاتا دابەشکرا و ڕاگەیاندرا کەوا بزاڤی ئومخونتودی سیزوی ئای «ڕمی نەتەوە» دامەزرێندرا، ئەوەی خوارەوەش لە بەیانەکەدا هاتبوو: ئیمرۆ یەکەکانی سەر بە بزاڤی «ڕمی نەتەوە» چەندین چالاکی سەرکەوتوویانەیان دژ بە دامەزراوە حکومییە تایبەتییەکانی پەیوەست بە سیاسەتی جیاخوازی و نەژادپەرستی ئەنجامداوە. «ڕمی نەتەوە» بزاڤێکی سەربەخۆی نوێیی ئەفریقییە و لە ڕیزەکانیدا هاووڵاتی فرە ڕەنگ و نەژادی



تێدایە، خەبات دەکات بۆ بەدیهێنانی ئازادی و دیموکراسی و شێوەی نوێ و هەمەجۆر پەیڕەو دەکات و هاوشانیشە لەگەڵ بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی لە گۆڕەپانەکەدا. مێژووی هەموو میللەتان لە قۆناغی ناسکدا دوو ئەگەری لەکێشە وهیچی تر نا، ئەویش: تەسلیم بوون، یان شەڕ، ئیمڕۆش لە خوارووی ئەفریقیادا کاتی ئەوە هاتووە، تەسلیم نەبین، هیچ ئەگەری ترمان لە پێش نییە بێجگە لە ئەگەری وەستان لە ڕووی دوژمنا و بە هەموو شێوەکانی بۆ بەرگری لە میللەت و دوارۆژ و ئازادیمان.

ئێمە لە بزاڤی «ئەمکا» دا کۆششمان دەکرد، هەروەها تێکڕای بزاڤی ڕزگاریخوازی، بۆ ڕزگاری و نەڕژانی خوێن و ڕوونەدانی شەڕی ناوەخۆ. ئێمە هیوادارین، لەم سەعاتە درەنگانەوە، چالاکییەکانمان، هەموو هاوڵاتیان هوشیار بکاتەوە بەوەی کەوا حیزبی نیشتمانی بەرەو چ هەڵدێرێکمان دەبات. هەروەها هیوادارین کەوا حکومەت و دۆستەکانیان پێش بەفیڕۆچوونی کات، حکومەت و سیاسەتەکەیان بگۆڕن و هوشیار ببنەوە، ئەوانە بکەن تا جڵەویان لە دەست دەرنەچووە و شەڕی ناوەخۆ هەڵنەگیرساوە.

هەڵبژاردنی ڕۆژی ١٦ی دیسێمبەر، ڕۆژی یادی دینگانیی، بۆ دامەزراندنی بزاڤەکە لەم ڕۆژەدا، هۆی تایبەتی هەبوو، لەم ڕۆژەدا، سپیەکان لە خوارووی ئەفریقیادا یادی هەرەسی پێشەوای زولو دینگانی لە شەڕی ڕووباری بلو «ڕووباری خوێن» لە ساڵی ١٨٣٨ز دا دەکەنەوە. دینگانی برای شاکای بەهێزترین دەستەڵاتداری دەوڵەتێکی ئەفریقی بووە، کە لە خوارووی ڕووباری لیمبۆبۆ دامەزرابوو. لەو ڕۆژەدا گوللەی بویرییەکان بەسەر ڕمی زولوەکانا زاڵ بوو و خوێنیان ڕووبارەکەی سوورکرد. لەم ڕۆژەدا، ئەفریکانییەکان یادی سەرکەوتنیان دەکەنەوە بەسەر ئەفریقییەکان و پشتیوانی خوداش بۆ خۆیان دووپات دەکەنەوە. هەر ئەو ڕۆژەشە ئەفریقییەکان بە ڕۆژی ماتەم و پرسەی دادەنێن بۆ قوربانییەکانیان لەو کۆمەڵکوژییەدا. بۆیەش ڕۆژی ١٦ی دیسێمبەرمان هەڵبژارد تا بە پیاوی ئەفریقی بڵێین کەوا شەڕ دەستی پێکرد و حەق و دینامێت لەگەڵمانە.

تەقینەوەکان حکومەتیان هەژاندو کارە تەخریبییەکانیان ریسوا کرد و وتیان: ئەو تاوانانە بە دەستی تێنوە گەمژەکان ئەنجام دراوە. هەروەها تەقینەوەکان سپیەکانی خوارووی ئەفریقیایان ترساندو هەستیان کرد لە سەرووی بورکانێکدا دەژین. ڕەشەکانیش بۆیان ئاشکرا بوو، کەوا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ڕێکخراوێکی بەرگری سلبی نییەو، بوویتە ڕمێکی بە هێز و خەبات بەرەو دڵی مەڵبەندی هێزی سپیەکان دەبات. پاش دوو هەفتەی تر و لە یادی سەری ساڵی نوێدا

چەندین تەقینەوەی ترمان ئەنجام دا. کە دەنگی تەقینەوەکان و زەنگی جەژنی لەدایکبوون و دەنگی ئۆتۆمۆبێلەکانی فریاکەوتن و پۆلیس تێکەڵبوون، ئەوانە ئاژاوەی بێ مانا و شێواندنی پێشوازی ساڵی نوێ نەبوون، بە پێچەوانە سەرەتای قۆناغێکی نوێی خەبات بوو بۆ رزگاری لە خوارووی ئەفریقیادا.

بە راگەیاندنی دامەزراندنی بزاڤی «ئەمکا» حکومەت هەڵمەتێکی دڕندانە و توندی بێ وێنەی دەستپێکرد. کاری یەکەمی پۆلیسی بەشی تایبەتی گرتنی ئەندامانی «ئەمکا» و بەدواچوون و شوێن هەڵگرتنیان بوو. ئێمەش لە بەرامبەریان دەستەوەستان نەوەستاین و ناچاربووین دان بەوە بنێین، کەوا دووچاری شتێ هاتووین و دوارۆژمان دەخاتە مەترسی و بڵێین هەموو بوارێک بۆ لەناوبردنیان رەچاو دەکەین.

هەر جارێ کە وینی دەهاتە سەردانم هەستم بە یەکپارچەیی خێزانەکەم دەکرد. کە پۆلیس زۆرتر چاوی لێ دەبڕی، ئەو سەردانەکەی کەمتر دەکردەوە. وینی زیندزی و زینانی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و ئەوانیش گچکە بوون و نەیاندەزانی کە من خۆم شاردۆتەوە، بەڵام مالگاتو، کە تەمەنی یازدە ساڵان بوو، هەموو شتی دەزانی و هوشیاری دەکردەمەوە کەوا ئاگام لەخۆم بێت وناوی راستی خۆم نەڵێم. هەستم کرد ئەو زۆر پەرۆشە و لەم تەمەنە بچووکەیدا وا چاک دەزانێ چۆن نهێنی بپارێزێت. رۆژێکیان مالگاتو لەگەڵ نیکۆلاسی کوڕی ئارسەر و هایزل گولدریتشی تەمەن یازدە ساڵان، لە باخچەکەدا یارییان دەکرد، لەو کاتەدا، وێنەیەکی منیان لە ژمارەیەکی گۆڤاری درام، کە وینی بۆی دەهێنام دیبوو، ئەویش هاواری کردبوو.

– ئەوە باوکمە ...!

کە نیکۆلاس ئەوەی بیستبوو بڕوای نەکردبوو، جا بۆ ئەوەی مالگاتو بیسەلمێنێ کەوا قسەکەی راستە، ناوی راستی باوکی دەڵێت و دەڵێ:

ناوی راستەقینەی باوکم نیلسۆنە. نیکۆلاس بە تووڕەییەوە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

– نەخێر، ناوی باوکت دیڤیدە ...! بۆیە نیکۆلاس بە غاردان دەگەڕێتەوە لای دایکی و دەپرسێ، راستە ناوی راستی دیڤید، نیلسۆنە، وەک چۆن مالگاتوی کوڕی دەڵێت، هایزل بەم قسەیە دەهەژێت و رووداوەکەی بۆ گێڕامەوە، بە بیستنی ئەم قسەیە، هەستم کرد من لەم شوێنەدا زۆرم نەماوە. دوایی بۆ کاری تر گەیشتمە شوێنی وا لە خەیاڵما هەر نەبوو. ئەوەیە خەباتکردن، مرۆڤ دەباتە دەرەوەی وڵاتیش. حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە مانگی دیسێمبەری هەمان



ساڵدا، داوەتێکی ئامادەبوونی کۆنگرەی بزاڤی نەتەوەیی رزگاری ئەفریقیای خۆرهەڵات و ناوەڕاست و خوارووی پێگەیشت. لە دوارۆژا ئەم کۆنگرەیە بە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقی ناسرا. بڕیاربوو کۆنگرەکە لە شوباتی/ فبرایری ١٩٦٢ز لە ئەدیس ئەبابا ببەسترێت. بزاڤەکە نیازی کۆکردنەوەی وڵاتە ئەفریقییە سەربەخۆکان و هەڤاڵبەندی بزاڤە رزگاریخوازەکان بوو. ئەرکی کۆنگرەش بوو، یەکەم و باشترین بوار بۆ حیزبمان بدۆزێتەوە بۆ پەیداکردنی پەیوەندنی و هاوکاری و راهێنانی ئەندامانی بزاڤی «ئەمکا». لیژنەی راگەیاندنی نهێنی حیزب، منی بۆ سەرۆکایەتی وەفدەکە دەستنیشانکرد. بەڵام من بۆ ناسینی خەباتگێڕان پەرۆشی سەردانی وڵاتانی تری ئەفریقی بووم، دوودڵیش بووم لە دابڕانم لە کاری نهێنی حیزب و حەزم لە دوورکەوتنەوەش نەدەکرد. بەڵام هاوڕێکانم زۆریان لێکردم، لەوانە پێشەوا لوتولی و بەڵێنیشی پێدام، هەر کە کۆنگرەکە کارەکانی تەواوکرد من بگەڕێمەوە. مەبەست لە سەفەرەکەمان، لە ئامادەبوون لە کۆنگرەکە زۆرتر بوو. کۆششمان بۆ پەیداکردنی پشتیوانی سیاسی و دارایی بوو بۆ هێزە سەربازییەکانمان، دواییش لە هەموویان گرنگتر، سازکردنی بوارێک بوو بۆ راهێنانی سەربازی هێزەکانمان لە چەندین وڵاتی ئەفریقیدا. هەروەها دەمانویست پێگەی حیزب لە وڵاتانی تری ئەفریقی بناسێنین، کە زۆر کەم لە سەر حیزبمان دەزانن. حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی زۆر پڕۆپاگەندەی ناشایستەی دەرحەقمان پەخشکردبوو، بۆیە دەبوایە دۆزەکەمان لەسەر ئاستێکی بەرین بناسێنین. پێش سەفەرەکەم، بە سەردانێکی نهێنی لە گراوتفیلدا ولە ماڵێکی ئارامدا دیدارێکی پێشەوا لوتولیم کرد. دیدارەکەمان سەرکەوتوو نەبوو. پێشەوا لە دامەزراندنی بزاڤەکە ئاگادار بوو و ورد و درشتی زانیارییەکانیشی بە دەست دەگەیشت. بەڵام لاوازی بیرکردنەوە و لەبیرنەمانی شتەکان، وای لێکردبوو شتەکانی لە بیر بچێتەوە، بۆیە تاوانباری کردم کەوا لە دامەزراندنی بزاڤەکە ئاگادار نییە و بە بێ رەزامەندی ئەوەوە دامەزراوە. ویستم دیدارەکەی دوربانی بە بیر بێنمەوە، کە تێیدا باسی بەکارهێنانی هێزمان کردبوو. بەڵام...! هیچی بەبیر نەدەهاتەوە، ئەوەش بوو، وای کردبوو بڵێین پێشەوا دژی بەکارهێنانی هێز و دامەزراندنی بزاڤی «ئەمکا» یە، بەڵام ئەو قسەیە لە راستی دوور بوو.

دوا شەوم لەگەڵ وینی دا لە ماڵی برادەرێکی سپی بوو لە دەڤەرەکانی باکوورا. لەگەڵ خۆیداو بۆ ئەم سەفەرەم جانتایەکی تازەشی بۆ هێنابووم. بۆ دەرچوونم بۆ دەرەوە نیگەران بوو و دەترسا. بەڵام، وەک جاران، خۆڕاگر بوو. وەک ژنێک خۆی نەنواند، وەک سەربازێک هاتە پێش چاوم.

بڕیارەکـە وابوو لە تانجـانیـقـاوە بڕۆم بۆ دار السـلام و لەوێشـەوە بۆ ئەدیس ئەبابا. پێش سەفەرەکەشم بڕیار بوو لە شوێنکی نهێنیداو بۆ وەرگرتنی پسولەکانی سەفەرو ڕێنمایی، ولتر و کاسرادا و دوما نوکوی لە سویتو ببینم. ئەحمەد کاسرادا لە کاتی دیاریکراودا گەیشت، بەڵام ولتر و دومـا دواکـەوتن، بۆیە بە ناچاری پلانەکـەمـان گـۆڕی و ئەحـمـەد بە ناچاری دەبوایە کـەسـێک بدۆزێتەوە بە ئۆتۆمۆبێل بمگەیەنێتە بیتشوانالاندو لەوێشەوە دەتوانم فرۆکەیەک بەکرێ بگرم و بۆ دەرەوەی وڵات بفڕم. پاشان زانیمان ولتر و دوما هەردووکیان گیراون.

چوونم بۆ بیـتـشـوانالاند زەحـمەت بوو و لە ترسی پۆلیـسـیش نیگەران بـووم و دەرچوونیـشم بۆ دەرەوەی وڵات بۆ یەکەم جاریش تووشی دڵەڕاوکێی کردم. بەرەو لوباتسی سەرسنوور ڕۆیشتین و، بە ئاسانی لە سنوور دەربازبووین و پاش نیوەڕۆیەکەی گەیشتینە لوباتسی و لەوێ بروسکەیەک لە دار السلامەوە هاتبوو. تێیدا داوایان کردبوو سەفەرەکەم دوو هەفتە دوابخەم. لەوێ لەگەڵ هاوڕێی دادگایی خیانەتدا، فیش کاتیسینگ کە گواستبوویەوە لوباتسی ژیام. هەر کە گەیشتم یەکسەر لەگەڵ مامۆستا کیەتی موتسیتی سەرۆکی حیزبی کۆنگرەی گەل لە بیتشوانالاند دانیشتم، ئەو حیزبە لە لایەن چەند کۆنە ئەندامێکی کۆنگرەی نیشتمانی دامەزرابوو، کاتم زۆر بوو، خۆم بە ئامادەکردنی وتارەکەی کۆنگرەم خەریک کرد، بێجگە لە پیاسەکردن لە ناو دەڤەرە شاخاوییە جوانەکـان، خـەریکی خـوێندنەوەش بووم. ئەگـەرچی ئەوەندەش لە سنووری وڵاتەکـەم دوور نەکەوتبوومەوە، هەستم بە غەریبی دەکرد. ماکس ئەملونوینی هاوڕێی ترانسکاییم لەگەڵ بوو. ئەویش ئەندامێکی گەنجی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی بوو. ئەم ماوەیەم بە سەیرانێکی خۆش دەزانی و جۆرەها ئاژەڵی سەیرم لە دارستانەکانا بینی. ڕەوە مەیمونی گۆشتخۆرم بینی و جوڵانەوەیان لە تیمێکی سەربازی دەچوو. لە باسوتولاندەوە جوماسیوزیش گەیشتە لام. من سوور بووم لەسەر ئەوەی زوو سەفەری دار السلام بکەین. پۆلیسی خوارووی ئەفریقیا تازە لە لوباتسی هاوڕێیەکی حیزبمانیان فڕاندبوو، بۆیە زوو سەفەرکردنم بە باش دەزانی. فڕۆکەکە گەیشت و یەکەم ئێستگەمان شاری کاسانی باکووری بیتشوانالاندی هەڵکەوتووی نێوان سنووری چوار وڵاتی بیتشوانالاند و ڕودیسیای باکوور و ڕودیسیای باشوور و باشووری خۆرئاوای ئەفریقیا بوو. ئەو کاتانە کۆلونییەکان وا ناویان دەهات. لەبەر هەڵسانی ئاوی زۆر، فڕۆکەکە بۆی نەکرا لە فرگەکەدا بنیشێت. بۆیە بە ناچاری لە ناو داران و لە دووری چەند کیلۆمەترێک نیشتەوە. بەڕێوەبەری ئوتێلەکە چاوەڕێی دەکردین. هەموویان چەکداربوون. کابرا وتی: ببوورن کە دواکەوتم، ئەوەش لەبەر



بوونی ڕەوە فیلێکی کێوی بوو. ئۆتۆمۆبێلەکە بێ سەر بوو. لەگەڵ جوماسیوز لە پشتەوە دانیشتین و شێری کێوی ناو دارستانەکەم لێوە دیاربوو. یەکەم جار بوو لە شەقامەکانی جوهانسبیرگ دوور بکەومەوە و بکەومە ناو ئەفریقیای چیرۆک و ئەفسانە و خەیاڵ.

بۆ ڕۆژی دوایی، بەیانیەکەی لە تانجانیقاوە بەرەو ئەمبیای سەرسنووری ڕودیسیای باکوور بەرێکەوتین. فڕۆکەکە ئێمەی لە نزیک تاڤگەکانی فیکتۆریا دەسوڕاندەوە و دوایی بەرەو باکوور هەڵکشا و لەسەر ڕەوەزە شاخێکدا دەفڕی. فڕۆکەوانەکە ویستی بە لاسلکی پەیوەندی بە ئەمبیاوە بکات، بەڵام بۆی نەکرا. ڕەوشی ئاوو هەواکە گۆڕا و ئاسمان تاسەی زۆری کەوتێ و فڕۆکەکە بەرز و نزم دەبۆوە و وەک پەڕەموچەیەک تەوژمی با دەیهەژاند. پاش گاڤێکی کورت، کەوتینە ناو گردۆڵکەی هەوری چڕ و فڕۆکەوانەکە بە ناچاری بوارەکەی بەرەو چیاکان گۆڕی. بوارەکە بە پێچ و پەنا و سوڕانەوە بوو. هەورەکە ئەوەندە چڕ بوو ئاسۆی دیتن زەحمەت بوو، لە ناکاودا فڕۆکەکە ڕووی وەرگێڕا و دوایی زانیم لە شاخێک لایدا، زەنگی هوشیارکردنەوە لێیدا و لەبەر خۆمەوە وتم: ئەوە کۆتاییە ...!! جۆماسیوز هەر قسەی دەکرد، بێدەنگ ببوو. لە ناکاو لە ناوچە تاریکەکان بەرەو ئاسمانێکی بێگەرد چووین. من هەرگیز حەزم بە سەفەری بە فڕۆکە نەدەکرد، ئەمەش بۆ من ئەزموونێکی زۆر ناخۆش بوو، لە کاتی فڕینەکەدا خۆم ئازا نیشاندا وبێ منەتیش نەبووم.

لە یەکێک لە ئوتێلەکانا دابەزین و چەند پیاوێک لە سالۆنەکەدا دانیشتبوون، ڕەش و سپی بوون، یەکەم جارە لە ژیانمدا ببینم ڕەش وسپی بە یەکەوە و لە یەک سالۆندا دانیشن. ئەمەیان بۆ من ئاسایی نەبوو لە ئوتێلێکدا ببینم نەژادپەرستی نییە. ئێمە لە ئوتێلەکە لە بەڕێز مواکانگلی لە حیزبی یەکێتی نیشتمانی ئەفریقی لە تانجانیقا و ئەندامی پەرلەمان دەگەڕاین و ئەویش لە ئێمە دەگەڕا. پیاوێک لە ژنە سپیەکەی پێشوازی نزیک بۆوە و ئەویش ئێمەی نیشاندا.

کابرایەک هاتووە بە ناوی ئامواکانگلی و لەم دوو پیاوە دەپرسێ ...!! بەڵێ، داوای لێبووردن دەکەم، لەبیرم چوو پێتان بڵێم . هەر بەرێزەوە وتی: تکایە زۆر ڕێزیان بگرن ئەوانە مێوانن. یەکەم جارە لە وڵاتێکا دەبینم ئەفریقی حوکم دەکات، گەرچی لە وڵاتەکەما ڕاونراوم، بەڵام وا هەستم کرد باری سەرشانم سووک بووە. بۆ هەر شوێنێک لە تانجانیڤا دەچووم دەمبینی کەسانی لە ڕەنگی پێستەکەی من جنێو و نەفرەت ناخۆن. یەکەم جارە دەبینم عەقڵ و کەسایەتیم پێوەرە نەک ڕەنگی پیستەم و ئەوانە هۆکاری سەرەکین بۆ بڕیاردان لەسەرما. ئەگەرچی سۆزم بۆ وڵات دەجوڵا، بەڵام هێشتا هەستم دەکرد لێرە لە وڵاتی ڕاستەقینەی خۆمدا نیم.

بۆ رۆژی دوایی گەیشتینە دار السلام و دیدارم لەگەڵ یەکەم سەرۆک کۆماری تازە ئازادکراو، جولیوس ینریری کرد. لە ماڵە سادەکەیدا بینیم، ئۆتۆمۆبێلە بچووکەکەی لە جۆری ئوستن بوو و خۆی دەیهاژوت. ئەوانە سەرسامی کردم و هەستم کرد کەوا ینریری ئەندامێکە لە میللەتەکەی. ینریری دەیووت، رژێمی چینەکان لە ئەفریقیادا نامۆیە و سۆسیالیستی شتێکی رەسەنە. ینریری پیاوێکی زیرەک وزانا بوو، هێمن قسەی دەکرد و دەیزانی من بۆچی هاتووم. باسی رەوشی خوارووی ئەفریقیام بۆ کرد و داوای یارمەتیم لێکرد. بەڵام ئەو هەڵسەنگاندنی رەوشەکەی بە جۆرێکی تر بوو. پێشنیاری کرد هەتا پێشەوای حیزبی نەتەوەیی ئەفریقی سوبوکوی لە زیندانا ئازاد دەکرێت و خەباتی چەکداریتان راگرن. ئەوەیان منی هەژاند. لەو (٥)رۆژەدا تێگەیشتم کەوا حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی چەند جەماوەری هەیەو لە چەندین بۆنەی تردا بۆم رونبۆوە کەوا لە وڵاتە ئەفریقییەکانا ناسراوە و جەماوەری هەیە. لایەنە لاوازەکانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقیم بۆ نیریری شرۆڤەکرد و وتم:

دواخستنی خەباتی چەکداریمان زیان و هەرەسە بۆ هەموو خەباتەکە بە گشتی پێشنیاری کرد یارمەتی لە ئیمپراتۆر هیلاسیلاسی حاکمی ئەسیوبیا وەرگرم و ئامادەیی نیشان دا بەوم بناسێنێت.

بڕیاربوو لە دار السلام دیدارم لەگەڵ ئولیڤەر تامبو هەبێ، لە بەر ئەوەی من درەنگ گەیشتم، بۆیە ئەو بە ناچاری رۆیشتبوو و نامەیەکی جێهێشتبوو، کەوا لە لاگۆسی نیجیریا و لە کۆنگرەی لاگۆسی وڵاتە سەربەخۆیەکاندا ببینێت. لە ناو فرۆکەدا بۆ ئەکرا، هاپی باسنر و ژنەکەیم بینی کە بۆ وەرگرتنی فەرمانە نوێیەکەی دەچووە ئاکرا. زوو وەک فەرمانبەرێ لە لای باسنر کارم کردبوو. لەبەر بۆچوون و چالاکییە چەپخوازەکەی لە خوارووی ئەفریقیادا خۆشەویست نەبوو، بۆیە هاتبووە گانا و لەوێ داوای مافی پەنابەری کردبوو. فرۆکەکە لە خەرتووم راوەستا و بەرەو گومرگ رێزبووین. جوماسیوز کەوتە پێشم و ژنەکەشی کەوتە پشتم. لەبەر ئەوەی پەساپۆرتم نەبوو، هەر ئەو پارچە کاغەزەی تانجانیقام لە لابوو، ئەویشم نیشاندا، کە لێی نووسرابوو «ئەوە نیلسۆن ماندێلایە، هاووڵاتییەکی خوارووی ئەفریقیایە و رێگای دراوە بێتە تانجانیقا و لەوێشەوە دەربچێت» پسولەکەم بە فەرمانبەرە تەمەن گەورەکەی پشت مێزەکە نیشان دا، چاوی تێبڕی بە رووما پێکەنی و وتی: بەخێربێیت کوڕی خۆم بۆ سودان ...!! دەستی گوشیم و مۆرێکی لە پسولەکەم دا. نۆرەی باسنریش هات و ئەویش وەک من هەمان پسولەی لە لابوو، کە پسولەکەی لێ وەرگرت، تەماشای کرد و بە ترشییەوە پرسی: ئەم پارچە کاغەزە چییە...؟ ئەوە کەی ناسنامەیەکی



رەسمییە. باستر بە نازەوە وەڵامی دایەوە، لەبەر ئەوەی پەساپۆرتم نییە، لە تانجانیقا ئەم پسولەیان بۆ ساز کردووم. ئەویش بە توورەییەوە، وەڵامی دایەوە. چۆن پەساپۆرتت نییە ... ؟ پیاوی سپی و بێ پەساپۆرتیان گوتووە ...! باسنر وەڵامی دایەوە، کەوا لە وڵاتەکەیدا لەبەر ئەوەی خەبات بۆ رەشەکان دەکات بۆیە پەساپۆرتی نییە و چەوساوەتەوە. بەڵام فەرمانبەرە سودانییەکە بە گومانەوە تەماشای کرد و وتی:چۆن وایە ... ! تو سپییت ...!

لەگەڵ جوماسیوز تەماشای یەکترمان کرد و، بە چرپە تێم گەیاند ... ئێمە مێوانی وڵاتی سودانین و نابێ بەرامبەر بە خانەخۆیەکەمان رەفتاری خراپ بکەین، لەبەر ئەوەی لە کاردا بەرپرسم بووە و، پیاوێکی سپیشەو بۆ رزگارکردنی رەشەکان خۆی دووچاری تەنگوچەڵەمە کردووە، بۆ ئەم مەبەستەش قوربانی داوە، بۆیە ناکرێ دەستبەرداری بم، لە دیار فەرمانبەرەکە راوەستام و سەرم بۆی هەژاند کەوا قسەکانی راستە. فەرمانبەرەکە لە هەڵوێستم گەیشت و نەرمی نواند ومۆرەکەی لە پسولەکەی دا و بە نەرمی بە باسنری وت:

بە خێربێیت بۆ سودان. دوو ساڵ بوو، ئولیڤەر تامبوم نەدیبوو، کە لە فرۆکەخانە بینیم نەمناسیەوە «رەنگە ئەویش هەمان سۆز و کاردانەوەی بەرامبەر من هەبووبێت». ئەو پیاوە قۆزو ریشتاشراو و خاوێنە، بوویتە پیاوێکی ریشدار و قژ درێژ، وەک پێشمەرگەکانی تری ئەفریقییەکان جلی خاکی سەربازی لەبەربوو، دیدارەکە زۆر خۆش بوو، بۆی سەلماندم کەوا لە دەرەوەی خوارووی ئەفریقیا نەبەردی گەورەی ئەنجام داوە. نووسینگەی حیزبی لە گانا و ئەنگلترا و میسر و تانجانیقا دامەزراندبوو. پەیوەندی گرنگ و زیندووی لە چەندین وڵاتانی ترا پەیداکردبوو، بۆ هەر شوێنێ دەچووم ئولیڤەر، ناوی بە چاکە و بە باشە لە لایەن دبلۆماسیەکان و پیاوانی دەوڵەت دەهات و، پەیوەندی چاکی لەگەڵیان سازکردبوو. بەراستی سەفیرێکی شایستەی حیزب بوو لە دەرەوەی خوارووی ئەفریقیا.

مەبەست لە کۆنگرەی وڵاتانی سەربەخۆ لە لاگوس، یەکێتی وڵاتانی ئەفریقی بوو، بەڵام لەبەر ناکۆکی بوونە ئەندامی وڵاتانان هەڵوەشایەوە. بە هێمنی جووڵامەوە و بەشداری کۆنگرەم نەکرد و نەمویست حکومەتی خوارووی ئەفریقیا بزانێ، من لە دەرەوەم، خۆم بۆ کۆنگرەی ئەدیس ئەبابا ئامادەکردبوو، لەوێ خۆم ئاشکرا بکەم.

لە ناو فرۆکەدا و لە رێگای ئەدیس ئەبابادا گور رادیبی و بیتر مولوتسی و خەڵکی تری ئەندامانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقیم بینی، ئەوانیش بەرەو کۆنگرە دەچوون بە دیتنی من

هەموویان سەریان سورما ، سەرقالی باسی رەوشی خوارووی ئەفریقیا بووین. کەشەکە خۆش و
هێمن بوو ، گەرچی گور رادیبی لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانیش وازی هێنابوو ، کە دیتم زۆر دڵشاد
بووم. لە بەرزاییـەوەو لە دووریمان لە خـاکی وڵات، زۆر شت لە یەکـتـری نزیکی کـردینەوە. لە
خەرتومەوە بۆ ئەدیس ئەبابا سواری فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی ئەسیوبیایان کردین. کە سوار بووم
و فڕۆکەوانەکەم بینی، پیاوێکی رەش بوو ، ئەو یەکەمجارە فڕۆکەوانی ڕەش ببینم. هەستم بە
شتێکی نامۆ کرد ، چۆن دەبێ پیاوێکی رەش فڕۆکەوان بێ ...!! هەستم کرد کەوتمە ناو نێچیری
نەژادپەرستی کە دەڵێن ئەفریقییەکان لە خەڵکی تر کەمترن و ، فڕۆکەوانی تەنیا کاری پیاوانی
سپییە. کە لە شوێنەکەمدا دانیشتم بە خۆمدا هاتمەوە ، بۆ بیر لە شتی وا دەکەمەوە. هەر کە
فڕۆکەکە بەرزبۆوە هێوربوومەوە و هەستم کرد تام لە سروشتەکەی ئەسیوبیا وەردەگرم و جەنگاوەرە
ئەسیوبییەکانم بە بیرهاتەوە کە چۆن خۆیان لە ناو ئەو شاخ و دارستانانە دەشاردەوە لە ڕۆژانی
شەڕیان دژ بە داگیرکەرانی ئیتاڵی. مێژووی ئەسیوبیا ، یان وەک جاران بە حەبەشە دەناسرا ، بۆ
پێش لەدایکبوونی مەسیح دەگەڕێتەوە. دەڵێن، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە سەردەمی کوڕەکانی
سلێمان و بەلقیسی شای سبائ. ئەگەرچی ئەم وڵاتە زۆر لە ژێر ڕکێفی داگیرکەران بووە ، بەڵام بە
زێدی ڕاستەقینەی نەتەوەی ئەفریقی دەزاندرێت. ئەم وڵاتە بەربەرەکانی زۆری کردووە ، لە سەدەی
رابردوودا و بە سەرۆکایەتی مینیلیک دژی ئیتاڵییەکان وەستاوە. لە ساڵی ١٩٣٠دا ئیمپراتۆر
هیلاسیلاسی هاتە سەر کورسی ئەسیوبیا و بووە هێزێکی ڕاستەقینە بۆ دیارکردنی مێژووی
ئەسیوبیای هاوچەرخ. تەمەنم هەڤدە ساڵان بوو کە موسولینی هێرشی دژ بە ئەسیوبیا بەرپاکردووە ،
لەو ڕۆژەوە رقم دەرحەق بە زۆرداران دروستبوو ، بە تایبەتی فاشیزم. هیلاسیلاسی پاش داگیرکردنی
وڵاتەکەی لە لایەن ئیتاڵییەکان بە ناچاری لە ساڵی ١٩٣٦دا لە وڵاتا ڕای کردووە ، کە هاوپەیمانان
لە ساڵی ١٩٤١ز دا ئیتاڵیان وەدەرنا ئەو گەڕایەوە وڵات. هەر بۆیەش ئەسیوبیا لە خەیاڵمدا
جێگیر ببوو و لە ئینگلتەرا یان لە فەرەنساو ئەمریکا زۆرتر حەزم بە دیتنی دەکرد. کە گەیشتم،
هەستم کرد سەردانی یەکەم سەرچاوەی بوونم دەکەم. لەوێش ڕەگ و ناسنامەی ئەفریقیم دۆزیەوە.
ڕووبەڕووبوونەوەشم لەگەڵ خودی ئیمپراتۆر وەک ڕووبەڕووبوونەوەم بوو لەگەڵ مێژوو.

ئەدیس ئەبابا ، پایتەختی ئیمپراتۆریەت نەبوو وەک ناوی دەهات، بەڵکو بە پێچەوانەی
گەورەیی و نازدارییەکەی بوو. شەقامی قیرتاوی کەم بوو ، بەرخ و بزن لە شەقامەکانیدا لە ژمارەی
ئۆتۆمۆبێلەکانی زۆرتر بوو. وەک جوهانسبیرک بالاخانەی بەرزی لێ نەبوو ، کۆشکی ئیمپراتۆر و



زانکۆ و ئوتێلی راسی لێبوو کە ئێمەی لێ دابەزیبوو. هەروەها ئەسیوبیا نموونەی دیموکراسی نەبوو.
حیزبی سیاسی و کۆمەڵەی میللی و دیارکردنی دەستەڵاتی ، لێنەبوو. هەموو شت هەر ئیمپراتۆر
بوو و بەس، ئەو خۆی لەسەرووی هەموویان بوو. پێش کۆنگرەکە، هەموومان لە شارۆچکەیەکی
بچووک، کە ناوی دیربا زید بوو کۆبووینەوە، لەوێ سەکۆیەکی گەورە لە مەیدانە سەرەکییەکەی
دانرابوو ، لە گۆشەیەکی دوور لە سەکۆکە و لە تەنیشت ئولیڤەر دانیشتم. لە ناکاو دەنگی
زوڕنایەکی بەرزهات و پاشان مۆسیقای تیپێک تێکەڵ بە ترپەی چەند دەهۆڵێکی ئەفریقی بوو ،
مۆسیقاکە هێدی هێدی لە سەکۆیەکە نزیکبۆوە و ترپەی سەدان پێی لەگەڵ بوو. لە ناکاودا
ئەفسەرێکی شمشێر لە دەست بەدەرکەوت، شمشێرەکەی لەبەر تیشکی خۆر دەبریسکایەوە ، چوار
سەد سەربازی رەش بەڕیزی چوار کەسی بەدلەی سەربازی لەبەر و تفەنگی لووس لە شان بە دوایدا
هاتن. سەربازەکان گەیشتنە پێش سەکۆیەکە و فەرمانیان پێکرا هەموو پێکەوە سلاو ئاراستەی
پیرێکی بەدلە ڕەنگین و سەرنجڕاکێش بکەن، ئەویش خاوەن شکۆ ئیمپراتۆری ئەسیوبیا و شێری
یەهودا هیلاسلاسی بوو.

یەکەم جارە لە ژیانمدا سەربازی رەش و ئەفسەری رەش و سەرکردەی رەشیش چەپڵەڕێزانیان
بکەن و ، مێوانی رەشی سەرۆک دەوڵەتی رەشان ببینم. لە بەیانیەکەی ڕۆژی نمایشەکەی لەگەڵ
ئولیڤەر چووینە نووسینگەی تایبەت بە سازکردنی پسولەی باوەڕهێنانی ڕێکخراوەکان بۆ
ئامادەبوونی کۆنگرەکە. بە بیانووی ئەوەی ئێمە نوێنەرایەتی عەشیرەتی کوسا دەکەین، ئوغندا
ناڕازیبوو بە بەشداری کردنمان. من یەکسەر بۆچوونەکەم رەتکردەوە و تووڕەییم پێوە دیاربوو ، بەڵام
ئولیڤەر بە هێمنی وتی: ئێمە بۆ یەکێتی ڕیزەکانی هەموو ئەفریقییەکان خەبات دەکەین و نوێنەری
هەموو توێژەکانمان لەگەڵە. بۆ زیاتر سەلماندنی هەڵوێستەکەمان، من وتم، سەرۆکی
ڕێکخراوەکەمان پێشەوا لوتولی کوسا نییە و لە زولوەکانە. بەوەوە ئینجا بوارمان درا بەشداری
کۆنگرەکە بکەین. لەوێ ئەوە فێربوم، کەوا ئەو شتانەی ئەفریقییەکان لەسەر ئێمەی دەزانن هەر
ئەوەندەیە کە پیاوانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی پێیان ڕاگەیاندوون. من یەکەمین کەس
بووم پاش ئیمپراتۆر وتارم پێشکەش کرد. ئەوە چەند مانگە خۆم لە قاڵبی دێڤید موتسامای
دەنوێنم و ئەوە دووبارە هاتمەوە ناو قالبی نیلسۆن ماندێلا. لە وتارەکەمدا باسی مێژووی خەباتی
نیشتمانیم لە خوارووی ئەفریقیا کرد، ناوی چەندین نموونەی کۆمەڵکوژیم هێنا ، کە دەرحەق بە
میللەتەکەمان کراوە ، هەر لە کۆمەڵکوژییەکەی بولهوکی ساڵی ١٩١٢ز ەوە کە تێیدا سەد و

هەشتاو سێ جووتیار بە دەستی سوپا و پۆلیس کوژران، هەتا کۆمەڵکوژییەکەی شارپیێل، کە لە دوای چل ساڵ روویدا، ناوم هێنان. لە وتارەکەمدا سوپاسی ئەو حکومەتانەم کردو بە تایبەتی ناوی گانا و نیجیریا و تانجانیقام هێنا کە فشاریان لە سەر حکومەتی خوارووی ئەفریقیادا هەیە و هەڵمەتیان بەردەوامە بۆ وەدەرنانی حکومەتی خوارووی ئەفریقیا لە رێکخراوی کۆمنوێلت. هەروەها ئاماژەم بە هۆکارەکانی دامەزراندنی رێکخراوی ئومخونتووی سیزوی «ئەمکا» کرد و روونم کردەوە، کەوا هەموو دەروازەکانی خەباتی سیاسیمان بە روودا داخرابوو و بە ناچاری ئەم رێکخراوەمان دامەزراند، هەروەها وتم: سەرکردایەتی تاوانێک دەرحەق میللەتەکەی دەکات، ئەگەر هەر خەریکی لووسکردنی چەکی سیاسیەکان بێت، چونکە ئەم چەکانە کاریگەریان نەماوە، لە ژێر زەبری کوشندەی چالاکییەکانی بزاڤی «ئەمکا» شەوی دیسێمبەر هەموو خوارووی ئەفریقیای هەژایەوە. گوێم لێبوو سەرۆک وەزیرانی ئۆغەندا هاواری کرد و وتی:

دەردیان دەرخوارد بدەن ...!

لە قسەکانمدا بەردەوام بووم وباسی ئەزموونی تایبەتی خۆم کرد و وتم: چەند رۆژێکە لە وڵاتی خوارووی ئەفریقیادا دەرچووم و دە مانگ زیاترە لە خێزانەکەم و برادەرەکانم دوورم، وەک تاوانبارێک لە لایەن حکومەتەوە راونراوم و بە ناچاری وا بە نهێنی کار دەکەم. بڕیارمدا وڵات جێ نەهێڵم و بەردەوام کاربکەم، ئەگەر بە نهێنیش بێت. دەمزانی چی دەڵێم و بەڵێنەکەشم جێبەجێ دەکەم. کە وتم دەگەڕێمەوەو لە خەباتا بەردەوام دەبم، بە گەرمی و بە چەپڵەرێزان وەڵامیان دامەوە. کە بواریان پێدراین یەکەم کەس لە کۆنگرەکەدا قسە بکەین، بۆ ئەوەیان بوو ئامادەبوان دۆزەکەم بناسن و تێبگەن و پشتیوانی بکەن. زۆر لە وڵاتانی ئەفریقی دوودڵ بوون لە هاوکاری خەباتی چەکداریمان، بەڵام لە وتارەکەمدا، ئامادەبووان تێگەیشتن کەوا خەباتگێڕان لە خوارووی ئەفریقیادا بێجگە لە بواری ئەم خەباتە بژاری تریان نییە. لەگەڵ ئولیڤەردا پێکەوە لە دیدارێکی تایبەتیدا لەگەڵ کینیت کاوندای پێشەوای حیزبی نیشتمانی یەکگرتووی رودیسیای باکوور و پاشان سەرۆک کۆماری زامبیبیا دانیشتین. ئەویش وەک جیولیوس ینریری بە جیاوازی رێبازی هەڤالانی خوارووی ئەفریقیا نیگەران بوو. ئەویش پێشنیاری کرد کە پاش بەربوونی سوبوکوی لە زیندانا وزەو کۆششەکانتان یەکبخەن. پاش رووداوەکانی شارپیێل و لەبەر چاوی پێشەوا ئەفریقیییەکانا حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی جێگای بایەخ بوو و حیزبمان لە چاو ئەوا سنووردارە و ناتوانێ خۆی لە شانی بدات. کاوندای کە رۆژانێک ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بوو، لە



پەیوەندی حیزب بە شیوعیە سپییەکان نیگەرانی راگەیاند و وتی: ئەوەیان لە گۆڕەپانی ئەفریقیدا بۆ حیزب خراپ دەکەوێتەوە، خەڵک نەک تەنیا لە ئەوروپا، لە ئەفریقیاش لە شیوعیەکان دووردەکەونەوەو ئەوەیان بۆ من جێگای سەرسوڕمانە. لە گەشتەکەمدا زۆر جار ئەم هەڵوێستەم گوێ لێبوو. ویستم بە کاوندا بڵێم، کەوا حیزبەکەیان دوور لەشوێنی خۆیدا پشتیوانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی دەکات، بەڵام ئەو دەستی لە سەر شانم دانا و وتی: نیلسۆن، قسەکردنت لەم بابەتە وەک ئەوە وایە لە ناو ئاوا، ئاو بفرۆشیت، من پشتیوانی حیزبتان دەکەم و لایەنگیری پێشەوا لوتولی دەکەم، بەڵام دەنگی من، تاکە دەنگ نییە لەناو حیزبی سەربەخۆیی نیشتمانی، پێویستە قسە لەگەڵ سایمون کیبویبوی بکەم، ئەگەر ئەو سەلماندی ئەوا بۆ من کارەکە ئاسایی دەبێت. سایمون کیبویبوی کەسی دووەم بوو لەناو حیزبا، ئیشم بۆ ئەوەکرد، بەیانی ببینم، داوام لە ئولیڤەر کرد بمباتە لای، بەڵام وتی: نیلسۆن، وا چاکە بەتەنیا بیبینیت، تەنیا بن، ئازادانەتر قسە دەکەن. یەک رۆژی تەواو لەگەڵیا مامەوە، قسەی سەیرم گوێ لێبوو، لە ژیانمدا شتی وام نەبیستبوو، وتی: وتارەکەی تۆ لە کۆنگرەو ئەندامانی وەفدی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی جێگای رەزامەندیمان بوو، ئەگەر هەر لەبەر ئەوانە بێ ئەوا هاوشانیتان دەکەین، بەڵام ئەو قسانەی لەسەر ئێوە لە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەییمان بیستبوو، نیگەرانمان دەکەن. دەڵێن ئێوە بزاڤی ئەمکا لە حیزبی شیوعی و حیزبی ئازادەکان سەرچاوەی گرتووە، مەبەستیش ئەوەیە ئەفریقییەکان بکەنە سووتەمەنی شەڕێک، کەوتە ناو دەستم، دوانەکەی سەرسامی کردم، زۆرم لا سەیربوو، چۆن بەم جۆرە قسانە بڕوا دەکەن، بۆیە وەڵامم دایەوە و وتم:

پێشەکی و پێش هەموو شتێک، دەزانرێت کەوا دوژمنداریەکی کۆن لەنێوان حیزبی ئازادەکان و حیزبی شیوعی هەیەو ناتوانن بۆ یاری کاغەزیش بەیەکەوە کۆببنەوە. ئەی چۆن لە کۆڕی خەباتا و لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی کۆک دەبن...!! دوایی با پێت بڵێم، من، نەک بە شانازی داهێنەری سەرەکی دامەزراندنی بزاڤی «ئەمکا»م. قسەکانم بەوە کۆتایی پێهێنا و وتم: بە داخەوە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی درۆی وا بڵاودەکاتەوە توانیم بە کیبویبوی بسەلمێنم. کەوا زانیارییەکانی لەسەر حیزب راست بکاتەوە. بەڵێنی دا خۆی کۆبوونەوەیەک بکات و خودی کێشەکە بخاتە بەرچاو، دوانی دووەممان سەبارەت بەکەمی زانیاری بوو لەسەر رووداوەکانی ناو خوارووی ئەفریقیاو توانینی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی ناوی حیزبمان ئەتک بکات. لە کۆتایی کۆنگەرەکەدا کیبویبوی ماڵئاوایی لێکردم و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستم. کۆنگرەکە

سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئێمەش ئەرکی زۆرمان کێشا، بۆ ئەوەی بەروونی بەتەواوی دۆزەکەمان بناسن.

هەر لەسەردەمی خوێندنما شەیدای دیتنی وڵاتی میسر بووم. میسری بێشکەی شارستانیەتی ئەفریقیاو نایابترین گەنجینەی جوانی و بیناسازی و هونەر. خەونم بەئەهرامەکان و پەیکەری ابی هول و رووباری نیل، مەزنترین رووباری ئەفریقیا دەبینی. بەفرۆکە لەگەڵ ئولیڤەر و رۆبرت ریشا، کە لە گەشتەکەدا هەر بەیەکەوە بووین، بەرەو قاهیرە فریین. بەیانی رۆژی یەکەمم لە مۆزەخانەکە بەسەربردو لەکارە هونەرییەکان و گەنجینە نایابەکان وردبوومەوە، زانیاری زۆرم و زانینی زۆر و تێبینیم تۆمارکرد. ئاشنای ئەو کەسایەتیانە بووم کەوا رۆژانێک شارستانیەتی دۆڵی نیلی کۆنی نازداریان ئەنجام داوە.

ئەو شتانەم هەر بۆ زانین و وردبوونەوە نەبوو و بەس، بەڵکو بۆ ئەوەم بوو پێویستە هەموو ئەفریقییەک زانیاری تەواوی هەبێت بۆ وەڵامی گومانە هەڵبەستراوەکانی سپیەکان کە دەڵێن: ئەفریقییەکان شارستانیەتی و مێژوویان بەرامبەر خۆرئاواییەکان هیچ نییە. بەچەند سەعاتێک ئەوەندەی بینیم زۆربوون بۆ سەلماندنی ئەوەی کەوا میسرییەکان چەندین کاری هونەری و بیناسازی مەزنیان کردووەو لەو کاتانەدا سپیەکان لە ئەشکەوتەکانا دەژیان.

میسر بۆ ئێمە نموونەیەکی گرنگ بوو، لە نزیکەوە بینیمان کە چۆن بەرنامەو گۆڕانکارییەکانی ئابووری سۆشیالیزمی دارێژراو لەلایەن سەرۆک جەمال عەبدولناسر دیارن. خاوەنداریەتی زەوییە تایبەتییەکان کەم کراوەتەوە و، کەرتەکانی ئابووری خۆماڵی کراون و، بواری پیشەسازی گەشەی هەیەو خوێندن لەسەر بەرنامەی دیموکراسییەو، سوپایەکی نوێژەنیش ئامادەیە، ئەوانە و چاکسازییەکان و دەستکەوتەکان هیوای ئێمە بوون، کەوا رۆژێ لە رۆژان لە خوارووی ئەفریقیادا جێبەجێ بکرێن، ئەوەی کە زۆر بۆ ئێمە گرنگ بوون، بوونی سوپایەکی بەهێزو هێزێکی دەریایی و ئاسمانی بوو.. کە خۆی لە شانی هێزی خوارووی ئەفریقیا بدات.

ئولیڤەر یەک رۆژ لە میسر مایەوەو بەیانییەکەی بەرەو لەندەن فڕی بەو هیوایەی لە پانا یەکتری ببینینەوە. پێش ئەوەی لە گەشتەکەماندا بەردەوام بین لەگەڵ رۆبرت ریشا، هاوبیری و هاوسۆزی بەرنامەمان شرۆڤەکرد. من دەمویست کە باسی رەوشی خوارووی ئەفریقیا دەکەین لە بیرمان بێت کەوا حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی دەستکەوتیشی هەیەو ئەوانیش پشتگوێی نەخەین. کە لە



هەر وڵاتێکا بارمان دەخست، من لە ئوتێل سەرژمێرو زانیارییە گشتییەکان و سیاسییەکانی وڵاتەکەو، مێژوو و ژیاننامەی سەرکردەکانم دەخوێندەوە، بەڵام رۆبرت، پێچەوانەی منی دەکرد، یەکسەر دادەبەزییە سەرشەقام و تەماشای دەکردو پرسیاری راستەوخۆی لە رێبواران دەکرد. بەپێچەوانەی یەکتری کارمان دەکرد، من جلی سادە، وەک رۆژانی خۆشاردنەوەم خۆم دەپۆشی بەدلەیەکی خاکی نیمچە سەربازیم لەبەر دەکرد، ئەویش بەدلەیەکی خاوێن و چاک و رەسمی نایابی لەبەر دەکرد.

لە تونس وەزیری بەرگریمان بینی، زۆر بەپێشەوا لوتولی دەچوو، بەڵام! تەنیا شێوەکەی کە قسەم لەگەڵ کرد و باسی رەوشی ئەفریقیام بۆ کرد، ئەوەم لەبەرچاوبوو، کەوا ناوی رۆبرت سوبوکوی لە زینداناو، بابەتی پروپاگەندەکانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی دێتەگۆڕێ، یەکسەر قسەکەی پێبڕیم و وتی: ئەو پیاوە لە زیندانا بێتە دەرێ، هەمووتان لەناو دەبات...!!

کە لە دیدارەکە دەرچووین، رۆبرت برۆکانی هەڵتەکاندو بەسەرسامیەوە وتی: لە سەرکردەکانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی خۆیان باشتر پێناسەت کردن، بەڵام من ویستم وێنەی راستەقینەیان پێشکەش بە وەزیرەکە بکەم. رۆژی پاشتر سەرۆکی تونسی «حبیب بورقیبە»م بینی، هەر زوو لە دۆزەکەمان حاڵی بوو و، رەزامەندی نواند بۆ راهێنانی سەربازیی ئەندامەکانمان و، پێنج هەزار جنیەی ئوسترلینی، بۆ کڕینی چەک پێشکەش کردین. پایتەختی مەغریب، قۆناخێکی تری گەشتەکەمان بوو. شوورە کۆن و ئەفسووناوییەکەی و بازاڕە هاوچەرخەکانی و مزگەوتە گەورە نایابەکانی. هەموویان ئاوێتەیەکی هەمەڕەنگی ئاکاری ئەفریقی و ئەوروپی و خۆرهەڵاتیان دەنواند. رەبات، ئیستگەی دیداری خەباتگێڕان و بزاڤەکانی رزگاری هەموو وڵاتانی ئەفریقیایە، لەوێ خەباتگێڕانی مۆزەمبیق و ئەنگۆلا و جەزائیرو دوورگەکانی سەری سەوزمان بینی. هەر لەم پایتەختەدا بارەگای سەرەکی سوپای رزگاری جەزائیری لێبوو، چەند رۆژێک لەگەڵ دکتۆر مستەفا سەرۆکی دەستەی جەزائیر لە مەغریب ماینەوەو قسەی زۆرمان سەبارەت بەمێژووی بەرهەڵستی جەزائیر دژ بە فەرەنسییەکان کرد. رەوشی جەزائیر لە رەوشی ئێمە دەچوو، لەوێش داگیرکەرە کەمینە بێگانەکان حکومی زۆرینەی هاووڵاتی ئەسڵیان دەکرد. دکتۆر مستەفا باسی سەرەتای سەرهەڵدانی بەرەی رزگاری جەزائیری بە چەندین هێرشی سنووردار لە ساڵی ١٩٥٤ پاش شکستی فەرەنسییەکان لە دیان بیان بوی ڤێتنام بۆ کردین. بەرەکە لە سەرەتادا وای دەبینێ کەوا بەسەربازی دەتوانن شکست بە فەرەنسییەکان بێنن، بەڵام دوایی بۆیان دەرکەوت، ئەوە ناکرێت. بۆیە بەرەی

رزگاری جەزائیر بەناچاری پەنای بردە بەر شەڕی پێشمەرگانە. دکتۆر مستەفا ئاماژەی بەوەدا کەوا شەڕی پارتیزانی سەرکەوتنی سەربازی بنبڕی پێناکرێت. هەر ئەوەندەی لە دەست دێ هێزی سەربازی و ئابووری بۆ شکاندنی دوژمن کۆبکاتەوە. دکتۆر مستەفا وتی: ئامۆژگاریتان دەکەم، لە پلانی سەربازیتان، لایەنی سیاسی لەبیر مەکەن. رای جیهانی بە قەد رەوە فرۆکەیەک کاریگەری هەیە، پاش سێ رۆژی تر بەرەو شاری وجدەی بیابانی سەرسنووری جەزائیر، مەڵبەندی سەرەکی سوپای جەزائیر لە مەغریب رۆیشتین، لەوێ سەردانی یەکەیەکی سەربازییمان کرد. بە دووربین لەودیو سنوورەوە سەربازانی فەرەنسیمان بینی. دان بەوە دەنێم، سەربازەکانم بەسەربازانی بەرگری حکومەتی خوارووی ئەفریقی دەزانی. پاش دوو رۆژ، بەشداری ئەو نمایشە سەربازیەم کرد، کە لەسەر شەرەفی بەڕێز ئەحمەد بن بیلا نمایش کرا، کە بەرێزی تازە لە زیندانەکانی فەرەنسادا رزگاری ببوو. پاش سەربەخۆیی ولاتەکەی کرایە یەکەم سەرۆک کۆماری ئەم ولاتە. نمایشەکە لەگەڵ نمایشەکەی ئەدیس ئەبابا جیاوازی زۆری هەبوو، بەدلەی سەربازی جوان و ئینزیباتی ورد و رێکی سەربازیشی لەگەڵ نەبوو. نمایشەکە هەر تەنیا نیشاندانی مێژووی بزاڤی خەباتی جەزائیر بوو لە هەموو قۆناخەکانیدا. لە نمایشەکەدا جەنگاوەرەکان بەکلاوو پێڵاوە بیانییەوە دەرچوون و کە چەند ساڵ لەرۆژانی خەباتیاندا بەکاریان هێناوە. خەنجەرو تفەنگ و تەورداس و رمەکانی شەڕیان پێکردبوو نمایشیان کرد. هەندێ لە گەنجەکانیش تۆپی دژە دەبابەیان هەڵگرتبوو، هەروەها دژە فرۆکەش نمایشکرا، بەڵام لەڕووی رۆیشتن و جلوبەرگەکانیان هەر نەدەگەیشتنە ئاستی سەربازە ئەسیوبییەکان. ئەوان سەربازی هێزێکی گیانفیدابوون و بەشداری چەندین شەڕیان کردبوو، زانیاری زۆریان لەسەر جۆرەکانی شەڕ هەبوو، بۆیە زۆر بایەخیان بەنمایشی جلوبەرگی سەربازی نەدەدا. هەر ئەوانەش بوونە هۆکارەکانی سەرکەوتن. گەرچی سەربازانی ئەدیس ئەباباش جێگای سەرنج بوون، بەڵام بەهزری من، ئێمە پێویستمان بەو سەربازانەی نمایشەکەی وجدە هەیەو، هیواشم خواست سەربازەکانی ئێمەش وەک ئەوانە بەجەرگ و ئازابن و سەرکەوتنی بێ وێنە بەدەست بێنن. لەدوا رێزی نمایشەکە، تیمێکی مۆسیقا دەرکەوت، سەرکردەی تیمەکە، پیاوێکی بالابەرزی چوارشانەو شکۆداربوو، پێیان دەووت: سودانیەکە ئەوەندە رەش بوو، لە شەوە دەچوو. سودانیەکە دارەکەی دەستی لەسەر سەرماندا رادەوەشاندو ئێمەی میوانیش بۆیان هەڵسااینەوە سەر پێیان و، لەبەرئەوەی پیاوی رەش بوون، بۆیە بەچەپڵەڕێزان و بەسۆزەوە پێشوازی گەرممان کردن. هەستی نەتەوەیی و نەژادیمان کاری خۆی کردو ئێمە لە ئەفریقییەکانی تر زۆرتر بۆیان هەڵچووین. دوایی پێیان وتین،



ئەم پیاوە لە شەڕەکانا ئازایەتی بێ وێنەی نواندووەو، جارێکیان بە تەنیا تیپێکی تەواوی سەربازانی فەرەنسەوی بەدیل گرتبوو، بەڵام هاوارو چەپڵەکانمان لەبەر ئازایەتییەکەی نەبوو، و هەر لەبەرئەوە بوو کە پیاوێکی رەشە.

لە مەغریبەوە بەرەو بام اکوی پایتەختی مالی و دواییش بەرەو غینیا رۆیشتین. لە مالیەوە بەرەو غینیا، وەک ئەوەبوو لەناو پاسێکدا بین، نەک لە ناو فرۆکەیەکدا. ناو فرۆکەکە پڕ مریشک کرابوو، ژنان دەهاتن و دەچوون و فولی سودانی و میوەی وشککراوەی نایاب و خۆشیان دەفرۆشت. گەشتەکە لە شێوە دیموکراسییەکەی تامی زۆرم لێی وەرگرت. کە گەیشتمە سیرالیون، پەرلەمان دانیشتنی هەبوو، بریارم دا لە دانیشتنەکەدا بەشداری بکەم. منیان لەسەر کورسییەکی نزیک سەرۆکەوە دانا. پاش کاتێک فەرمانبەرێکیان هاتە بن گوێم و چرپاندیە گوێم و داوای ناسنامەی لێکردم، منیش بە زەردەخەنەوە وتم:

من نوێنەری پێشەوا لوتولیی خوارووی ئەفریقیام...!

بەگەرمی دەستی کوشیم و بە راکردن بەرەو رووی سەرۆک پەرلەمان چوو و گەڕایەوە لام و وتی: تۆ بە هەڵە دانیشتویت، ئێرە شوێنی میوانان نییە، بەڵام بۆ تۆ ئاساییەو لە شوێنەکەی خۆتا مەجولێوە. دانیشتنەکەیان یەک سەعاتی خایاندو، پاشان لەگەڵ ئەندامانی پەرلەمانا چامان خواردەوە، لە ناکاو، هەر ئەوەندەم بینی، هەموویان ریزیان بەست و، یەک یەک بۆ دەست گوشینم هاتنە پێش، یەکێکیان بەخۆشیەوە وتی: بۆ من جێگای شەرەفێکی مەزنە، دەستی پێشەوای شکۆدار لوتولی خاوەن خەڵاتی نۆبلی ئاشتی بکوشم. ئای لەو شتە ئەگریسە.!! دیارە فەرمانبەرەکە بە هەڵە لە من تێگەیشتبوو، منی بە پێشەوا بەوان ناساند. پاش کاتێک سەرۆک وەزیران سیر میلتون مارگای بۆ دەست کویشنم هاتە پێش و فەرمانبەرەکەو وەک من پێشەوا بم پێشکەشی ئەویشی کردم. ویستم بلێم من پێشەوا نیم، بەڵام ئەوان بواریان نەدام و چارەم نەماو خۆم هەر وا ناساند. کە دیدارەکەی سەرۆک کۆمارم کرد، لەوێ بوار رەخساو کێشەکەم بۆ باسکردو ئەویش بە ئاسایی وەریگرت و تێمگەیشت و، کەسایەتی منی ناسی و یارمەتییەکی دارایی تێریشی پێشکەش کردین. لە لیبیریاش سەرۆک تابمانم بینی و، پاش ئەوەی پێنج هەزار دۆلاری بۆ چەکدارکردن و راهێنان و بەرنامەکانمان داینێ، لەسەرخۆ وتی: پارەی رۆژانەی خۆت هەیە..؟ بەڕاستی وتم، پێویستم بەبڕێ پارەش بۆ مەسرەفی خۆم هەیە، یەکسەر یاریدەرێکی زەرفێکی هێنا، کە چوار سەد دۆلاری نەقدی تێدابوو. لە لیبیریاوە بەرەو غاناوە رۆیشتم. لە غانادا وەک بڕیاربوو

ئولیڤەرم دۆزیەوەو، هەردووکمان میوانی مەندوبی سامی غینیا عەبدوڵلا دیالو بووین. کە وتم لە غینیا، دیداری سەرۆک سیکوتوریمان بۆ ساز نەبوو، یەکسەر پێشنیاری گەڕانەوەی بۆ کردین. زۆر زۆر بە کەسایەتی سیکوتوری سەرسام بووم، لە خانوویەکی سادەدا دەژیاو جلوبەرگێکی ئاسایی لەبەردابوو. بەدەستی خۆی جلە پێویستەکانی دەشوشت. باسی مێژووی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و بزاڤی «ئەمکا»و دۆزەکەمان بۆ کردو داوامان کرد بڕی پێنج هەزار دۆلار وەک یارمەتی پێشکەشمان بکات و زۆر بە وردی گوێی بۆ قسەکانمان راگرت. وەک چۆن وتارێکی رەسمی بدات، بە دەنگێکی تایبەتی وتی: حکومەت و میللەتی غینیا هاوشانی خەباتی هەموو براکانمانن لە خوارووی ئەفریقیا و ئەوەی لە دەستمان بێ دریغی ناکەین و، ئەوەشمان بە رەسمی لە نەتەوە یەکگرتووەکان راگەیاندووە. لەسەر کورسییەکەی هەڵسایەوەو لە گەنجینەکەیدا دوو دانە کتێبی خۆی دەرهێناو پێشکەشی کردین، ئێمەش سوپاسمان کردو کۆتایی بە دیدارەکەی راگەیاند و ئێمەش هاتینە دەرەوە. هەستمان بە بێزارییەکی زۆر کرد، لە ولاتێکی ترەوە هاتبووین و بۆ غینیا داوەتکراوین، هەر بۆ ئەوەی ئەحمەد سیکوتوری دانەی کتێبی خۆمان بداتێ ...! ئەم سەفەرەمان بە کات بەفیڕۆدان زانی، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت بەرپرسێک لە بەشی کاروباری دەرەوەیان لە ئوتێل هاتە لامان و جانتایەکی داخراوی پێشکەشکردین، کە جانتاکەمان کردەوە، بینیمان پڕە لە پارە، لەگەڵ ئولیڤەر بە شادییەوە تەماشای یەکترمان کرد و گەمەی پێ هات و وتی:

نیلسۆن، پارەکە بە دراوی غینیایەو لە دەرەوەی غینیا هیچ ناکات. ئولیڤەر پێشنیاری کرد، پارەکە بدەینە برادەرێکی لە سەفارەتی چیکوسلوفاکیاو بۆمان بکاتە پارەیەک لە دەرەوە رەواجی هەبێت. ئەگەر لە بەر جوانی و شۆخی سینگالییەکان نەبوایە، کە لە شەقامەکانا بە جلوبەرگە رەنگینەکانیان، بە نازەوە هاتووچۆیان دەکرد، هیچ شتێ لە جوانی نەدەگەیشتە جوانی و ناسکی بەلەمەکانی راو، کە لە ناو بەندەری داکارا دەبینران. لە بازاڕەکەدا گەڕام، بۆن و بەهاراتەکانیان مەستیان کردم. بازاڕەکانیان زێدە جوان بوون. لەگەڵ ئولیڤەردا لەم گەشتە کورتەمدا لە سینیگال تامێکی زۆر خۆشمان وەرگرت. خەڵکی سینیگال ئاکار جوان و خاوێن و بە زەوقن، کۆمەڵگەی سینیگال کۆمەڵگەیەکی تایبەتی و دەگمەن و فرە کەلتووری جیاوازن لە فەرەنسی و ئیسلامی وئەفریقی.

لە رێگای دیدارمان بە سەرۆک لیوبولد سینگور، ئولیڤەر تووشی تەنگە نەفەسی رەبۆیەکی توند هات. داوام لێکرد بگەڕێتەوە ئوتێل، بەڵام سووربوو لەسەر ئامادەبوونی، لەبەر ئەوەی تاقەتی



رۆیشتنی نەمابوو، بۆیە بە ناچاری لە پشتی خۆمکرد و گەیاندمە بارەگای سەرۆک. کە سەرۆک بینی زۆر پەرێشان بوو و، یەکسەر داوای دکتۆری تایبەتی خۆی کرد. بە سینگوریم وت: گوایە سەربازی سینیگالی هەن هاوشانی سوپای فەرەنسی شەڕی جەزائیرییەکان دەکەن. ئەو میللەتانەی تازە لە داگیرکەران رزگاریان دەبێ، ناتوانن بە ئاسانی شێوە و ئاکاری رژێمەکە بڕەوێنەوە. بۆیە ئەویش هێشتا بە دابونەریتی رژێمی ئەرستقراتی و خۆشیەکانی مەست بوو. ئەوەش ناتوانێ کەسی لێوە بەدەر بگرێت، خۆشم. سینگور پیاوێکی زیرەک و زانا و شاعیر بوو، وتی وا خەریکم زانیاری و بابەتی زۆر لەسەر پاڵەوانی مێژووی ئەفریقی شاکا کۆدەکەمەوە. ئێمەش پەرۆشی زۆرتر زانیاری و مێژووی ئەم پاڵەوانە بووین و بۆیە پرسیاری زۆرمان لێکرد. بە کورتی باسی رەوشی خوارووی ئەفریقیامان بۆ کرد. داوای کۆمەکی دارایی و شوێنی راهێنانی سەربازیمان لێکرد. لە وەڵامدا وتی: من بێ کۆبوونەوەی پەرلەمان بەڵێنی هیچ نادەم. بۆ مەسەلەی راهێنانی سەربازی پێشنیاری کرد، بەڕێز دابوسیەی وەزیری داد ببینین، بۆ دیدارەکە کیژێکی فەرەنسی جوانیشی بۆ تەرجەمە لەگەڵ ناردین. وەڵامی نەدایەوە و هەستم بە نیگەرانی کرد، بۆ مەسەلەیەکی گرنگی وەک راهێنانی سەربازی، کیژێکی منداڵی فەرەنسی بێگانەی نەناسمان بۆ تەرجەمە لەگەڵدا دەنێرێت ...!! من دڵنیا نەبووم، سینگور هەستی کرد و وتی: ماندێلا نیگەران مەبە، لێرە لە سینیگال فەرەنسییەکان هاوسۆزییان لەگەڵ ئەفریقییەکانا هەیە. کە گەیشتینە نووسینگەی وەزیر، چەندین سکرتێرەی ئەفریقیمان لە نووسینگەی پێشوازیدا بینی، یەکێکیان لە کیژە فەرەنسییەکەی پرسی، بۆچی هاتوویت، ئەویش لە وەڵامدا وتی: لە لایەن سەرۆکەوە بۆکاری تەرجەمە ناردراوم. ژنەکان کەوتنە دەمەتەقێ و یەکێکیان رووی لە من کردو پرسی: بەڕێز، تۆ ئینگلیزی قسە دەکەیت ...؟

منیش وتم، بەڵێ بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکەم. ئەویش وتی: کەواتە باشە، وەزیریش ئینگلیزی قسە دەکات. دەتوانن راستەوخۆ قسە بکەن و پێویستتان بە وەرگێڕ نابێ. کیژە فەرەنسییەکە دڵگران بوو و کەوتە تەنیشتمان. وەزیرم بینی و بەڵێنی دا یارمەتیمان بدات. لە کۆتاییدا، ئەوەی سینگور بەڵێنی دابوو هیچی جێبەجێ نەکران، بەڵام پەساپۆرتێکی دبلوماسی دامێ و پارەی پلیتی سەفەری داکار بۆ لەندەنی بۆ دابینکردین دان بەوە دەنێم کە من رژێمی بەریتانیم زۆر لا پەسند بوو. هەر کە باسی دیموکراسی خۆرئاوا و ئازادی دەکەم، یەکسەر رژێمی پەرلەمانی بەریتانیم بە بیر دێنەوە. پیاوی ئینگلیز لەلای من نموونەی پیاوەتی و جوامێرییە «جنتلمان». ئەگەرچی بەریتانیا لانکەی دیموکراسی پەرلەمانیە و ئەو دیموکراتیەشە رژێمی ناڕەوای

بۆگەنی ئێستای لەسەر نەوەی میللەتەکەم چەسپاندووە. من رقم لە ئیستعماری بەریتانی دەبێتەوە، بەڵام شێوە و جۆری ژیانی بەریتانی رەتناکەمەوە. زۆر شت لە هزرمدا گەڵاڵە ببوو، بۆیە بڕیاری سەفەری بەریتانیام دا. ئەگەرچی خۆشم حەزم لە دیتنی ئەم وڵاتە هەبوو و، زۆریشم لەسەری بیستبوو و یان خوێندبۆوە. ئەوەو لەبەر تەندروستی ئەلیڤەریش نیگەران ببووم و رازیم کرد سەفەرێک بکەین و لەوێش خۆی نیشانی دکتۆرێک بدات. هەروەها حەزم بە دیتنی ئەدیلایدی ژنی و مناڵەکانی دەکرد، دیداری یوسف داودی نوێنەری حیزب لە بەریتانیام بە پێویست دەزانی. هەروەها دەمزانی لە لەندەن لە هەموو شوێنێ زیاتر زانیاری زۆرم لە شەڕی پارتیزانی دەستدەکەوێت.

دووبارە لە لەندەنیش خۆم شاردەوە، دەمزانی دەستەڵاتدارانی خواروی ئەفریقیا تۆری ئەمن و ئیستخباراتیان دەنێرن. دەبوایە نەزانن لەوێم، سەرەڕای ئەوەش لاچەپ و تەنیا نەژیام. دە رۆژەکە بە گەڕان و دیداری کۆنە برادەران و سەردانی شوێنە گشتییەکانمان کرد و خەریکی کاروباری حیزبیش بووم. ماری بینسونی هاوڕێمان، زۆری لەناو لەندەن گێراین، ئەو شارەی قەڵاتی ئەو هێزە بوو کە سەردەمێک سێ بەشی گۆی زەوی حوکم دەکرد. بینسون، ئەو خۆی لەدایکبووی بریتوریابوو، پاشان زۆرم لەسەر خەباتی نووسی. لە لەندەن چووینە کەنیسەی ویستمینستر و کاتژمێری بیگبینمان بینی. باڵەخانەی پەرلەمان، کردەوەکانی لەگەڵ جوانی و شکۆ و مەزنییەکەی دوو رووی زۆر جیاوازبوون. کە پەیکەری ژەنرال سماتسی نزیک کەنیسەی ویستمینسترمان بینی، پێکەنینمان هات و بە گاڵتە وتمان: رەنگە رۆژێ بێ ئەم پەیکەرە بە پەیکەری ئێمە بگۆڕدرێت. زۆر لە برادەران وتیان رۆژنامەی ئوبزیرڤەری هەفتانە بە سەرۆکایەتی دێڤید ئەستر، زۆر راپۆرتی لایەنگیری بۆ حیزبی کونگرەی نەتەوەیی ئەفریقی تێدا بەدی دەکرێت. لەسەر وتارەکەی دوێنێدا، حیزبی ئێمەی بە حیزبی دوێنێ ناوبردبوو. ئولیڤەر دیدارێکی لەگەڵ دیڤید ئەستر لە ماڵەکەی خۆیدا بۆ سازکردم. لە دیدارەکەدا زۆرمان قسە لەسەر حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کرد. نازانم دیدارەکە کاریگەری لەسەر رۆژنامەکە کردووە، یان.. نا.!! بەڵام دیاربوو شێوەکەی گۆڕا و باشتر هەواڵەکانی حیزبیان دەگەیاند. ئەستر پێشنیاری کرد، چەندین کەسایەتی سیاسی ببینم، لەگەڵ پەرلەمانتارانی کرێکاران دینیس هیلی پێشەوای حیزبی کرێکاران و پێشەوای ئازادیخوازان دانیشم.

هەتا دوا رۆژەکانم یوسف دادم نەبینی. دیدارەکان خۆش نەبوون. من و ئولیڤەر تووشی چەندین



ناڕەحەتی دەبووین. زۆر لەسەرکردە ئەفریقییەکان بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری نزیکبوونەوەمان لە شیوعییە سپییەکان و لە هیندییەکانیان لێدەکردین. هەندێکیان بڕوایان وابوو، کەوا شیوعییەکان دەستەڵاتیان بە سەر حیزبماندا دەشکێ. ئەگەر رامانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی بە دژایەتی رەگەزی سپی نەبوایە، ئەوا رامانی یەکسانی و دوور لە جیاوازی نەژادییمان لاری بۆ نەدەرەخساندین. لە وڵاتانی تری ئەفریقیدا بە ئاسانی سەرکردەکانیان هزرو رامانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقیان لە هەڵوێستەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی وەردەگرت. زووتر ئولیڤەر ئەم مەسەلەیەی لەگەڵ یوسف داود باسکردبوو، بەڵام یوسف بە بۆچوونەکان خۆشحاڵ نەبوو، ئولیڤەر وای دەبینی کەوا حیزب راوبۆچوونی تایبەتی خۆی هەبێت و ئەوەشیان لە حیزبەکانی تری ناو پەیمانی کۆنگرە جیای دەکاتەوە، منیش لەگەڵ بۆچوونەکەی هاوشان بووم.

دوا شەوی لەندەنم لەگەڵ یوسفا بە دەمەتەقێ بەسەر برد و، پێم وت: ئێمە لەو قۆناغەی ئێستاماندا، کە پەیڕەوی خەباتی چەکداری دەکەین، پێویستمان بە کۆمەکی دارایی و راهێنانی سەربازی لە هەموو وڵاتانی ئەفریقی هەیە، بۆیە دەبێ لە جاران زۆرتر رەچاوی بۆچوونەکانیان بکەین. یوسف، وتی: تۆ و ئولیڤەر دەتانەوێت واز لە سیاسەتی ئەنتی نەژادی حیزب بهێنین، کە بناغەی بەڵگەنامەی ئازادی بوو. لە وەڵامدا وتم: نەخێر، تۆ هەڵەیت و من هەرگیز سیاسیەتی ئەنتی نەژادپەرستی حیزبم رەفز نەکردیتەوە، بەڵکو ئەوەی ئێمە داوای دەکەین، حیزب سەربەخۆیی بڕیارەکانی لە دەست نەدا و بیانپارێزێت و رامانی سەربەخۆ هاوپەیمانی کۆنگرە رابگەیەنێ. حیزب لەوە راهاتووە، کەوا لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی هیندی خواروی ئەفریقیاو حیزبی کۆنگرەی میللی ملونەکان، بەیانی رەسمی هاوبەش لە مەسەلەی پەیوەند بە بەرژەوەندی ئەفەریقییەکان رابگەیەنێ. ئەو دەبێ بگۆڕێت. ئەوانەش یوسفی رازی نەکردو هەر دەیپرسی:

سیاسەتەکانی حیزب چین..؟ منیش وتم:

من باسی سیاسەتەکان ناکەم، باسی وێنەی حیزب دەکەم لە چاوی خەڵکانی تر. رێکخراوەکان هاوشانی یەکتری کار دەکەن، بەڵام پێویستە حیزب لەناو هەموو حیزب و رێکخراوەکاندا دیاربێ. بەجیابوونەوەم لە برادەرەکانم لە لەندەن خەمگین بووم و، بەرەو قۆناخێکی سەیرترو شاراوەتر بەرێکەوتم. قۆناخی راهێنانی سەربازی لە ئەدیس ئەبابا. خۆم بۆ شەش مانگ راهێنانی سەربازی ئامادەکرد. لەوێ وەزیری دەرەوە ئەیفو پێشوازییەکی گەرمی لێ کردم و منی بردە ناوچەی کولفی، لەوێی بنکەی سەرەکی قەڵاچۆکردنی تەخریبی ئەسیوبی لێبوو. هەر لەوێش وانەی سەربازی

وەردەگردم. گەرچی وەک ئارەزوومەندێک یاری مستەکۆڵێم کردبوو، بەڵام زانیاریییەکانم سەرەتایی بوون. مـولازمی یەکـەم وندونی بیـفـیکادو، کـە ئەفـسـەرێکی زیرەک بوو و بەشـداری شـەڕە نهێنیییەکانی دژ بەئیتالییەکانی کردبوو، ئەو سەرپەرشتی ڕاهێنانی دەکردم. بەرنامەکە لە هەشتی بەیانیـەوە تا یەکی نیوەڕۆ و پاشـان خـواردن و خـۆشـوشتن و لە کـاتژمـێری دووی پاش نیـوەڕۆ تا چواری ئێـوارەو لە کـاتژمـێـری چوارەوەش عـەقـیـد تادیسی وانەی سـەربازی دەدامێ، تادیسی یاریدەری بەرپرسی پۆلیس بوو و دەوری زۆری بینیـبـوو لە پوچەڵکردنەوەی کـودەتایەک بۆ رووخاندنی ئیمپراتۆر هیلاسیلاسی. بەگشتی ڕاهێنانەکە قورس بوو.

لە ڕاهێنانەکەدا فـێری بەکارهێنانی تفـەنگی ڕەشاش و دەمانچەو نیـشـانگرتن بووم. لەگەڵ سەربازانی پاسەوانی ئیمپراتۆر لە کولفی و کەتیبەکەیەکی تری تایبەتا فێری نیشانگرتن لە دووری پەنجا میل. ڕاهێنانم کرد. هەروەها ڕاهێنانم لەسەر تۆپ و تەقاندنەوەو دانانەوەی مین و تەقینەوە و چۆنیەتی خۆپاراستنیشم کرد. هەستم کردو وەک سەربازێک ڕاهاتووم و وەک سەربازێکیش بیرم دەکردەوە، ئەو بیرکردنەوەیەش لەگەڵ بیرکردنەوەی سیاسییەک جیاوازی زۆری هەیە. لە هەموو شت زیاتر تامم لە «کاروانەکەی جێبەجێکردن» وەرگرت، کە تێدا هەر سەربازێک تفەنگێک و چەند فـیـشـەک و کـەمـێکی سنووردار ئاوی دەدەنێ و داوای لێ دەکـەن بەمـاوەیەکی دیاریکراو بگاتە خاڵێکی دیار. لەو کاروانەدا بە جوانی سروشتی جوانی دارستان و هەورازەکانم بینی. ئەسیـوبیا لەڕووی دروستبوونیدا جیاوازە، خەڵکەکەی هێشتا گاسنی دار بەکاردەهێنن و خواردنیان کەمێ پێخۆرو بیرەی خۆماڵییە. ژیانیان وەک ژیانی لادێیەکانی خوارووی ئەفریقیا بوو، ژیانی هەژاران لە هەمـوو شـوێنێکا وەک یەکە. عـەقـید تادیس لە دەرسەکـانیـدا باسی هێـزە نیـزامیـیـەکـان و سەرکردایەتی سوپاکان و ئینزیباتی نێوان سەربازانی بۆ کردین. ئێوارەیەکیان کە پێکەوە نانمان دەخـوارد، بەمنی وت. مـاندێلا، ئەوەت لەبیـرنەچێ، تۆ سـوپایەکی رزگـاری دادەمـەزرێنی، نەک سوپایەکی سەرمایەداری ئاسایی. لەنێو سوپای رزگارییدا دەبێ یەکسانی لە نێوان سەربازەکاندا پەیڕەو بکرێ، دەبێ هەڵسوکەوتت لەگەڵ سەربازەکانت وەک سەربازانی سەرمایەداری نەبێت. لە مەیدانا، دەبێ دەسەڵاتی خۆت بە بڕواوە بەکاربێنیت و وەک سوپای ئاسایی خۆراگرو توند بیت. لەکاتی پشوودانا، لەگەڵ سەربازەکانت هاوشان بیت و لە نووسینگەی خۆتا و بەتەنیا نان نەخۆیت و لێیان دوورنەکەویتەوەو لەگەڵ سەربازی پلە نزمیشدا هەمان ڕەفتارت هەبێت و جیاوازییان لە نێوان مەکە. قسەکانی زۆر جوان بوون. هیچ لارییم نەبوو. لەوکـاتەی کە عـەقـید قسـەی بۆ من



دەکرد، ئەفسەرێکی هاوڕێی هات و پرسیاری لە برادەرێکی کرد، عەقیدیش بەتووڕەییەوە تەماشای کردو وتی:

نابینیت وا من لەگـەڵ کـەسـێکی گـەورە قـسـە دەکـەم، نازانی نابێت لەکـاتی نان خـواردنا دامببڕیت...!! بڕۆ و نەتبینمەوە، ئەمەی وت و بە هەمان هەناسەی دەرس فێرکردنا بەردەوام بوو.

بڕیاربوو ڕاهێنانەکەم شەش مانگ بخایێنێت، بەڵام پاش هەشت هەفتە بروسکەیەکم لە حیزبەوە بەدەست گەیشت و داواکاربوون بگەڕێمەوە وڵات، خەباتی چەکدار گەشەی سەندبوو و بۆیە دەبوایە سەرۆکی بزاڤی «ئەمکا» لە گۆرەپانەکەدا بوایە. عەقید نادیس مشوری سەفەرێکی بەنهێنی بۆ خواردم و لە فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمـانی ئەسیـوبی بۆ خـەرتووم گـەشـتێکی بۆ سازکـردم، پێش سەفەرەکەم دەمانچەیەک و دووسەد فیشەکی دامێ، منیش سوپاسم کرد بۆ ڕاهێنان و دیارییەکەی. ئەگەرچی لە کاروانەکەی جێبەجێکردنا زۆر ماندووکرابووم و، بەڵام هێشتا هەڵگرتنی ئەو بارە فیشەکەم، کە بەقەد کێشی منالێک دەبوو لا زەحمەت بوو، لە خەرتووم فەرمانبەرێکی هێڵی ئاسمانی بەریتانی، هاتە پێشوازیم و وتی:

گەشتەکەت بۆ دارالسلام یەک ڕۆژ دوادەکەوێت، بۆیە شوێنی حەوانەوەتمان لە ئوتێلێکی نایاب بۆ سازکردویت. بەڕاستی حەزم دەکرد، ئەمشەوەیان لە ئوتێلێکی سادە بومایەو لەبەرچاوان دوور بومایە. لە هەیوانی ئوتێلەکەدا بە پێش چەند مێوانی سپی گوزەرم کرد، دەمانچەکانیان لە ژێر چاکەتەکانیاندا دیاربوو، منیش ئەو هەموو فیشەکانەم لەبن پەراسوما بەسترابوو. ئاشکرایە ئەو دەمانە هێشتا ئامێرە ئەلکترۆنییەکانی پشکنین پەیدا نەببوون، بێجگە لەوەش هەزارەها جنێە پارەم لە گیرفانەکانا دابوو، وام هەست دەکرد ئەوانەی بەرامبەرم چاویان بە تیشکی ئەکسەوە بەستراوەو هەموو شتەکان دەبینن، لەهەر ساتێکا بگیرێم، دەگیرێم...!! بەڵام بەسەلامەتی گەیشتمە ژوورەکەم و بارگەکەم داگرت و ئەوەی خۆش بوو لە خواردن و خواردنەوە داوام کرد، بەڵام هێشتا ترپەی پێی خزمەتگوزارەکانی ناو ئوتێلەکە دەیانترساندم. لە خەرتوومەوە گەیشتمە دارالسلام، لەوێی بیست و یەک سەربازی «ئەمکا»م بینی بۆ ڕاهێنانی سەربازی بەرەو ئەسیوبیا دەڕۆیشتن. بەم دیمەنە زۆر دڵشاد بووم. کەوا پیاوان وا دێنە ڕێزی بزاڤەکە. ئەو بزاڤەی من لە پێشەنگی دامەزرێنەرەکانی بووم. دیارە کەوا بۆ بەرگری لە وڵات، گیانیان لەسەر دەستەو، چاوەڕوانی ئیشارەتی من دەکەن بۆ هەڵگیرسانی ئەم شەڕە. ئەو شەڕە بۆ ئەو یەکەم دەستەیەی بەشداری دەکەن جێگای مەترسیە. زۆربەیان گەنجی شارەکان بوون، سەربەرزو خوێن گەرم بوون.

لەسەر شەرەفی من بزنێک سەربراو بەیەکەوەنانی نێوەڕۆمان خوارد و باسی سەفەرەکەم بۆ کردن، داوام لێکردن پابەندی یاسا سەربازییەکان بن و زۆر گوێ رایەڵ بن و وتم:

ئێوە نوێنەری بزاڤی رزگارین لە خوارووی ئەفریقیا، هەروەها وتم، پێویستە راهێنانی سەربازی هاوشانی راهێنانی سیاسی بێت، چونکە شۆڕش هەر تەقەکردن نییەو بەس، بەڵکو بزاڤێکە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەی دادو یەکسانی. سەربازەکان سلاوی سەربازییان بۆ کردم، ئەویش یەکەم جارە سلاوی سەربازی لە سەربازەکانمانەوە بۆ بکرێت.

سەرۆک جولیوس نیریری بۆ ئەمیبا فرۆکەیەکی تایبەتی بۆ تەرخانکردم و لەوێشەوە یەکسەر بۆ لوباتسی، فرۆکەوانەکە وتی:

لەکاتی دادەبەزین.

ئەم بڕیارە نوێیە نیگەرانی کردم، لە کاتی حاکمی ناوچەکەو ئەفسەرێکی ئاسایش، هەردووکیان سپی بوون پێشوازیان کردم، حاکمەکە لە ناومی پرسی، منیش وتم:

ناوم دێڤید موتسامایە، ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی:

نەخێر، تکایە ناوی راستەقینەی خۆت بڵێ..!

دووبارە وەڵامم دایەوەو وتم: دێڤید موتسامای، دیسان ئەویش وتی: تکایە ناوی راستەقینەی خۆت بڵێ، زانیاری تەواوم لەلایە کە من پێشوازی لە بەڕێز ماندێلا دەکەم و پێویستە باشترین یارمەتی و هۆکاری گەیاندنی بۆ دابین بکەم. جا ئەگەر تۆ بەڕێز ماندێلا نەبیت، ئەوا ناچارم دەستگیرت بکەم، چونکە کەسی تر بۆی نییە بەم شێوەیە بێتە ناو وڵات. جا تکایە تۆ بەڕێز ماندێلای...؟ یان نا...!!! کەوتمە ناو... گێژاوێک، بڵێم چی لە هەردوو حاڵەتدا گیراوم بە حاکمەکەم وت:

ئەگەر تۆ هەر سووریت کەوا من دێڤید موتسامای نیم و نیلسۆن ماندێلام. ئەوا ناتوانم سەرپێچیت بکەم پیاوەکە پێکەنی و وتی: لە دوێنێوە چاوەڕوانی تۆ دەکەین. حاکمەکە منی بردە لای چەند هاوڕێیەک، کە لە چاوەڕوانی من دابوون. بە رێگادا بەرەو لوباتسی رۆیشتین و لەوێی جومودیس و هەڤاڵێکی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کە ناوی جوناس ماتلوبوو، کە نیشتەجێی ئەوێی بوو بینی. حاکمەکە وتی:

پۆلیسی خوارووی ئەفریقیا دەزانی تۆ دەگەڕێتەوە وڵات، بۆیە من پێشنیاردەکەم بەیانی بگەڕێنەوە، سوپاسی حاکمەکەم کرد بۆ ئامۆژگاریی و یارمەتیەکانی. کە گەیشتینە ماڵی ماتلوو



بەهاوڕێکانم وت:

من ئەمشەو هەر دەپەڕمەوە، لەم سەفەرەمدا بۆ جوهانسبیرگ سیسیل ویلیامزم لەگەڵدابوو، ئەویش پیاوێکی سپی بوو کاری دەرهێنەری شانۆیی دەکرد و ئەندامی بزاڤی «ئەمکا»بوو. وەک شوفێری تایبەتی ئەو ئۆتۆمۆبیلەکەم لێخوری و بەرێکەوتین.

***ئەم نووسینە بەشێکە لە کتێبی (گەشتە دوورەکەم بۆ ئازادی)ی ماندێلایە.**

## بەشی د ٣٥

# ریڤونیا

کە لە سنوورگەڕاینەوە هەناسەیەکی قوولم هەڵکێشا. پاش ئەو دابڕانە زۆرە، هەوای وڵات، بۆنێکی خۆشی هەبوو. شەوێکی سامالی زستانی بوو. ئەستێرەکان جوانترین پێشوازییان لێکردین. پێشوازیەکی وا گەرم، کە لە هیچ وڵاتێکی تری ئەفریقی پێشوازیی وام لێ نەکرابوو. گەرچی من وڵاتێکم جێهێشتبوو کە بۆ یەکەم جار شنەبای ئازادیم تێدا هەڵدەمژی. وا بەرەو ژیانێکی راونراو و جیهانێکی ئاوارە دێمەوە، بەڵام هەستیشم بەخۆشیەکی قووڵیش دەکرد، چونکە هەرچۆن بێت دەگەڕێمەوە سەر ئەو خاکەی لەسەریا لە دایک بووم و دوارۆژ و چارەنووسمی تێدایە.

کە لە سنووری نێوان بیتشوانالاندو باکووری خۆرئاوای ترانسفال گوزەر دەکەیت، دەیەها رێگای بێ نیشانەت دێتە پێش. سیسیل شارەزای رێگا کورت و قەدبڕەکان بوو. لە رێگادا، زۆری پێڕاگەیاندم، زۆری پێ وتم کە لە پاش منەوە روویان دابوو. سەفەرەکەمان شەوێکی خایاندو لە نیوەی شەودا سنوورمان بەزاند وە بەیانیەکەی گەیشتینە کێڵگەی لیلیازلیف. من هەر بەدلەشڕەکەم لەبەردابوو.

بواری بیرکردنەوەو پشوودانمان نەبوو. شەوی دوایی کۆبوونەوەیەکی نهێنی لیژنەی کار سازکرا، سەبارەت بە سەفەرەکەم راپۆرتێکم پێشکەش کرد. کۆبوونەوەکە گرنگ بوو، تێدا ولتر سیسولوو موسا کوتانی و گوفان ئەمبیکی و دان ئەتلومی وئادجیە بی و دوما نوکوی بەشداربوون. پوختەی کارەکانی ئەنجامم دابوون بۆم باس کردن. بەوردیش باسی ناڕەزایی و گلەییەکان، لەمەڕ پەیوەندی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و سپیەکان و هیندییەکان و شوعییەکان بەتایبەتی بۆ باسکردن. قسەکانی زامبیبیا هەر لە گوێمدا دەزرنگایەوە، کە وتیان، دەزانین کەوا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی بەهێزترو بەجەماوەرترە، بەڵام ئەوان لە رەهەندی نانەژادی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ شیوعییەکاندا سەرسامن.



لە کۆبوونەکەدا وتم: من و ئولیڤەر هاوسۆزبووین لەوەی کەوا حیزبمان دەبێ زۆرترو روونتر سەربەخۆیی خۆی ئاشکرا بکات و بۆ دۆستە تازەکانی ناو کیشوەری ئەفریقیاش بسەلمێنێت، کەوا ئێمە سەربەخۆین، چونکە ئەوان هاوکاری راهێنانی سەربازانی بزاڤی «ئەمکا»مان دەکەن. پێشنیارم کرد، دووبارە هەڤاڵبەندیمان دابڕێژینەوە، وا بکەین حیزبمان سەرکردەی ئەم هەڤاڵبەندییە بکات، بەتایبەتی لەو کارانەی پەیوەستی کاریگەری بەئەفریقیامانەوە هەبێت.

پێشنیارەکەم، زۆر ناسک و پڕ مەترسی بوو، بۆیە دەبێ بۆچوونی هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی بۆ وەرگیرێت، لیژنەی کار، پێشنیاری کرد بچمە دوربان و راپۆرتێک پێشکەشی لوتولی بکەم. هەموویان بەوە رازی بوون، بەڵام گۆفان ئەمبیکی ئامۆژگاری کردین یەکێکی تر رەوانە بکەین. گوفان ئەو کاتە دانیشتووی کێڵگەی لیلیازلیف نەبوو، ئەو وەک ئەندامێکی سەرکردایەتی باڵای سەرکردایەتی «ئەمکا» لە کۆبوونەوەکە ئامادە بوو، بۆیە وتی: جێگای مەترسیە ئەو بۆ ئەم کارە ترسناکە رەوانە بکەین، ئەو تازە لە دەرەوە گەڕاوەتەوەو ئامادەیی هەیە بۆ گەشەی کاری بزاڤی «ئەمکا». هەمومان منیش ئامۆژگارییە گرنگەکەمان رەتکردەوە.

شەوی دوایی بە بەرگی کەسایەتی شوفێری تایبەتی سیسل لە ریڤونیا بەرێکەوتم. بەرنامەی دیداری زۆرم لە دوربان بەنهێنی هەبوو. پێشەکی دەبوایە لەگەڵ مونتگومری نایکر و ئیسماعیل میر دانیشم و باسی ئەنجامی گەشتەکەی خۆمیان بۆ بکەم و، شرۆڤەی پێشنیار و پێشهاتە تازەکەیان لەگەڵدا بکەم. ئەوان هەردووکیان کەسی نزیک بوون لە پێشەوا لوتولی و، بڕوای پێیان هەبوو. سووربووم لەسەر ئەوەی بە لوتولی بڵێم: کەوا من هاورێکانی ئەوم دیوەو سەرنجەکانیانی پێڕابگەیێنم. هەردووکیان بەبۆچوونی من، کە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ببێتە پێشڕەوی حیزبەکانی تری ناو هاوپەیمانی کۆنگرەو بەیانی سەربەخۆو ئازاد دەربکات و تێروانینی تایبەتی بەکێشە ئەفریقیەکان هەبێ، سەرگران بوون.

هەردووکیان وایان دەبینی ئەم رامانە پەیمانەکە هەڵدەوەشێنێت چوومە گروتپیل و لە ماڵی ژنێکی هیندی پێشەوام بینی، بەهێمنی گوێی لە قسەکانم راگرت و دوایی وتی: من حەز ناکەم سیاسەتمەداری بێگانە بەرنامەمان بۆ دابڕێژێت. هەروەها وتی: من لە ئەنجامی هۆکاری گونجاو سیاسەتی ئەنتی نەژادپەرستیم هەڵبژاردووەو مەعقولیش نییە لەبەر ئارەزووی چەند سەرکردەیەکی بێگانە ئەم سیاسەتە بگۆڕین.

بە پێشەوام وت: ئەم سیاسیانە، لەم سیاسەتە بێزارنین، بەڵام دەڵێن ناتوانین تێبگەین.

هەروەها وتم: من وا دەبینم هەندێ گۆڕانکاری ورد لە سیاسەتی حیزب بکەین، تا وا لە دۆستەکانمان بکەین لە رامانەکانی حیزب بگەن و سیاسەتەکەی قبووڵ بکەن. من ئەوەم بۆ سازکردنێکی بەرگری بوو. چونکە ئەگەر وڵاتانی ئەفریقی بڕیاری هاوکاری حیزب و رێکخراوێکی بچووکی وەک حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی بکەن، ئەوا رەنگە ببێتە رێکخراوێکی بەهێزو مەزن.

پێشەوا هەرگیز بڕیاری لە ناکاوو خێرای دەرنەدەکرد، زانیم ئەوەیان کات و بیرکردنەوەو دانوستانی لەگەڵ برادەران دەوێت. پێشەوام جێهێشت و ئامۆژگاری کردم بۆ خۆم وریاو لەسەرخۆ بم. لە کۆبوونەوە نهێنییەکاندا بەردەوام بووم و دوا کۆبوونەوەشم لەگەڵ سەرکردایەتی گشتی هەرێمەکانی بزاڤی «ئەمکا» بوو لە دوربان.

سەرکردەی سەرکردایەتی دوربان زانای تەقینەوە برونو ئەمتولو بوو، پێشتر نەمدیبوو. بەڵام زووتر بۆی نووسیبووم کەوا حەز بە دیدارم دەکات، بەڵام نەک لەو رەوشی ئیمڕۆدا. بە سەرکردایەتیم راگەیاند، کەوا گەشتەکەی ئەفریقیام چۆن بووەو هاوکاریی چیم وەرگرتووە راهێنانی سەربازی چۆن دەکرێت. هەروەها پێم وتن، کەوا چالاکییەکانی ئیمڕۆی «ئەمکا» تەنیا کاری ئاژاوەو تەخریب دەبێت، ئەگەر ئەوەش ئەنجامی نەپێکا، ئەوا دەست بەشەڕی پارتیزانی دەکەین.

ئێوارەکەی لە ماڵی رۆژنامەنووسی وێنەگر ئادجی ئارنایدو، کە خانەخوێم بوو، ئیسماعیل و فاتیمەی ژنی و مونتگومری نایکرو ئادجیە ئان سینگم لە دانیشتنێکی بەخێرهاتنەوەو ماڵئاواییکردنا بینی،چونکە بڕیاربوو بەیانییەکەی بەرەو جوهانسبیرگ سەفەر بکەم. شەوچەرەکە خۆش بوو، زۆر لە مێژبوو شەوچەرەی وا هێمن و بەپشووم نەدیبوو، چاک و خۆش نووستم. عەسری رۆژی یەکشەممەی ٥ی ئۆگست/ ئەیلول سیسلم بینی و بەسەیارە باشەکەی جۆری ئوستن بۆ گەشتە دوورەکەمان بەرەو جوهانسبیرگ بەڕێکەوتین.

بەدلە سپیەکەی تایبەت بەشوفێریم لەبەردابوو بەنۆرە لێمان دەخوریی. رۆژەکە خۆش بوو، کەمێ ساردبوو. لەگەڵ جوانی سروشتی ناتال و سەوزاییەکەی رۆژانی وەرزی زستانیدا مەست ببووم. کاتم دەبێت وینی و منداڵەکانم ببینم. خۆزگەم خواست وینی بۆ وەرگرتنی زەوق لە جوانی ئەفریقیا لەگەڵم بوایە، چونکە بۆم نەدەکرا هەموو دیمەن و کارەکانمی بۆ بگێڕمەوە.

کە لە ناوچەی پیشەسازی دوربان دوورکەوتینەوە، دیمەنە جوانەکان و گردو دۆڵەکانی دەڤەری شارەکەمان لێ دەرکەوت، ئاوی هێمنی ئۆقیانوسمان لێ بەدیارکەوت، ئاوەکەی شینی تۆخ بوو. دوربان بەندەری سەرەکی ناوچەی پیشەسازی خوارووی ئەفریقیایە. رێگا سەرەکییەکەی



جوهانسبیرگ تەریبی هێڵی ئاسنی شەمەندەفەر بوو، هەر لەوێ بیرم لەوە کردەوە کەوا ئێمە هێڵەکانی شەمەندەفەر بکەینە مەبەستی چالاکییەکانمان بۆ تەخریب و ئاژاوە، ئەوەش خاڵێکی نایابە، ئەوەم لە دەفتەرە بچووکەکەی بەرباخەڵم نووسی، ئەوەی بۆ هەموو شوێنێ لە باخەڵمدا بوو. کە ناو شاری هوفیکی هەڵکەوتووی دووری بیست میل لە باکووری خۆرئاوای بیترماریتسبیرگ گوزەرمان کرد، هەرباسی چالاکییەکانی تەخریبمان دەکرد. لە سیدارادا، ئەو شارە بچووکەی پاش هوفیک، ئۆتۆمۆبێلێکی جۆری فورد فی ٨ بە خێرایی لێمان گوزەری کرد، دیار بوو چەند پیاوی سکی تێدابوو. کە ئاوڕی پشتەوەم دایەوە، دوو ئۆتۆمۆبێلی مشت پیاوی سپیم بینی. لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەی پێشمانەوە ئیشارەتی راگرتنمان بۆ کرا. هەر ئەو دەمە هەستم کرد، کەوا راوە راوەکەم تەواو بوو، هەڤدە مانگەکەی ئازادیم لە تەواو بووندایە.

سیسل خێراییەکەی کەم کردەوە رووی لە من کردو پرسی:

دەبێ ئەو پیاوانە کێ بن ..؟

وەڵامم نەدایەوە. هەردووکمان وەڵامەکەمان دەزانی. بۆ مەبەستەکەیان پەنایەکی چاکیان دەستنیشانکردبوو، تەنیشتمان هەڵدێرەو دەچێتە ناو دارستانێکی چڕو بە ئاسانی دەتوانن ناچارمان بکەن بەرەو دارستانەکە بمانهاژۆن ئەگەر ویستمان رابکەین. لەلای چەپی شوفێر بووم، بیری هەڵاتنی ناو دارستانەکەم کرد، بەڵام مسۆگەر بووم تەقەیان لێدەکردم و بە ئاسانی دەیانپێکام و دەکوژرام. ئۆتۆمۆبێلەکە راوەستا، پیاوێکی کەڵەگەتی زراڤی روو گرژی لێ دابەزی و بەرەو لای پەنجەرەی نەفەر هات. پیاوەکە ریشی نەتاشیبوو، وای لێ دیاربوو چەند شەوێکە نەنووستووە. وام لێکدایەوە کەوا چەند رۆژە بەدوامانەوەیە، خۆی پێناساندم و بە دەنگێکی نەرم وتی: من ئەفسەر فورسترم و لە پۆلیسی بیترماریتسبیرگەوە فەرمانی گرتنی تۆم پێیە. ناوی پرسیم. منیش وتم، ناوم دێڤید موتسامایە. سەری راوەشاندو بە ئەدەبەوە چەند پرسی کرد، لە کێوە هاتووی و بەرەو کێندەرێ دەڕۆیت. ویستم لە وەڵامەکانا رابکەم و زانیاری بە سوودی نەدەمێ، بۆیە تووڕەیی لە دەموچاوی دەرکەوت و وتی:

برا، تۆ نیلسۆن ماندێلایت، ئەوەش سیسیل ویلیامزەو ئەوەش فەرمانی گرتنتان. ئەفسەرەکە ئاگاداری کردینەوە کەوا پۆلیسێک بە پلەی رائید هەتا بیرماریتسبیرگ لەگەڵتان سوار دەبێت. ئەو کاتانە، هێشتا پۆلیس ئیشیان ورد و جوان نەبوو، بۆیە فورستر هەر منی نەپشکنی. دەمانچەو فیشکەکانم هەر پێبوو. جارێکی تر بیرم لە راکردن کردەوە. لە بەر زۆری پیاوانی پۆلیس، دەمزانی

بواری دەربازبوونم سنووردارە. دەمانچەو دەفتەرە تایبەتیەکەم بە دزی خستە نێوان کورسی خۆم و کورسیەکەی سیسیل. لە بەر هەر شتێ بووبێت پۆلیس نەیدۆزینەوە، ئەوەش بەختیاری کردم و خەڵکێکی زۆری لە گرتن رزگارکرد.

لە بنکەی پۆلیسدا منیان بردە نووسینگەی ئەفسەر فورستر، لەوێ چەند ئەفسەری تریشی لێبوو. لەوانە، وەکیلی ئەفسەر تروتار، ئەوەی لە دۆزی خیانەتەکەماندا یەکێک لە شاهیدەکان بوو. ئەو دەمەش تروتار لە ناو گیراوەکاندا بۆچوونی چاکی گەیاند، چونکە لەوێ سیاسەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بە وردی و بێ تانەو بە بێ درۆ باسکرد. بە گەرمی هەواڵی یەکترمان پرسی.

هەتا ئێستاش دانم بە هیچ نەناوە، ناوم هەر دێڤید موتسامایە، تروتار وتی:

بۆ..؟ نیلسۆن لەسەر ئەم شانۆگەرییە بەردەوام دەبی، تۆ چاک دەزانی من دەزانم تۆ کێیت.

وەڵامم دایەوە، ناوی خۆم وت و تەواو. داوای پارێزەرم کرد. ئەوانیش داواکەیان رەتکردمەوە، بۆیە منیش هیچی ترم نەووت.

سیسیلیان لە ژوورێکی تەنیا دانا و منیش بوارم بۆ رەخسا بیر لە وەزعی خۆم بکەمەوە. هەموو دەمێک گرتنم لە پێش خۆمدا دانابوو، بەڵام کەسی خەباتگێڕ حەقی خۆیەتی ئینکار بکات. ئەمشەوە هەستم کرد بەرگەی گرتن و دیلی ناگرم، هەستم بە نیگەرانی و شڵەژان کرد. دیارە یەکێک ئاگاداری پۆلیسی کردیتەوە کەوا من لە دوربانم و دەگەڕێمەوە جوهانسبیرگ. پۆلیس وای دەزانی من چەند هەفتەیە گەرامەتەوە وڵات. لە مانگی یونیو/حوزەیراندا و بە مانشێتێکی پانا لە رۆژنامەکانا نووسیبوویان گەڕانەوەی گوڵە رەشەکەی بەهار. ئەو دەمانەی ئەوەیان بڵاوکردبۆوە، من هێشتا لە ئەدیس ئەبابا بووم. دەبێ ئەوەشیان هەر بۆ هەڵخەڵەتاندن بووبێت ..!!

دەستەڵاداران لەبەر ئەوەی گومانیان هەبوو، کەوا وینی ئاگادارە، کە من گەڕاومەتەوە، بۆیە تەنگاویان کردبوو. دەمزانی لە دوای بوون و چەند جارێک ماڵەکەیان پشکنیبوو. مەزندەی ئەوەیان کردبوو کە سەردانی پێشەوا دەکەم، راستیش بوو. دەمزانی شتێ دەزانن و بەڵام گومانی ئەوەم نەبوو بزانن من لەدوربانم. بۆیە هاتوچۆ و جووڵەیان خستبووە ژێر چاودێری و دەستکێش. قسەش لە زاری کەسانی نیازپاکیش دەرچووبوو.

خۆشم کەمێ گوێم نەدەدایێ و دواشەویش لە شەوچەرەیەکی گەورەدا بەشداربووم و خەڵکێکی زۆریش دەیانزانی من لە دوربانم. گلەییشم لە خودی خۆم دەکرد، کەوا زۆر هۆشیارو ئاگادار نەبووم.



هەموو ئەگەرەکانم سەرو بن کرد. ئایا لە دوربان دەستکێش هەبووە یان لە جوهانبێرگەوە خەبەرم لێدراوە..؟؟ ئایا لە ناو بزاڤەکەمانە..؟؟ ناسیارە، یان بێگانەیە..؟؟ لەو کارانەدا مەزندە و خەیاڵ دوور دەڕوات، کە زۆر بیرم کردەوە، ماندووبووم و خەوم لێکەوت.

شەوی **٥**ی ئوگستۆسی/ ئاب **١٩٦٢** لە دۆزینەوەم لەلایەن پۆلیسەوە پێویستم بەگومان و نیگەرانی نەما، وا لەناو دەستیاندام.

بەیانییەکەی خۆم بۆ ئەو مەینەتیەی ئەو رۆژەی دووچارم دەبێتەوە سازکرد. دەبوایە لە بەرامبەر ئەوانەی منیان دەستگیر کردووە، یان لەبەر ئاکامەکەی هەر رەوشێک دێتە پێشم. خۆم لاوازو رەشبین نیشان نەدەم. سەعات هەشت و نیوی بەیانی لە بەرامبەری قازی هەرێمەکە راگیرام و ئەویش بەرەسمی بەرەو دەستەڵاتدارانی جوهانسبیرگی ناردم. دانیشتنەکە زۆر ئاسایی بوو، وەک ئەوەی تەماشای دۆزی کێشەیەکی هاتوچۆ بکەن. بەئاسایی و بەبێ ئەوەی رەچاوی توندو تیژی منیان سوارکردو بۆ جوهانسبیرگ بەڕێیان کردم. لە رێزی پشتەوەی سەیارەیەک و بەدەست کراوەیی دانیشتم. لە رێزی پێشەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەش دوو پیاوی ئاسایش دانیشتن. برادەران زانیبوویان گیراوم. فاتیمە هەندێ خواردنی هێنابوو. منیش لەگەڵ دوو ئەفسەرەکەی مەخفەرەکە کە لەگەڵما سواربوون بەشمان کرد. لە شاری فولکسراست راوەستاین و بواریان دا دابەزم و کەمێ قاچەکانم بجووڵێنم. لەبەرئەوەی بەجوانی و بە رەوشتی بەرزەوە لەگەڵمانا جووڵانەوەو بڕوایان پێم هەبوو. بۆیە بیرم لە راکردن نەکردەوە.

کە لە جوهانسبیرگ نزیک بووینەوە، گۆڕانێک لە رەوشەکە روویدا. لە رادیۆدا گوێم لێبوو، کەوا من گیراوم و سەیتەرە و پشکنینەکانی رێگای ناتال هەڵگیرێت. مەغریبەکەی لە دەڤەری جوهانسبیرگ تیمێک پۆلیس هاتنە پێشمان و هاورێمان بوون. دەستیان کەلەپچەکردم و خێرا سواری لۆرییەکی پۆلیسی داخراوی پەنجەرە تاریکیان کردم. کاروانەکە بەرێگایەکی ئاڵۆزی لاچەپ بەرەو مەیدانی مارشال رۆیشت. وا دیاربوو پۆلیس لە کەمینێک دەترسا.

لە ژوورێکی تاکە کەسیان دانام و یەکسەر بیرم لە بەرنامەی بەیانی کردەوە، گوێم لە کۆخەیەک بوو، کۆخە نەک هەر ئاساییە لە زیندانا، بەڵکو هەستم کرد دەنگی کۆخەکە دەناسم. هەڵسامەوە سەرپێ و بانگم کرد. ولتر..؟؟

بەڵێ، تۆ لێرەیت...! ماندێلا.!!

لەگەڵ سەرسوڕمان و دڵشادیی و بێ هیوایی و خۆشی، پێکەنینمان هات. زانیم، کەوا لە پاش

مناو بە ماوەیەک ئەویشیان گرتووە. کۆک بووین لەسەر ئەوەی کەوا شتەکان بێ بەرنامە و ڕێکەوت نەبووە.

دیارە کەوا ئەم شوێنە جێگای نموونەیی نەبوو بۆ کۆبوونەوەی لیژنەی کار، بەڵام بۆ ڕۆژێکی وا باش بوو. بە گێڕانەوەی سەربردەی گرتنەکەم و وردەکاری کۆبوونەوەکانی دوربان، شەوەکەم زوو لێ ڕۆیشت. بۆ ڕۆژی دوایی بۆ بەرەسمی درێژکردنەوەی ماوەی حیجزەکەم، منیان بردە بەردەم دادوەرێک. هارولد و ولبی و جوسلوڤو، کە زانیبوویان من گیراوم، هاتبوون و لە خوارەوەی بینایەکەو لە ژوورێکدا قسەمان کرد. وەک پارێزەرێک چەندین جار لە بەرامبەر ئەم دادوەرە راوەستابووم و لە نێوانماندا ڕێزو پەیوەندی هەبوو. لە دادگادا چەندین پارێزەری چاکم دەناسی. زۆرجار مرۆڤ دووچاری ڕووداوی سادە دەبێتەوەو لەوێ هەست بەغروور و سەربەرزی دەکات، هەست ناکەم من لە چوارچێوەی کەسایەتیمدا پارێزراو بووم، خۆم بەدەست بەستراوەیی لەبەردەم دادگاوە بینی. منی راونراو بەدەستی پۆلیس بۆ ماوەی یەک ساڵ، وا بە جوانی و بەڕێزو شکۆوە لەلایەن پارێزەران و فەرمانبەران و دادوەرەکەش لە دادگاوە مامەڵەم لەگەڵدا دەکرێت. هەموویان منیان دەناسی، نیلسۆنی پارێزەر و نمایندەی یاسایی، نەک نیلسۆنی راونراو لەلایەن یاساوە، ئەوەش ورەی زۆر زۆر بەرزکردم.

لە دووانەکانیدا، دادوەرەکە نیگەرانی و شڵەژانی پێوە دیاربوو، نەیدەویست رووم تێبکات، هەروەها وەکیل و پارێزەرەکانیش سەرسام ببوون. بیرم بۆ ئەوەچوو، ئەوانە لەبەرئەوە نییە نیگەرانن کەوا هاوڕێیەکیان دادگایی دەکرێت، بەڵکو لەبەر ئەوەیانە کەوا منی ئاسایی و لەسەر بیروبۆچوون و بڕواکانم دادگایی دەکرێم. یەکەم جار بیرم لەوە کردەوە دەوری راستەقینەی خۆم لەناو دادگا ببینم و بواریش رەخساوە کەوا منی تاوانبار و نیشانەی راستی و داد لە دادگای بکوژان و لەبەر رۆشنایی سەرەتاییەکانی بێگەردی دیمۆکراسی و لە کۆمەڵگایەکدا کە وازیان لەو چاکسازی و سەرەتاییەیانە هێناوە. دڵنیابووم، کەوا من لەناو قەڵای دوژمنیشدا دەتوانم بەردەوام خەبات بکەم.

کە پرسیارم لێکرا، کێ پارێزەرتە..! لە وەڵامدا وتم:

خۆم پارێزەری لە خۆم دەکەم و جوسلوڤویش دەوری راوێژکار دەبینێت، بەرگریکردن لە خۆم بواریش خۆش دەکات لەم دادگایەدا هەڵوێستی ئەخلاقی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی نیشان بدەم لە دژایەتیکردنی نەژادپەرستیدا، ئەوەندەی حکومەت ڕووبەڕووی تاوان و لێپرسینەوە دەکەم. ئەوەندە بەرگری لە خۆم ناکەم. بە وردی و بە بایەخەوە گوێم لەو تۆمەتانە گرت کە ئاراستەم



کرابوون، لەوانە هاندانی کرێکارە ئەفریقییەکان بۆ مانگرتن و سەفەرکردنم لە وڵاتەوە بۆ دەرەوە بەبێ پسوولەی رەسمی باوەڕپێکراوەوە. سزای تاوانی لەم جۆرە لە خوارووی ئەفریقیای ژێر چەپۆکی رژێمی نەژادپەرستی رەنگە دەگاتە دە ساڵ زیندان. سەرەڕای ئەمانە مەسەلەکەم بەخۆشی وەرگرت، چونکە بۆم دەرکەوت حکومەت هیچ دەلیلی تەواوی لەسەر پەیوەندیم بەبزاڤی «ئەمکا»ەوە لەسەرما نییە، ئەگەر ئەوەی هەبوایە تاوانی ترسناکی وەک خیانەت و تەخریبی دەخستە پاڵم.

هەتا هۆڵی دادگام جێنەهێشت وینی م نەبینی. کە بینیم، دیاربوو بێزاری و خەمی پێوە دیاربوو، بێگومان بیری لەو ساڵ و مانگە درێژانە دەکردەوە. کە تەنیا دەمێنێتەوە، ئەرکی گەورە کردنی دوو مناڵی بچووکیش زۆرە لە شاری جوهانسبیرگی دژوار بکەوێتە ئەستۆی. جیاوازیش زۆرە لە نێوان بیرکردنەوە لەو تەنگوچەڵەمانە و ڕووبەڕووبوونەوەی واقیعیانەیان، بێجگە لە پێشکەشکردنی زەردەخەنەیەکی بەرین، کە من نیگەران نیم و تۆش نیگەران مەبە هیچی ترم لە دەست نەهات. دەمزانیش، ئەوەیان باری ژان و سووتانی سووک نەدەکرد.

لە دادگاوە بەرەو زیندانی قەڵای جوهانسبیرگیان بردم. کە لە دەروازەکەدا دەرچووم و بەرەو لۆرییە داخراوەکە چووم، سەدان کەسم بینی و هوتافەکانی ئاسایی حیزبیان، ئەمانلاو ئەنگایتو، واتە «هێز» و «هێز بۆ ئێمە»یان دەوتەوە. دەنگەکان تێکەڵ بەهاوارو گۆرانی ببوو، خەڵکەکە بەدەستی لە لۆرییەکەیان دەدا، ئەویش بەهێواشی دەجووڵایەوەو لە دادگاکە دووردەکەوتەوە، گرتنەکەم بووە یەکەم هەواڵی هەموو ڕۆژنامەکان. لە ڕۆژنامەکانا ئەم مانشێتانە دەرکەوتبوون: پۆلیس دوو ساڵی گەڕانی تەواوبوو، نیلسۆن ماندێلا گیراوە. گوڵە ڕەشەکەی بەهاریش، وەک جاران باوی نەما و ئەویش چیتر ئازادانە ناسووڕێتەوە.

پاش چەند ڕۆژێک بوار درا وینی بێتە سەردانم، وەک جارەکەی تر بێزاری و خەمی لە ڕوویدا نەبوو، جوانترین جلیشی لەبەرکردبوو. لەگەڵ خۆیدا دەستەیەک جلی بێجامەی نووستنی حەریری نایابی هێنابوو. دەستە بێجامەکەش شیاوی ساڵۆنێکی گەورەبوو، نەک زیندان نەوێرام بڵێم، ئەوانە هی زیندان نین، چونکە دیارییەکە نیشانەی دڵسۆزی و خۆشەویستی و هاوشانی بوونە بۆ من، منیش سوپاسم کردو باسی کاروباری خێزان و گوزەران و هەردوو مناڵەکەمان کرد، ناوی چەند برادەرێکم هێنا کە دەتوانن یارمەتی بدەن، چەند کەسی قەرازیشم ناوهێنان کە پارەی منیان لە لایە. داواشم کرد بەڕاستی بە مناڵەکان بڵێت، کەوا من بۆ ماوەیەکی زۆر دوادەکەوم و وا زوو

ناگەڕێمەوە. ئێمەش یەکەم خێزان نین دووچاری ئاکامی وا هاتووین. پێش ئێمە زۆر کەس گیراون و ئازادبوون و لە جاران توندتر گەڕاونەتەوە. هەروەها پێم وت: کێشەکەمان رەوایەو هاوڕێکانم دڵسۆزن، بەهیمەت و دڵسۆزی تۆوە دەتوانم لەو هەنگاوە تاڵە دەرباز بم، دەبێ ئاکامەکەی وەرگرین هەرچی بێت، بەگەرمی و لەگەڵ سۆزێکی قووڵەوە زۆر یەکترمان لە باوەشکرد، وەک ئەوەی ئەمەیان دوا دیداربێت، هەتا رادەیەکێش وابوو، قەدەر وای هێنا ماوەیەکی زۆر لە یەکتری دابڕاین و ئەوەشیان لە مەزندەی هیچماندا نەبوو. ئەفسەرەکە رێگای پێدام هەتا نزیک دەرگا سەرەکییەکە هاوشانی وینی بڕۆم، دواییش چاوم بەندی رۆیشتنەکەی بوو، کە تەنیا و بەشانازییەوە رۆیشت.

* * *

لە قەڵاتەکەدا لە ژێر چاودێری عەقید میناردا بووم، کابرایەکی ئەفریکانی بوو، هاوڕێیە توندڕەوەکانی تارادەیەکی زۆر بە لیبرالییان دەزانی، ئەفسەرەکە پێی وتم: دەتوانی لە نەخۆشخانەی زیندانەکە بمێنیتەوە، شوێنەکە لە زۆر شوێنی تر زۆر ئارامترە، لەوێش کورسی و مێزێکت بۆ دابین دەکەین و دەتوانی بۆ ئامادەکردنی بەرگرینامەکەت بەکاریان بهێنیت. راستە نەخۆشخانەکە خۆش و ئارام بوو. لەوێ دەمتوانی لەسەر قەرەوێڵەیەکدا بخەوم و ئەمەش لە هیچ زیندانیکدا دەست ناکەوێت. لە راستیدا پیاوەتی عەقیدیش لەبەرئەوە بوو، کەوا نەخۆشخانەکە، ئەمینترین شوێن بوو کەوا منی تێدا حەجز بکەن، بۆ هاتنە ژوورەوە دەبوایە دوو دیواربەندی چاودێرکراو بەچەکداران ببڕیت. لە نێوان دوو دیواربەندەکەش چوار دەروازەی زەبەلاحی کلیلدراو بەقفڵی گەورە هەبوو. لەبەرئەوەی رۆژنامەکان نووسیبوویان، گوایە بزاڤەکەمان من لە زیندانا دەرفێنێت، بۆیە بەرپرسان کۆششی زۆریان دەنواند بۆ ئەوەی ئەم کارە مەیسەر نەبێت.

لە رۆژنامەکاندا، لەناو ریزەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقیش پڕۆپاگەندەی شێتانە کرابوون، کەوا کەسێک لەناو بزاڤەکەمان ناوی منی داوە، من بەگرتن داوە. هەبوو وتبووی خانەخوێیەکەی دوربانم، ئادجی ئار نایدو، پاش دوا مێواندارییم خەبەری لێداوم، من وا هەست دەکەم، ئەوەیان هیچ بناغەی راستی نەبوو، یان رۆژنامەکان ئەوەیان مەزندە کرد، گوایە شیوعییە سپییەکان و هیندییەکان ناویان داوم، لەبەر ئەوەی من لەناو حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هزری نەتەوەیی ئەفریقی پەیڕەو دەکەم، بەڵام، ئەو قسانە هەموویان دروستکراوی حکومەت بوون و



نیازیش لە هەڵبەستنیان پەیاکردنی ناکۆکی بوو لە نێوان ریزەکانی بزاڤەکەماندا. ئەوەش بەڕای من پلانێکی بەدکاری بوو بۆ ئاژاوەنانەوە، پاشان لەگەڵ ولتر و دوما و جوسلوفو و ئەحمەد کاسراداو دواییش لەگەڵ وینیش باسمانکرد. خۆشبەختانە هەموویان هاوسۆزبوون لەگەڵ بۆچوونەکەم. لە کردنەوەی کۆنگرەی ساڵانەی گەنجانی هیندی لە ترانسفال وینی بەشداری کردبوو. لەسەر پێشنیاری من لە وتارەکەیدا جەختی لەسەر ئەم مەسەلەیە کرد، گومانەکانی رەواندەوەو رۆژنامەکانیش ئاماژەیان بەجوانی و بەرەوانی قسەکانی وینی دابوو. وینی لە وتارەکەیدا وتبووی:

ئێمە کات بەوە بەفیڕۆ نادەین، ئایا کێ ماندێلای بەگرتن داوەو یان کێ فرۆشتوویەتی و چۆن خیانەتی لێکرا، ئەوانە هەموو پڕۆپاگەندەن و ئاگری ئاژاوەو دووبەرەکی خۆش دەکات و ریزەکانمان شلۆق دەکات بۆ رووبەڕووبوونەوەی زۆرداران.

چیرۆکی ئەوەی گوایە فەرمانبەرێک لە قونسلیەتی ئەمریکی پەیوەندار بە وەکالەتی ئیستخباراتی ناوەندی خەبەری لە من داوە. ئەوەش لە هەموویان زۆرتر باوبوو، بەڵام ئەوەش هیچ هەواڵ و شتی راستی لێ نەکەوتەوە، ئەگەرچی وەکالەتی ئیستخباراتی ناوەندی بۆ نیشاندانی دەستەڵات و شان و شکۆی دەستەڵاتی ئەمریکی زۆر ئیشی بەدکاری وایان ئەنجام دەدا، بەڵام لەمەیاندا تاوانیان ناخەمە ئەستۆ، راستیەکەی من خۆم کەمتەرخەمیم نواند لە خۆشاردنەوە، کەمتر خۆدەرخستن و پەیوەندییەکانم. کە رووداوەکان بەبیرخۆم دەهێنمەوە تێدەگەم کەوا دەکرا بەئاسانی شوێنی دابەزینم لە گەشتەکەی دوربانم بەچەندین شێوە بدۆزرێتەوە. جێگای سەرسوڕمانیشە کە زووتر نەکەوتوومەتە داویان.

دوو رۆژ لە نەخۆشخانەی قەڵاکە مامەوە، دوایی گواسترامەوە بریتوریا. لە جوهانسبیرگا سەردانم ئازاد بوو و مێوانی زۆرم دەهات، مێوان ورەی گیراوان بەرز دەکات. نیازیش لە گواستنەوەم بۆ بریتوریا دوورخستنەوەم بوو لە زێدی خۆم و کەمکردنەوەی مێوان و سەردانەکانم بوو.

لەگەڵ گیراوێکی ترا بەکەڵەپچەکراوەیی سواری لۆرییەکی کۆن و پیسیان کردم. لەناو لۆرییەکەدا تایەکی پیس و بە روون فرێ درابوو و هەریەکێکمان لەسەر رۆخێکی دانیشتین، لەگەڵ تایەکەدا ئەم لاو ئەم لامان دەکرد.

بەو دانانەی حکومەت سەرسام ببووم، چەند کەسێکیان لەگەڵ من دانابوو. هاوڕێی ژوورەکەم ناوی ئەنکادیمنک بوو، ئەو کابرایە ئەندامی بەدکارترین دەستەی تاوان بوو لە هەرێمی سویتو.

گیراوی سیاسی و تاوانبارانیان تێکەڵی یەکتر نەدەکردن، بەڵام بۆچی لەگەڵ منا ئەوەیان کردبوو. دەبێ بۆ جاسوسیان بووبێت. ڕەوشم زۆر خراپ بوو، بەوە تووڕەو نیگەران ببووم. کە گەیشتمە زیندانی بریتوریا، منیان لەگەڵ ئەو کابرایە خستەوە یەک ژوور. ئەوەش زۆر تووڕەتری کردم. بۆ ئامادەکردنی فایلی دۆزەکەم، پێویستم بە ئارامی و تەنیایی هەبوو، بۆیە زوو داوام کردو ناچارم کردن لە یەکترمان جیابکەنەوە، لە کۆتاییدا هاتنە سەر ڕێ. هەفتانە دووجار بواری سەردانم هەبوو، گەرچی ڕێگاکە دووریش بوو، بەڵام وینی بە بەردەوامی دەهات و، جلی پاک و خواردنی خۆشیشی دەهێنا، ئەوەش نیشانەی دڵسۆزی و خۆشەویستی بوو. کە قەمیسێکی خاوێنم لەبەردەکرد، هەستم بە وەفاو خۆشەویستی دەکرد، دەمزانی سەفەر بۆ بریتوریاو لە ناوەندی هەفتەو بە ڕۆژو بەهەبوونی دوو منالی ساوا کە پێویستیان بەنازو پەروەردەیە، چەند زەحمەتە. برادەران زۆر هاتنە لام، بە تایبەتی خاتوو پیلای، ئەوەی ڕۆژانە ژەمی نیوەڕۆیان بۆ سازدەکردم.

خواردنی هەمەجۆری خۆش و بەتامم لەلا کۆدەبۆوە، ئەوەش وای لێکردم بەرامبەر ئەو گیراوانەی کەس سەردانی نەدەکردن و هیچیان بۆ نەدەهات، هەست بەشەرمەزاری بکەم، بۆیە سەرپێچی ڕێنماییەکانم دەکردو زۆربانم دەعوەت دەکرد. تا چاوی پاسەوانەکان قەپات بکەم، بەشی ئەوانیشم دەدا، جارێکیان سێوێکم دایە پاسەوانێکی ئەفریقی، بە مۆنیەوە وتی: نامەوێت..!

پاسەوانە ئەفریقییەکانیش خوی سپیەکانیان گرتبوو، ڕەوشی توندو نەرمیان دەنواند، حەزیان دەکرد چاویان لێ بکەنەوە. ڕۆژێکیان ئەفریقیەکە بینی سێوێکم دایە پاسەوانێکی سپی و وەریگرت، بۆیە ئەویش جاری دووەم سێوێکی لە دەستم وەرگرت. پاشان توانیم خواردن بەسەر گیراوەکانی تریش دابەش بکەم.

بەپێی ئاشی پروپاگەندەکانی ناو زیندانا، زانیم کەوا ولتریش گواستراوەتەوە بریتوریا، گەرچی لە یەکتری جیاکرابووینەوە، بەڵام هەواڵی یەکترمان دەپرسی و پەیوەندیمان هەر مابوو. ولتر داوای کردبوو بە کەفالەت بەربێت، منیش ئەوەم بەباش دەزانی، بەربوون بەکەفالەت لەناو شانەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بابەتێکی زۆر ناسک بوو. هەبوو، ئەوەی بە جۆرێک لاوازی دەزانی، یان ئاسانکارییەکانی یاسایان بە هەڵدەزانی. من بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبووم، وام دەزانی دەبێ هەموو حاڵەکان جیاجیا تەماشا بکرێن، کە ولتر بە سکرتێری گشتی حیزب هەڵبژێردرا، بڕوام وابوو کەوا پێویستە بەکەفالەت دەربچێت، چونکە ئەو ئەندامێکی گرنگ بوو بۆ کاری ڕێکخستنی حیزب. ناکرێ لە کونجی زیندانا بمێنێتەوە. لەو حاڵەتەدا کەفالەت



پرۆسەیەکی پراکتیکانەیە، نەک مەسەلەیەکی تیۆریی. حاڵەتی ئەو لە حاڵەتی من جیاوازبوو. من کاری نهێنیم دەکرد، ئەو ئەم کارەی نەدەکرد. من هێمای میللی یاخیبوون و خەبات بووم و ئەویش لە پشتی پەردەوە بوو. ولتر ڕازی بوو کەوا من بەکەفالەت بەرنەبم، چونکە لە هەموو حاڵەتەکانا ڕەزامەندی لەسەر ناکرێت، خۆشم نەمدەویست خەڵکەکە وام تێبگات کەوا بەرگەی ئاکامی ئوسلوبی کاری نهێنی ناگرم کە کردبوومە بەرنامەی خەباتی خۆم، لەگەڵ ولتردا ڕێکەوتین.

پاش ماوەیەکی تر دیسان گواسترامەوە زیندانی قەڵاتەکە لە جوهانسبیرگ، لە ئۆکتوبەر/ تشرینی یەکەم ڕۆژی دادگاییم دانرا. زیندان خەسڵەتی سنوورداری هەیە، بەڵام تەنیاییەکەی ناچارت دەکات خەریکی خوێندن و نووسین بیت. بۆ وەرگرتنی لیسانس لە یاسا بە نامە خەریک بووم، ئەوەش شەهادەیەکە بۆ بەخشینی پلەی مافی پارێزگاری لە دادگا. یەکەم کار لە زیندانا کردم، نامەیەکم بۆ بەرپرسانی زیندان نووسی، تێدا داوام کرد بۆ تەواوکردنی خوێندنم کتێبی تایبەتیم دەوێت، داوای کتێبی یاسای بەدکاری کەسایەتیم «یاسای تورتس» کرد، ئەمەیان کتێبێکی بەرنامەی خوێندنە.

پاش چەند ڕۆژێک عەقید ئوکامب بەرپرسی زیندانی بریتوریا، کە یەکێک بوو لە بەرپرسە ناوبەد و خراپەکارەکانی زیندانا، لێم بەژووریێ کەوت، بەزلی و نەفس بەرزی و فیزەوە، قسەی لەگەڵ کردم و وتی:

ماندێلا، تۆ ئێستا لەناو دەستی ئێمەدایت، کتێبی «بلێسەکان»ت بۆچییە. ناوی ئینگلیزییەکەی کتێبەکەیەو تورتس لە وشەی بلێسەکان نزیکە، دیارە دەتەوێت بۆ کارە تەخریبەکانت بەکاریان بهێنیت..؟!

لە مەبەستی نەگەیشتم هەتا وێنەیەک لە نامەکەمی دەرهێنا کە تێدا داوای کتێبی یاسای تورتسم کردبوو، کە بینیم، بزەم هاتێ، بەبزەکەم تووڕە بوو، وشەی تورتس، بەئینگلیزی لە وشەی تورتس بە زمانی ئەفریکانی نزیکە، کە واتای بلێسە دەگەیێ، ئەوەشیان بۆ تەقاندنەوە بەکاردێت، ئەوەیان ناوی کتێبەکە لە یاساو عەقیدم تێگەیاند، ئەویش بەتووڕەییەوە ژوورەکەمی جێهێشت.

لە حەوشەی زیندانا، ڕۆژێکیان غاردان و مەشقەکانی سویدیم دەکرد، پیاوێکی هیندی بالابەرزی کۆک کە ناوی موسا دیناس بوو، لێم هاتە پێش و وتی: ئەگەر داوایەک ئاراستەی بەرپرسان بکەم و داوا بکەم بۆ زیندانی نەخۆشخانەکەو نزیک تۆم دەگوازنەوە..!! لەبەرئەوەی موسا بەتاوانی فێڵبازی دوو ساڵ زیندان کرابوو و ناوبانگیشی باش نەبوو، بۆیە وام دەزانی

دەستەڵاتداران ئەوەی بۆ ناکەن، بۆیە وتم باشە، بەڵام وا دەرکەوت من بەهەڵەدا چووبووم، بەڕاستی جێگای سەرسوڕمان بوو کەوا پیاوێکی تاوانباری وەک موسا بهێننە تەنیشت کابرایەکی سیاسی وەک من، کە لە چاوەڕوانی دادگا، لەبەرئەوەی پێویستم بەهاوڕێیەک هەبوو و بۆیە هیچ لاریم نەنواند. لەبەرئەوەی موسا کابرایەکی دەوڵەمەند بوو پارەی هەبوو، بەپارەکەی چاوی ئەفسەرانی زیندانەکەی قەپات کردبوو ئیمتیازاتی زۆری هەبوو، وەک پۆشینی جلوبەرگی تایبەت بەگیراوی کەسانی سپی و خواردنیشی وەک سپییەکان بوو، لە ئیشی زیندانیشا ئازاد کرابوو.

شەوێکیان عەقید میناری سەرکردەی زیندان، ناسراو بە دۆستایەتی لەگەڵ ئەفریقییەکان هات، موسای بردە دەرەوەو تا بەیانی نەگەڕانەوە. ئەگەر بەچاوی خۆم ئەمەم نەدیبایە بڕوام نەدەکرد.

دیناسی سەربردەی سەیری لەمەڕ گەمەکردنی بە پارەو گەندەیی ئابووریی وەزیرەکان دەگێڕایەوە، ئەوانە بۆی سەلماندم کەوا نەژادپەرستی چۆن ژەهرێکە و سیماکانی رەوشت لە هەموو ئاستێکدا دەڕوخێنێت. نەوەک جاسوسی حکومەت بێت، باسی سیاسەتم لەگەڵدا نەدەکرد. جارێکیان وتی حەز دەکەم باسی سەفەرەکەی ئەفریقیام بۆ بکەیت، منیش خۆم لە بابەتەکە دزییەوە. زۆری کۆشش کرد زووتر ئازاد بێت بۆی مەیسەر نەبوو. بەڵام هەر توانی چوار مانگ پێش دوو ساڵەکەی دادگایەکەی بەرببێت. راکردن لە زیندانا دوو مەبەست دەپێکێت، یەکەمیان خەباتگێڕێکە و ئازاد دەبێت و دەکەوێتەوە کۆڕی خەبات، تین و تەوژمێکی گەرم دەداتە خەباتەکە، دووەمیشیان زەبرێکی پروپاگەندەش ئاراستەی دادگای دوژمن دەکرێت. بیرۆکەی راکردن لە زیندانا بەردەوام هاوبیرم بوو، لە سەردانەکانم بۆ نووسینگەی بەرپرسی زیندانەکە زۆرچاوم لە باڵاخانەکەی زیندانا دەگێڕا، تەماشای کلیل و قفل و دەرگاکان و جموجۆڵی پاسەوانەکانم دەکرد، نەخشەیەکی وردی باڵاخانەکەم کێشا. شوێنی نەخۆشخانەی زیندان و دەروازەکانم دیارکرد، نەخشەکەم رەوانەی دەرەوەکردو داوام لە بزاڤەکەمان کرد شرۆڤەی بکەن و پاشان بیفەوتێنن.

دوو پلان بۆ هەڵاتنم لە ئارادابوو، یەکەمیان لە بیرۆکەی موسا دیناس بوو، ئەوەیانم پشت گوێ خست. دووەمیان، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی نەخشەی بۆ کێشابوو. بەهۆی جوسلوفو پێم راگەیاندن. پلانەکەش بریتی بوو لە خۆگۆڕین و دروستکردنی کلیلی ژوورەکان و وەرگرتنی ریشێکی پان و درێژ لەناو چاکەتێک لە دەرەوەی زیندانا بۆم بێتە ژوورەوەو دانانی ریشەکە بۆ هاتنە دەرەوەم. جوان پلانەکەم شرۆڤەکرد بۆم ساغبۆوەو کەوا پلانەکە نەگەییوەو بواری سەرگرتنی کەمە. سەرنەگرتنیشی زەبرێکی کوشندە بەر رێکخستن دەکەوێ. لە دیدارێکمدا لەگەڵ جوسلوفودا



پێم راگەیاند، کەوا هێشتا «ئەمکا» ئامادە نییە ئەم کارە ئەنجام بدات و ئەم کارەش بە تیمێکی سەربازیش ئەنجام نادرێت. پێشنیارم کرد کەوا پلانەکە تا دوای دادگا دوابخەن و ئەوکاتە چاودێری و پێداویستەکانی کەم دەکرێتەوەو ئاسان دەبێت. لە کۆتاییدا وتم:

تکایە پاش خوێندنەوەی کاغەزەکە لە سێدارەی بدەن.

جوسلوو هاوڕێیەکان بە قسەیان کردم و پلانەکەیان دواخست، بەڵام کاغەزەکەیان وەک بەڵگەنامەیەکی مێژوویی هەڵگرت، لە رۆژێکی خراپدا بە رووممدا دادرایەوە. رۆژی دووشەممەی ١٥ی ئۆکتۆبەری **١٩٦٢** یەکەم دانیشتنی دادگاییم دەستی پێکرد، حیزبمان لیژنەی بەناوی «ئازادی بۆ ماندێلا» پێکهێنا، بۆ ئەم مەبەستەش چالاکی چاکیان ئەنجام داو. لەسەرانسەری وڵاتا دەوریان بینی و شعارەکانیان لە زۆر دیوارەکانا بینرا، حکومەت ویستی کۆبوونەوەکان قەدەغە بکات، بەڵام ئەوان سووربوون لەسەر چالاکییەکانیان و هەڵمەتەکەیان بەردەوام بوو، بڕیاردرا لە رۆژی کردنەوەی دادگاکەم لیژنەی «ئازادی بۆ ماندێلا» لە پێش دەروازەی دادگادا خۆپێشاندانێکی میللی گەورە ساز بکەن. بەرنامەیان وابوو لە هەردوو لای ئەو شەقامەی ئەو لۆرییەی کە منی تێدایە راوەستن. بەپێی ئەو راپۆرتانەی گەیشتبوونە دەستم و، لە چرپەی پاسەوانەکانمدا، زانیم جەماوەرێکی فراوان بەشداری دەکات. رۆژی دووشەممە، رۆژی دادگاییم بوو، ئەوان رۆژی شەممە هاتن و وتیان: خێرابە خۆت ساز بکە، دادگایەکەت لە بیریتوریا دەکرێت. زووتر ئاگاداریان نەکردمەوە، ئەگەرنا بە پاسەوانێکی هاوسۆزم هەواڵەکەم دەگەیاندە دەرەوەو پێم رادەگەیاندن، کەوا من لە جوهانسبیرگ دەگوازرێمەوە.

بزاڤەکەمان چالاکانە لەگەڵ گۆڕانەکە مامەڵەی کردو خۆی چاک سازدا، هۆڵی دادگاکە، کە کەنیسەیەکی کۆنی جولەکەکان بوو، پڕ دۆست و هەڤاڵانم بوو. لەو چوار ساڵەی دادگایی خیانەتەکەمدا، کە هەر لەو کەنیسەیەدا بەرێوەچووبوو، کەنیسەکە ببووە ماڵی دووەمم. لەبەرئەوەی راوێژکاری یاساییم جوسلوفوو بۆی نەبوو لە جوهانسبیرگ دووربکەوێتەوە، بۆیە نەیتوانی ئامادەبێت و لە جیاتی ئەودا پارێزەری پایەدار بوب هیبل جێگای گرتەوە.

بەیانی رۆژی شەممە بە جلوبەرگی ئاسایی کوسا، کە لە پێستی پڵینگە، لە جیاتی قات و ملپێچ، هاتمە ناو هۆڵی دادگاکەو ئامادەبووان هەڵسانەوە سەر پێیان و دەستیان بەرزکردەوەو سلاوی ئاسایی ئەفریقییان دەووتەوە: ئەمانلا و ئەنگاویتو «واتە» هێزو هێز بۆ ئێمە. شێوەی خۆنیشاندانەکەم سیحرێکی لەناو ئامادەبووان نواند. لەناویاندا ژمارەیەکی زۆری خزم و کەسوکاری

خۆم بوون، کە لەسەرووی ترانسکاییەوە هاتبوون، هەروەها وینیش بەجلوبەرگی ئاسایی کوساوە هاتبوو، کلاوەکەی سەری و کراسە درێژەکەی تا سەر چۆکان کوسایی لەبەربوو.

ئەو جلوبەرگە تەقلییدیەم لەبەرئەوە لەبەرکرد، تا بیسەلمێنم کەوا منی رەشی ئەفریقی، وا لە دادگایەکی پیاوانی سپیدا دادگایی دەکرێم. مێژوو و کەلتوورو رۆشنبیری نەتەوەکەمم لەسەر شان بوو. لەو کاتانەدا هەستم کرد کەوا نەتەوەی ئەفریقی و دوێنی پاک و ماندوو و دوا رۆژی نادیاریشی دەدوێنم. لەبەرکردنی پیستی پڵینگ و ناوزڕاندنی دیمەنەکانی یەکسانی سپیەکانی دەگەیاند. دەمزانی دەرکەوتنم بەو پۆشینە ئەفریقییە دەستەڵاتداران وەک چۆن کەلتوورو و شارستانیەتی ئەفریقی دەیانترسێنێت، ئەوەش ئاوا دەیانترسێنێت.

هۆڵەکە هێمن بۆوەو دانیشتنەکە کرایەوە، سڵاوێکی رەسمیم ئاراستەی پارێزەری داواکار بەرێز بۆش کرد، ئەوەش لە رۆژانی پارێزەریمدا فێری ببووم. هەروەها سڵاویشم لە بەرێز فون هیردنی دادوەریش کرد ئەویشیان بۆ من غەریب نەبوو. داوام کرد دادگایەکەم دوو هەفتە دوابخەن، بیانووشم ئەوە بوو کەوا بەبێ ئاگادارکردنەوە منیان هێناوەتە بریتۆریا، بواریشم نەبووە تیمی تایبەت بە بەرگریم ئامادە بکەم. دادوەرەکە داواکەمی بۆ یەک هەفتە دواخستن قبووڵ کرد. لە رێگای گەڕانەوەمدا بۆ ژوورەکەم، یەکێک لە پاسەوانەکان بەشڵەژاوییەوە هات و، وتی: بەرپرسی زیندان عەقید جایکوبز فەرمانی کردووە جلە تەقلییدیەکەت بدەیتە ئەو. منیش وتم:

دەتوانی پێی رابگەینیت جلەکانم نادەم.

پاسەوانەکە لەرزی گرت و لێم پاڕایەوەو داوای پێستە پڵینگەکەی دەکردو وتی:

ئەگەر پێستەکە نەبەم لە کارەکەم دەردەکرێم، دڵم پێی سوتاو وتم:

چاک گوێم لێ راگرەو برۆ بەگەورەکەت بڵێ، ماندێلا وای وت، نەک تۆ..!!

پاش کاتێکی کورت عەقید جایکوبز خۆی هات و داوای «بەتانیەکەی» کرد، وەک ئەو ناوی لێنا. وەڵامم دایەوەو وتم: هیچ دەستەڵاتێ ناتوانێ، کەسێ ناچار بکات لە هۆڵی دادگا چی لەبەر بکات، ئەگەر بە زۆریش لێم بستێنیت، ئەوا لە دادگای باڵا شکایەتت لێ دەکەم. بۆیە عەقید نەیتوانی چیتر داوای «بەتانیەکە» بکات و دەستەڵاتدارانیش بواریان دام تەنیا لە هۆڵی دادگادا دەتوانی ئەم جلە لەبەربکەیت. تا سۆزی خەڵکانی تر گەرم و بەجۆش نەکەیت بۆت نییە لە دەرەوەی هۆڵەکە لەبەریان بکەیت.

پاش هەفتەیەک دادگایەکەم دەستپێکرد، بواریاندا پێش مرافعەکە قسە بکەم و وتم:



تکایە بوار بدەن ئەوە روون بکەمەوە کەوا ئەم دۆزە، دادگاییکردنی ویست و خواستەکانی میللەتی ئەفریقیایە. ئەوەش وای لێکردم خۆم بەرگری لە خۆم بکەم. مەبەستم بوو بەدادگا و چاودێران و رۆژنامەنووسان رابگەینم کەوا من دەوڵەت دادگایی دەکەم. پاشان داوام کرد دادوەرەکە داگرن، چونکە من لەڕووی ئەخلاقییەوە ملکەچی ئەو بریارانە نیم کە لە پەرلەمانێ دەرچووبێت من نەتوانم نوێنەرایەتی تێدا بکەم. لە دادگایەک دادوەرێکی سپی سەرۆکایەتی بکات دادپەروەری تێدا نابێت. هەروەها وتم: ئەوە چ جۆرە دادگایەکە کەوا من دادگایی دەکات...!! چۆن دادوەری تێدا دەبێت..؟؟ ئەگەر دادوەرەکەو داواکارم هەر سپی بن، پاسەوانیشم هەر سپی بێت، دەبێ کەسێ بروا بکات، لەم دادگایەدا داد پەیڕەو بکرێت، کێ بروا دەکات..؟؟!!

چ نهێنییەک لەوەدایە، پیاوێکی ئەفریقی لە مێژووی ئەم وڵاتەدا لەلایەن دادپەروەرانی هاوخوێن و هاورەگەزی خۆیەوە دادگایی نەکراوە..!! بەرێزان ئیمرۆ من ئەم نهێنیەتان بۆ ئاشکرا دەکەم، ئامانجی سەرەکی ئەو نەژادپەرستییە چەسپاندنی ئەو دادپەروەرییە کە لە چوارچێوەی سیاسەتی دەوڵەت بخولێتەوە، ئەگەر هاوشانی یاساو رێنماییەکانی دادگایانی وڵاتانی پێشکەوتوو نەبیت، بەرێزان من دژی هەموو جۆرێکی سیاسەتی نەژادپەرستیم، بەدرێژایی ژیانم شەڕم کردووەو ئێستاش شەڕی دەکەم، هەتا لە ژیانیشدا بم شەڕی هەر دەکەم. من رقم لەو رەوشەی ناو ئەو هۆڵەیەو چونکە لێرە هەست دەکەم کەوا پیاوێکی رەش لە دادگای پیاوانی سپیدا دادگایی دەکرێت، دەبوایە ئەوەشیان نەبوایە.

داواکار نزیکەی سەد شاهیدی لەسەرانسەری وڵاتا ئامادەکردبوو، لە ترانسکای و لە خوارووی ئەفریقیاش هاتبوون. لەوانە پۆلیس و رۆژنامەنووس و مودیر ناحیەو کرێکاری چاکیشیان هێنابوو. زۆربەیان بەشێوەیەکی هونەری سەلماندیان کەوا من بەشێوەی نایاسایی سەفەرم کردووەو، کرێکارانی ئەفریقیم بۆ سێ رۆژ مانگرتن و مانەوەیان لە ماڵەکانیانەوە لە مایو/مایسی ١٩٦١دا هان داوە. لە راستیدا نەمدەتوانی بەرپەرچی گومانەکان بدەمەوەو وەڵامی مەعقولیشم نەبوو.

داواکار داوای بەرێز بارناردی سکرتێری تایبەتی سەرۆک وەزیرانی کرد، تا شاهیدیم لەسەر ئەو نامە تایبەتیە لەسەر بدات، کە ئاراستەی سەرۆک وەزیرانم کردبوو، کە تێدا داوام کردبوو، کۆنگرەیەکی نیشتمانی گشتی ساز بکرێت، ئەگەرنا سێ رۆژان مان دەگرین. نامەکە خوێندرایەوەو ئاشکرابوو کەوا داوای کۆنگرەیەکم کردووەو نوێنەری هەموو توێژەکانی میللەتی خوارووی ئەفریقیای تێدابێت و لەم کۆنگرەیەدا دەستوورێکی بێ نەژادپەرستی بۆ وڵات دابنرێت. پاشان

پرسیارکردن لە بارنارد دەستی پێکرد.

ماندێلا، نامەی ئاراستەی سەرۆک وەزیران کردبوو...؟؟

شاهید: بەڵێ وای کردبوو.

سەرۆک وەزیران وەڵامی نامەکەی دایەوە...؟؟

شاهید: نەخێر وەڵامی خاوەنەکەی نەدایەوە. ماندێلا: باشە، سەرۆک وەزیران وەڵامی نامەکەی نەدایەوەو هاوبیری لەگەڵما کە نامەکە پابەندی بابەتی گرنگی بۆ زۆرینەی خەڵکی ئەم وڵاتە دەگەیاند.

شاهید: نەخێر هاوبیرت نیم.!!

ماندێلا: هاوبیرم نیت.! مافی مرۆڤ و ئازادییە مەدەنییەکان بایەخی زۆرو کاریگەری زیندووی هەیە بۆ میللەتی خوارووی ئەفریقیا.؟

شاهید: ئەوانە راستن.

ماندێلا: ئەو مەسەلانە لە نامەکەدا باسیان کرابوو.!؟ شاهید: بەڵێ. وا دەزانم.! ماندێلا: کەواتە تۆ هاوبیرمی، کەوا ناوەڕۆکی نامەکەم تایبەت بوو بە مافی ئازادییە مەدەنییەکان و هی تر..

شاهید: بەڵێ، نامەکەت لەو بابەتانە دەدوا.

ماندێلا: ئەوەش دەزانی کەوا ئەفریقییەکان لەو مافانە بێ بەشن، وایە یان نا.؟ بێ بەشن لە بەشدارکردنیان لە دەستەڵات.

شاهید: لە هەندێک لەو مافانە...!

ماندێلا: لە پەرلەمانا ئەندامی ئەفریقی نییە.

شاهید: ئەوەیان راستە.

ماندێلا: بۆ هیچ ئەفریقییەیەک نییە خۆی بۆ جڤاتی هەرێمی و شارەوانی کاندید بکات.

شاهید: راستە..

ماندێلا: لەم وڵاتەدا ئەفریقییەکان مافی دەنگدانیان نییە...؟

شاهید: مافی دەنگدانیان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانا نییە. ماندێلا: بەڵێ، منیش مەبەستم ئەوەیە، من پەرلەمان و دەزگا حکومییەکانی دەوڵەت و جڤاتی هەرێمەکان و ئەنجوومەنی شارەوانییەکان، لە هەموویان مافی دەنگدانیان نییە، ئەفریقییەکان ئەم مافانەیان نییە.



شاهید: بەڵێ، راستە.

ماندێلا: کەواتە هاوبیری منی کەوا دەبێ سەرۆک وەزیرانی وڵاتێکی پێشکەوتوو لە جیهانا، وەڵامی نامەیەک بداتەوە ئەگەر باس لە کێشەی زۆرینەی میللەت بکات، ئەگەرنا هەڵوێستێکی شەرمەزارییە...!

هاوبیرمی...؟!

شاهید: نەخێر، هاوبیرت نیم.

ماندێلا: هاوبیرم نیت، کەوا سەرۆک وەزیران نامەیەکی پەیوەست بەبابەتی زۆر زیندووی ژیانی زۆرینەی هاووڵاتیانی وڵاتەکەی پشتگوێ بخات، شتێکی شازو ناسروشتییە.

شاهید: سەرۆک وەزیران نامەکەی پشت نەخستبوو.

ماندێلا: تکا دەکەم تەنیا وەڵامی پرسیارەکە بدەرەوە، بە بۆچوونی تۆ کە سەرۆک وەزیران وەڵامی نامەیەکی تایبەتی و پەیوەست بە زۆرینەی خەڵک نەداتەوە، هەڵە نییە..؟

شاهید: سەرۆک وەزیران بەدەنگ نامەکەوە هاتبوو.

ماندێلا: بەڕێز برنارد، حەز ناکەم رەوشتم لەگەڵتا خراپ بێت، تکایە خۆت ناچار بکە تەنیا وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە. پرسیارەکەم ئەوەیە، ئایا رەواو جوانە سەرۆک وەزیران وەڵامی نامەیەکی پەیوەست بەبابەتی زیندووی زۆرینەی هاووڵاتیانی وڵاتەکەی نەداتەوە.

بەڕێز برنارد هەرگیز هاوبیرم نەدەبوو، هەر ئەوەندەی وت، کەوا ناوەڕۆکی نامەکە بۆنی دوژمنایەتی لێ دەهات و بەبێ ئەدەبی نوسرابوو. بۆیەش سەرۆک وەزیران وەڵامی نامەکەی نەدایەوە.

لەکاتی دانوستانەکاندا، داواکارو دادوەر زۆریان کرد کە من ژمارەی ئەو شاهیدانەیان پێ بڵێم کە بانگی دادگایان دەکەم. من هەموو جارێ دەمووت ژمارەی شاهیدەکانم بەقەد ژمارەی شاهیدەکانی داواکارەو زۆرترن. کە داواکار دۆزەکەی تەواوکرد، هۆڵەکە هێمن بوو، هەموو چاوەڕێی مرافعەی بەرگری بوون. هەڵسامەوە سەرپێ، لە جیاتی ئەوەی شاهیدی یەکەم بانگ بکەم، بەهێمنی وتم: من هیچ شاهیدێ بانگ ناکەم و فایلی بەرگریش دادەخەم دەنگە دەنگێ لەناو هۆڵەکە پەیدابوو و پارێزەری داواکار بەسەرسامییەوە وتی: ئەی خودایە!!

هەر زوو فێڵم لە دادگا کردو زانیم لە هەموو شت باشترو بە سوودترین بڕیار ئەوەیە تاوانی راست ئاڕاستەی دەوڵەت بکەم و ئەوەش ئاماژەیەکی بەهێزە، پێویستم بەشاهیدی بەرگری و

سەلماندنی بێ تاوانیم نابێ کە پرسیارم لە شاهیدەکانی داواکار کرد، دادوەرم وەک سەرۆک دادگاش بەرگری کرد کەوا لە ئەسڵدا شتە راستییەکان دانوستانیان لەسەر نییە.

دادوەر بەبڕیارەکەم سەرسام بوو و وتی:

قسەی ترت ماوە بڵێیت..؟

نەخێر جەنابی دادوەر، من دەڵێم و دان بەوە دەنێم کەوا من هیچ تاوانێکم نەکردووە.

هەر ئەوەندەت پێیە.؟!

جەنابی دادوەر ئەگەر شتی ترم هەبوایە دەمووت. پارێزەری دادوەر کاغەزەکانی بۆ نمایشی کۆتایی دۆزەکە داوەشاند، کە مەزندەی کاتی پێ نەدەکرا. وتارێکی کورتی ئاراستەی دادگا کردو داوای کرد کەوا بە دوو دۆزەکە سزابارم بکەن. بۆ رۆژی دوایی دانیشتنەکە دواخرا، پێش بڕیارەکەی دادوەر لە دۆزەکە بوارم درا وەک دەڵێن بۆ بەرگری سوککردنی سزاکە خۆم سازبکەم.

بۆ بەیانییەکەی، پێش دەستپێکردنی دانیشتنەکەی دادگاو لە نووسینگەیەکی بچووکی هۆڵی دادگا، لەگەڵ راوێژکاری یاساییم بوب هیبل لەمەڕ ئەو بڕیارەی کە رۆژی پێشترو بۆ یەکەم جار لە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ دانانی سزاکان لەسەر خوارووی ئەفریقیادا دەرچووبوو، دانوستانێکمان کرد. هەروەها بوب پێیراگەیاندم کەوا لە دژی دادگاییکردنی من و لە خۆشی بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بورت ئەلیزابێت و دوربان، چەندین کاری تەقاندنەوەیان ئەنجام داوە. لەو کاتانەدا، پارێزەری داواکار بەڕێز بوش لێمان بە ژوورێ کەوت، داوای لە بوب کرد تەنیا جێمان بهێڵێت. کە بوب لە ژوورەکە دەرچوو وتی:

دەزانی ماندێلا، ئیمرۆ نیازم نەبوو بێمە دادگا، دەزانی یەکەم جارە رقم لە کارەکەم دەبێتەوە، ژان دەمگرێت، کە داوا لە دادگا دەکەم تۆ بە زیندان دادگایی بکرێیت. دەستی بۆ دەستکوشینم درێژ کردو هیوای خواست شتەکان بەجوانی بڕوات. سوپاسی هەڵوێستی پاکیەکەیم کردو دڵنیام کرد کەوا ئەم هەڵوێستەم لەبیر نەچێت.

دەستەڵاتداران لەبەر زۆربوونی ئامادەبووان چاک خۆیان سازدابوو، ئەو سەدو پەنجا کورسیەی کە تایبەت بوون بەکەسانی نائەوروپی هەمووی گیران. وینی بەجلوبەرگە تەقلیدییەکەی خۆی و چەند خزم و کەسێکیشم کە لە ترانسکایەوە هاتبوون، ئامادەبوون. لە دەرەوەش سەدان خۆپیشاندەرانیش راوەستابوون و بەقەد ئەوانیش پۆلیسی لێبوو.

کە لە هۆڵەکە چوومە ژوورەوە، دەستم بۆ سڵاوی ئاسایی ئەمانیلا «هێز» بەرزکردەوەو



ئامادەبووانیش بە نگاویتو «هێز بۆ ئێمە» وەڵامیان دامەوە، دادوەرەکە چەکوچەکەی دەستی لە مێزەکە دا و فەرمانی بێدەنگی دا، کە بێدەنگ بوون. بەکورتی تاوانەکانم خوێندرایەوە داوام لێکرا قسە بکەم.

بۆ سووککردنی سزاکەم یەک سەعات بەرگریم کرد. دووانەکەم بەرگری نەبوو، ئەوەندەی دووانێکی سیاسی بوو. حەزم دەکرد بۆ دادگای روون بکەمەوە، هۆکارو هاندەرەکان چین کەوا منی تووشی ئیمرۆ کرد، بۆچی ئەم کارانەم ئەنجام داوە، هەروەها پێیان بڵێم، ئەگەر بوارم بۆ بڕەخسێتەوە جارێکی تریش ئەو چالاکییانە دەکەمەوە، ئەمەی خوارەوەم لە وتارەکەمدا هاتبوو.

چەند ساڵێک پێش ئێستا، کە مێرد منداڵ بووین، لە گوندەکانمان لە ترانسکای، زاناکانمان چیرۆکی خۆشی رۆژانی پێش هاتنی سپییەکان بۆ هەوارەکەیان بۆ دەگێڕاینەوە. ئەوکاتانە خەڵکەکە لەژێر سێبەری دیموکراسی مەلیکەکان و دارودەستەکانیان ئاشتیانە دەژیان و ئازادانەو بەبێ چاودێری و پشکنین لە سەرانسەری وڵاتا دەسووڕانەوە، وڵاتەکە بەدڵ و بەگیان موڵکی خۆمان بوو، لەسەر ئەرزەکەی و لەناو دارستان و رووبارەکانیدا دەژیاین و گەنجینەی زۆرمان لە کانزاکان لەژێر قومدا دەردەهێنا. لەم وڵاتە جوانەدا گەنجینەی زۆرمان هەبوو. حکومەتمان دامەزراندبوو حوکمی خۆمان دەکرد، سوپا و بازرگانی و پیشەمان هەبوو. زاناکان سەروەری و شەڕی داگیرکەرو دوژمنانیان بۆ دەگێڕاینەوە.

رژێمی ئەفریقی کۆنتان لەم وڵاتەدا بنبڕکرد. رژێمەکە کاریگەری قووڵی لەسەر بیردۆزی سیاسی و گەشەکردنی مندا هەبوو. زەوی تاکە وەسیلەی سەرەکی بەرهەم بوو بۆ گوندەکە، ئەویش موڵکی تاکە کەس نەبوو، موڵکەکە موڵکی هەموو خەڵکی گوندی بوو. جاران لە ناو کۆمەڵدا یەک چین هەبوو. هەژار و دەوڵەمەند نەبوو، کەس کەسی نەدەچەوساندەوە. بنچینەی یاسا و دادپەروەری لە سەر ئەساسی یەکسانیدا بوو. لە دەستوری جڤاتدا بە ئەمبیز و بیتسوو یان بە کغوتلا دەناسرا و هەر ئەوەش حوکمی عەشیرەتی دەکرد. جڤاتەکە ئەوپەڕی دیموکراسی بوو، هەموو پێکەوە کاروباری عەشیرەتەکەیان بەڕێوەدەبرد. پێشەوا و خەڵک و شەڕکەر و پزیشک، هەموویان لە جڤاتەکەدا بەشداربوون و کاریگەرییان هەبوو. جڤاتەکە کێش و دەستەڵاتی وای هەبوو کەوا عەشیرەت بۆی نەبوو بێ ئەو بڕیارێ بدات، یان لە یەکێکیان پەشیمان بێتەوە.

لەو کۆمەڵگایەدا سادەیی و شڵەژانی زۆر هەبوو، هەموو پێویستییەکانی رۆژانە جێبەجێ نەدەکران، بەڵام تۆی دیموکراسی شۆڕشگێڕ هەبوو، کەس کۆیلەو ژێردەستی کەسێ نەبوو و لەم

رۆژانەداو لەو رژێمەدا، برسیەتی و ترس و پێویستییەکان گوم دەبوون. من و هاورێکانم تا ئیمڕۆش و لەبەر رۆشنایی ئەم مێژووەدا خەبات دەکەین و ئەوەش سەرچاوەی سیاسیمانە.

بۆ دادگام روونکردەوە بۆ هاتوومەتە ناو حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، ئەو حیزبەی بە سیاسەتی دیموکراسی و ئەنتی نەژادپەرستییەکەی لە ناو هەڵوێست و ویستەکانمدا جێگای کردبۆوە، هەروەها باسی ئەو ئەستەم و تەگەرانەم کرد کە هاتوونەتە پێشم بۆ راگرتنی نێوان ئیلتیزامم بە یاسا و رازیکردنی ویژدانم. بۆیە وتم:

کەسی ئەفریقی لەم وڵاتەدا لە بەربەرەکانێدایە لە نێوان ویژدانی خۆی و یاسادا. ئەمەشیان هەر لە خوارووی ئەفریقیادا نییە، بەڵکو لە هەموو شوێنێک ویژدان و هزر و رامان و سۆز هەبێ گەشە دەکات. لە بریتانیای سەردەمدا، پیاوێک لە لایەن نەتەوەکەی خۆیەوە زیندانی کرا. ئەویش، برتراند رسلی گەورەترین فەیلەسووفەکانی خۆرئاوای سەردەم بوو، وەک من چۆن ئێستا لە بەردەمتان دادگایی دەکرێم لەسەر ئەوەی ویژدانم وا دەخوازێت، ئەگەرچی سەرپێچی یاساشم کردووە، ئەوەش لە سەر داوای ویژدانم بووە. ئەویش بۆ رازیکردنی ویژدانی بوو، کە بینی حکومەت چەکی ناوەکی پەیرەو دەکات، دادگایی کرا. ئەوا من و زۆر ئەفریقی تر وەک من دووچاری ئەم ئاکامە هاتووین، ئەم یاسایەی کە حکومەتی حیزبی نیشتمانی پەیرەوی دەکات، بە هزری ئێمە یاساکە دوورە لە رەوشت و ناکرێ قبووڵ بکرێت. ویژدانمان داوامان لێدەکات سەرپێچی بکەین و کۆشش بۆ گۆڕانی بکەین. سروشتی ئادەمیزاد وایە ناتوانێ دەستەوەستان بێ و هیچ نەکات و چالاکی دژیان نەبێ. بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی لە کۆمەڵگایەکی بەخێرو ژیانێکی ئاسوودە بژیت، دەبێ دژی ئەو زۆردارییە خەبات بکات، چەندی لە دەستەڵاتا بێ دژایەتییان بکات.

زۆرم بۆ ژماردن کە چۆن حکومەت بە هۆی یاساوە ژیانی پێشێلکردووم و کاری سیاسی و پیشەییم تەگەرەی هاتیتەپێش، بە گەف و بە گرێدان و دادگایی زۆر ترسێنراوم. بەپێی یاسا من تاوانبارم و تاوانەکەم ئەوەیە ئەوەی بڕوام پێیەتی رامان و ویژدانم پێیان راستە و کردوومە. جێگای سەرسوڕمانە مرۆڤ لەسەر ئەو راستییانە راو بنرێت. لەبەر ئەوانە بە شاراوەیی بژیت و چەند مانگێک ژیان بە قاچاغی بەسەرببات، وەک چۆن لە فایلەکانی پێش ئەم دادگایە ریزکراون.

ئەو ماوەیەی لە خێزان و منالەکانم دووربووم ئاسان نەبوو، چەند خۆش بوو ئەو رۆژانەی پاش کارکردنێکی زۆر و ماندووبوون دەگەڕامەوە ناویان و بەیەکەوە لەسەر یەک خوانی خواردن دادەمەزراین، لە جیاتی ئەوانە، لە لایەن پۆلیسەوە راو دەنرام و لەسەر خاکی خۆما چاودێری دەکرام



و بۆ گرتنم کۆششیان دەکرد. ئەم ژیانەم لە ژیانی ناو زیندان زەحمەتتر بوو. بڕوا ناکەم کەسێکی ژیر هەبێ بە رەزامەندی خۆی ئەم ژیانە هەڵبژێرێت و پێی رازی بێت و واز لە ژیانی ئاسایی خۆی لە ناو خێزان و کۆمەڵەکەی لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو بێنێت..!! بەڵام، رۆژێ دێ مرۆڤ بێبەش دەبێ، وەک من بێبەشم، لە ئاسوودەیی ژیانی رۆژانە و یاسا لە لایەن حکومەتەوە بەکارهاتووە بۆ راونانم، وازناهێنن بژیم. ئەو جۆرە ژیانەشم بە ئازادی خۆم هەڵبژاردووەو پەشیمانیش نیم. ئەوەش ئاکامی ژیان و دوارۆژی هەر کەسێک دەبێ ئاوا تەماشای ژیان بکات و دەکەوێتە ژێر فشاری زوڵمی پۆلیس و دەزگاکانی تری داپلۆسێنەری حکومەت.

چەند جار داوامان ئاراستەی حکومەت کرد سەبارەت بە زوڵم و بێبەشیمان. هەموویانم لەبەردەم دادگادا باسکرد، ئاماژەم بە مانگرتنەکەی ساڵی ١٩٦١ز دا کە دوا چارەسەر بوو، بۆ بە دەنگهاتنی حکومەت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەمان. حکومەت توندوتیژی بەرامبەر داوای ئاشتیمان بۆ چارە سەرکردن بەکارهێنا، هەروەها بۆم روونکردنەوە، کەوا حکومەت بەرپرسیارە لەوەی کە ئێمە هەڵوێستی توندمان نواندووە. شانازیم بە ژیانی سیاسی و خەباتەکەم راگەیاند هاوکاریشم بە چالاکی و هێز ودانایی خەڵکی تر بەرز نرخاند. زۆری وەک من لەسەر بیرو باوەڕ نرخەکەیان گراندا، زۆریش باجی گران دەدەن.

بە دادگام وت: پێش ئەوەی چ بڕیارێ دەربکەن، هیچ کاریگەری لە خەبات و بەردەوامیم ناکات. بەڕێز جەنابی دادوەر، حەز دەکەم ئەوە چاک بزانی، ئەو سزایەش ئاراستەی من دەکرێت، ناتوانی پیاوان راگرێت، ئەوانەی هەست دەکەن لەسەر رێگای راستن، مێژووش شاهیدە کەوا سزا ناتوانێ پیاوانی بە ویژدان لەو مەسەلانە بڕەوێنێتەوە، هەروەها وتم، رۆڵەکانی میللەتەکەم و هاورێیانی خەباتم سزاکان کاریگەریان لێ ناکات.

ئەگەرچی دەزانم رەوشەکانی ناو زیندان لەم وڵاتەدا بۆ هاووڵاتی ئەفریقی زۆر دژوار و زەحمەتە، سەرەڕای ئەوانەش ئامادەم هەر سزایەکم بەرامبەر بکرێت قبووڵی بکەم. لەو زیندانەدا ژیاوم و دەزانم دەرحەق بە ئەفریقییەکان لە پشت شیشبەندەکانیشەوە چ جۆرە نەژادپەرستییەک پەیرەو دەکرێت. سەرەڕای ئەوانەش هیچ شتێ من و هاورێکانم لەم رێگایەدا لار ناکاتەوە. ئازادی بۆ وڵاتەکەیان دوا لوتکەی مەبەستی پیاوانەیەو هیچ هێزێ نەکارێت بڕواکانیان تەسک بکاتەوە. رەوشی خراپی هاووڵاتیانم لەم وڵاتەدا وام لێدەکات لە رەوشە بۆگەنەکانی ناو زیندانا نەترسێم.

جەنابی دادوەرو ئەم دادگایە هەر چیم بۆ ببڕێتەوە، کە تەواو بوو، وەک پیاوانی خاوەن مەسەلە

دووباره دەگەڕێمەوە سەر ئەو ڕێبازە و ویژدانی خۆم ڕازی دەکەم. ڕقم هەر لە نەژادپەرستییە. ئەگەر لە زیندانا ئازاد بکرێمەوە خەبات دەکەم تا ئەو زوڵمە بەیەکجاری بنبڕ بکرێت.

ئەرکی خۆم بەرامبەر میللەتەکەم و ئەفریقیا جێبەجێ کرد، گومانم نییە مێژوو دەگێڕێتەوە، کەوا من بێتاوانم و ئەندامانی حکومەت دەبێ لەبەردەم ئەو دادگایە وەک تاوانبار ڕاگیرێن؟

کە تەواو بووم، دادوەرەکە بۆ ماوەی دە دەقیقە، بۆ دوا دووانی دادگا دانیشتنەکەی داخست، پێش دەرچوونم لە هۆڵەکەدا نیگایەکم لە خەڵکەکە کرد، گومانم لە سزاکەم نەبوو. پاش دە دەقیقە لە کەشێکی توند و ئاڵۆز دادوەر حوکمەکەی ڕاگەیاند. ئەویش، زیندانی سێ ساڵ، لەبەر ئەوەی خەڵکی بۆ مانگرتن هانداوە. دووساڵیش زیندانی لەبەر ئەوەی بە قاچاخ وڵاتی جێهێشتووە. واتە پێنج ساڵ و بێ لێبووردن. بۆیە هاتو هاوارێک لە ناو هۆڵەکەدا بەرز بۆوە. دانیشتنەکە تەواو بوو، سزاکە توندبوو، هەڵسامەوە سەرپێیان و سڵاوی ئاساییم بۆ ئامادەبوان کردو وتم «ئەمانلا» ئەمەم سێ جار وتەوە. جەماوەرەکەش بەیەکەوەو لەناکاوا سروودی نیشتمانی ئەفریقیایان «خودایە ئەفریقیا بپارێزە» یان وتەوە. گۆرانی وتراو هەلهەلە لێدراو خەڵکەکە کەوتنە سەما، ئەوانە لە بیریان بردمەوە کەوا بەرەو زیندان دەچم. یەکەم ئەفریقیم لەسەر چالاکی سیاسیم بۆ درێژترین ماوە بە زیندان دادگایی دەکرێم.

بوارم درا بە کورتی ماڵئاوایی لە وینی بکەم، ئەمجارە ورەی بەرز بوو، فرمێسکی لە چاوان نەهات نیگەرانی و خەمی پێوە دیار نەبوو، بڕوای زۆر بە خۆی هەبوو. وینی بەڕاستی هاوڕێی خەباتم بوو، نەک هاوسەر. سوور بوو لەسەر ئەوەی هانم بدات و ورەم بەرز بکاتەوە. بینایەی دادگام بە لۆرییەکی داخراوی پۆلیس جێهێشت و جەماوەرەکەش بە گۆرانییەوە دەیانووت: خودایە ئەفریقیا بپارێزە.

زیندان تەنیا ئازادی لە مرۆڤ زەوت ناکات و بەس. بەڵکو ناسنامەکەشی لێ وەردەگرێتەوە. هەموو کەسێک هەمان پۆشاک دەپۆشن، وەک یەک خواردن دەخۆن و ڕۆژانە بە هەمان بەرنامەی ڕۆتینی بەڕێ دەکەن. ڕژێمی زیندان داپلۆسینی زۆردارانەیە و سەربەخۆیی ناخوازێت. کەسایەتی لە یەکتری جیاناکاتەوە. لەبەر ئەوەی کەسی شۆڕشگێڕ مرۆڤێکە دژ بە زۆرداری خەباتی کردووە و لەبەر ئەوەی مرۆڤە و دەبێ بەرهەڵستی زۆرداری زیندان بکات نابێ زیندان وای لێ بکات لەو ڕەوشتانە داماڵێت.

ڕاستەوخۆ لە دادگاوە گوازرامەوە زیندانی بریتۆریای ناوخۆ، ئەو باڵەخانە ناشیرین و



ڕەزاقورسەم چاک دەناسی. ئیمڕۆ وەک گیراوێکی حوکمدار هاتووم، نەک وەک تاوانبارێک چاوەڕێی دادگا بکات، بە ناشیرینی و بەدفەڕییەوە وەرگیرام. جلوبەرگەکەم داکەند. لە دواجارا عەقید جایکوبز توانی جلە تەقلیدییەکەم وەرگرێت. بەدلەی تایبەت بە گیراوی ئەفریقیم بۆ تەرخانکرا. بەدلەکەش بریتی بوو لە دوو شەروالی کورت و قەمیسێکی خاکی دڕ و چاکەتێکی قوماش و جووتێ گۆریە و پێڵاوێکی سەندەل و کڵاوێکی قوماش. جلی ڕەسمی گیراوی ئەفریقی وایە. بە مناڵیان دەزانن بۆیە شەرواڵی کورتیان دەدەنێ.

بە دەستەڵاتدارانم وت، من بە هیچ جۆرێ بەم شەرواڵە کورتانە ڕازی نیم و ئامادەم لە دادگا شکایەت بکەم. کە کاتی خواردنی ئێوارە هات، ئاردی شۆپانی تێکەڵ بە شیری ساردم نەخوارد. عەقید جایکوبز بیری لە مەسەلەکە کردەوە. پێشنیاری ئەم چارەسەریەی کرد: دەتوانی شەرواڵی درێژ لەبەر بکەیت و خواردنی تایبەتی بخۆیت، بەڵام بە مەرجێ لە گیراوەکانت جیادەکەینەوە، بە گاڵتەوەش وتی: بڕیار بوو لەگەڵ گیراوە سیاسیەکانا بمێنیتەوە. بەڵام بەڕێز، وا خۆت تەنیاییت هەڵبژارد. داوا دەکەم زەوق لە زیندانە تاکە کەسیەکەت وەرگریت. وتم تەنیایی زیانی نابێت، ئەگەر بە ئارەزووی خۆم بخۆم و لەبەر بکەم. چەند هەفتەیەک تەنیا ژیام و کەسم نەبینی و گوێم لە دەنگی هیچ گیراوێکیش نەبوو. ڕۆژانە بیست وسێ سەعاتیش تەنیا بووم و نیو سەعاتیش ڕاهێنانی وەرزشی بەیانیان و نیو سەعاتیش ڕاهێنانی ئێوارانم دەکرد. لەبەر ئەوەی هەرگیز تەنیا نەژیابووم بۆیە هەر سەعاتێکم بە ساڵێک بوو. لە ژوورەکەمدا ڕووناکی سروشتی نەبوو، تاکە گڵۆپە کارەباییە یەتیمەکە کە بیست و چوار سەعات داگیرسابوو، تاکە ڕووناکیم بوو. چونکە سەعاتیشم نەبوو، بۆیە زۆرجار شەو و ڕۆژم لێ تێکدەچوو. هیچم نەبوو بیخوێنمەوە و هیچیشم نەبوو پێی بنووسم، کەسم لە دەورو پشتا نەبوو، قسەی لەگەڵدا بکەم. عەقڵی مرۆڤ لەو ڕەوشەدا جام دەکات و حەز دەکات بە شتێک سەرقاڵ بێت لە بازنەی کەسایەتی خۆی دوورکەوێتەوە. دەزانم مرۆڤ هەیە دارکاری لە تەنیایی لا خۆشترە. پاش ماوەیەک لە ژووری تەنیاییدا زەوقم لە هاوڕێیەتی زیندەوەران وەردەگرت، زۆری نەمابوو لەگەڵ سیسرکەکان بکەومە قسەکردن. تاکە کەس کە جارجار چاوم پێ دەکەوت پاسەوانێکی پیری ئەفریقی بوو. ڕۆژێکیان ویستم بە سێوێک چاوی قەپات بکەم و قسەی لەگەڵ بکەم.

باوکە، ئەو سێوەم لێ وەردەگریت ...؟

پشتی تێکردم و بە بێدەنگییەکەی وەڵامی دامەوە، بەڵام من وازم لێ نەهێنا و هەر ویستم

بیدوێنم. بە گەورەییەوە هاتە دووان و وتی:

شەروالێکی درێژو خواردنی کەمێ باشترت داواکرد. ئەوەی ویستت بۆیان کردی، لەمانە زۆرتر چیت ماوە داوای بکەیت.

بەڵێ، راستی دەکرد هەر دابڕانە لە خەڵک، هیچ ناخاتە سەر مرۆڤایەتی مرۆڤ. پاش چەند هەفتەیەک ویستم گەورەیی خۆم بخەمە ژێر پێ و لە عەقید جایکوبز داوا بکەم، شەروالی کورتم بدەنێ و لە بەرامبەریا تێکەڵ بە خەڵکم بکاتەوە. زۆرم بیر لەو رەوشەی خۆم کردەوە، وام دەزانی خەڵکی شۆڕشگێڕ ئەوەیە لە ناو خەڵکەکە بێت و لە هاورێ و کەسەکانی نزیک بێت، نەک تەنیا لە پشتی زیندانا بمێنێتەوە. تەنیایی واتە رەشکردنەوەی ئەوەی کردم و دابڕانە لە ئەفریقیا و لەو خەباتەی بە نیازبووم ئیشی بۆ بکەم، لەعنەتم لە خۆم کرد ئاوا سوپای رزگاری وڵات دادەمەزرێنم.

بە توندی نارەزاییم لە تەنیاییەکەم کردو ویستم بگەمەوە هەڤاڵە گیراوەکان لەوانە رۆبرت سۆبۆکۆی پێشەوای حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی. پاش کۆششێکی زۆر بەرپرسان رازی بوون. عەقید مەرجی بۆ دانام، ئەگەر جارێکی تر لاساری بکات ئەوە لەوە خراپتری بەسەردەهێنین. خەنی بووم، ئاردە بە شیرەکەی شۆپانم ئەوەندە بە تام دەخوارد وام دەزانی بەخۆم وبە زەوقی خۆم لێندراوە وام دەزانی لە ژیانما خواردنی وا خۆشم نەخواردووە.

پەرۆشی دیداری هەڤالان بووم، کە زۆربەیان ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی بوون بە تایبەتی سۆبۆکۆی. حەزم دەکرد قسەی لەسەر پەیوەندییەکانمان لەگەڵدا بکەم، ئەگەر لە دەرەوە بوار نەدەڕەخسا بۆ ئەم دیدارە ئەوە لێرە بوارێکی باشە بۆ نزیکبوونەوە و لە یەکترگەیشتن و هەڤاڵبەندی. کەش و بوارەکەی زیندان باشترە و ئازادانەترە بۆ دانوستان.

لە حەوشەی زیندانا دیدارمان بوو، بە گەرمی یەکترمان لە ئامێز کرد. بێجگە لە سۆبۆکۆی هەڤالانی تری وەک جۆن گۆتسیوی، کە ئەندامێکی بەرزی یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی خوارووی ئەفریقیا بوو و ئارون مولیتی ئەندام لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و رۆژنامەنووس لە نیوئایدچ و ستیپن تیفۆ شیوعیەکی ناسراوی یەکێتی سەندیکاکانی کرێکاران و ئەندام لە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی لێبوو. روبرت سۆبۆکۆی داوای لێکردم بە وردی باسی سەفەرەکەی ئەفریقیای بۆ بکەم، منیش بە شانازییەوە بۆم گێڕایەوە، شێلگێرانە وەکو خۆی باسی وێنەی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانیم لە گۆڕەپانی ئەفریقیادا بۆ کرد. لە کۆتاییدا پێم راگەیاند کەوا چەند مەسەلە هەیەو حەز دەکەم دانوستانی لەسەر بکەم. بەڵام بەڕێوەبەرانی زیندان من و ئەویان لەیەکتری دوورخستەوە، ژووری هەردووکمانیان زۆر دوور لە



یەکتری دانا.

سەرەڕای ئەوەش جارجار لە حەوشەکەی زینداناو لە کاتی پشوودانەکانا یەکترمان دەبینی. من زۆر رێزی سۆبۆکۆیم دەگرت و بەپیاوێکی بەرێزو هۆشمەندم دەزانی، بەڵام لەسەر رەوشی زیندان کێشەمان هەبوو. سۆبۆکۆی لەگەڵ ئەوە نەبوو کە نارەزایی لە رەوشی خراپ و پۆلیسی زیندان بگرین و کەسانی سیاسی بەرهەڵستی بکات و بۆ گۆڕان کۆشش بکات، ئەگەرچی لەبەر خراپی وەزعەکە لەوەدا نەبوو بێدەنگی لێبکرێت، چونکە ئەوەیان دان پێنانە بە زیندانی رژێمەکە. بەڵام ئەو وای دەبینی کەوا رەوشی زیندان بەو شێوەیە چارەسەرناکرێت و ئەوەش بەندە بە رەوشی سیاسەتی دەوڵەت و ئەوەش راستییەکە گفتوگۆی لەسەر نییە. بەڵام ئەم مەسەلەمان کردە لاوەکی و مەسەلە سەرەکییەکەمان خستە پێشەوەو هەردووکمان نامەیەکمان ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی زیندان کردو تێدا رەوشی خراپی زیندانمان باسکرد.

زیندان بەهیچ شێوەیەک وورەی بە سۆبۆکۆی بەرنەدابوو، پیاوێکی ناسک بوو زوو زوو تووڕە دەبوو ئەوەش خەتای ستیڤن تیفۆ بوو، ببووە دڕکی پشتی و بەردەوام تەنگاوی دەکرد و گاڵتەی پێدەکرد. تیفۆ پیاوێکی وشک و رەشبین و درێژدادڕبوو. بەڵام شارەزایی لە سەر مێژووی روسیا زۆر بوو، هەروەها پیاوێکی شەڕکەری ئازابوو، ئامادەیی شەڕی بەردەوامی لەگەڵ برادەرانیشی هەبوو، رۆژانە لەگەڵ سۆبۆکۆی دەبووە شەڕیان.

سووربووم لەسەر ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ سۆبۆکۆی لەسەر سیاسەتی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی بکەم، بە تایبەتی لەسەر درووشمی ناسراوی «ئازادی لەساڵی **١٩٦٣**». ئەوە ساڵی **١٩٦٣** هات و ئازادی جێبەجێ نەبوو. جارێکیان بە سۆبۆکۆیم وت:

برام، لە هەموو شت خراپتر ئەوەیە سەرکردە شتێ بە میللەت بڵێت و بزانی ناهێتە دی، ئەوە هیوای ساختە لە لای جەماوەر دروست دەکات.

ئەمەم زۆر بە ئەدەبەوە وت، بەڵام تیفۆ خۆی تێکەڵکرد و چەندین رەخنە و گلەیی ئاراستە کرد، وتی: ماندێلا ناخی تۆی دۆزیەوەو چاک دەزانی ئەوەی ئەو دەیلێت راستە. بەم شێوەیە بەردەوام بوو لە ئیزعاجکردنی. سۆبۆکۆی، هاتە وەڵام وتی:

تەنیا جێم بهێڵە.

بەڵام تیفو وازی نەهێنا و بەردەوام بوو وتی:

ئەی بوب جەماوەر چاوەڕێتە، دەتکوژن چونکە هەڵتخەڵەتاندون. تۆ پیاوێکی ئارەزوومەندی

نەک سیاسیی ڕاستەقینە.

تیفو ڕۆژانە دەنگی دەهات و گلەیی و شکایەتی لە لای پاسەوانەکان هەبوو، هەر جارێک لەسەر شتێک بوو، لەسەر گەرما و سەرما و ڕەوشی زیندان. ڕۆژێک پاسەوانێک لێی پرسی:

بۆ هەموو بەیانیەک تۆ شکایەتت هەیە..؟

شکایەتم هەیە چونکە حەقی خۆمە شکایەت بکەم.

تەماشاکە، ئەوە ماندێلا ڕۆژێک نییە شکایەتی هەبێت. تیفو بە گاڵتەوە وەڵامی دایەوەو وتی:

ئای ماندێلا، ساوایەکی بچووکەو لە پیاوی سپی دەترسێت، ماندێلام نەدەناسی هەتا ڕۆژێک لە خەو ڕابووم و بینیم ڕۆژنامەکان نووسیبویان، ماندێلا، ماندێلا ماندێلا. لە خۆم پرسی ئەو ماندێلایە کێیە، ئەو پیاوەیە ئێوە دروستان کرد، لەبەر چەند هۆیەک دروستانکرد، نازانم بۆ.. ئا ئەوەیە ماندێلا..؟!

پاش دوو هەفتە و هەر لە زیندانی بریتۆریادا بووم، کە ولتر سیسۆلۆیان هێنا، ئەویش بە تاوانی هاندان، بۆ ناڕەزایی شەش ساڵ زیندانی بۆ بڕابۆوە. بوارمان لە ناو زیندانا بۆ ڕەخسان باسی بەربوونی بە کەفالەت بکەین، من زۆر بە تەواوی پاڵپشتیم دەکرد. پاش دوو هەفتە ولتر بەربوو، بزاڤەکەمان ڕێنمایی بۆ دەرکرد بە نهێنی کار بکات و سەرۆکایەتیان بەو سپارد، ئەویش زۆر بەلەخۆبوردنەوە کارەکەی ئەنجام دا.

بەماوەیەکی کورت پاش دەرچوونی ولتر لەگەڵ سوبوکوی بەرەو نەخۆشخانە دەچووین و لە دووری بیست و پێنج یاردە خەباتگێڕی هیندی ناسراو بە ناناسیتام لە حەوشەکەدا بینی. ئەو بوو هەڵمەتی ڕووبەڕووبونەوەکەی بوکسبیرگی ساڵی ١٩٥٢ی ڕابەرایەتی کردبوو. دادگای بریتۆریا تاوانباری کردبوو بە بیانۆی ئەوەی ئەو خانووەی کە چل ساڵی تێدا ژیا بوو ڕازی نەبوو چۆڵی بکات، تا بە پێی یاسای دەڤەرەکانی نەژادی بکرێتە گەڕەکێکی سپی نشین. بینیم پشتی کۆم ببوو و، بە پێخواسی دەڕۆیشت و، کە بینیم هەستم بە شەرم کرد من سەندلم لە پێدایە. لەبەر ئەوەی لەژێر چاودێری دەڕۆیشتین بۆیە بۆم نەکرا بچمە خزمەتی و سڵاوی لێبکەم. لە ناکاو بوورامەوەو کەوتمە سەر زەوی و چاوی چەپم زامداربوو. لە زیندانی قەڵاکە لە جوهانسبیرگ پشکنینم بۆ کرابوو. وتیان زەغتی خوێنت بەرزە، بۆ ئەوەش دەرمانی لە شێوەی کەپسوولم بۆ سەرفکرابوو، لەبەر ئەوەی دەرمانەکەم زۆرتر بەکارهێنابوو، بۆیە وام لێهات و ئامۆژگاریم کرا ئەوە سووک بکەمەوەو خوێ کەم لە خواردنا بخۆم، بەوە تەندروستیم باش بوو.



ئەو ڕۆژە بوو لەپاش دادگایەکەم یەکەم جاربوو وینی دێتە سەردانم، سەرەڕای ئەو زامەم سوور بووم بیبینم. بەوە زۆر نیگەران بوو، بۆم باسکرد بۆ وام لێهاتووە. تێمگەیاند کەوا تەندروستیم باشە. سەرەڕای ئەوەش قسە بڵاوبۆوە کەوا تەندروستیم خراپە.

* * *

لە کاتی دادگاییمدا لە ساڵی ١٩٦٢دا و لە پاش ساڵی ١٩٥٩وەو بۆ یەکەم جار حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کۆنگرەی ساڵانەی خۆی بەستا. لەبەر ئەوەی ڕێکخستنی حیزب لە خوارووی ئەفریقیا قەدەغەبوو، بۆیە کۆنگرەکە لە لوباتسی نزیک سنووری بیتشواناڵاند و خوارووی ئەفریقیا بەسترا. کۆنگرەکە وەچەرخانێکی گرنگ بوو لە مێژووی حیزبدا. چونکە لەوێ بە ڕوونی ئاشکرای کرد کەوا پەیوەندی لە نێوان حیزب و بزاڤی «ئەمکا»ی چەکداری هەیە. ئەگەرچی حیزبمان ڕێبازی سەرەکی خەباتی سیاسی جەماوەری بوو. ئەوەش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو کارە تیرۆریستانە نامسئولانە هات کە ڕێکخراوی بوقو ئەنجامیان دەدا. بوقو بە زمانی کوسا «سەربەخۆ» یان خۆڕاگری تەنیا، ڕێکخراوەکە پەیوەندی ناڕەسمی بە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی هەبوو، کارە تیرۆریستەکانیان دژی سپییەکان و ئەو ئەفریقیانەبوو کە هاوکارییان دەکردن.

حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی دەویست ڕووی پتەویی بۆ میللەت دەربخات و سووریش بوو لەسەر ئەوەی کەوا چالاکییەکانی دارێژراو و بەرپرسانەیە.

حکومەتیش بەرنامەی «گەشەپێدانی تاک»ی گەشە پێدەدا، کە دەیویست بە ڕای جیهان ڕابگەیێنێ سیاسەتی جوداخوازی نەژادپەرستیان، بۆ هەر کۆمەڵەیەکی نەژادی، ئازادی تایبەتیان دەداتێ. هەرێمی ترانسکای نموونەیەکی ئەم سیاسەتەبوو، لە ینایر/ کانوونی دووەمی ١٩٦٢دا سەرۆک وەزیران فیرووود ڕایگەیاند کەوا حکومەتی خوارووی ئەفریقیا بە نیازە حوکمی زاتی بداتە هەرێمی ترانسکای، لە ساڵی ١٩٦٣دا هەرێمەکە حوکمی زاتی وەرگرت. لە فبرایر/شوباتی ١٩٦٣دا بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی تەشریعی ترانسکای هەڵبژاردن کرا. خەڵکەکە بە ڕێژەی سێ بۆ یەک، دەنگیان لە دژی سیاسەتی حوکمی زاتی دا.

سەرەڕای ئەوەش حکومەت هاوکاری ڕژێمی بانتوستانی کرد، ئەو ڕژێمی خەڵکەکە بەشداری دەنگدانیان کرد بەس بۆ ناڕەزایی. ئەگەرچی من دژی ڕژێمی بانتوستان بووم، بەڵام پێم پاش بوو حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی سوود لەو ڕژێمە وەرگرێت و بیکاتە دووانگەیەک بۆ گەیاندنی بۆچوونی خۆی، چونکە زۆربەی سەرکردەکانی بە گرتن و ئاوارەو دەستبەسەری دەمیان گیرابوو.

کاری تیرۆری دژ بە دەستەڵاتی بانتو زۆر بوو، لە بەرامبەر ئەوەش هوشیاری و ئاگاداری حکومەت زیادیکرد. جون فورستر کرایە وەزیری دادیش، ئەوەی زیندانی کرا لەسەر ئەوەی دژی لایەنگیری حکومەت بوو بۆ هاوپەیمانەکان لە شەڕی جیهانی دووەم، ئەویش بە نەرمی و بەسۆزی بەناوبانگ بوو. سیاسەتی دەستی پۆڵاینی ئەو دژایەتی چالاکییەکانی تیرۆریستی بوو.

لە ١ی مایو/مایس ١٩٦٣دا حکومەت تشریعاتی بە قسەی سەرۆک وەزیران جون فۆرستر بۆ پشت شکاندنی بزاڤی «ئەمکا»ی چەکداری دەرکرد. یاسای دەستکاری یاسای گشتی ناسراو بە یاسای گرتن بۆ ماوەی نۆهەد ڕۆژ. بە کەوتنی مافی ڕاگرتنی لەبەردەم دادگا، هەروەها دەستەڵات دەداتە هەموو ئەفسەرێک بۆ گرتنی هەر کەسێک ئەگەر گومانی لێ بکات. ئەوەش بە تاوانی ئەوەی نیازی تاوانێکی سیاسی هەیە. کەسی گیراویش بە بێ لێپرسینەوەو دادگا بۆ ماوەی نۆهەد ڕۆژ دەگیرێت و مافی پارێزگاری نییە مافی ئەوەشی نییە بەرگری لە خۆی بکات لەمەڕ ئەوەی دانی بە تاوانەکە ناوە. هەروەها فۆرستر ئەوەشی ڕاگەیاند کەوا ماوەکەی درێژیش دەکرێتەوە بۆ هەتا هەتایی. ئەو یاسایە خوارووی ئەفریقیا دەکاتە وڵاتێکی پۆلیسی بە جۆرێک دەستەڵاتی بگاتە دیکتاتۆریەتی وا لە هەموو جیهانا وێنەی نەبێت. ئەوەش دەزگاکانی پۆلیسی کردە دەزگایەکی دڕندەو، کاری ئازاری دژواریان بەکاردەهێنا. لەگەڵ گیراواندا تەوژمی کارەبایی و خنکاندن و جۆرەها شێوەی ئازاریان پەیڕەو دەکرد. لە پەرلەمانیش تاکە دەنگی نارەزاییش دەنگی هێلین سوزمانی ئەندامی حیزبی پێشکەوتنخوازی لیبرالی بەرز بۆوە.

سزای کارکردن لە حیزبە قەدەغەکان زیادکرا، ماوەی گیرانیش لە پێنج ساڵ زیاد کراو تا لەسێدارەدانیش بە تومەتی بڵاوکردنەوەی هزری شیوعیەت و بەرنامەی حیزبەکانی تری قەدەغەکراو.

لە مایوی ١٩٦٢دا ماوەی زیندانیەکەی سۆبۆکۆی کە سێ ساڵی بۆ بڕابۆوە تەواوبوو، لە جیاتی ئەوەی ئازادی بکەن، ماوەکەیان بۆ درێژکردەوەو ڕەوانەی دوورگەی روبینیان کرد.

فۆرستر پاڵپشتی یاسای تەخریبی ساڵی ١٩٦٢ی کرد، ئەوە حەق دەداتە دەستەڵاتداران بە بەسەرداداناتی ماڵان و گرتنی هاووڵاتیان، هەروەها چەسپاندنی توندترین سزا کە لە پێش دادگاکان بەدواچوونەوەی بەسەردا نەبێت. پێشێلکردنی ئازادییەکان وای لێهات، بە شێوەیەک، لە هیچ ڕژێمێکی فاشیزمیش پەیڕەو نەکرابێت. کورتترین ماوەی سزا کرایە پێنج ساڵ و هەتا سزای لەسێدارەدان. ئەگەرچی یاساکە بە وشەی جوان ڕازابۆوە، بەڵام لە یاساکە توندترین سزا بۆ



هەڵگرتنی چەک بەبێ مۆڵەت بڕابۆوەو بە کاری تێکدەرانە دەناسرا. یاسایەک لە پەرلەمان دەرچوو کە بەپێی ئەو بڕیارە هەرکەسێ قسەو هەواڵێکی ڕۆژنامەیەک یان قسەکەرێکی سیاسی نادروست و قەدەغە بگێڕێتەوە سزا دەدرێت. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٢دا ڕۆژنامەی نیوئادج ڕاگیراو هەڵگرتنی هەر چاپکراوێکی قەدەغەش بە کارێکی تاوانکاری دانراو، دووساڵیش زیندانی لەسەر دانرا. ڕێنماییش بۆ دانیشتنی بە زۆر لە ماڵەوە دەرچوو، ئەوەش خەباتگێڕی سیاسی سپی هێلین جوزیفی گرتەوە.

لە کۆتاییەکانی مانگی مایۆدا، شەوێکیان پاسەوانێک هاتە ژوورەکەم، فەرمانی پێکردم بارگەکەم بپێچمەوە، لێم پرسی، بۆ کوێ..؟ وەڵامی نەدایەوە. پاش دە دەقیقە خۆم لەبەردەم نووسینگەی پێشوازی دۆزیەوە، هەر لەوێ سێ گیراوی سیاسی تریشم بینی. لەوانە، ستیڤن تیفوو جون گاتسۆی و ئارون مولیتی، عەقید ئوکامب بە کورتی پێی وتین دەگوازرێینەوە.

تیفو، پرسی بۆ کێندەرێ..؟

عەقید لە وەڵامدا وتی بۆ دوورگەکە.

یەک دوورگە هەیەو ئەویش ناوبانگی خراپە.

بە زنجیر بەسترابینەوە، وەک سەندوق سواری لۆریەکی داخراویان کردین، قاپێکیان بۆ پێویستی، لەناو لۆریەکە دانابوو، ئاسان نییە چوار کەسی بەستراو لە ناو لۆریەکی بەرێیوە. هەتا کیپ تاون ڕێگاکە، شەوەکەی خایاند، عەسرەکەی گەیشتینە بەندەرەکە.

شۆستەکانی بەندەری کیپ تاون پڕبوو لە پیاوانی ئاسایش و پۆلیسی چەکداری رووگرژی توورە.

بەپێوە لە ناو مەخزەنێکی داخراوو بە بەلەمێکی کۆن بەڕێکەوتین. شوێنەکەمان یەک کولانکەی بۆ هەواو تیشکی خۆر تێدابوو، شەپۆلەکان بەلەمەکەیان دەهێناو دەبرد. کولانکەکە بۆ مەبەستی تریش کرابوو، ئەویش پاسەوانەکان لەوێوە میزیان بەسەردا دەکردین. ئێوارەکەی سواری بەلەمەکە بووین، دوورگەکەمان بە دیمەنێکی سەوزی جوان لە ئاسۆوە وەک سەیرانگەیەکی گەشتوگوزار لێ بەدیارکەوت.

«دوورگەکە». خەڵکی کوسا وا پێناسەیان دەکرد، ئەو تیشە بەردینە بەزرەیە کە دەکەوێتە دووری هەژدە میلی کەناری کیپ تاون. هەموو خەڵکیش وای دەناسن. کە منداڵ بووم ناوی ئەم دوورگەیەم بیستبوو. لە ناو کوسادا بە ناوی پێشەوای سەربازی ماکانا دەناسراو، ئەوەی

سەرکردایەتی شەڕی کوسای چوارەمی کرد، ئەو شەڕەی بە ناوی ئەنکسیلیش دەناسرێت، بە سوپایەکی دە هەزار چەکدار شەڕی دژی گراهامزتاون لە ساڵی ١٨١٩ کرد. پاشان بەریتانییەکان بۆ ئەو دوورگەیە دووریان خستەوە. ماکانا ویستی بە بەلەمێکی بچووک رابکات، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە کەنار لە ناو دەریادا خنکا. ئەم رووداوە لە تەونی زمانی کوسا بە نەمری مایەوەو خەڵکەکە کۆششە بێ هیواکەیان بەم زاراوە «ئوکوزا کوکا ئەنکسیلی» ناساند. وەنەبێ ماکان یەکەم پاڵەوانی ئەفریقی بێت بۆ ئەم دوورگەیە دوورخرابێتەوە، لە شەڕی خوی خویی دژ بە هۆلندییەکان لە ساڵی ١٦٥٨دا. یان فون رایبەک شەرکەری ئەفریقی ئوتشوماوی ناسراو لە لایەن ئەوروپاییەکان بە هاری «داوی دەریا» بۆ ئەم دوورگەیە دوورخستەوە. یادی ئەوەم کردەوە. کە دەڵێن یەکەم کەسە بە بەلەمێکی بچووکی بە سەوڵ لە دوورگەکە رایکردو بە سەلامەتی گەیشتە کەنار. وشەی روبین بە هۆلندی گۆلکی دەریا دەگەیێنی، کە شەپۆلەکانی ئۆقیانوسی هیندی سارد لە باکووری قوتبی خوارووودا دەیهێنان و، بە سەدان لە چواردەوری کۆدەبوونەوە. پاشان خەڵکی نەخۆشیان بۆ دوورگەکە دووردەخستەوەو، لەم دوایانەدا دووبارە حکومەت کردیەوە بە زیندان.

چەند پاسەوانی زەبلاح پێشوازییان کردین و بە هاوارەوە دەیانووت، ئەوەیە دوورگەکە، دەبێ لێرەش بمرن.! کۆمەڵگایەکی گەورەمان لێ بەدەرکەوت. کە بە چەندین قۆنگرەی چاودێری دەوری درابوو، لە هەردوولای رێگاکە بۆ بینایە سەرەکییە رێزێک پاسەوانی چەکدار وەستابوون. کەشەکە زۆر ئاڵۆز بوو.پاسەوانێکی دەموچاو سوور هاواری کردو وتی:

من لەو دوورگەیەدا گەورەتانم.

ئەو کابرایە، یەکێک بوو لەو دوو برایەی بە پاسەوانی دڵڕەق ناسرابوون. هەموو پاسەوانەکان بە زمانی ئەفریکانی قسەیان دەکرد، ئەگەر بە زمانی ئینگلیزی وەڵامت دابایەوە، دەیانووت: ئێمە لە زمانی خۆشەویستانی کافرەکان ناگەین (رەشەکان). بەرەو بینایەی زیندان رۆیشتین و پاسەوانەکان هاواریان دەکردە سەرمان و دەیانووت، جووت جووت، واتە دوو دوو و بەرێز برۆن، من کەوتمە تەنیشت تیفوو، پاسەوانەکان هاواریان کرد و دەیانووت: هاس! هاس! ئەم وشەیە بۆ لێخوڕینی ئاژەڵ بەکاردێت.

پاڵیان دەداین تا خێرا برۆین، تەماشای تیفۆم کردو بە چرپە تێمگەیاند، یا بە قسەکانیان نەکەین و، ئەگەرنا سەغڵەتمان دەکەن، سەری هەژاندو رازی بوو. دەبوایە زوو حاڵیان بکەین و ئێمە تاوانبار نین و گیراوی سیاسین و نابێ بەم جۆرە مامەڵەمان لەگەڵ بکەن. بە تیفۆم وت لەسەرخۆبە،



پاسەوانەکە سەرسام بوو. کلینهانس هاواری کرد: چاک گوێم لێ رابگرن ئێرە جوهانسبیرگ و بریتۆریا نییە. ئێوە ئێستا لە دوورگەی رۆبینن، بواری هیچ سەرپێچییەکتان نادەین. هاس،.!! گوێمان نەدایێ، لەسەرخۆ رۆیشتین. پاسەوانەکە فەرمانی دا راوەستین و رووی تێکردین و وتی:

چاک گوێ راگرن، ئێمە لە کوشتنتان دەست ناپارێزین. ئەوەش بۆ گاڵتەو خۆشی نییە. ژن ومناڵەکان و خزم و کەسوکارەکانتان هیچتان لێ نازانن. ئەوەش دوا ئاگادارکردنەوەیە. هاس، هاس..!!

کە لە قسەکانی بۆوە، من وەڵامم دایەوەو وتم:

تۆ ئەوەت لەسەرە، فەرمانەکەت جێبەجێ بکەیت و، ئێمەش ئەوەی لەسەر شانمانە جێبەجێی دەکەین.

سووربووم لەسەر ئەوەی بە قسەی پاسەوانەکان نەکەین. کە ئەو قسانەم کرد گەیشتینە ژوورەکانمان و چووینە ژوورێکی گەورە، ئەرزەکەی چەند ئینجێک ئاوی لێ راوەستابوو. پاسەوانەکە هاواری کردە سەرمان و وتی:

جلەکانتان داکەنن.!!

هەر پارچەیەکمان لەبەر دەکردەوە، پاسەوانەکە دەیپشکنی و فڕێیدەدایە ناو ئاوەکە. کە جلەکانمان تێرئاوبوون ئەمریان کرد لەبەریان بکەینەوە.

دوو ئەفسەرەکە، ئەوەی بچووکیان پلەی نەقیب بوو وناوی پیریک بوو و لێمان هاتنە ژوورێ، دیار بوو بە تەمابوو بە توندی لەگەڵمان بجوڵێتەوە. بەرەو تەمەن بچووکەکەمان، ئارۆن مۆلیتی هات، کە مرۆڤێکی رووخۆش بوو. پێی وت:

بۆچی قژت درێژە..؟

ئارون وەڵامی نەدایەوە، ئەفسەرەکە هاواری لەسەر کرد: من لەگەڵ تۆمە. بۆچی قژت درێژە؟ درێژی قژ سەرپێچی رێنماییەکانە. دەبوایە قژت ببڕیت، بۆچی بەم شێوەیە درێژە...؟

کەمێک راوەستاو رووی لە من کردو وتی:

دەبوایە قژت هەندەی قژی ئەم کوڕە، درێژ بووایە...

بەرەو رووم هات و ترسام، نەوەک لێم بدات و هیچ دەستەڵاتم نییە، ناتوانم بە هیچ شێوەیەک بەرگری لە خۆم بکەم. خۆم گرت و وتم: ئەگەر ئازای یەک پەنجەم دەگەیەنێ لە بەرزترین دادگای وڵاتا شکایەتت لێ دەکەم. بەوەش وەک مشکی داماوی کەنیسەکانت لێ دێت.

هەر کە کەوتمە قسەو ئەو دەنگی نەبوو، کە تەواوبووم بە سەرسامیەکی زۆرەوە تەماشای کردم، منیش سەرسام بووم. هەستم بە ترس کرد، ئازا نەبووم، خۆم ئازا دەرهێنا. مرۆڤ لە حاڵەتی وا باشە خۆی ئازا دەربێنێت، سەرەڕای ئەوەش هەست لە ناخیدا هەبوو، پرسی:

کوانی ناسنامەکەت..؟!

ناسنامەکەم دەرهێناو دامێ، نیگەرانی بە چاکی پێوە دیاربوو وتی:

ناوت چییە؟

سەرم بۆ ناسنامەکە هەژاندو وتم:

ناوم لە ناسنامەکەدا نووسراوە.

تەماشای ناسنامەکەی کرد و وتی:

پێنج ساڵ، بە پێنج ساڵ زیندانی کراویت و بەم شێوەیە دەجوڵێیتەوە، تێناگەیت، پێنج ساڵ یانی چی...؟

ئەوەیان بەندە بە خۆم، ئامادەم پێنج ساڵەکەم بچێژم، بەڵام قبوڵم نییە کەرامەتم پێشێل بکەن، تۆش دەبێ بە پێی یاسا بجولێیتەوە.

ئێمەی نەدەناسی و نەیدەزانی ئێمە گیراوی سیاسین، یان نەیدەزانی پیشەمان پارێزەرە. ئاگادار نەبووم لەو قسانەدا ئەفسەرەکەی تر لە ژوورەکە دەرچوبوو، ئەو پیاوێکی باڵابەرزی هێمن بوو، دوایی زانیم ناوی ستاینە، ئەویش ئامیری بەرزی دوورگەکەیە. پاش ئەوە نەقیبەکەش لە ژوورەکە دەرچوو.

بە تەنیا لە ژوورەکە ماینەوە، دیاربوو ستیپن تیفو دەمارەکانی گرژ ببوو و بە بێ وەستان قسەی دەکرد:

بویر (واتە پیاوی سپی)ەکەت تووڕە کرد، وەزعمان ئاڵۆز دەبێت.

کە تیفو قسەی دەکرد ئەفسەرێکی زەبەلاح لێمان بە ژوورێ کەوت و بە زمانی کوسا کە زۆر چاکە قسەی پێ دەکرد وتی:

فایلەکانتانمان پشکنی دیارە پاکن، تەنیا یەکێکیان نەبێ...

پاشان رووی لە ستیپن تیفو کرد و وتی:

فایلەکەت پیسە.

تیفو بە هەڵچونەوە وتی:



توکێیت، تا بەم شێوەیە بمدوێنیت؟ یان دەڵێیت فایلەکەت پیسە، تۆ تەماشای فایلەکەت کردووم، هەمووییان بەرگرییە لە مافە رەواکانی نەتەوەکەم، من تاوانبار نیم، بە پێچەوانە تۆ تاوانباری...!

ئەفسەرەکە تیفوی هوشیار کردەوە ئەگەر جارێکی تر بەم شێوەیە قسەی لەگەڵ بکات شکایەتی لێ دەکات. پێش ئەوەی بچێتە دەرەوە پێی وتین: رەوانەی ژوورێکتان دەکەم پەنجەرەی هەیە و دەڕوانێتە دەرەوە، دووبارە بە گەفەوە وتی:

ئامۆژگاریتان دەکەم لەم پەنجەرانەوە قسە لەگەڵ کەس ناکەن، بە تایبەتی تۆمان گواستەوە ژوورەکە، ژوورەکە چاک بوو پەنجەرەکانی گەورە و کەمێ بەرزیش بوون، دەرەوەی لێ دیار بوو خەڵکی تر و هاتوچۆی پاسەوانەکانیشمان دەبینی. رووبەرەکەی باش بوو بەشی هەموومانی دەکرد، ئاودەستی تایبەتی و گەرماوی بە دوشی لێبوو.

ماندووبووین. پاش خواردنی ئاردە تێکەڵاوەکەی شۆفان، هاوڕێیان درێژبوون، خەویان لێکەوت. منیش وەک ئەوان، گوێم لە تەقەیەکی پەنجەرەکە بوو، چاوم بڵند کرد و پیاوێکی سپیم بینی و بانگی دەکردم یەکسەر قسەی ئەفسەرەکەم بیر هاتەوە و کە بۆم نییە لە پەنجەرە قسە لەگەڵ کەس بکەم، بۆیە لەسەر سەرینەک پاش گاڤێک گوێم لێبوو بانگی دەکردم:

ئەی ماندێلا، وەرە...!!

بە ناوی خۆم بانگم دەکات، وەک ئەوەی کابرا بزانی چیم لە هزرە، بۆیە وتی: من پاسەوانێکی ملونم و خەڵکی بولمفونتاینم.!

هاتە قسە و هەواڵی خێزانەکەمی پێ راگەیاندم و وتی، رۆژنامەکانی جوهانسبیرگ نووسیبوویان، گوایە وینی لە زیندانی بریتۆریا هاتیتە سەردانت، هێشتا پێیان نەوتووە کە تۆ بۆ ئێرە گواستراویتەوە، سوپاسی ئەو زانیاریەم کرد و پرسی، جگەرە دەکێشیت. منیش وتم نەخێر. بەڵام هاوڕێکانم جگەرەکێشن. رۆیشت و کە گەڕایەوە هەندێ تووتن و لەفەی خواردنی هێنا. تیفو و جۆون گاتسیوی تووتنەکەیان بەشکرد و هەمووشمان لەفەکانمان بەیەکەوە خوارد. ئەو پاسەوانە شەوانە، بە بەردەوامی بۆ چەند هەفتەیەک سەردانی دەکردین، تووتن و لەفەشی پێبوو. ئەوەش بۆ ئەو جێگای مەترسی بوو. ئاگاداریشی کردینەوە کەوا بێجگە لە ئەو مامەڵە لەگەڵ کەسی تر نەکات.

***

سەرەتا نەماندەزانی دوورگەکە چەند گیراوی تێدایە، دوایی زانیمان نزیکەی هەزار کەسی ئەفریقی تێدایە، هەموویان لەم دواییەدا هاتوون. زۆربەیان کەسانی تاوانبار بوون، دڵنیاش بووم خەڵکی سیاسیشی تێدایە. حەزم دەکرد بیانبینم بەڵام، لەبەر ئەوەی ئێمە جیاکرابووینەوە، بۆیە ئەوەیان زەحمەت بوو. ڕۆژانە لە ژووره داخراوەکەمان بووین و داوامان کرد وەک گیراوانی تر ئیشمان پێ بکەن، پاش ماوەیەک ڕەزامەندیان لەسەر کردو بەڵام ئێمە ڕاستەوخۆ لە ژێر چاودێری کلینهانس بووین. یەکەم ئیش کە کردمان گڕ کردنەوەو داپۆشینی ئەو بۆڕیانە بوو کە تازە ڕایانکێشابوو، شوێنەکە بەرزبوو، لەوێوە جوانی و دیمەنە سەرفرازەکانی دوورگەکەمان لێ بەدیارکەوت.

کلینهانس ڕۆژانە کارەکەی ئێمەی قورستر دەکرد و وەک گاو وڵاخ مامەڵەی لەگەڵ دەکردین. ستیف تیفو، لە هەموومان بە تەمەنتربوو، ڕۆژێکیان ماندووبوونەکەی وای لێکرد بەرگە نەگرێت و خاکەناسەکەی فڕێیداتە سەر ئەرز، کلینهانس بەوە تێیخوڕییەوە. ستیف بە زمانی ئەفریکانی وەڵامی دایەوە و وتی:

تۆ نەزانی، هەتا زمانی دایکی خۆت بە چاکی نازانی. بۆیە بۆت نییە فەرمانمان لەسەر بکەیت و بە گوێرەی توانام کاردەکەم و هەر ئەوەندەشم لە دەست دێت. زیادتریشم پێناکرێت.

پاشان بە شانازییەوە دەستی دایەوە خاکەناسەکەیەوە دەستی کردەوە ئیش. ستیف مامۆستای زمانی ئەفریکانی بوو زمانەکەی زۆر چاک دەزانی، هەروەها زمانی هۆڵەندی پەتی دەزانی، لەگەڵ پاسەوانەکانا بە زمانی پاراو و پەتی و لەوان جوانتر و پاکتر بە شانازییەوە قسەی پێ دەکرد. بەڵام، ئەوان لەوەدا زیرەک بوون خۆیان لەگەڵیا تووشی شەڕە زمان نەدەکرد.

لەو پاسەوانە سپیانەی دوورگەکە، ئەو دوو برایەی کلینهانس بوون. بەوە دەناسران کە توندن و ئازاری زۆری گیراوانیان داوە و مامەڵەیان خراپە، گەورەکەیان لەسەر ئێمە بوو، بەرامبەرمان مامەڵەی وا خراپیان نەنواند شیاوی باس بێت. برا بچووکەکیان ئەوەندە ژیر نەبوو. ڕۆژێکیان لە کارکردنێکی گران دەگەڕاینەوە و لەبەردەم سەدان گیراوا گوزەرمان کرد، کە خۆڵیان دەگواستەوە. ئێمەشی لەگەڵ بوو، لەگەڵ براکەشی قسەی دەکرد فەرمانی بە گیراوێک کرد، پێڵاوەکەی بۆ پاک بکاتەوە. ئێمەیان ڕاگرت و خۆیان کەوتنە دەمەتەقێیەکی تایبەتی. لەو کاتەدا گیراوێکم کەوتە بەرچاو کە بە تاوانی بەشدارییان لە یاخیبوونەکەی جووتیارانی ساڵی ١٩٥٨ بە سێدارە دادگایی



کرابوو و ناسیمەوە، ڕووم وەرگێڕا و ویستم تەماشایان بکەم و برا بچووکەکە بەو چاوە تەماشای کردم کە نیازی لێدانمی هەیە. بەڵام شکۆ و ویستم وای لێکردم نەگەڕێمەوە. بۆم هات و برا گەورەکەی دەستی ڕاکێشاو چرپاندیە گوێ و هەڵوێستەکە کۆتایی هات.

ڕۆژێک پیرۆنی بەرپرسی گشتی زیندانەکان و چاودێری دوورگەکەش بۆ ئەوەی گوێی لە گلەیی و گازاندەکانمان ڕاگرێت، هاتە سەردانمان. ئەویش پیاوێکی تووڕە و توند بوو، حەزی بە دیداری ڕووبەڕووی گیراوان نەدەکرد، منیش بە تەما نەبووم بە گژییدا بچم، بەڵام سووربووم لەسەر ئەوەی ببیبینم و بەبێ ریا و ساردکردنەوە قسەی لەگەڵا بکەم.

بۆیە پێم وت: سوپاس بۆ ئەو سەردانەت، بەڕاستی هەندێ کێشەمان هەیە و پێویستە چارەسەر بکرێن. کێشەکانم بۆ ڕیز کرد، ئەویش لە وەڵامدا وتی: مەسەلەکان تەماشا دەکەم و هیوادارم چارەسەرییان بۆ بدۆزمەوە.

دیار بوو حەزی دەکرد سەرنجمان ڕاکێشێت، ڕووی داینێ. ڕووی لە تیفو کردو تەماشای ورگە زلەکەی کرد و پێش ئەوەی بچێتە دەرەوە وتی:

لە زیندانا ئەو ورگەت نامینێت.

ئەو بە ئەنقەست وشەی ورگی بەکارهێنا، ئەوەشی هێما بوو بۆ ورگی ئاژەڵ. تیفو لەوانە نییە وەڵام نەداتەوە بۆ وەڵامی ئەو جنێوە بە سەرۆکی زیندانی وت:

دەزانی جەنابی نەقیب من هیچ قسەیەک کارم لێ ناکات، چونکە من ئەندامی حیزبی شیوعیم، ئەو حیزبە شۆڕشگێرەی بۆ میللەتانی زولم لێکراو لە سەرانسەری جیهانا بە شانازییەوە خەباتی بەردەوامی کردووە.

بەڵام تۆ و حیزبی نەتەوەیی داماو، هەر بۆ زبڵدانی مێژوو باشن. من لە سەرۆک دەوڵەتە سپڵەکەتان ناسراوترم. تۆ دەبێ کێ بێت. تۆ تەنیا فەرمانبەرێکی و حەقی ڕێزگرتنت هەر نییە، لەو زیندانە دەربچم هەر ناوتم لە بیر نامێنێت. ئەویش بە ڕوویدا ڕوانی و بۆی دەرچوو.

***

شەوانە، سەردانەکانی پاسەوانە ملونەکە کەمێک ئازارەکانی دوورگەکەی سووک دەکردین، سەرەڕای ئەوەش ستیف هەر ڕازی نەبوو. شەوانە هەر جگەرەی دەکێشاو بەشە تووتنەکەی تەواو

دەکرد، بەڵام گاتسیوی وا نەبوو دەستی بە بەشە تووتنەکەی خۆیەوە دەگرت، ئێوارەیەکیان تیفو نیگەران بوو. بەو ڕەوشەوە هاتە پێشم و وتی:

نیلسۆن، تۆ بەشی گاتسیوی لە تووتنەکە زۆرتر دەدەیت.

ڕاستی نەدەکردو منیش بە گاڵتەوە پێم وت:

باشە، لەمەودوا تووتنەکە دەکەمە دوو بەش و خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە.

ئەمە بووە یاسا. هەموو جارێک تیفو لە هەڵبژاردنی بەشەکەی خۆییدا دوو دڵ دەبوو، نەیدەزانی کامیان ببات. پاش نیگاو ڕامانێکی زۆر بەشەکەی دەبردو شەویش دەستی بە جگەرەکێشان دەکرد. سەرەڕای ئەوەش تیفو هەر پیر نەدەبوو. کە پاسەوانەکە دەهات و لێمان نزیک دەکەوتەوەو تەماشای دەکرد نەوەک من برێک بۆ گاتسیوی بشارمەوە، ئەوەش پاسەوانەکەی نیگەران دەکرد، بۆیە جارێکیان وتی:

تکایە لەبەر مەسەلەی ئەمنی من هەر مامەڵە لەگەڵ ئەودا دەکەم.

منیش دڵنیام کردو تیفوم هوشیار کردەوە کە تووتنەکەی لێ وەردەگرم. لە پاسەوانەکە نزیک نەکەوێتەوە.

بۆ شەوی دوایی تیفو لە پاسەوانەکە نزیک کەوتەوەو پێی وت:

لەمەودوا بەشی من ڕاستەوخۆ بدە دەستی خۆم.

پاسەوانەکە شڵەژاو وتی:

ماندێلا ڕیکەوتنەکەمان پێشێلکرا، ڕۆژانی تر هیچ ناهێنم.

لە تیفوم خوڕییەوە تا بێدەنگ بێت. بە پاسەوانەکەم وت:

گوێی مەدە قسەکانی پیر بووە (دەستم بۆ سەرم درێژکرد) لە بیری کە. هێور بۆوەو تووتن و لەفەکانی داینێ و هوشیاریشی کردینەوە کەوا ئەوەی ئەم شەوە، دووبارە نەبێتەوە، ئەگەرنا دواجارەو هیچی تر نامبیننەوە.

هەستم کرد دەبوایە لە بڕی ئەو لاسارییەی تیفو دەبێ سزایەکی بدەیین، بۆیە پێم وت:

جوان گوێم لێ ڕاگرە، زۆری نەمابوو لەو زخیرەیە بێ بەشمان بکەیت، بۆیە ئەم شەو بەشت نادەم، ئەگەر ڕەوشت نەگۆڕێت، ئەوا جارێکی تر هیچ وەرناگریت.

تیفو لە سوچێکی ژوورەکە و ئێمەش لە سوچێکەی تر دانیشتین، دەستمان بە خواردنی لەفەکان کرد و هێدی هێدیش ئەو ڕۆژنامەمان دەخوێندەوە، کە پاسەوانەکە بۆی هینابووین. پاش گاڤێک



خەومان هات و نوستین. پاش نیوەی شەو هەستم کرد کەسێک دەمهەژێنێت، کە بە ئاگا هاتم، بینیم تیفویە بە هێمنی دەڵێت:

نیلسۆن، نیلسۆن، بە بێبەشکردنم لە تووتن. زەبرێکی کوشندەیە لە جیگایەکی ناسکت دام. من پیاوێکی پیرم بۆ ئازادی نەتەوەکەم قوربانی زۆرم داوە و تۆش وا لەم زیندانەدا سەرکردەمانی. چۆن دڵت دێ بەم جۆرە سزامان بدەییت. ئەمە کەی دادپەروەرییە. ئەی ماندێلا.

قسەکانی کاری لێکردم. هەستم کرد سزاکەی توندە. ئەو پیاوە لە من زۆرتر خەباتی کردبوو، ئەو لەفەی مابوو دامێ، گاتسیویم بە ئاگاهێناو داوام لێکرد لە تووتنەکە بەشی بدات. تیفو مەزاج توند بوو، پاش ئەم شەوە نەرم بوو.

لە ماوەی کارکردنما لە ڕەوشی زیندان و گیراوەکان چاک تێگەیشتم. دەسەڵاتداران چەند گەنجی گیراوی ئەندام لە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەییان بۆ ژوورەکەی بەرامبەرمان گواستەوە، دەکرا شەوان لە پشتی شیشبەندەکانەوە قسەیان لەگەڵ بکەم. یەکێک لەوانە نقابینی ئەمینی خزمی ئەمکیکیزوینی بوو، بە شیرخۆری دیبووم.

باسی ترانسکایمان کرد و دەنگوباسی خێزانەکەمی پێ ڕاگەیاندم. کە قسەمان دەکرد.

گەنجێکیان پرسی، مامە تۆ سەر بە کام ڕێکخستنی..؟

وەڵامم دایەوە، کەوا من سەر بە ڕێکخستنەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقیم، گەنجەکانی چواردەوری ڕوویان گرژبوو و لە پەنجەرەکە دوورکەوتەوە. لێی پرسیم، هیچ ڕۆژێ لە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی کارت کردووە؟ بە نەخێر وەڵامم دایەوە. ئەو وتی زانیمان لە سەفەرەکەی ناو ئەفریقاتدا پەیوەندییت بە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی کردبوو. دووبارە بە نەخێر وەڵامم دایەوە و وتم: من لەوەتی حیزبایەتی دەکەم لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانیم هەتا مابم لەو حیزبەش دەبم. بە قسەکە دڵگران بوو و لێم دوورکەوتنەوە. دوایی زانیم، گوایە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی پروپاگەندەی وای کردبوو، گوایە من لە سەفەرەکەی ئەفریقیامدا پەیوەندییم بە وان کردووە. بەم قسانە سەرسام نەبووم و دڵشادیشی نەکردم. لە سیاسەتدا زۆر جار مرۆڤ بە هەڵە لە هەڵویست و گۆڕانەکاندا دەگات. پاشان خزمەکەم پرسی، گوایە لە بریتوریا دیدارم لەگەڵ سوکوبودا بووە. منیش وتم: بەڵێ ڕاستە و زۆریش دۆست بووین و دیداری بەسوودیشمان هەبوو. ئەو و هاوڕێکانی بەم هەواڵە زۆر دڵیان خۆش بوو. ئەو شەوە داوایانکردم ئەوەش دوا دیدارمان بوو. پاش چەند سەعاتێک لە دیدارەکە پاسەوانێک هات و داوای کرد بارگەتان بپێچن.

هەردوو برادەرەکەمیان برد و من تەنیا لە ژوورەکەم مامەوە. لە زیندان وایە کاتەکە وایە بواری ماڵئاواییکردنت لە برادەران نادەن. ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵ یەکێکدا دەبێت و لە ناکاو لە یەکتری دادەبڕێیت و جارێکی تر نایبینیتەوە. زیندان زۆرجار لە کەسایەتی مرۆڤ دەدات، چونکە ڕەوشەکە وایە ناچاری خۆت گرمۆڵە و دوورەپەرێز ڕاگریت.

تەنیا مامەوە و نیگەرانیم زۆرتربوو. کۆمەڵە کەسێک ئارامیت دەدەنێ و مرۆڤی تەنیاش بێ شاهێدە.

لە دەرگاکەمدا، وتم پاسەوان کوانی خواردنم، من خواردنی ئێوارە وەرناگرم.

پاسەوانەکە هاواری کرد:

دەبێ بە گەورەم بانگم بکەیت.

ئەم شەوە بە سگ بەتاڵی سەرم نایەوە. بۆ بەیانی ڕۆژی پاشتر منیان بردە بریتوریا. بەشی زیندانەکان بەیانێکی دەرکرد، گوایە بۆ سەلامەتیم منیان گواستیتەوە بریتوریا چونکە ئەندامانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی بە نیاز بوون دەستدرێژیم بکەنە سەر. قسەکە هیچ سەرچاوەی ڕاستی نەبوو. چونکە پاش ماوەیەکی کورت، بۆم دەرکەوت لەبەر چەند هۆی پەیوەست بە حکومەت منیان گواستیتەوە.

لە زیندانی هەرێمی بریتوریادا منیان لە ژوورێکی تاکە کەسی دانا. فێلیش لە گیراوان ناکرێت، زۆری نەخایاند نامەی نهێنیم لە ئەندامانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی پێگەیشت، لەوانە هنری فازی ئەندامی بزاڤی (ئەمکا) کە لە ڕێگای گەڕانەوەی لە ئەسوبیبیا لەسەر سنوور گیرابوو، لەوێ ڕاهێنانی سەربازی کردبوو، یەکەم کەسیش بوو بە پێی یاسای تەخریب گیرابوو.

بە پێی ئەو پەیوەندییە نارەسمییانە لەگەڵ گیراوەکانا، ڕێنمایی ئامادەکردنی بەرگریم بۆ دۆزەکانیان ساز دەکرد، پێشنیاریشم دەکرد سەردانی هارولد ولب بکەن. دوایی زانیم ئەویش گیرا، بەوەش تێگەیشتم شتێکی ترسناک بەڕێوەیە. ڕۆژێکیان لە پاش ڕاهێنانی وەرزشیم دەگەڕامەوە ژوورەکەم، لە ڕێگادا لە ناو حەوشەی زیندانا ئەندرو ئەملانگینیم بینی، ئەوم لە سێپتیمبەر/ ئەیلولی ١٩٦١ کە بەرەو دەرەوە بۆ ڕاهێنانی سەربازی دەچوو بینیبوو. ئای کە کارەساتێکی گەورەبوو، دەبێ بێجگە لەوانەش کێی تر گیرابن.

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٦١ بۆ ماوەی دوو ساڵ قەدەغەی سیاسییان خستە سەر وینی، لە گیراوێکم بیست، گوایە وینی بە تاوانی سەرپێچی قەدەغەکەی خراوەتە سەر، ڕەنگە دووچاری



زیندان یان ئیقامەی جەبری بێت. وینی کەڵلەڕەق بوو، ئەوەش وای لێدەکات زۆرتر لاسارییان بکات، گومانیشم لەوە نەبوو کەوا سەرپێچی قەدەغەکەی کردووە. ئامۆژگاری ئەوەشم نەدەکرد سارد بێتەوە، بە پێچەوانەش زۆر نیگەران بووم و دەترسام بۆ ماوەیەک بیگرن.

بەیانیەکی مانگی یۆلیۆ/ تەمووزی ١٩٦٣ لەو کۆڵانەدا بۆ ژوورەکەم دەگەڕامەوە و لە ڕێگادا توماس ماشیفانی سەرۆک کرێکارانی کێلگە لیلیازلیفم بینی. بە گەرمی پێشوازییم کرد، دەمزانی دەستەڵاتداران بە ئەنقەست ئەو دیدارەیان سازکرد، تا من بیبینم و قسەی لەگەڵ بکەم و، لەسەرم بیبێتە ماڵ کە من دەیناسم. بونی ماشیفانی لە زیندانا، واتە ئاشکرابوونی نهێنیەکانی ریڤونیا.

پاش دوو ڕۆژ بانگی نوسینگەی زیندان کرام و لەوێ ولتر و گوڤان ئەمبیکی و ئەحمەد کاسراوداو ئەندەر و ملانگینی و بوهیبل و ریموند مهلابای ئەندامی سەرکردایەتی باڵای بزاڤی (ئەمکا) کە تازە لە ڕاهێنان لە چین گەڕابونەوە ئەلیاس موتسولایدی ئەندامی بزاڤی (ئەمکا) و دینیس گولدبیرگی ئەندازیار و ئەندامی حیزبی کۆنگرەی دیموکراتخوازان و رستی بیرنستاین ئەندزایاری بیناسازی و ئەندامی کۆنگرەی دیموکراتخوازان و جیمی کانتر پارێزەر و زاوای هارولد ولبیم بینی. هەموومان تاوانی تەخریبمان خرابووە پاڵ بۆ ڕۆژی دوایی خۆمان لە بەردەم دادگا بینیەوە. ئەو کاتە من نۆ مانگم لە پێنج ساڵەکەم تەواو کردبوو.

* * *

هێدی هێدی ئەوەم لەلا گەلاڵە بوو چی ڕووی دابوو. لە عەسرەکەی ڕۆژی ١١ی یونیو/ حوزەیران لۆرییەک گەیشتە شوشتنگەکەی کێڵگەی لیلیازلیف، ئەوەش بە هزری کەسدا نەدەهات. پاسەوانە گەنجە ئەفریقیەکە رایگرتوون، پۆلیس بە خۆی و سەگەکانیانەوە لە ناوچەکە بڵاوبوونەوە. پۆلیس چواردەورەی ناوچەکەی گرتوو، ژمارەیەکیان چوونە ناو بینایە سەرەکییەکە و لە یەکێک لە بینایەکانی دەرەوەدا کە چونەژوورەوە بینوویانە دە کەس لەسەر مێزێک کۆبونەوەتەوە و چەند کاغەزێکیان لە پێشە. ولتر لە پەنجەرەکە خۆی فڕێ داوەتە دەرەوە و ویستویەتی رابکات و سەگە پۆلیسیەکان پێشیان لێی گرتووە. هەروەها هەڵمەتی گرتنەکە ئارسەر گولدریتشیشی گرتەوە کە ئەو کاتە خۆی و سەیارەکەی هاتبووە ناو کێلگەکە.

پۆلیس کێڵگەکەیان هەموو پشکنی و دەستیان بەسەر سەدان بەڵگەنامە و کاغەزی بایەخداردا

گرت.

لەو کاتەدا گرنگترین بەڵگەنامەی تایبەت بە نەبەردی مایبای لەسەر شێوەو بەرنامەی شەڕی پارتیزانی لە خوارووی ئەفریقی لە گۆڕێ بوو، حکومەت بە یەک دەستوەشاندنێک گورزێکی توندیان لە بزاڤەکەدا، توانیان سەرجەم ئەندامانی بزاڤەکە بەیەکەوە بگرن، هەموویان بە پێی یاسای حیجز نۆهەد ڕۆژ گیران.

جوسلوفوو برام فیشر بەختیاربون ئەو کاتە لەوێ نەبوون، ئەگەر چی ڕۆژانە هەر پێیەکیان لە کێڵگەکە بوو. دۆزینەوەی کێڵگەکە شتێکی سەیر نەبوو، بەڵام سەیر لەوەدابوو کە هەتا ئێستا نەدۆزرابۆوە. حکومەت بەرنامەکانی گۆڕی و پرۆسەکانی لەم جۆرەیان گەشە پێداو چاودێرییان خستە سەر قسەکردن بە تەلەفۆن. بە بەردەوامی چاودێری شوێنەکانیان دەکرد. ئەم هەڵمەتە سەرکەوتووە بۆ حکومەت سەرکەوتنێکی مەزن بوو.

ڕۆژی یەکەم بوارمان نەدرا پارێزەر بگرین، بە تۆمەتی تەخریب ڕووبەڕووی دادوەریان کردینەوە. پاش چەند ڕۆژێک بواریاندا تیمێکی پارێزەران ببینین، کە پێکهاتبوو لە برام فیشر و فیرنون بیرانجیە و جول جوفیە و جۆرج بیزوس و ئارسەر شاکالسون. لەبەر ئەوەی من لە زینداناابووم بۆیە بە تەنیا بووم، لەوەتی گیرابووم ئەوە یەکەمین بواربوو لەگەڵ برادەرانی حیزب دیدارمان هەبێت.

برام فیشر دڵتەنگ بوو، بە هێمنی وتی: لە داواکاری گشتیم زانیوە تاوانەکەتان زۆر مەزنە و هەرچی سزای توند لە دادگا هەبێت دووچارتان دەبێتەوە. لەبەر ڕەوشی وڵاتیش ئەو ئەگەرە بە ڕادەیەکی زۆر لەبارە، لەو دەمانەدا لە ژێر سێبەری سێدارەدا دەژیاین. دەرچوونی بڕیاری سێدارە هەموو شتی دەگۆڕێ، لەو دەمەدا ئەو ئەگەرەمان لە پێش خۆمان دانا، چونکە زیندانی هەمیشەیی بۆ تاوانی لەمە سوکتر دەرچووبوو. بەرپرسانی زیندانیش ئەم قسانەشیان ڕووبەڕوو دەکردینەوە کەوا ئێمە ئەگەری لە سێدارەدانمان هەیە. پێش خەوتنم ئەو ڕۆژە پاسەوانێک لە دەرگاکەمی داو وتی:

ماندێلا، بۆ نووستن نیگەران مەبە، خەوی زۆر درێژت لێدەکەوێت.

کەمێ بێدەنگ بووم و وتم:

هەموومان، تۆش، زۆر خەوت لێدەکەوێت زۆر زۆر...

ئەم وشانە هەندێ خەمباری و پرسەیان پێوە بوو. لە ٩/ی ئوکتۆبەر/ تشرینی یەکەم ١٩٦٣ بە لۆریەکی داپۆشراوی دابەشکراو بە ناوبڕەیەک بە دوو بەش یەکێک بۆ کەسی سپی و ئەوەی تریش بۆ پیاوی ڕەش، گوازرامەوە کۆشکی دادی برتیوریای بارەگای دانیشتنەکانی دادگای باڵا. دۆزەکە



لە نێوان (حکومەت)، لە لایەک و (سەرکردایەتی باڵای گشتی و ئەوانی تر) بوو. دوایيش بە دۆزی ماندێلا و ئەوانی تر، ناسرا. بە دادگای ریڤونیاش ناسرا. لە نزیک بینایەی دادگاوە پەیکەرێکی بول کروپری سەرۆک کۆماری ترانسفال بەرز راگیرابوو، ئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەم شەری ئیستعماری بریتانیای کردبوو، لە ژێر پەیکەرەکە دەستەواژەیەک لە وتارەکەی نوسرابوو کە وتبووی: ئێمە کێشەکەمان بە ڕووی هەموو جیهانا ڕادەگەێنین، جا سەرکەوین یان بمرین، ڕۆژێ دێ خۆری ئازادی لە ئەفریقیا هەڵدێ، وەک هەڵاتنی خۆر لە نێوان هەوری بەیانی.

لۆریەکە لە نێو ڕێزێک سەیارەی پۆلیساندا گوزەری کرد، لە پێشەوەش سەیارەیەکی گەورەی بەرپرسانیش دەڕۆیشت. کۆشکی دادگا پڕ پۆلیسی چەکداربوو. بۆ ئەوەی ئامادەبووان و دۆستەکانمان نەمانبینن، ئێمەیان بە دەرگایەکی پشتەوەی ئاسنی گەورەدا بردە ژوورێ. چواردەورەی بینایەکە بە پۆلیسی چەکدار دەوری گیرابوو، کە لە لۆرییەکە دابەزیین گوێمان لە هاوار هەلهەلە و گۆرانی ئامادەبووان دەبوو. تا دادگاکە دەستی پێکرد، ئەو دادگایەی لە ڕۆژنامە هەرێمیەکان و جیهانییەکانا بە گرنگترین دۆز لە خوارووی ئەفریقیایان ناساند، ئێمەیان لە زیندانێکی نهۆمی خوارەوەی بینایەکە دانا.

بە هاوشانی دوو چەکدار بۆ هەر یەکێکمان لە ژوورەکان دەرچووین. بەرەو هۆلە بنمیچە بەرزەکەیان بردین، هەموومان بە سڵاوی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی پێشوازییمان لە جەماوەرەکە کرد.

دەنگی: هێز، هێز بۆ ئێمە، با ئەفریقیا بگەڕێتەوە. بەرز دەهات، ئەوەش ورەی بەرز دەکردینەوە. پۆلیس ناوونیشان وێنەی هەموو ئەوانەی وەرگرت کە لە هۆلەکەدا ئامادەبوون. لە هۆلەکەدا دەیان ڕۆژنامەنووسی هەرێمی و جیهانی و نوێنەری حکومەتانی دەرەوەش ئامادەبوون.

لە ناو هۆلی دادگاش چەند پۆلیسێک ئێمە و خەڵکەکەیان لە یەکتر جیاکردەوە. زۆر تووڕە بووم لەوەی منیان بەو جلە پیسانەی زیندان هێنابوو، چونکە من تاوانبار بووم بۆیە مافی خۆگۆڕینم نەبوو. دوایی بۆیان گێڕامەوە ئەو ڕۆژە بێجگە لە جلوبەرگە ناشیرنەکانم من خۆشم نارێک بووم. چەند مانگێک لە ژووی تەنیایی پازدە کیلۆ لە کێشم دابەزیبوو، ویستم بە ڕووی جەماوەرەکە پێبکەنم و ڕوویان خۆش بکەم، ئەو پێشوازییەی خەڵکەکە دەرمانێک بوو زام و خەمەکەی سوک کردمەوە.

دابینکردنی ئاسایش لە ڕۆژی دادگایەکە لەوپەڕی بەرزی بوو. چەند پێشتر ئارسەر گولدریتش و

هارولد ولب و موسا مولا و عبدالحي جاسات بە دانی بەرتیل بە پاسەوانەکانیان توانیبوویان لە زیندانا رابکەن. ئارسەر و هارولد بۆ سوازیلاند بە خۆگۆڕینیان بە جلی قەشەیەتی دەربازببوون و لەوێش بۆ تانجانیقا.

لەو دەمەدا رایان کردبوو کە حکومەت لەبەر گەشەسەندنی رێکخستنەکان تووشی هستیریا هاتبوو، ئەوەش لە ناوەوە و دەرەوە رۆژنامەکان باسیان دەکرد و حکومەتی زۆر نیگەران کردبوو و ورەی خەباتگێران و ورەی خەباتی گەشە پێدابوو.

دادوەری دادوەرانی ترانسفال بەڕێز قورتس دی فیت سەرۆکایەتی دادگایەکەی کرد، بە عەبایەکی سووری تۆخ دەرکەوت و لە ژێر گومبەتێکی دار دانیشت. دی فیت پێش هاتنی حیزبی نیشتمانی بۆ دەسەڵات لە لایەن حیزبی یەکگرتوو دامەزرابوو، لەسەر حکومەت حیساب نەبوو. دی فیت پیاوێکی رووترش و نیوچەوان باریک و زووش هەڵدەچوو. پارێزەری داواکاریش دکتۆر بیرسی یوتاری جێگری داواکاری گشتی ترانسفال بوو، چاویشی لەپایەی داواکاری گشتی وڵات بوو. یوتار پیاوێکی گچکەی کەچەڵی رێکوپێک بوو، کە تووڕە دەبوو یان هەڵدەچوو، دەنگی دەگیرا. حەزی لە دراما دەکرد و وشە و زاراوەی قەبە و بەلەرینەوەی بەکاردەهێنا.

یوتار لەسەر پێیان دووانی بۆ دادگادا و وتی:

بەڕێز دادوەر، دۆزی داواکار دەوڵەتە و داوالێکراویش سەرکردایەتی باڵای گشتی و کەسانی ترن.

من تاوانباری ژمارە یەک بووم. یوتار لیستی تاوانباری بە نوسراوی پێشکەش بە دادگا کرد. داوای تاوانبارکردنی زووی کرد و دادگایی خێراشی داواکرد. ئەوە یەکەم جارە لیستی تاوانباری وەردەگرین، چونکە داواکار لێی دەشاردینەوە، هەروەها دانەیەکیشی دابووە رۆژنامەی راند دیللی میل، ئەوانیش لە لاپەڕەی یەکەمی و بە گەورەیی بڵاویانکردبۆوە. تاوانەکان بەشداریکردن بوو لە زۆرتر لە دوسەد کاری تەخریبی، کە خۆیان لە شۆڕشی بەهێز دەنوێنێ بۆ وەرگرتنی دەسەڵات بە هێزی سەربازی و رووخاندنی حکومەت.

تاوانی تەخریب و رووخاندنی رژێمیان خستە پاڵمان، نەک تاوانی خیانەتی مەزن، بەپێی یاسا، پشکنینی سەرەتایی ورد، ئەم جۆرە دۆزانە ناگرێتەوە «ئەوەش لە بەرژەوەندی زۆر چاکی بەرگری بوو». لە هەردوو حاڵەتدا سزاکەی سێدارە بوو. لە حاڵەتی خیانەتی مەزندا حکومەت دەبێ سەلماندنی بێگومانی چەسپاو و بۆ هەر دۆزێک دوو شاهید هەبێت. بەڵام لە یاسای تەخریبدا



دەکرێ بەرگری بێتاوانی تاوانبار بسەلمێنێت.

برام فیشر لە جێگاکەیدا هەڵسایەوە سەر پێ و داوای لە دادگاکرد لەبەر ئەوەی کاتی گونجاوی نەبووە بۆ ئامادەکردنی وردەکارییەکانی بەرگری دانیشتنەکە دوا بخریت. ئاماژەی بەوەشدا کەوا هەندێکیان چەند رۆژە لە ژووری تەنیاین، بەرگریش هەر ئەو رۆژە لیستی تاوانبارکردنی وەرگرتووە و حکومەتیش سێ مانگە خۆی بۆیان سازداوە. دادوەر مۆڵەتی سێ هەفتەیدا تا ٢٩ی ئوکتوبەر/ تشرینی یەکەم دۆزەکەی دواخست. لەبەر بوونی قەدەغەی چالاکییەکان و مانەوەی ئیجباری لە جوهانسبیرگ، وینی نەهاتبوو بۆیە هەستم بە بێزاری کرد. ئەوەش رەزامەندی پۆلیسی دەویست بێتە بریتوریا ئەوانیش بۆیان نەکردبوو. زانیم پۆلیس چونەتە سەر ماڵی و گەنجێکی خزمیان گرتووە. وەنەبێ وینی تاکە هاوسەر بێت بە پێی یاسای گرتنی نۆهەد رۆژی گیرابێت، ئەلبیرتینا و کارولاین و موتسولیدیش گیرابوون، هەروەها ماکسی کوڕی ولتریشیان گرتبوو. گرتنی ژن و مناڵانی خەباتگێڕان دڕندەترین شێوەی پاڵەپەستۆبوو لەسەریان، حکومەت پەیڕەوی دەکرد. زۆریان بەرگری هەموو جۆرە ئازار و ناخۆشەکانیان دەکرد تەنیا ئەمەیان نەبێت.

وینی بە ئیستئناف داوای ئامادەبوونی کردبوو، ئەوانیش بە مەرجی لەبەر نەکردنی جلە تەقلیدییەکەی رازی ببوون. ئەوەیە حکومەت لە ناوچەکەدا داوای گەشەپێدانی کەلتووری دەڤەری ئەفریقیە نشینەکان دەکات و بواریش نادات وینی جلی میللی خۆی لە دادگا لەبەر بکات.

لەو سێ هەفتەیەی خەریکی ئامادەکردنی دۆزەکەمان بوین دیدارمان بۆ رەخسا. دووبارە کەوتمەوە ناو هاوڕێیەکانم و ئەوەش شەنگ و هێزی دامێ. هەروەها بوارمان درا کەسوکارمان هەفتەی دووجار و بۆ ماوەی نیو سەعات سەرمان بدەن و ژەمێک خواردنی دەرەوەی زیندان بخۆین. خاتوون بلای دووبارە خواردنە بەتامەکانی پەیدابوونەوە و منیش هێدی هێدی تەندروستی و کێشم چاکبۆوە.

ئێمە لە ناو زیندانا خەریکی ئامادەکردنی بەرگری بووین و حکومەتیش لە دەرەوە بە رۆژنامەکان دادگایی دەکردین. ئەگەرچی رۆژنامە بۆی نییە دۆزی تەواونەبوو ناوبێنێت. چونکە گیراو بە پێی یاسای گرتنی نۆهەد رۆژی لە دۆزی ریڤۆنیا، بە مەرجە رەسمییەکان بە تاوانبار ناژمێردرێت و بۆ حکومەتیش نابێ دەم لە دۆزەکە وەردات. ئێمە هەموومان و وەزیری دادیش بە شۆڕشگێڕی توندخواز ناوبرد. رۆژنامەکان بە بەردەوامی باسی (شۆڕشی سەربازییان) دەکرد.

لە رۆژی ٢٩ی ئوکتوبەر/ تشرینی یەکەم گەڕاینەوە دادگا، لەبەردەم دادگادا جەماوەرێکی زۆر

وەستابوون و هەلهەلە و هاواریان بوو، ناوچەکە لە رووی ئەمنیەوە چاک کۆنترۆڵ کرابوو، نوێنەر و کەسایەتی پایەداری بالوێزخانەکانی دەرەوەش ئامادە ببوون.

چونکە ئەو سێ هەفتەیە لەگەڵ هاورێکانم بووم، بۆیە ئەمجارە بە زەوق و مەزاج و قاتیشم لەبەر بوو. پارێزەرەکەمان توانیبووی دادگا ناچار بکات بە جلی زیندان نەهێنە دادگا و جلی تایبەتمان دەستکەوت. بە سڵاوە ئاساییەکەی خۆمان دەرکەوتین و ئەوانیش ئاگاداریان کردینەوە ئەگەر ئەمە دووبارە بکەنەوە و ئەوە بە جلی زیندان جارێکی تر دێنەوە. بە پێچەوانەی جاران و تا بە سڵاوە تایبەتیەکەمان دەرنەکەوین، فێڵیان لێ کردین، ئێمەیان پێش دادوەرەکان بردە ژوورەوە، تا ئێمە بەسەر ئەوانەوە نەچینە ژوورەوە و سڵاوەکە نەکەین، وایان سازدا. دادوەر هاتە ژوورێ و کەس دەنگی لێوە نەهات و دانیشتنەکە دەستی پێکرد.

پارێزەرەکەمان برام فیشر بە هێرشێکی توند دەستی پێکردو لیستی تاوانبارکردنەکەی بە خڕ درۆ و لاوازو هیچ و نامەعقول و ناگونجاو ناساندو نمونەی لەو بەرواری رۆژی رووداوەکان هێنایەوە کەمن لە زیندانی بریتوریا بووم. دادوەری گشتی تەماشایەکی دادوەری کرد و لە جیاتی ئەوەی وەڵامی برامی پارێزەر بداتەوە، وتی: ئەوە وتارێکی سیاسی بوو. دادوەر تەنگاوبوو و بە داواکاری وت: ئەوەی لە بنچینەی مرافەعەکەت گەیشتبم، بەڕێز بوتار، تۆ ئەوانەت بە تاوانبار ناساندووە. دادوەر دۆزەکەی لادا و دانیشتنەکەی داخست.

لە رووی یاسایی و هونەرییەوە ئێستا ئێمە سەربەستین، دەنگە دەنگێ لە ناو هۆڵەکەدا پەیدابوو. پێش ئەوەی دادوەر هۆڵەکە جێبهێڵێت ئێمەیان گرتەوە. سوانبولی ئەفسەر دەستی لەسەر شانی یەکێکمان داناو، وتی:

بە تاوانی تەخریب دەگیرێیت.

وەکو رەوەیەک ئێمەیان بردەوە زیندانەکانمان. سەرەڕای ئەوەش بڕیارەکەی دادگا گورزێکی کوشندەبوو بەر حکومەت کەوت. لەو دۆزەی بە باوکی دۆزەکان دەناسرا هاتەوە سەر سفر، دەبوایە سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە.

حکومەت دووبارە لیستەکەی تاوانی دارِشتەوە. دادگا لە دیسمبەر / کانوونی یەکەم سەرلەنوێ دانیشتەوە.

لەو ماوەیەدا بۆمان ئاشکرابوو کەوا دژایەتی دادوەرەکەی بەرامبەرمان دژوارتر بووە. توورەیی حکومەت کاریگەری زۆرتری لەسەر کردووە. دووبارە تاوانەکانی ئەوەی گوایە خەڵکمان بۆ



رووخاندنی حکومەت بە وەسیلەی سەربازی هانداوە و شەڕی پارتیزانی خوێندرایەوە. منیان تاوانبارکرد کەوا بەرنامەی شۆڕشێکی شیوعیانەمان بە پاڵپشتی وڵاتانی بێگانە دارِشتووە. داواکاری گشتی ئاماژەی بە شتی وادا لە دراما دەچوو، گوایە ئەوەندەمان فیشەک و زەخیرە هێناوە بەشی تەقینەوەی جوهانسبێرگی دەکرد.

نووسەری دادگا داوای کرد بەرگری بکەین، کۆک بووین لەسەر ئەوەی بە شێوەی ئاسایی وەڵام نەدەینەوە، هەر ئەوەندە بکەین بێزاری خۆمان لە شێوەی راپەڕاندنی دادگاکەیان دەربڕین. پرسیاری ئاساییمان لێکرا، ئەویش:

تاوانباری ژمارەیەک، نیلسۆن ماندێلا وەڵامت چییە، تاوانباری یان بێتاوانی..؟ هەڵسامەوە سەر پێیان و وتم:

بەڕێز دادوەر، حکومەت دەبێ بکرێتە ناو قەفەسی تاوانباری. منیش بێتاوانم.

تاوانباری ژمارە دوو، ولتر سیسۆلۆ، وەڵامت چییە، تاوانباری یان بێتاوانی..؟

حکومەت بەرپرسە لەوەی لە وڵاتدا روو دەدات، منیش بێتاوانم.

دادوەر هاتە قسە و وتی من ئارەزووی ئەوەم نییە گوێ لەو وتارە سیاسیانە راگرم، تەنیا ئەوەندەمان دەوێت وەڵامەکان بەند بێت بە تاوانباری و بێتاوانیتان. هەمووومان گوێمان نەدایە قسەکانی ئەو، حکومەتمان خستە گۆشەی تاوانباری.

حکومەت بڕیاری دابوو وتارەکەی پارێزەری داواکار یوتار لە رادیۆی رەسمی خوارووی ئەفریقی بخوێندرێتەوە، مایکرۆفۆنیان لەبەردەم ئەو و دادوەر دانابوو، ئەوەش دراماکەی دادگای سەیرتر کردبوو.هەرکە یوتار دەنگی لێوە هات بۆ کردنەوەی مرافەعەکە، برام فیشر هەستایەوە، داوای کرد تا دادگایەکە بە شێوەیەکی گونجاو بەرێوەبچێت پەخشەکەی رادیۆ راگرن، چونکە بوونی ئەوە کار لە کەرامەتی دادگا دەکات. ئەگەرچی یوتار سووربوو لەسەر هێشتنەوەی، بەڵام دادوەر فەرمانیدا هەڵیگرن. یوتار لە وتارەکەیدا ئاماژەی بەوەدا، کەوا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی لەوەتی کاری نهێنی دەکات، بەرنامەی شەڕی چەکداری پەیڕەو دەکات ئەوەشی بۆ رووخاندنی حکومەت و وەرگرتنی دەسەڵاتە بەهێز. هەروەها وتی: ئێوە هەزارەها یەکەی چەکدارتان لە سەرانسەری وڵاتا بڵاوکردیتەوە، چاوەڕوانی هەڵچوونێکی گشتی و هێنانی هێزێکی بێگانە دەکەن. لە نانەوەی ئاژاوە و نائارامی و نەمانی یاسا پلان بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی شۆڕشگێرانەی کاتی و وەرگرتنی دەسەڵات دەکەن. هزری گەورەی پشت ئەم پلانەش «ئەمکا»یە، کە بارەگاکەشی لە

ریڤۆنیایە.

حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و حیزبی شیوعی سیاسەتەکەی بۆ دادەڕێژن. یوتار بە وتارە بە سۆزەکەی ئاماژەی بەوە کرد کەوا چۆن بزاڤی «ئەمکا» پلانی راپەڕینی ساڵی ١٩٦٣ داناو ئەندامەکانی بۆی سازدابوو (ئەوەش تێکەڵ کردنی ئێمە و حیزبی کۆنگرەی نەتەوەییە)، هەروەها چۆن ئیستگەیەکی پەخشمان لە ریڤۆنیا دامەزراندبوو، ئێمەشی بە بەرپرسی ئەنجامدانی ١٢٢ کاری تخریبی لە وڵاتا دانابوو. ئەلیاس موتسولیدی و ئەندر و مالانپینی بەرپرسی چەکدارکردنی خەڵک لە دەڤەری کیب دانا. بە درێژی باسی یەرهەمهێنانی جۆرەها چەک و تەقەمەنی و وەرگرتنی پارە لە دەرەوەی وڵات کرد.

حکومەت لەو سێ مانگەدا ١٧٣ شاهێدی ئامادە کردبوو، دۆزەکەمانی بە هەزارەها کاغەز و پسولە و بەیان و وێنەی فۆتۆگرافی و نەخشە و رەشنووس و پەساپۆرتێک بە ناوی دێڤید موتسامای دەوڵەمەند کردبوو.

یەکەم شاهێد وێنەگرێکی سەر بە پۆلیس بوو، کە لە رێڤونیا وێنەی فۆتۆگرافی وەرگرتبوو، پاش ئەو خزمەتکاری خێزانی گولدریتش بوو، کە لە کێلگەی لیلیازلیفدا بوون، ئەو ماوەیەش لە کێلگەکەدا دەستبەسەر بوون، ئەوانیش هیچ پەیوەندییان بە بۆچونی سیاسی خاوەن ماڵەکە نەبوو. ئەوان ئێمەیان یەک یەک ناساند. جیلیمان کە بە پەنجە ئاماژەی بۆ تاوانباری ژمارەیەک کرد، خۆی لە من نەناسکرد، خۆی وا نیشاندا منی لە کێلگەکە نەدیوە. داواکار داوای لێکرد باشتر دیقەتی بدات. بەڵام ئەو بە دڵنیاییەوە وتی:

ئەم ناوە لە ناو ئەم هۆڵەدا نییە. دانوستانمان لە نێوان خۆماندا کرد، دەبێ حکومەت بە چ بەڵگەیەک تاوانبارمان بسەلمێنێت. بۆ من ئەو دەمانەیە کە لە ریڤۆنیا و لە ناو وڵات و دەرەوەدا خەریکی پلان و نەخشەکێشان بووم. کە ولترم لە زیندانی بریتۆریا بینی پێم وتبوو: کتێب و بەڵگەنامە و کاغەزەکانم لە کێلگەکەدا بگوازێتەوە. بەڵام کە راستی بیرنستاین لە هەفتەی یەکەمی دادگاییەکەدا داوای بەردانی بە کەفالەت کردبوو، داواکار داواکەی رەفز کردبۆوە و بیرسی یوتار ئەو نەخشەیەی نیشان دابوو کە لە زیندان نەخشەم کێشابوو بۆ هەڵاتنم. یوتار وتبووی ئەوانە هەموویان بەرنامەی راکردنیان هەیە. ئەوەش نیشانەی ئەوەبوون کەوا بەڵگەنامەکانم هیچیان نەگوازرابوونەوە، دوایی زانیم هاورێکانم لەبەر گرنگی مێژووییان نەیانفەوتاندبون. بۆیە خەرجی داوای کەفالەتەکە کەوتە سەر ئەستۆی راستی بیرنستاین. شاهێدی سەرەکی دەوڵەت برۆنۆئەمتۆلۆ



بوو، یان بەڕێز «س» وەک لە دادگادا ناوی دەهات. کە یوتار پێناسەی کرد، وتی شاهێدییەکەی سێ رۆژ دەخایەنێت بە شێوەیەکی درامیش وتی: ژیانی لە مەترسی دایە. یوتار وتی ئەم شاهێدە لە دانیشتنێکی داخراوا قسە دەکات و رۆژنامەنووسانیش بۆیان نییە ناوی بهێنن. ئومتولو پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانە و بیرتیژبوو، لە زولوکانی دوربان بوو، لە هەرێمی ناتال ببووە سەرکردەی بزاڤی «ئەمکا».

لەبەر ئەوەی پسپۆر و شارەزای تەخریب و تەقینەوەبوو، بۆیە زۆر سەردانی ریڤۆنیای دەکرد. جارێکم لە ناتال بینیبوو، کە لە دەرەوە گەڕابومەوە، وتارێکم بۆ ئەندامانی بزاڤەکە لە هەرێمەکە پێشکەش دەکرد، ئەویش لەوێ بوو، بەڵگەکانی ئەو هیچی لە بێ تاوانباریم نەهێشتەوە، گومانم نەما. سەرەتا ئومتولو بەوە دەستی بە دووانەکەی کرد وتی:

من ئەندامی بزاڤی «ئەمکا» بووم. لە تەقاندنەوەی نوسینگەی شارەوانی و ستونی وزە و هێڵی کارەبا بەشداربیم کردووە. بە وردی و بە جوانی راڤەی کاری تەقاندنەوەکان و مین و نارنجۆکە دەستییەکان و شێوەی کاری نهێنی کرد. هەروەها وتی: هەتا ئێستاش بڕوام بە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ماوە، گلەییشم لە رێکخستنەکانی و لە بزاڤی «ئەمکا» هەیە، وا دەزانم بە دەستی حیزبی شیوعی ئەم بەرنامەیە بەڕێوە دەبەن.

ئەمتولو شەهادەکەی بە کورتی و بە وردیدا، بۆ ئامادەبووان هەموو شتەکان روون و ئاسان هاتنە گۆڕێ.

بەڵام قسەکانی نەخش و جوانکاری تێدابوو. بێگومان ئەوەش بە رێنمایی پۆلیس بووە. بە دادگای وت، کەوا من لە دیدارم بە ئەندامانی «ئەمکا»ی هەرێمی ناتالم وتبووم: ئێمە سەربازی دڵسۆزی شیوعیین و ئەوەی قسەی هەیە با بە ئاشکرا بڵێت. لە راستیدا من هەرگیز قسەی وام نەکردبوو، قسەکەی ئەو بۆ گرێدانی بزاڤەکە بوو بە حیزبی شیوعی. وردەکارییەکانی ئەوەندە وردو جوان رێز دەکرد بۆ خەڵکی ئاسایی بڕواکردنی گومانی تێدا نەدەما. بەڵام راستییەکان بەرەواژبوون. بە رووخان و خیانەتەکەی ئومتولو ئارەقەم کرد، پۆلیس و شێوە پۆلیسیەکانی ئازاردانی دەزگاکانی پۆلیسیش دەتوانی بەهێزترین ئەندامانی حیزب بروخێنێ. بەڵام ئومتولو دەستی لێنەدرابوو، ئەو دوورتر پەلی هاویشت، خەڵکی وای راکێشایە ناو مەسەلەکە، ناویان لە فایلەکانی دۆزەکە بە هیچ شێوەیەک نەهاتبوو. مرۆڤ رەنگە رامان و بۆچونی بگۆڕێت، بەڵام ئەو ژمارە زۆرە خەڵکە بێ ئاگاو بێ تاوانانە تووش بکات، شتێکە لە هزر زۆر دوورە و بیانووی بۆ نادۆزرێتەوە. دوایی بۆمان

ئاشکرابوو، کەوا ئومتولو پێش ئەوەی بێتە ناو ڕیزەکانی بزاڤی «ئەمکا» دزبووە و سێ جاریش بەم تاوانە دادگایی کرابوو.

سەرەڕای ئەو ڕابردوویەی دادوەر بڕوای پێکرد و قسەکانی کاریگەری زۆری لەسەر هەموومان زۆر بوو.

بەڵگەنامەی سەرەکی کە حکومەت ئێمەی پێ تاوانبار کردبوو ئەو بەڵگەنامەی شەش لاپەڕەییەی پلانی کاربوو، کە پۆلیس لە کێڵگەکەدا بەسەری دابوون ئەم بەڵگەنامەیان لەسەر مێزەکە لەبن دەستان گرتبوو.

پلانەکە ئەوەی دوایی بە پرۆسەی مایبوو ناسرا، جەوهەرەکەی پلانی هەڵگیرسانی شەڕی پارتیزانی بۆ ئەگەر ڕاپەرینێکی میللی دژ بە بە حکومەت بوو. بەرنامەکەی دابەزاندنی هێزە میللیەکان لە چوار دەڤەری جیاواز لە خوارووی ئەفریقیا و هێرشکردن بۆ سەر چەند مەڵبەندی دیاریکراو. هەروەها لە پلانەکەدا ئەوەش دیارکرابوو، کە هێزێکی حەوت هەزار سەربازی ئامادەکراو لە لایەن بزاڤی «ئەمکا» بە پاڵپشتی سەدو بیست سەربازی دەرەوە سازبکەن. بیانووی سەرەکی داواکاریش ڕەزامەندی لێژنەی ڕاپەراندنی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بوو لەسەر پرۆسەی مایبۆ، کە دوایی کرایە کارنامەی کاری بزاڤی «ئەمکا»، ئێمەش پێمان لەسەر ئەوە داگرت کە پلانەکە لەبەر گرتنی زۆری ئەندامان هیچی جێبەجێ نەکراو هەر لە ژێر دیراسەت دابوو، بە ڕەسمیش ڕەزامەندی لەسەر نەکرابوو. بە ڕای من ئەگەر چی پلانەکە جێبەجێش نەکراو، هەر ڕەشنووسبوو و ڕەزامەندیشی لەسەر نەکرابوو. مەبەست و لایەن و وەسیلەکانی پراکتیکانە نەبوو. ئەو دەمە بڕوام نەبوو کەوا ئەگەری پارتیزانی گونجاو بێت. پلانەکە بە ئامادەبوونی من داڕێژرابوو، ناکۆکی و بۆچوونیش لەسەر ئەوە هەبوو، کە حیزب بە ڕەسمی پلانەکەی پەیڕەو کردووە، یان نا. گوفان بە هاوکاری جو سلوفو پلانەکەی دارشتبوو، بۆیە سوور بوو لەسەر ئەوەی لە ناو دادگا باسی ئەوە نەکرێت کەوا سەرکردایەتی باڵا پێشەوا لوتولی ڕەزامەندییان لەسەر نەکردووە، ئەگەرچی لە لایەن دەستەی ڕاپەراندنی حیزبەوە دەرچووبوو. سزاکە توند و دۆزەکە ترسناک بوو. ئەوەش ئێمەی نەشلەژاند و چەند نوکتەشمان لەسەر سێدارە و لە سێدارەدان بۆ یەکتر گێڕایەوە. دینیس گولدبیرگ لە هەموومان بە تەمەن بچووکتر بوو، ئەو خاوەنی نوکتەکان بوو، لە کاتی جدی نوکتەی بۆ دەهات و نەیدەگێڕایەوە. زۆر بەوەی پێکەنین، چۆن ریموند مهلابا بۆ خۆشاردنەوە جلی پیاوانی کەنیسەی لەبەر کردبوو، بە قەشە مهلابا بانگیان کردبوو. لە نێوان خۆمان بە پسوولە نامە و شتمان بە



یەکتری دەووت پاش خوێندنەوەیان، نامەکانمان فڕێ دەدایە ناو زبڵدانەکە. مولازم سوانبولی قەڵەو ڕووسووری ئەفسەری بەشی تایبەتی چاودێرمان، هەستی دەکرد نامەکان لەسەر ئەوە و باسی ئەو دەکەین. ڕۆژێکیان بە وردی تەماشای دەکردین، گوفان ئەمبیکی نامەیەکی نووسی و خۆی نواند کەوا بابەتەکە گرنگ و نهێنیە و دایە من، منیش خوێندمەوە و سەرم بۆ هەژاند و دامە ئەحمەد کاسراداو ئەویش پاش خوێندنەوەی دنکە شقارتەیەکی دەرهێنا گوایە نیازی وایە بیسوتێنێت. مولازم لەبەر ئەوەی ئاگرکردنەوە لە ناو زیندانا قەدەغەیە، بۆیە بە تەنگاویی پڕی دایەو لە دەستی فراند و لە خۆشیا زۆر دڵشادی نواند، گوایە سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێناوە و نهێنیەکی ئاشکرا کردووە، کە خوێندیەوە زۆر تووڕە بوو، وتی: باشە بزانن چۆن لێتان دەردەهێنم.

گوفان نوسیبووی بە ڕاستی سوانبول پیاوێکی کۆکە..!

ژیانمان لە دەرەوەی زیندان بە ئاسایی دەڕۆیشت و چاوەڕوانی دادگامان دەکرد. باربرای ژنی جیمی کانتۆر لەسەر منداڵبوون. جیمی پارێزەربوو، هەر لەسەر ئەوە گیرابوو، چونکە زاوای هارۆلد ولبی بوو. کە لەناو قەفەسی تاوانباریبیدا بووم بەیانیەکیان ئەم نامەیەم وەرگرت:

لەگەڵ باربرا بە درێژی قسەمان کردووە، کۆک بووین لەسەر ئەوەی منداڵەکەی، چ کچ بێت، یان کوڕ بێت بە شانازییەوە، سەرەڕای ئەو بەدکاریانەی لە ڕابردوودا ئەنجامت داون، تۆم بۆ ناونانی منداڵەکە لە کەنیسە هەڵبژارد. بە بەریدی فەوری وەڵامەکەم بۆ جیمی ناردەوە، بە دڵشادییەوە من، ئەو ئەرکە قبووڵ دەکەم، نەک منداڵەکە. حکومەتیش غیرەت ناکات تا ئەو ڕۆژە لە سێدارەم بدات.

داواکار بە درێژایی وەرزی جەژنی لە دایکبوونی ساڵی ١٩٦٣ز هەتا فبرایر/ شوباتی ١٩٦٤ز خەریکی نمایشی ڕووداوەکان بوو. یەک مانگ، یان زۆرترمان لە پێش بوو بۆ پشکنینی بەڵگەکان و ئامادەکردنی بەرگرییەکان. هەموومان وەکو یەک بەڵگەکان نەیدەگرتینەوە. جیمس کانتۆر ئەندامی حیزب نەبوو، بەڵگەکان نەیدەگرتەوە، نەدەبوو هەر بێتە دادگاش. سەبارەت بە ڕاستی بیرنستاین و ریمۆند مهلاباو ئەحمەد کاسرادا بۆ بەشدارییان لە پلانگێڕان، بەڵگەکان لاوازبون. بڕیارش بوو هیچی تر نەڵێین تا هەڵوێستیان هەر بەهێز بێت. ڕاستی هەر هیچی لەسەر نەبوو، هەر ئەوەندە بوو لە ریڤۆنیا بوو. شەشەکەی تریش دەرباز نەدەبوون، بڕیارێک هەر دەیگرتنەوە.

برامی پارێزەر زیاد لە پێویست ڕەشبین بوو. ئەو دەیووت: ئەگەر بیسەلمێنین کەوا حیزب بیری شەڕی پارتیزانی و شەڕ و کاری تەخریبیشی بۆ خوێن ڕشتن پەیڕەو نەکردبێت ئەوا حکومەت سزای لە سێدارەدانمان هەر بۆ دەبڕێتەوە. هەندێک لە ئەندامانی تیمی بەرگریمان دوو دڵبوون لەسەر ئەوەی

شەهادەکانی ئێمە لەبەردەم دادگا زیان بە دۆزەکەمان دەگەیەنێ. بەڵام جۆرج بیزوس رای وابوو ئەگەر تاوانباران شەهادەی خۆیان نەدەن و بە دادگای نەسەلمێنن ئەوان پلانی شەڕی پارتیزانییان نەبووە، ئەوا قورسترین سزایان بۆ دەبڕێتەوە.

پێشەکی ئێمە بۆچوونمان وابوو، دادگا بەکارناهێنین بۆ تاقیکردنەوەی رەوتی داد، ئێمە دادگا دەکەینە سەکۆ دووان و دەربڕینی هزر و رامانی سیاسیمان. بۆ نموونە لە هەندێ کاری تەخریبی پاشگەز نابینەوە و یان لە سیاسیەتی ئەنتی توندوتیژی پەشیمان نابینەوە. خەمی رزگاربوون و سزای قورسمان نەبوو، ئەوەندەی پەرۆشی دۆزەکەمان بوو، قوربانیش هەر چی بێت گرنگ نییە. بە واتا یاسایەکەی بەرگری لە خۆمان ناکەین، بەڵکو بە واتا ئەخلاقییەکەی دەیکەین، دادگمان بە وەسیلەیەکی خەبات دەزانی.

ئامادەبووین ئەوەی حکومەت دەیزانی دانی پێبنێین، بەڵام زانیاری وا نەدەرکێنین ئەگەر زیان بە کەسانی تر بگەیەنێت.

بریارماندا رووبەڕوو بە حکومەت بلێین ئێمە بەرنامەی شەڕی پاریتزانیمان هەبووە. سیاسەتی ئەوەمان هەبوو و ئەگەر پلان و بەرنامەی کارە تەخریبیەکان سەری نەگرت، شەری پارتیزانی ئەگەری ترە.

ئەو سیاسەتەش لەبەر ئەوەی وەکو پێویست تاقینەکرابۆوە، بۆیە هەرەسی نەهێنابوو. ئینکاری ئەوەش دەکەین کە حکومەت بە کوشتنی خەڵکی بێ تاوان تاوانبارمان دەکات، ئەگەر لە لایەک ئەمەش روویدابێت، ئەوە بە دەستی لایەنی تربووە نەک ئێمە. رامان هێنانی سوپای بێگانەمان نەبووە. بۆ روونکردنەوەی پێویست، دەبوایە راڤەی تێرو تەسەلیش سەبارەت بە پرۆسەی مایبوی پێشکەش بکەین.

سەبارەت بە من حکومەت بەڵگەی روونی بۆ تاوانبارکردنم هەبوو. بە دەستنووسی خۆمەوە بەڵگەنامەیان لەلابوو کە من بە شێوەی ناشەرعی سەفەری دەرەوەم کردبوو. ئیشم بۆ سازدانی بواری راهێنانی سەربازی بۆ ئەندامانی بزاڤەکەمان بە دەرەوە کردبوو. منیش لە پشت دامەزراندنی بزاڤی «ئەمکا» بوویمە. بە دەستخەتی من دەستنووسێک بە ناوی «چۆن دەبیتە شیوعییەکی چاک»یان لەبن دەستیدا بوو، ئەوەش بەڵگەیەک بوو بۆ حکومەت کە من ئەندامی حیزبی شیوعیم. لە راستیشدا ئەوەیان قسەیەکی روناکبیری چینی لیۆشاوشی بوو، رۆژێکیان لەگەڵ موسا کوتانی دانوستانمان دەکرد، ئەو قسەیەم بۆ وروژاند، میللەت حیزبی شیوعی بە نموونە هێنایەوە، لەبن



دەستمدا نووسیم. من وام دەزانی ئەدەبیاتی شیوعییەکان بۆ دەستەیەکە، زمانەکەی بێزاریی تێدایە، خەڵکی سادە لێ حاڵی نابێت بۆ خوێنەری خۆرئاوا نوسراوە، ئەگەر بۆ هاوولاتی سادەی ئەفریقی نوسرابایە دەبوایە سادە و روونبوایە، بەڵام موسا بۆچونەکەی بە پێچەوانەی من بوو. بۆ سەلماندنی قسەکەم ئەو وتارەی لیۆشاوشی بن دەستیان، بە دەربڕینێکی ترم نوسییەوە، بە مەرجێک لەگەڵ تێگەیشتنی کەسی ئەفریقی بگونجێت.

من شاهێدی یەکەم بووم، ئەوەش دەبێتە نموونەیەک ئەوانی تر بۆ بەرگری مرافعەکانیان لەسەری دەڕۆن. لە خوارووی ئەفریقیادا یاسا وا پەیڕەو دەکرێت، شاهێد بە پێی پرسیار و وەڵام قسەکانی وەردەگیرێت، بەڵام من ئەو یاسایەم پەیڕەو نەکرد، لە جیاتی ئەمە یاداشتنامەیەکم لە ناو قەفەسی تاوانباری خوێندەوە.

هاورێکانم بە یاسای پرسیار و وەڵام شاهێدەکەیاندا.

ئەگەر شاهێد لە شێوەی خوێندنەوەی یاداشتەکەی پێشکەش بکات ئەوە تووشی پرسیار و وەڵام نابێتەوە. بۆیە یاداشتەکەی ئەو نرخەی نابێت وەک یاداشتە ئاسایەکە، ئەوەشم بۆ خۆدزینەوە بوو لە کێشەی پرسیار و وەڵامەکان. پارێزەرەکانمان هۆشیاریان کردینەوە، کەوا دادوەر ناوەڕۆکی یاداشتەکەمان بە هەند وەرناگرێت، هەڵویستیشی لاواز دەبێت. بەڵام ئێمە بۆ ئەمەیان رامانێکی فەلسەفەی سیاسیمان هەبوو لە هەمبەر دیارکردنی چوارچێوەی هەموو دۆزەکەمان. پەرۆشی رووبەڕووبوونەوەی پارێزەری داواکاربووین تا بەهێزو بە روونیەوە دادگا بکەینە سەکۆیەک بۆ دەربڕینی چەوسانەوەمان.

لەبەر بوونی ئامێری گوێگرتن لە ئاخاوتنەکانمان بە نامەگۆڕینەوە لەسەر شتەکان رێکەوتین.

ئامێرەکان سوودیشیان هەبوو، توانیمان هەواڵی چەواشەی پێ بە حکومەت رابگەیەنین. وتمان ئێمە شاهێدی لەبەردەم دادگا رادەگەیەنین. ئەوەش وای لە بەرگریکرد خۆی بۆ ئەمە سازبدات.

لە دەمەتەقێیەکی دروستکراوەوە بە جولجوفی پارێزەرەکەمان راگەیاند کارم بە دۆزی خیانەتەکەم هەیە بۆ سازدانی قسەکانم. لەبەر رۆشنایی ئەم قسەیەم یوتارم بە دیراسەتی وردەکاری دۆزەکە سەرقاڵ کرد.

دوو هەفتە خەریکی ئامادەکردنی وتارەکەی بەردەم دادگا بووم. ئێواران هەر لە ژوورەوە بووم. کە لە سازدانی تەواو بووم بۆ هاورێیەکانم خوێندەوە. رەخنە و بۆچوونەکانم بەرچاوگرت و هەندێ دەستکاریشم کرد، هەموو لایەک رەزامەندییان لەسەر راگەیاند. نیشانی برام فیشرمدا، ئەو کە

خـوێندیەوە هەندێ نیگەران بوو لە پێش پارێزەرە گـەورەکـانی وەک هال هانســونی دانا، پاش خوێندنەوەی ئەو رامانەی لەسەری هەبوو:

ئەگەر ماندێللا ئەمە لەبەردەم دادگا بخوێنێتەوە، یەکسەر لە دەرگای پشتەوە بۆ داری سێدارەی دەبەن.

بۆچوونەکە ترسی لەلای برام دروستکرد و بەیانی هات و داوای کرد دەستکاری بکەم. هەستم دەکرد هەرچی بێژین هەر سێدارەیە، بۆیە ئەوەی راستە با بە روونی بیلێین. رەوشی وڵات بە گشتی خراپ بوو.

رۆژنامـەکـان پێـشـبـینی لە سـێـدارەدانیـان دەکـرد. برام لێم پاڕایەوە دوا برگـەی وتارەکـەم نەخوێنمەوە. منیش سووربووم لەسەر خوێندنەوەی.

رۆژی دووشەممەی ٢٠/ی ئەپریل/ نیسـان لە ژێر چاودێریەکی ئاسایشی زۆرەوە ئێمـەیان بۆ دەستپێکردنی مرافەعەکەمان لە کۆشکی داد برد. دایکم لەگەڵ وینی ئامادە ببوو، بەسەر هەژاندنێ سڵاوم لێکرد، هۆڵەکە جمەی دەهات لە خەڵک.

برام فیـشـر رایگەیاند کـەوا تاوانبـاران دانیـان بە هەندێ لە تاوانەکـانیـان ناوە، ئەم قـسـەیە هۆڵەکـەی هەژاند. بەرگری ئەوە رەتدەکـاتەوە کـەوا بزاڤی ئومـخنتـووی سـیـزوی «ئەمکا» باڵێکی سەربازی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقییە. برام فیشر لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، وتی:

بەراستی بەرگری ئەمە رەتدەکاتەوە...؟

بەڵێ، ئینکار دەکـەین، لە پلانەکـەدا بەرواریک بۆ دەسـتـپـێکردنی پارتیـزانی دەسـتـنیـشـان نەکـراوە، هیـواش هەبـووە خـۆیان لەم هەنگاوە دووربخـەنەوە. برام بە دەنگێکی نەرمـەوە، وتی:

دادوەری بەڕێز، ئێـسـتـا مـرافـەعـەی بەرگـری دەست پێـدەکـات، تـاوانبـاری ژمـارە یـەک ئەوەی لە دەستەی دامەزرێنەری بزاڤی «ئەمکا» بووە، هۆکارەکانی دامەزراندیشی، لە قەفەسی تاوانبارییەوە دەخوێنێتەوە.

یوتار ترسی لێنیشت و هەڵسایەوە سەر پێیان و هاواری کرد:

گەورەم دادوەر..!! گەورەم دادوەر...!!

ئەو لەبەر ئەوەی بە مەزەندی خۆی، چاک خۆی سازدابوو، بۆیە بەم هەواڵە، کە من شیاوی ئەوە نیم وەڵامم بداتەوە بێزاری درکاند. بۆیە وتی: دادوەری بەڕێز، یاداشتی قـەفـەسی تاوانبـاری ئەو قورسیە هەڵناگرێت کە سوێندی بۆی خواردووە.



دادوەر دیفیت بە ساردییەوە وەڵامی دایەوە، وتی:

دکتۆر یۆتار، وا دەزانم پارێزەری بەرگری پسپۆری ئەوەندەی هەیە، بەبێ یارمەتی تۆ، ئەوە بە چاکی دەزانێ، وەڵامی بداتەوە.

یوتار بە دڵساردییەوە دانیشت، برام هاتە دووان و وتی:

من و وەکیلەکەم بێئاگانین لە برگەکانی یاسای جنایات. نیلسۆن ماندێلاتان پێشکەش دەکەم.

هەڵسامەوە سەر پێیان و رووم لە دادگا کرد و بە هێمنی یاداشتەکەم خوێندەوە.

منم تاوانباری یەکەم. من هەڵگری بڕوانامەی لیسانسم لە ئاداب، بە هاوکاری بەڕێز ئولیڤەر تامبۆ بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە جوهانسبێرگ کاری پارێزەرییم کردووە. بە تاوانی دەربازبوونم لە وڵات بە قاچاغ و هەندانی هاووڵاتیان لە کۆتاییەکانی مایۆ/ مایسی ١٩٦١ز بۆ مانگرتن، پێنج ساڵ زیندانیم بۆ براوەتەوە.

دەمەوێ بە خێرایی دان بەوە بنێم کەوا من لە دەستەی دامەزرێنەری بزاڤی «ئەمکا» بووم،هەتا گیرانم لە ئۆگست/ ئابی ١٩٦٢ز دەوری سەرەکییم تێدا هەبووە.

لە سەرەتادا ئەوە بە درۆ دەخەمەوە، کەوا خەباتی خەڵکی خوارووی ئەفریقیا بە دەستی وڵاتانی دەرەوە و شیوعییەکانە. من وەکو و کەس و سەرکردە، لەبەر ئەو رەوشەی خوارووی ئەفریقیا و لەبەر نەژادی ئەفریقیم، نەک لەبەر ئەوەی کەسێک لە دەرەوەی خوارووی ئەفریقیا پێیڕاگەیاندوم، خەباتم کردووە. لە تەمەنی منداڵی و گەنجیمدا لە دەڤەری ترانسکای زۆرم لە زاناکانی عەشیرەتەکەم لەسەر مێژووی پڕ شانازی میللەتەکەم بیستبوو. چیرۆکی بەرخودان بۆ سەربەستی و رزگاری خاکی وڵاتیان بۆ دەگێڕاینەوە.

پاڵەوانیەتی دینگانی و بامباسا و هینتساو ماکانا وسقوانگتی و دالاسیلی و موشیویشوو سیخوخونی، نموونەی شانازی نەتەوەی ئەفریقیم بیستبوو. ئەوانە فێریان کردم رۆژێ دادێ بتوانم بۆ خزمەتی میللەتەکەم خەبات بکەم. ئەوانە سەرچاوەی ئەوەن، کە ئیمڕۆ لەسەری دادگایی دەکرێم.

پاش ئەو پێشەکییە دەبوایە بێمە سەر مەسەلەی توندوتیژی. هەندێک لەوانەی لەم دادگایەدا بیستم، راستن، هەندێکیانیشش درۆن. ناڵێم من پلانی کاری تەخریبم دانەناوە. ئەوانەشم بۆ ویستی ئاژاوە و شێتیم نەبووە. بە پێچەوانەوە، من ئەوانەم کردووە، پاش ئەو رەوشە سیاسییەی لە وڵاتا، بەرجەستە ببوو. چەوسانەوە و زوڵم و داپڵۆسین لە لایەن پیاوانی سپی گەیشتبووە لوتکە بەرامبەر رۆڵەکانی نەتەوەکەم. بە ئەنقەست، دەمویست بە دادگا رابگەیەنیم کەوا پەیڕەوی

هێزمان لە دیدی نامەسئولانە و بێ هزریان نەبووە. هەروەها پەرۆشیش بووین لەمانەدا قوربانی
گیانیش نەبێت.

حیزبی کونگرەی نیشتمانی ئەفریقی کۆششی بۆ دیموکراسی ئەنتی نەژادپەرستی بووە، کاری بۆ
نزیکبوونەوەی تیرەکان کردووە. ڕاستییەکی تاڵیش هەیە، ئەو پەنجا ساڵەی بەرنامە و کاری
ئاشتیانەی حیزب، بێجگە لە چەوسانەوە و یاسای داپڵۆسین و زەوتکردنی مافەکان بەرهەمی تری
نەبووە. بۆ دادگا زحمەتە ئەوە وەربگرێت، ئەم میللەتە لە مێژە چاوی لەم بەرنامەیە و ئیشی بۆ
دەکات، تا بتوانێت شەڕی پیاوانی سپی بکات بۆ وەرگرتنەوەی مافە زەوتکراوەکانی. بەڵام حیزبی
کۆنگرەی نیشتمانی بە پەرۆشەوە ویستوویەتی ئەم هەڵچوونە جەماوەرییە بمژێت و بەرنامەی
ئاشتیانەیان بۆ پێشنیار بکات، لە کێشەی هێز و بەرکارهێنانی توندوتیژی دووریان بخاتەوە. کە
لە مانگەکانی مایۆ یۆنیۆ/ مایس و حوزیرانی/ ١٩٦١ز دا شرۆڤەی ئەنجامەکانی بەرهەمی
خەباتی ئاشتیمانکرد، بۆمان ڕوونبۆوە، بەرهەمی خێری نەبووە. بە ناچاری و بە نیگەرانییەوە هزری
ئیرهابیمان لا گەڵاڵە بوو.

بزاڤی «ئەمکا» لە نوڤێمبەری/ تشرینی دووەمی ١٩٦١ز پێکهات. کە ئەو بڕیارەماندا،
دەستکەوتی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی لە بەرنامەی ئاشتیانە و بەیەکەوە ژیانی نەژادەکانمان لەبەر
چاو گرت. بینیمان ئەوەیان وڵات بەرەو شەڕی ناوخۆ دەبات، سپی و ڕەش دەکەونە ناو شەڕێکی
ناوخۆی خوێناوی. ئەو ڕەوشەش زۆر ترسناک دەبێت، شەڕی ناوخۆ هەموو ئەو بەرنامانەی حیزب
جێبەجێی کردبوون دەیڕووخێنێت.

ئاشتی و هاوکاری و ئارامی و بەیەکەوە ژیانی نەژادەکان بە بوونی ئەم شەڕە، زۆر زەحمەت
دەبێت.

شوێنەواری شەڕەکانی ڕابردوو هەر مابوون، زامی شەڕی نێوان (بویر و ئینگلیز) پەنجا ساڵ بوو
سارێژ نەببوو. دەبێ...!! زامی شەڕی ئەمجارە ئەگەر بەرپابێت چەند ساڵ بخایەنێت..؟؟ ئەم
شەڕانە بەبێ زیان و قوربانی زۆر نابێ. هەروەها وتم: تاکە هیوامان بۆ برایەتی و پێکەوە ژیانی
نەژادەکان پەیڕەو کردنی هێزبوو، حکومەت زۆر بە توندی بە سزای مردن وەڵامی داینەوە. ئێمە
شەڕی ناوخۆمان ئارەزوو نەبووە. بەڵام، بە ناچاری خۆمان بۆ ساز دەکرد. ئەم ئەزموونە بوار بۆ
حکومەت ساز دەکات ڕەشەکوژی ئەفریقیەکان بکات. ڕژانی خوێنی زۆری نەوەی نەتەوەکەمان بە
بەرکارهێنانی هێز، وای لێکردین پەیڕەوی بەرنامەی هێز بکەین. کە شەڕ یەخەی گرتین، دەبێ بە



مەرجی سوودی زۆر بۆ نەتەوەکەمان بچینە ناو مەیدانەکە.

تاکە بژارمان بۆ کەمترین قوربانی شەڕی پارتیزانی بوو. بۆیە بەرنامەی دواڕۆژمان لەم
سەرچاوەیەوە داڕشت. سپییەکان ڕاهێنانی سەربازییان دەکرد و ڕەشەکانیش لێی بێ بەریبوون.
وامان دەبینی دەبێ ناوکێک بۆ هێزێکی پێشڕەوی ڕاهێنراومان بۆ کاتی بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ
هەبێت. پێش ئەوەی کاتمان بە فیڕۆ بەسەردا گوزەر بکات، دەبوایە ئامادەباشی بۆ بکەین، کە بۆمان
نەکرا.

بە دادگام وت من لەم ماوەیەدا، بۆ بەشداریکردنی کۆنگرەی بزاڤی نەتەوەیی ڕزگاری ئەفریقیای
خۆرهەڵات و ناوەڕاست و خواروو و بۆ ڕاهێنانی سەربازی، چومەتە دەرەوەی وڵات. مەبەست لە
ڕاهێنانی سەربازیشم بۆ هاوشانی میللەتەکەم بووە، ئەگەر دووچاری شەڕی پارتیزانی بێت. بڕواشم
وابوو چالاکییەکانی تەخریبیمان مەبەستی نەپێکاوە، بۆیە دەبێ بەردەوام بین لەسەر ئەم بەرنامەیە.
بۆ دادگاشم ڕوونکردەوە، کەوا هێلێک لە نێوان حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و بزاڤی «ئەمکا»دا
هەیە، دەمانویست بە باشی هێلی نێوانیان دیار بێت. ئەوە بەرنامەمان بوو. بەڵام لەبەر گیران و
چاودێری زۆری ئەندامەکانمان لە لایەن حکومەتەوە، تەگەرەی زۆرمان دەهاتە پێش، بە ناچاری
زۆریان لە هەردوو ڕێکخراودا کاریان دەرکرد. وای لێهات جیاکردنەوەی نێوانیان زەحمەت بوو،
بەڵام هەرمابوو.

بۆ دادگام ڕوونکردەوە کەوا بە هیچ شێوەیەک ئێمە بەرنامە و ڕێنمایی حیزبی شیوعیمان پەیڕەو
نەکردووە. ئایدلۆژیای حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هەر بۆ نەتەوەی ئەفریقی بووە و بەس.

شیعارەکەمان هەر وەکو خۆیەتی کە دەڵێت(پیاوی سپی لە دەریا دەکەین). بڕوابوونمان بە
نەتەوەیی ئەفریقیش، واتە میللەتی ئەفریقی لەسەر خاکی خۆیدا بە ئازادی بژیێت. گرنگترین
بەڵگەنامەی حیزبیش بەڵگەنامەی ئازادییە، کە تێدا هەرگیز داوای دامەزراندنی دەوڵەتی
سۆشیالیستی نەکردووە....

ڕۆژێک لە ڕۆژان حیزب داوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئابووری نەکردووە، وەک ئاگاداریش بم
دژی ڕژێمی سەرمایەداریش نەبووە.

لە ناو حیزبی ئێمەدا، تەنیا ئەفریقییەکان دەتوانن کاری تێدا بکەن، ئەوەش بە پێچەوانەی
حیزبی شیوعییە. بەرنامەی سەرەکی و یەکەمان ئەفریقییەکان یەکبگرن و مافە سیاسییەکانیان
هەبێت. بەرنامەی حیزبی شیوعی ڕووخاندنی سەرمایەداری و دامەزراندنی حکومەتێکی

کرێکارییە. حیزبی شیوعی جەخت لەسەر بوونی جیاوازی چینەکان دەکات و ئێمەش داوای نزیکبوونەوەیان دەکەین.

راستە یارمەتیمان لە نێواندا هەیە، ئەوەش وەنەبێ هاوشانی مەبەستەکان بێت، وەک کۆشش بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتی سپییەکان. لە مێژووی بەشەرییەتدا نموونەی دیاری هاوکاری هەیە، وەک یارمەتی بەریتانیای مەزن و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت دژ بە هتلر. ئەوەش هەتا هتلریش نەیتوانی بڵێت، تشرشل یان روزفیلت بونەتە شیوعی یان داری دەستی شیوعیەت، یان بەریتانیاو ئەمریکا کار بۆ بە شیوعیکردنی جیهان دەکەن. ئاسان نییە، هەتا ئەو سپیانەی رقی کۆنیشیان دەرحەق بە شیوعییەکان هەیە بزانن بۆچی سیاسی ئەفریقی، شیوعییەکان دەکەنە هاوپەیمانی خۆیان. بەڵام بۆ ئێمە هۆیەکە دیار و روونە. جیاوازی رامانیش لە نێوان خەباتگێران، ئەوانەی دژ بە ستەم و چەوسانەوە کاردەکەن هەر هەیە. شیوعییەکان تا ئیمڕۆش تاکە کۆمەڵەی سیاسین لە خوارووی ئەفریقیادا مەمەڵە وەک بەشەر لەگەڵ ئەفریقییەکان دەکەن وەک بەشەر تەماشایان دەکەن. لەگەڵمان دەخۆن و دەخۆنەوە، دەماندوێنن و کارمان لەگەڵ دەکەن و لە ناوماندا دەژین، بۆیە زۆر لە ئەفریقییەکان ئازادی و شیوعییەت بە یەکسانی دەبینن.

بە دادگام وت، من هەرگیز شیوعی نەبوومە بەردەوام خۆم بە نیشتمانپەروەرێکی ئەفریقی زانیوە.

ئینکاری ئەوەش ناکەم حەز بە خولقاندنی کۆمەڵێکی بێ جیاوازی چینایەتی دەکەم و مەیلی مارکسیەتیم هەیە. سەرکردەکانی ئەفریقی لە وڵاتانی تازە ئازادبوو جۆرێک لە بەرنامەیەی سوسیالیستیان بۆ گەیاندنی وڵاتەکەیان بە رەوتی وڵاتانی پێشکەوتووی خۆرئاوا پەیرەو دەکرد. لە خوێندنەوەی هزری مارکسییەت و دەمەتەقێ لەگەڵ شیوعییەکانا فێرببووم، کەوا پەرلەمانەکانی خۆرئاوا رژێمێکی کۆنەپەرستانەیە و گیانی دیموکراسی تێدا نییە. بەڵام من بە پێچەوانەی هزری وان رژێمی خۆرئاوام لا پەسندبوو.

بەڵگەنامەی مەزن و سکاڵانامەی مافەکان و یاسای مافەکان، هەموویان لە لای دیموکراتخوازانەوە پەسەندن. من رێزی زۆرم بۆ دامەزراوە سیاسییەکانی بەریتانی و رژێمی دادگەوەریان هەیە. پەرلەمانی بەریتانی لە لای من بەرزترین دامەزراوی دیموکراسیە لە جیهان. زۆر بە سەربەخۆیی دادی بەریتانی معجبم، رۆژبەرۆژ بێلایەنی زۆرتری لێ دەوکەوێتەوە. هەمان سۆز و رامانیشم بەرامبەر بە پەرلەمان و دادی ئەمریکیش هەیە، لەوێش دادو دەسەڵات سەربەخۆیی



خۆیان هەیە.

بە درێژی باسی جیاوازی ژینی رەش و سپیم لە خوارووی ئەفریقیادا کرد. رەشەکان لە رەوشێکی تەندروستی و فێربوون و داهات و گوزەرانی خراپدا دەژین. سپییەکانیش لەوپەڕی خۆشی و شادومانی دەژین. کاریش بۆ گەشەی زۆرتر دەکەن. سپییەکان زۆر ئەوە دەڵێنەوە، کەوا ژینی ئەفریقییەکانی خوارووی ئەفریقی لە وڵاتانی تری ئەفریقیا باشترە. دەڵێم باشترە لە وڵاتانی تر. بەڵام لە هاووڵاتیانی سپی لە وڵاتا خراپترە، لەوان هەژارترین، یاساکانی پەیڕەوکراو لە وڵاتا ئەم جیاوازییەی خولقاندووە و بواری دروستبوونی یەکسانی نادات. ئەوەی ئیمڕۆ رەشەکان لە چەوسانەوە هەستی پێدەکەن لە ئەنجامی سیاسەتی راستەوخۆی سپیەکانە. سالاریەتی سپییەکان، واتە نزم راگرتنی رەشەکان. ئەو یاسایانە لە قازانجی سپییەکانە و، رەشەکان زەلیل دەکات. کارەکانی دەستی بێگومان ئیشی ئەفریقییەکانە. هەر دەمێک پیاوێکی سپی ویستی شوێنێک پاک بکاتەوە، یا کالایەک بگوازێتەوە، چاو لە پیاوێکی رەش دەگێرێت ئەو کارەی بۆ ئەنجام بدات، بێ ئەوەی کارکەر ئەویش بێت.

ئەفریقییەکان لە خوارووی ئەفریقیادا، داوای تەواوی بەشی خۆیان دەکەن. داوای ئارامی و پاراستنیان لە کۆمەڵگا دەکەن. پێش هەموو شتێک داوای مافی سیاسی خۆیان دەکەن، بێ ئەوە هیچ شتێ مەیسەر نابێت. دەزانم ئەوە شۆڕش دەگەیەنێت، چونکە رەشەکان لە وڵاتا زۆرینەن، بۆیەش پیاوی سپی لە دیموکراسی دەترسێت. ئەوانەن، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی خەباتی بۆ دەکات.

خەباتەکەی خەباتێکی نەتەوەیی نیشتمانیە. خەباتە بۆ ئەوەی میللەتی ئەفریقی لە ئازار و زوڵما رزگاری بێت. خەباتە بۆ ژیان.

هەتا ئەو دەمە کاغەزەکەم دەخوێندەوە. کاغەزەکەم دانایە سەر مێزەکەی پێشم و نیگایەکەم لە دادوەر کرد. هۆڵەکە کش و مات بوو. چاوم لە چاوی دادوەر نەکردەوە هەتا ئەو وتەیەم کە لەبەر دەووت، تەواو نەکرد، کە دووانەکەم کۆتایی پێهێنا.

بە درێژایی ژیانم کاری خەباتم بۆ میللەتی ئەفریقی کردوە. دژی سالاریی سپییەکان خەباتم کردووە، هاوکات دژی سالاریی رەشەکانیش بوومە. لە ژیانمدا شەیدای کۆمەڵگایەکی دیموکراسی ئازاد بوومە، کە هەموو لایەک بە یەکسانی و یەکێتی ژیانی تێدا بەسەرببەن. هیوام وایە بۆ ئەم مەبەستە بژیم و بە دەستی بهێنم، ئەگەر بەرقراریش نەبوو، بۆی دەمرم.

هۆڵەکە هەمووی کشومات بوو. دانیشتم و ئاوڕم لە کەس نەدایەوە، وام دەزانی هەموو ئامادەبووان تەماشام دەکەن. سەرەتا وا دیاربوو بێدەنگیکە زۆر دەخایەنێت. بەڵام هەر نیو دەقیقەی خایاند.

ئامادەبووان بە قیژەی ژنانیشەوە بەیەکەوە هاواریکیان لێ بەرزبۆوە. خوێندنەوەکەم درێژایی دانیشتنەکەی خایاند، زۆرتر لە چوار سەعات، لە هەشتی بەیانییەوە هەتا چواری ئێوارە. کە رەوشەکە هێمن بۆوە، بۆ هەڵمژینی ئاڵۆزیی وتارەکەی من و لەبەر ئامادەبووان، دادوەر داوای تاوانباری ژمارە دووی کرد. نەدەبوو ئەم رۆژە، وتارەکەی من، یەکەم و دوا وتار بێت. بەڵام داواکەی بەرهەمی نەبوو، کە تەواو بووم دانیشتمەوە، جارێکی تر دادوەر دەم و چاوی منی نەدیتەوە.

رۆژنامەکانی ناوخۆ و دەرەوە بایەخی زۆریان بە وتارەکەمدا، سەرەڕای قەدەغەیی وتارەکەم بە پێی یاسا، رۆژنامەی راند دیللی مایل هەمووی بلاوکردەوە. یاداشتنامەکە هێلی دیاری بۆ بەرگریمان دانا، هیچمان بۆ داواکار نەهێشتەوە، ئەوان وایان دەزانی ئێمە وەک شاهێد و بەرگری و دانپێنەنان بە کارە تەخریبییەکان دێینە دووان، چەکمان کردن. بۆیان روونبۆوە، ئێمە بە پێی یاسا لە کارەکان پاشگەز نابینەوە، بە پێچەوانە بە شانازی و بە ئەنقەست دانمان بە تاوانەکان نا.

شاهێدی دووەم، ولتر سیسولو بوو، بەختی ئەو وا کەوتەوە، ئەو توندیەی داواکار بۆ منی سازکردبوو، دووچاری ئەو بۆوە. ولتر تووشی چەندین پرسیاری ئیستفزازی و رەق و دوژمنکارانە هات، ئەویش بە هێمنی و بە وردی وەڵامی دانەوە. روونی کردەوە کەوا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بەرنامەی پرۆسەی مایبوی لە شەڕی پارتیزانی پەیڕەو نەکردووە. هەروەها وتی:

من دژی پەسەندکردنی بووم لە لایەن حیزبەوە چونکە، ئەو سیاسەتە هێشتا کاتی نەهاتبوو.

دوایی نۆرەی گوفان هات، بە شانازییەوە باسی تۆماری کاری خۆی لە ناو حیزبی شیوعی کرد. پارێزەری داواکار پرسی: کە بەشداری هەندێ لە چالاکییەکانت کردووە، بۆ دان بەو چوار تاوانە نانێیت کە ئاراستەت کراوە. لە وەڵامدا وتی:

سەرەتا وام زانی دەبێ لێرە راوەستم سوێند بخۆم و هۆکارەکانی بەشداربوونم لەو رێکخراوانە راڤە بکەم. ئەوەش لایەنێکی ئەخلاقی هەیە. دووەمیان، دانپێنانم بە تاوانێک، واتە بە سادەیی دانپێنانێکی ئەخلاقییە، بەڵام لە رووی ئەخلاقییەوە هەست بە تاوان دەکەم ئەگەر شتێ بڵێم.

ئەحمەد کاسرادا و راستی بیرنستاین ئەندامەتیان لە حیزبی شیوعی و کۆنگرەی نیشتمانی



راگەیاند. راستی لە کێلگەی ریڤونیاش گیرابوو، بەڵام حکومەت بێجگە لە بەشداریکردنی لە پەخشی رادیۆیی، هیچ بەڵگەی تری لەسەر نەبوو. ئەحمەد کاسراداش وتی:

من بەشدارییم لەو چالاکییانەی رووبەڕووم کراونەتەوە، هەموویان بە درۆ دەخەمەوە، پاڵپشتی نەبەردییەک دەکەم خەبات بەرەو پێشەوە ببات.

وەک پێشتر ئاماژەم پێدابوو، گرتنی گیراوی ژمارە هەشت، جیمس کانتور و دادگاییکردنی جێگای سەرسوڕمانی هەموومان بوو. زاواو شەریکی نوسینگەی پارێزەری بوو لەگەڵ هارولد ولب، نوسینگەکەیان خزمەتی زۆری یاساییان کردین، بەڵام لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و بزاڤی «ئەمکا» ئەندام نەبوو. هیچ بەڵگەی دژ نەبوو، من وام دەبینی گرتنی ئەو هەر بۆ بێزارکردنی پارێزەرە پێشکەوتوخوازەکان بوو.

جیمس جلی جوان و بە زەوقی لەبەر دەکرد، ملپێچێکی حەریری نایابی بەستابوو، منیش ملپێچێکی پانی مۆدیل کۆنم بەستابوو . پێم وت:

وەرە، با ملپێچەکانمان بگۆڕینەوە. دەڵێت چی...؟

لە دانیشتنەکەی داننان بە بڕیارەکە، ئەو بە ملپێچەکەی منەوە دەرچوو. کە دادوەر ئازادیکرد بە ملپێچەکەی ماڵئاواییکردنی بۆ پێکرد و رۆیشت.

رایموند مهلابا یەکێک بوو لە ناودارترین کەسایەتی حیزب و بزاڤی «ئەمکا» لە دەڤەری کیبی خۆرهەڵاتا. بەڵام ئینکاری کرد کەوا ئەندامی بزاڤەکەیە و ئاگاداری چالاکییە تەخریبییەکانە. حکومەتیش بەڵگەی وای لەسەر نەبوو. بڕیاریشماندا تاوانباری ژمارە نۆ ئەلیاس موتسولیدی و تاوانباری ژمارە دە ئەندرو ئەملانگینی لە قسەکانیان هیچ نەڵێن، چونکە هەردووکیان ئەندامی ئاسایی بزاڤ بوون و شتی تازەیان پێ نەبوو. ئەلیاس ئەگەرچی لە زیندانا دارکاریش کرابوو، بەڵام هیچی نەدرکاندبوو،ئەندرو بە بێ سوێندخواردن دانی بەوە نابوو کەوا نامە و رێنمایی لە جیاتی بزاڤی «ئەمکا» گەیاندبوو، بۆ ئەوەش جلی قەشانی پۆشیبوو. بە دادگاشی راگەیاند ئەوەش وەک ئەوانیتر لە زیندانا بە کارەبا ئازار دراوە و لێدانی خواردووە. ئەندرو دوا شاهێدی دۆزەکە بوو. بەرگری هیچی نەما بیڵێت، هەر ئەوە مایەوە دادگا مرافعاتی کۆتایی و دوا بڕیار رابگەیەنێت.

لە رۆژی ٢٠/ مایو/ مایس پارێزەری داواکار یوتار چەند دانەی بەرگکراوی لە دوا وتارەکەیدا بە دەزگاکانی راگەیاندن و دانەیەکیشی دایە پارێزەری بەرگری. ئەگەرچی لە بەرگێکی قەشەنگا بوو، بەڵام زۆر بە ئاڵۆزی و شێواوی وتارەکانی تۆمارکردبوو، وەکو پێویست بەڵگەو روونکردنەوەی

لەسەر تاوانەکان و هەڵسەنگاندنی تێدانەبوو، جنێوو قسەی ناشیرینی سۆزداری زۆری تێدابوو. وەک ئەوانەی خوارەوە لە قسەکانیدا هاتبوو:

ئەو شێوە فێڵبازانەی تاوانباران پەیڕەویان دەکرد، مایەی شەرم بوو. ئەگەرچی ئەوان لە سەدا یەکی دانیشتوانی بانتۆن، ئەرک و گلەیی هەمموو هاوولاتیانی خوارووی ئەفریقیایان لەسەر شان بوو، گوایە دووچاری جۆرەها ستەم و چەوسانەوەو لاوازیی هاتوون.

دووبارە دادوەر گومانی لە ئاکارا دەرکەوت و قسەکانی پێبڕی و وتی، بەڕێز یوتار دان بەوە دەنێیت، کەوا نەتوانی بیسەلمێنیت حیزبەکە بڕیاری شەڕی پارتیزانی داوە. وایە یان نا..؟؟

یوتار شکایەوە. ئەو بە پێچەوانە تێدەگەیشت. ئێمەش بەو قسەی دادوەر سەرسام بووین و هیوامان لا دروست بوو. یوتار ویستی بە شلەژانەوە بە دادگا بڵێت، کەوا حیزب ئامادەباشی بۆ پارتیزانی هەبووە. بە بێزارییەوە دوفیت وەڵامی دایەوە و وتی:

بەڵێ، دەزانم، بەرگریش ئەوەیان وت، بەڵام تاوانباران دەڵێن، هەتا گیرانیشمان نەمانتوانی بڕیاری کۆتایی بۆ پارتیزانی بدەین. ئەوەی من لە تۆ تێدەگەم قسەیەکت نییە بەرپەرچی ئەوانە بدەیتەوە. بەو بڕیارە رازیت.

جەنابی دادوەر خۆت دەزانی.

یوتار کۆتایی بەوە هێنا کەوا کێشەکە خیانەتی مەزن لە جۆری یەکەم نییە بەڵکو کێشەی کوشتن و کۆششە بۆ کوشتن. هەردوو گومانەکە لە لیستی تاوانبارکردنا نەهاتووە. بە تووڕەییەوە وتی:

تۆ جورئەت ناکەیت شتە وردو گەورەکانی ناو لیستەکەت بسەلمێنیت. دەیزانی ئەو قسانە سەرچاوەی راستیان تێدا نییە.

یەکەم کەس لە تیمی بەرگری ئارسەر شاسکالسۆن قسەی کردو وەڵامی لایەنە یاساکانی دایەوە، کە داواکار وروژاندبووی. ئەوەی کە یوتار سەبارەت بە کوشتار باسی کردبوو، ئەو وتی: براڤەکە لەگەڵ خوێن رشتن نەبووە. روودانی کارە تەخریبیەکانی خستە ئەستۆی لایەنیتر، دادوەر وەڵامی دایەوەو وتی، ئەوەمان بڕاندیتەوە. ئەو قسەیەی دادوەر سەرکەوتنێکی مەزنی چاوەڕواننەکراو بوو.

برام فیشەر زۆر پەرۆشی وەڵامدانەوەی دوو گومانی ترسناک بوو، ئەویش نیازی شەڕی پارتیزانی براڤەکەو، یەک بەرنامەیی و یەک رێکخستنی لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بوو.



ئەگەرچی دادوەر بڕوای هەبوو کەوا براڤەکە دەستی بە شەڕی پارتیزانی نەکردبوو. بەڵام وریایی دەویست. کە فیشر ویستی بەردەوام قسە بکات دادوەر بە تووڕەییەوە وتی:

وا دەزانم هەڵوێستی خۆم لەم بابەتەدا دەربڕی. من رازیم بەوەی کەوا هیچ چالاکیەکتان نەکردووەو رۆژی دیارکراویشتان بۆی نەبووە.

برام ویستی بچێتە ناو بابەتی دووەم، دادوەر قسەکەی پێبڕی و وتی: من ئەوەش دەزانم کەوا رێکخراوەکان، دوو رێکخراوی جیاواز بووینە. برام ئەو رامانەی دادوەری لە هزرا نەبوو. لەبەر ئەوەی دادوەر لە شتەکان گلەیی نەبوو، بۆیە دانیشتەوە. ئەگەرچی دووچاری سزای لەسێدارەدانیش ببووین، بەڵام هەستمان بە دڵشادیی کرد. بۆ ئەوەی دادوەر بڕیاری کۆتایی لە دۆزەکەمان دەربکات، دانیشتنەکە بۆ سێ هەفتە دواخرا.

* * *

لە هەمموو جیهاندا رۆژانەی دادگای ریڤۆنیا سۆراخ دەکرا. لە کاتیدرائیەی سانت ول لە لەندەن بە درێژایی شەوەکە نوێژمان بۆ دەکرا. خوێندکارانی زانکۆی لەندەن بە بێ ئامادەبوونی من، منیان بە سەرۆکی یەکێتی خوێندکاران هەڵبژاردبوو. لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەستەیەک لە پسپۆڕان پێشنیاری سازکردنی کۆنگرەیەکی نیشتمانیان بۆ خوارووی ئەفریقیا کردبوو، تێدا بڕیاری پەرلەمانێکیان دابوو، نوێنەری راستەقینەی میللەت بێت. داواشیان کردبوو لێبووردنی گشتی بۆ گیراوانی دژ بە نەژادپەرستی دەربچێت. بە دەنگنەدانی چوار دەوڵەت، لەوانە ئەندامانی بریتانیا و ئەمریکا لە جڤاتی دەوڵەتان بڕیارێک دەرچووبوو، داوایان لە حکومەتی خوارووی ئەفریقی کردبوو، دادگاکە راگرن و لێبووردن بۆ گیراوەکان دەربکات.

لە رۆژانی پێش دانیشتنەکانی دادگای ئیستئناف، خەریکی خۆسازکردنبووم بۆ ئامادەکردنی چەند لێکۆڵینەوەیەک بۆ خوێندنی بەکەلۆریۆس لە یاسا، لە زانکۆی لەندەن. بەشداریکردنم لە تاقیکردنەوە و خۆسازدانم شتێکی سەیربوو، لەو رۆژانەی چاوەڕوانی بڕیاری دادگام. پاسەوانەکان زۆریان لا سەیر بوو. بە بیریان دەهێنامەوە کە من بەرەو کێندەرێ دەچم، پێویستم بە تاقیکردنەوە نییە، لە راستیدا حەزم بەم تاقیکردنەوەیە هەبوو.

ئەوەش هێمای هیواو بەردەوامیم بوو. دەمزانی لەم نزیکانە کاری یاسایی ناکەمەوەو ئیشم پێ

نیبیە بە پێچەوانەی ئەوەش بیرم نەدەکردەوە. تاقیکردنەوەکەم بە سەرکەوتوویی ئەنجام دا.

دووبارە لە کۆشکی داد لە رۆژی پێنج شەممەی ١١/یۆنیۆ/حوزەیران کۆبووینەوە، چاکم دەزانی شەشمان تاوانبارکردنمان دوا بڕیاری دادگا بوو. تاکە پرسیاریش سزاکەمان چییە؟؟

دادوەر یەکسەر هاتە ناو بابەتەکە. بەهێمنی و لەسەرخۆ قسەی دەکرد.

هۆکارەکانی حوکمەکانم تۆمارکردووەو بڕیاردراوە بە پێویستی نازانم بیانخوێنمەوە. تاوانباری ژمارە یەک، بەهەر چوار تاوانەکەی تاوانبارکراوە. تاوانباری ژمارە دوو، ئەویش بە هەر چوار تاوانەکە تاوانبارکراوە. تاوانباری ژمارە سێ، بە هەر چوار تاوانەکە تاوانبارکراوە ...

کاسرادا بە یەک تاوان تاوانبارکرا. راستی بیرنستاین لەبەر ئەوەی هیچی لەسەر نەبووە ماڵ، بۆیە سەربەست ئازادکرا. دوفیت، بەردەوام بوو وتی:

ناخوازم لەم دانیشتنەدا لە سزاکە بدوێم، بوار بۆ حکومەت و بەرگری کراوەیە تا کاتژمێری دەی بەیانی بۆ پێشکەشکردنی راپۆرتی تازە.

دانیشتنەکە هەڵگیرا.

هیواداربووین کاسراداو مهلابا ئازاد بکرێن، کە تاوانبارکران ئەوەمان بۆ روونبووە کەوا حکومەت زۆر توندە بەرامبەر بە دۆزەکە پرسیار لێرە ئەوەیە، سەرەڕای لاوازی بەڵگەی پێویست، وا مهلابا بە هەر چوار تاوانەکە تاوانبارکرا، ئەدی بۆچی سزای سێدارە بۆ ئەوانەی بەڵگەی مسۆگەریان لەسەرە دانانێن..!!

ئەمشەوە خەریکی تاوتۆکردنی رەوشەکەبووین. من و ولترو گوفان بڕیارماندا سزاکان هەرچی بێت، داوای ئیستئناف نەکەین. پارێزەرەکانمان بەم بڕیارەمان ئەبلەق بوون. دەمانزانی ئەم بڕیارە هەڵوێستی ئەخلاقیمان بەرامبەر بە دۆزەکەمان لاواز دەکات. لەسەرەتادا سەربەرزیمان بە دۆزەکە راگەیاند، ئەوەشمان لە روانگەی ئەخلاقییەوە نواندبوو. بە ئیستئنافکردنی دۆزەکە هەڵوێستەکەمان بەرەواژ دەکەین. سزای لەسێدارەدان لە ناو ولاتا هەژانێکی جەماوەری گشتی بەرپادەکات، ئەوەش ئەم سۆزە مەزنە لەبار دەبات. ئەو پەیامەی دەبێ ئاراستەی خەڵکی بکەین، هەموو شتێک بۆ خەبات لە پێناوی ئازادی هەرزانە.

تیمی پارێزەران بەم بڕیارەی ئێمە رازی نەبوون و داوایان کرد باش بیر لەم بڕیارە بکەنەوە، من و ولترو گوفان بیرمان لەوە دەکردەوە، بەیانی بە راگەیاندنی بڕیارەکەی دادگا چی بڵێین چیمان لەدەست دێ ئەگەر بڕیاری سێدارەمان بۆ دەرچوو. پارێزەرەکە وتی دادوەر پاش بڕیارەکە لەبەر



ئەوەی تۆ تاوانباری ژمارە یەکی لێت دەپرسی:

چ بیانورت هەیە بڕیاری سێدارەت بۆ دەرنەچێت...؟

بە تیمەکەم وت:

لەو حاڵەتەدا قسەی زۆرم هەیە بیڵێم. من بۆ مردن ئامادەم و دەزانم مردنی من رێبازی خەبات بەرەو پێشەوە دەبات. رۆحی ئێمە بەفیرۆ ناچێت، بە گیانێکی شەهیدەوە زۆرتر خزمەت بە میللەتەکەمان دەکەین لەوەی لە ژیاندا بمێنین. پارێزەرەکان وتیان:

ئەم قسەیە وا دەکات ئیستئناف مەحاڵ بێت. وەڵامم دایەوە ئێمە داوای ئیستئناف ناکەین.

ئەگەر دادگاییەکە سێدارە نەبێت، ئەوە ئیستئناف نەکردن پێویست نییە، چونکە لەو حاڵەتەدا ئەگەری دۆڕانمان هەیە. دادگای ئیستئناف نەرمی دادوەر دوفیت دەبینێ و بڕیاری لەسێدارەدان دەچەسپێنێت. ئیستئناف، داوا و تەوژمی جیهانی بۆ ئازادکردنمان سست دەکات. لەسێدارەدان ئەگەری نزیکی حکومەتە. جارێکیان جون فۆرستر وەزیری داد بە برادەرەکانی دەووت: سەرۆک وەزیران سماتس لە رۆژانی شەڕی دووەمی جیهانیدا هەڵەیەکی گەورەی کردبوو کە کەسانی تاوانبار بە خیانەتی مەزنی لەسێدارە نەدابوو. ئێستاش حیزبی نیشتمانی هەڵەی وا ناکات.

ئامادەبووم لەسێدارەدان قبووڵ بکەم. ئەگەر مرۆڤ کارێک بکات دەبێ ئەنجامەکەی وەرگرێت، ناکرێ مرۆڤ شتێ بکات و ئەنجامەکەی قبووڵ نەکات. هەموومان لەبەر ئەوەی ئازابووین بۆیە ئامادەین و واقیعین. ئەو قسەی شکسپیرم بەبیر هاتەوە کە دەیووت:

وەرگرتنی ئاکامی مردن بە خۆشی، تامی مردنەکە وەک تامی ژیان خۆش دەکات.

* * *

سالێک بەسەر گیرانەکەی ریفۆنیای بەدناو رابوورد. بۆ دواجار لە رۆژی هەینی ١٢/یونیو/حوزەیران/١٩٦٤ لەژێر چاودێریەکی توندەوە کاروانەکەمان شەقامەکانی شاری بەخێرایی لەگەڵ دەنگی ئینزارەوە بڕی و چووینە ناو هۆڵی دادگا. شەقامەکانی بەرەو دادگا هەموویان گیرابوون. ئەوەی لە دادگا نزیک بایەوە پۆلیس داوای پسوولەی تایبەتی لێدەکرد. لە وێستگەکانی شەمەندەفەرو پاسەکانا خاڵی پشکنین دانرابوون.

سەرەڕای دەستدرێژی پۆلیسەکان نزیکەی دوو هەزار کەسی لافیتە بەدەست راوەستابوون، لە

لافیتەکانیان نووسرابوو «ئێمە لەگەڵ سەرکردەکەمانین». سەکۆکەی دادگا پڕ خەڵک بوو، بۆیە ڕۆژنامەنووسانی ناوخۆو جیهانی بە ناچاری بەپێوە مابوونەوە.

بە دەست سڵاوم لە وینی و دایکم کرد، ئەوەی ئەرکی سەفەری لە ترانسکایەوە کێشابوو. بە هاتنیان دڵشادبووم. بێگومان هەستێکی نامۆیە ژنێک لەم ڕێگا دوورەوە بێت و ببینێت، ئایا حوکمی سێدارە بۆ کوڕەکەی دەردەچێت ..!! بڕوام وابوو دایکم لە ناوەڕۆکی دۆزەکە نەدەگەیشت، نەیدەزانی چی روو دەدات، بەڵام هەموو گاڤێ هاوکاری وپشتیوانی بۆ من دەگەیاند. هەروەها وینیش، ئەوەش هێزو ورەی قایمتر دەکردم.

دادنووس بە ناوی دۆزی «حکومەت دژ بە نیسلۆن ماندێلا و ئەوانی تر»ی بانگ کرد. پێش وتنی بڕیارەکە بوار درا، هارۆلد هانسۆن و نووسەری بەناوبانگ سەرۆکی حیزبی ئازادیخوازان، داوای سووککردنی سزاکە بە دادگا بڵێن. هانسۆن قسەزان بوو، لە وتارەکەیدا وتی: نەتەوەکان بە داپڵۆسین دانامرکێن. ئەگەرچی وەسیلەکانی تاوانباران دژ بە یاسایە، بەڵام نیازیان تاوان نەبووە. بە بیر دادوەری هێنایەوە، کەوا میللەتی ئەفریکان خۆیان هێزیان لە خەباتیان بۆ ئازادی بەکارهێناوە.

باتون لەگەڵ بەرنامەی بەکارهێنانی هێز نەبوو، بەڵام لەبەردەم دادگادا وتی: دەکرێ دوو ئەگەر بخرێتە بەردەم تاوانباران. یان دەبێ سەریان شۆڕکەن، یان بەرگری بکەن. وا چاکە دادگا بەرامبەریان دلۆڤان بێت، ئەگەرنا وڵات هەمووی دەکەوێتە تاریکی.

دیاربوو دوفیت گوێی لەهەردوو پیاوەکە رانەگرتبوو. نە سەری بەرزکردەوە و نە تەماشای کردن، یان دەستی بۆ قەڵەم ببات تێبینیەک بنووسێت. کەوتبووە دەریای بیرێکی قووڵەوە. لە ناو مەسەلەکە دەکولا و بە نیازی بڕیارێک بوو. بەسەری ئیشارەتیدا هەڵسینەوە سەرپێیان. ویستم چاوم لە چاوی بنێم، تەماشای لای منی نەدەکرد، چاوی لە ناوەندی هۆڵەکە دەکرد، دەموچاوی ماندوو دیاربوو، بە زەحمەت نەفەسی دەهات. نیگای یەکترمان کرد، لە چاوەکانیدا بۆ هەموومان، سزای لەسێدارەدان دەخوێندرایەوە، ئەگەرنا ئەو پیاوە هێمنە بۆ وا شێواوە. دادوەر هاتە زمان و وتی:

لە نێوان ئەو دادگاییکردنەدا زۆرم لەسەر چەوسانەوەی نائەورووپیەکان بیست. تاوانبارەکان کە سەرکردەی هاووڵاتیانی نائەورووپین، زۆریان لەم زوڵمە راگەیاند، هەروەها پارێزەرەکانیشان زۆریان درکاند. وتیان بیانووی ئەم چالاکیانەمان لە ئاکامی ئەو زوڵمەیە. بەڵام من بڕوا ناکەم ئەوانە بۆ



خێرو خۆشی ئەوانی تر وا دەکەن، وەک تاوانبارەکان وتیان. ئەوانەی پلانی گۆڕانی رژێم دادەنێن و دەستەڵات وەردەگرن، قازانج و دەستکەوتی تایبەتشیان دەوێت.

دوفیت کەمێک راوەستاو نەفەسێکی دا، بە دەنگێک، هەر ئەوەتەبوو گوێمان لێبوو، کەوتەوە قسەو وتی:

دیارە کاری ئەم دادگایە وەک کاری هەموو دادگاکانی ئەم جیهانە چەسپاندنی یاساو رژێمە. دادگاش لە ژێر سێبەری یاساکانی دەوڵەت کاردەکات. ئەو تاوانەی ئەوانەی پێ تاوانبارکراوە، پلانگێڕییەو ئەوەش خیانەتی مەزنی لێ دەکەوێتەوە. دیارە حکومەت ویستی ئەم تاوانەیان نەخاتە ئەستۆ. بۆیە پاش دیراسەتی رەوشەکە بە قووڵی، گەیشتینە ئەوەی ئەو سزا گەورەیەی کە شایستەیانە بۆیان دانانێین. بە پێی ئەرکی سەرشانم ناتوانم لەوە زیاتر لەگەڵیاندا نەرم بم. بۆیە سزای هەر هەموویان زیندانی ئەبەدییە.

بە بزەوە تەماشای یەکترمان کرد. ئامادەبوان نەفەسێکی قووڵی شادیان هەڵکێشا، کە دادوەر بڕیاری سێدارەی بە سەرماندا دەرنەکرد. هەندێکیان لەبەر ئەوەی گوێیان لە دەنگی دادوەر نەبوو شاگەشکە بوون. ژنەکەی دینیس گولدبیرگ، لەبەر ئەوەی گوێی لە دەنگەکە نەبوو، هاواری کرد و لێی پرسی:

حوکمەکە چی بوو ..؟

بە دەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوە:

ئەبەدی!! هەتا هەتایێ!! ئەبەدی!!

چاوم بۆ وینی و دایکم لەسەر سەکۆکە گێڕا، لەبەر هات و هاوار وقەرەباڵغی کەس بە کەس نەبوو، کەسم بەرچاو نەکەوت، پۆلیس خەڵکەکەیان پاڵدەدا. سڵاوی حیزبم بۆخەڵکەکە کرد ئەوانیش بە سۆزەوە بۆ ئەوەی هەواڵەکە بگەیەننە دەرەوە لە هۆڵەکە دەردەچوون. پاسەوانەکان فەرمانی چۆڵکردنی هۆڵەکەیان دا. بە نائومێدی دواجار چاوم لە هۆڵەکەدا گێڕا، کەسم نەبینی.

لە ژووری خوارەوەی دادگادا بە زنجیر بەستراببووینەوە. لەبەر زۆری جەماوەرەکەی دەرەوە، پۆلیس تەنگاو و شڵەژاوبوون. نیو سەعات ماینەوە پۆلیس لە بوارێک دەگەڕا ناوچەکە چۆڵ بێت و دوورمان بخەنەوە. لە دەرگای پشتەوەی دادگاوە سواری لۆرییان کردین، هەردوولامان بە ماتۆڕ گیرابوو، رۆیشتین. لۆرییەکە تا لە جەماوەرەکە دوورمان بخاتەوە رێگایەکی نائاسایی گرتەبەر، سەرەڕای ئەوەش گوێمان لە دەنگی «هێز» و «خودایە ئەفریقیا بپارێزێت» دەبوو. لە پشتی

شیشەکانەوە دەستی بەستراومان بەرز کردەوە بە هیوای ئەوەی جەماوەرەکە بیبینن.

هەموومان ئێستا تاوانبارکراوین. دینیس گولدبێرگی سپیان لە ئێمە جیاکردەوە. ئێمەشیان لە زیندانی بریتوریای ناوخۆ، لە لایەکی لاچەپیان دانایین، هەستمان بە بوونی هیچ گیراوی تر نەدەکرد لە جیاتی هەلهەلەو هاوار تەنیا گوێمان لە قرەقڕی دەرگاو کلیلەکان بوو.

ئەو شەوە لەسەر ئەرزا پاڵکەوتم و لەگەڵ خۆمدا بڕیارەکەی دوفیتم لێکدەدایەوە. بێگومان خۆپیشاندانی جەماوەری لەسەرانسەری ئەفریقیا و پاڵەپەستۆی جیهانی، کاریگەری لەسەر ئەم بڕیارە هەبووە. سەندیکاکانی کرێکارانی جیهان نارەزاییان لەسەر ئەم دادگایە هەبووە. یەکێتییەکانی کرێکارانی دەربەندەکان لە هەموو جیهانا بڕیاری قەدەغەی کاریان بە کالاکانی خوارووی ئەفریقی راگەیاند. سەرۆک وەزیرانی رووسی لیونید بریجنێف نامەی بۆ هاوپیشەکەی لە خوارووی ئەفریقیا دکتۆر فیرفوت نووسی، تێدا داوای دلۆڤانی بۆ ئێمەکرد. لە کۆنگرێسی ئەمریکیش نارەزایی کرا. لە بریتانیادا پەنجا ئەندامی پەرلەمان رێپێوانێکیان سازکرد. دەگوترا، گوایە داگلاس هیومی وەزیری دەرەوەی بریتانی لە پشت پەردەوە، پاڵپشتی دۆزەکەمانی کردبوو. نوێنەری ئەمریکا ئەدیلای ستیفنسون لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە وتارێکدا وتبووی ئەوەی لە دەستمان بێت ناهێڵین سزای لەسێدارەدانیان بۆ دەربچێت.

هەر بیرم لەوە دەکردەوە هەر لەبەر ئەوەی شەڕی پارتیزانی دەستی پێنەکردبوو و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و بزاڤی «ئەمکا» دوو رێکخراوی جیاوازن، بۆیە لەسێدارە نەدراین و توند نەبووین. ئەو لاپەڕانەم هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد.

فیرفوت لەبەردەم پەرلەمانا وتی:

بروسکەو داواکانی وڵاتانی هەموو جیهان کاری لە بڕیارەکەمان نەکرد. بە شانازییەوە وتی: بروسکەکانی وڵاتانی سۆشیالیزمان فرێ دایە ناو تەنەکەی زبڵێ. پێش کۆتایی دانوستانەکان، دادوەر دوفیت بە برامی پارێزەرمانی وتبوو:

لە سەرانسەری جیهانا رەخنەو نارەزاییمان ئاراستەکراوە. ئەوەش بە شێوەیەک دانپێنانە بەوەی لە دەرەوە کاریگەرییان لەسەر هەبووە. ئەوەی چاک دەزانی دەرکردنی بڕیاری کوشتنمان ئەویان بە بکوژی راستی دەناساند. دوفیت لە لایەن سپییەکانیشەوە پاڵەپەستۆی لەسەر بوو. ئەو خۆی لە ئەفریکانە سپیەکان و لە بەرهەمی رژێم رێبازی هزری باوی ئیمرۆی خوارووی ئەفریقیایە. هیچ مەجبوور نییە لە رێبازی رژێم دەربچێت، هاوکات بە گوێی ئەوانی کرد بۆ بڕیارەکەی گرتنی ئەبەدی



و دەوری نارەزاییشی هەبوو لە دەرنەکردنی سزای سێدارە. بە بڕیارەکەی دادوەر بۆ کاسراداو موتسولیدی و ئەملانگینی سەرسام بووم. وام دەزانی کاسرادا ئازاد دەکرێت و سزاکەی ئەلیاس و ئەندرو سووک دەبێت، چونکە هەردووکیان ئەندامی تازەی بزاڤی «ئەمکا» بوون. ئەوەی هەموویان کردبوویان، بە قەد یەکێک نەبوو. کە ئەحمەدو ئەندروو ئەلیاس بڕیاری ئیستئناف نەکردنەوەیان دا گران لەسەریان کەوتەوە، ئەگەری ئەوە هەبوو سزاکەیان کەمێک سووک بکرێتەوە.

گیراوە ئەفریقییەکان لە زیندانی بریتۆریا، لە ئێوارانەوە تا کارەبا کوژاندنەوە خەریکی گۆرانی و سروودی ئازادی گوتن بوون. ئێمەش بەشداری ئەم ئاهەنگە شکۆدارە دەبووین. دەنگەکە بە ئەمری کارەبا کوژانەوەکە دەڤەرەکەی هێمن دەکردەوە. بەڵام لێرە و لەوێ دەنگی «ئەماندلا» واتە «هێز» دەهات و سەدان گیراویش بەیەک دەنگ وەڵامیان دەدایەوە بە «ئەنگویتو» واتە «هێز بۆ ئێمەیە».

ئێمە ئەم بەرنامەمان زوو داناو دواییش خەڵکێکی زۆر فێری بوون، دەنگەکە هێزی وای تێدابوو ورەی بە ئێمە دەبەخشی و بۆ بەردەوامی لەسەر رێبازەکەمان گەرمی دەکردین.

## بەشی سێیەم

# دوورگەی رۆبین؛ سەرەتای هیواکە

هێـڵی بەیانیی چاککردنی رەوشی زیندانەکـان هەمـوو کـاتێ وەک یەک نەبوو. لێـرەو لەوێ پێشکەوتن بەدی دەکراو هەندێ جاریش کۆسپیش دەکەوتە پێش کۆششەکان، ئەگەر پاش چەند ساڵێک هەنگاوێک بۆ باشترکردنی رەوشەکە هەبوایە، ئەوا بە یەک رۆژ هەڵدەوەشایەوە، وەک ئەوە وابوو، ئەگەر یەکێک بەردێکی گەورە بۆ سەر شاخێ سەر بخات و لەناکاوو بە چەند چرکەیەک غلۆربێتەوە، پاش سەرکەوتنمان لە چەندین شەڕ بۆ چاکسازی رەوشەکە، هەندێ گۆڕانکاری لە زیندانی دوورگەکە بەدەست کەوت. وەنەبێ ئێمە کاروباری رۆژانەی دوورگەکەمان بەڕێوەبردبێت، بەڵکو بەڕێوبەرایەتی زیندان بە هاوکاری ئێمە ئیشی دەکرد. پاش کۆچکردنی ڤان رینسبیرگ ژیانمان زۆرتر بەرەو گونجاندن رۆیشت.

لە سێ ساڵی یەکەمدا بۆ هەمووان شەرواڵی درێژ دابینکرا، لە ساڵی ١٩٦٩دا، هەر یەکێک لە ئێمە لە جیاتی وەرگرتنی جلوبەرگی هەمەڕەنگ، قاتی تایبەتیمان وەرگرت، قاتەکە بەپێی پێوان بوو و بۆمان هەبوو خۆمان بیشۆین، هەروەها بواریشی دا، هەرکاتێ بمانەوێت لە پشووی هەفتەدا، بچینە گۆڕەپانەکە.

گەرچی خواردنی گیراوەکان وەک یەک نەبوو، بەڵام بوار درا گیراوە رەشەکان هەندێ جار بەیانیان نان وەرگرن و بواریش درا پێکەوە نان بخۆین و جیاوازیەکان هێدی هێدی نەمان، کاغەزی یاریمان بۆ تەرخانکراو بواردرا رۆژانی شەممە و یەک شەممەوانی هەموو هەفتەیەک یاری پێبکەین، وامان لێ هات و بە بێ قسەبڕین و ئازادانە لە ژوورەکان قسەبکەین. کە پاسەوانەکان



بەرپرسانی پشکنینیان دەبینی بە تورتورەکانیان ئاگاداریان دەکردینەوەو تێدەگەیشتین کەوا دەبێ کار بکەین و تەورداسەکانمان لە دەست بێ، بۆیە لەکارکردن بەردەوام دەبووین، توانیمان پاسەوانە باشەکان دەستنیشان بکەین و نێوانمان لەگەڵیاندا خۆش دەکردو کە بەرپرسان هەستیان دەکرد، ماوە ماوە بۆ چەند مانگێک پاسەوانەکانیان دەگۆڕی.

ئازادانەو بە ئارەزووی خۆمان سەردانی یەکترمان دەکرد. لە کۆبوونەوەکانی دەزگای باڵاو کۆبوونەوەی ئەندامەکان و لیژنەی ئۆلوندی لێپرسینەوەیان نەبوو ئەگەر پاسەوانەکان ئاشکرایان نەکردبایە، زیندانەکە گۆڕا، گیراوەکان کاروباریان بەڕێوەدەبرد، نەک بەرپرسەکانی زیندانەکە.

ئەفریکانی پیاوی توندو بەدینەو لە خودا دەترسێت. ئەو برگەیەی لە بەرنامەی هەفتانەکەیدا نەگۆڕا، نوێژی بەیانی یەک شەممووان بوو. بەڕێوبەرایەتی ئەمەی بە ئەرکی پێویست دەزانی وایان دەزانی نەفرەتیان لێ دەکرێت ئەگەر ئەم ئەرکە ئایینییە پیرۆزە دوابخەین. هەموو بەیانی رۆژانی یەک شەممە قەشەیەک دەهات دووانی بۆ دەداین، قەشەکان پابەندی جۆرەها کەنیسە و باوەڕبوون، وەک، ئەنجلیکانی و هۆڵندی چاکسازی و میتۆدی و جۆری تر. فەرمانبەرانی تایبەت بە بەرژەوەندی زیندانەکان داوایان دەکرد، کەوا باسی یەک شت بکرێت و بەس، ئەویش کاروباری ئایینی و هیچی تر. پاسەوانەکان قەشەیان دەهێنا، ئەگەر قەشەکە لە قسەکانیدا لاری هەبوایە، ئەوا دەیانگۆڕی.

لە دوو ساڵی یەکەمدا، بۆ وانە ئایینییەکانیش نەماندەتوانی لە ژوورەکانماندا دەربچین. قەشەکە لە دەروازەی ساڵۆنەکەوە دووانەکەی پێشکەش دەکرد، لە ساڵی سێیەمدا نوێژەکە لە گۆڕەپانەکە دەکرا، بێجگە لە نیو سەعاتەکەی راهێنانی وەرزشی، تاکە بواری دەرچوونیشمان ئەم نوێژەبوو. دیندارمان کەم بوو، بەڵام کەس گلەیی لە دووانە درێژەکان نەبوو، چونکە لە دەرەوەو لەبەر ئەو هەوایە خۆشە بوو. کە نوێژەکە کەوتە گۆڕەپانەکەی دەرەوە، ئامادەبوون بووە ئیختیاری، بۆیە هەندێ لە گیراوەکان ئەگەر قەشەکە لە کەنیسەو بڕوای ئەو نەبوایە ئامادەنەدەبوو، گەرچی من مەزهەبی کەنیسەی میتودییم، بەڵام لە هەموو نوێژەکان ئامادە دەبووم و گوێم لە دووانی هەموو قەشەکان رادەگرت.

قەشەی باوک هیوز لە مەزهەبی ئەنجلیکانی هەرێمی ویلزی بریتانی هاتە سەردانمان، پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانەبوو، کاری قەشەیی لە تیمی غەواسەکان لە رۆژانی شەڕی دووەمی جیهاندا کردبوو. نوێژیی لە ساڵۆنەکە بە دڵ نەبووو ئەوەی بە دژی نەریتی ئایینی زانی، لە سەردانی

یەکەمیدا. بە دەنگە گەورەکەی چەند برگەی وتاری سەرۆک وەزیرانی بریتانی وینستۆن تشرشڵ کە بۆ سەربازەکانی بەرەی شەڕی دابوو، بۆی خوێندینەوە. کە تێدا هاتبوو:

لە کەنارەکاندا شەڕ دەکەین، لە فڕۆکەخانەکاندا، لە شەقام و کێڵگەکان و شاخەکاندا، ئێمە هەرگیز کۆڵ نادەین.

دووانەکەی کە لە گۆڕەپانەکە پێشکەشی کرد زۆر جوان بوو، بە هەواڵەکانی ئاوێتەی دەکرد، ئێمە زۆر سوودمان لێ دەبینی وەک: سەرۆک وەزیرانی خوارووی ئەفریقیا وەک فەرعۆنی جارانی میسر دەکات. سوپای گەورە ئامادە دەکات. فێربووین، پاش نوێژو دووانەکە، سلاواتیشمان لێدەدا، وام مەزەندە دەکرد باوک هیوز هەر لەبەر ئەو سەلاواتانە دەهات، ئارغۆنێکی بچووکیش دەهات و دەیژەنی، سۆز و چرینی دەنگەکانی ئێمەی لەسەر ئاوازی تیمی دەنگبێژانی وڵاتی رەسەنی خۆی ویلز دەژنی.

قەشەکەی میتودیس بەرێز جۆنز، پیاوێکی نیگەران و تووڕەبوو، لە سەردەمی شۆڕشی کۆنغۆدا دووانی دابوو، لە ئەنجامی کاری ئەوێ دا وا تاڵ و نامۆی لێ هاتبوو، لە دووانەکانیدا، زۆر جەختی لەسەر ئاشتبوونەوەو ئاسایی کردنەوە دەکردەوە، دەیووت، پێویستە ئێمە لەگەڵ سپییەکاندا کۆک و هاوشان بین. رۆژێکیان بینیم ئادی دانیالز لە دووانەکەی قەشە جۆنز زۆر تووڕەبوو و بەرگەی نەگرت و هاتە قسە:

– ئێمە پێویستمان بە ئامۆژگاری ئاشتبوونەوە نییە، وا بیست و حەوت ساڵە هاواری بۆ دەکەین. ئەم قسەیە پشتی شکاندو جارێکی تر بۆ دووان نەهاتەوە.

وەنەبێ قەشە جۆنز قوربانی یەکەمی هەڵچوونەکانی ئادی بێت، یەک شەممەیەک قەشەی رەنگین برا سبتمبر و دەنگی زوڵاڵی هاوڕێمان هینی فیریس هەمووومانی خستبووە حاڵەتی لە بیرچوونەوە و داوایان کرد هەمووان چاومان دابخەین، هەتا قەشەکەش لەگەڵ سۆزی دەنگی ئەودا چاوی داخست، تەنیا ئادی نەبێ. لەسەر نووکی پێیەکانی خۆی گەیاندە جانتاکەی قەشەو ژمارەی ئەو رۆژەی رۆژنامەی (سەندەی تایمز)ی هێنایەدەرێ، ئێمە نەماندەزانی رۆژنامەی پێیە، پاش ئەو رۆژە چیتر قەشە سبتمبەر رۆژنامەی نەهێنا.

قەشە ئەندریە شیفر، یەکێک بوو لە ئەندامانی دەستەی کەنیسەی چاکسازی هۆڵەندی لە ئەفریکیا، ئەمەیان هاوشانە لەگەڵ کەنیسەی چاکسازی هۆڵەندی، کە زۆربەی زۆری ئەفریکیانیەکان تێدا ئەندامە. دەستەکە تایبەتمەندی هەبوو بۆ خزمەتگوزاری بە ئەفریقییەکان و بەس. قەشەکە



پیاوێکی پارێزگارو رەوشت تیژبوو، زۆر دووانی بۆ گیراوانی بەشی گشتی دەدا، رۆژێکیان هاتە بەشەکەی ئێمەو لێمان پرسی، بۆچی قسە بۆ ئێمە ناکات. بە تووڕەییەوە وتی:

– ئێوە خۆتان بە خەباتگێری مەیدانی ئازادی دەزانن، بەڵام وا پێ دەچێ، کە گیراون، یان سەرخۆش بووینە، یان مەستی حەشیشە بووینە، گوناحە بە ئێوە بڵێین شۆڕشگێڕ!

سەرەڕای ئەو قسانەش سووربووین بێتە لامان و قسەمان بۆ بکات، ئەوەبوو لە کۆتایی شێستەکاندا هات.

قەشە شیفر، لە یەک لایەن ئازادبوو، ئەویش، ئایینی بە شێوەیەکی زانستی شرۆڤە دەکرد، ئەم ئوسلوبەم بە دڵ بوو، چونکە زۆر کەس هەیە زانست بۆ دژایەتی ئایین بەکاردێنێ، بەڵام ئەو زانستی بۆ بڕوا ئایینەکانی بەکاردەهێنا. لە یەکێک لە دووانەکانیدا باسی ئەو سێ زانایەی کرد، چۆن بە هۆی دەستنیشانکردنی ئەستێرە گەیشتینە خۆرهەڵات و لەوێش بۆ بێت اللحم و وتی، ئەمەیان ئەفسانە نییە، هیمای بەوەکرد کەوا نیشانەی فەلەکی زانستی لە شێوەی کلکەئەستێرە هەبووەو هاوکات لە هەمان رێباز لە ئاسماندا دەردەکەوێت و ئەوەش لە کتێبی پیرۆزدا باس کراوە.

زۆر سەردانی کردین و سۆزی بۆمان جولاو گاڵتەشی زۆر دەکردو جارێکیان بە گاڵتەوە وتی: ئەرکی پیاوی سپی لەم وڵاتەدا لە ئەرکی پیاوی رەش زەحمەتترو گرانترە، چونکە، کە پیاوی سپی ئاژاوەیەکی دێتە رێ، بۆ چارەسەری دەگەڕێت، بەڵام، بەڵام ئێوەی رەش کە ئاژاوەیەکتان دێتە رێ، بیانووتان بۆ دۆزیتەوەو وتوتانە، ئەنگابیلۆنگۆ..!!

بەم قسەیەی زۆر پێکەنین، نەک لەبەر ئەوەی دەربڕینی وشەکەی سەیربوو، بەڵام، لەبەر ئەوەی وشەکە بە زمانی کوسا مانای (پیاوی سپی خەتای تۆبە) دەگەیێنێ، واتە هەموو ئازارەکانمان دەخەینە سەر ئەستۆی سپییەکان، بۆیە پێویستە تەماشای ناخی خۆمان بکەین و گلەیی لەخۆمان هەبێ و لە شتەکان بەرپرس بین، من بە تەواوی بڕوام بە وەیەو پاڵپشتی دەکەم.

رۆژی جەژنی سەری ساڵ، وەک رۆژی یەکشەممەی رۆژانی هەفتە، ئەو رۆژەی بەڕێوەبەرایەتی خۆشەویستی و مرۆڤایەتیان بەرامبەرمان دەنواند. لەو رۆژەدا لە ژوورەوەمان ناکەن و دەتوانین کەمێ شیرینەمەنی بکڕین. خواردنی جەژنی سەری ساڵی ئاساییان پێشکەش نەدەکردین، بەڵام کوپێکی زۆرتری قاوەو ژەمێکی ئێوارەیان دەداینێ، هەروەها بەڕێوەبەرایەتی بواری ئاهەنگی گۆرانی و پێشبڕکێ و شانۆگەرییان بەم بۆنەیە پێدەداین. بەرپرسی تیمی ئاهەنگەکە، سیلبی ئەنگیندانی ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و ئەندام لە کۆمەڵەی لاوی حیزبی

کۆنگرەی نیشتمانی بوو، پیاوێکی بەهرەمەندو فرەبەهرەو دەنگخۆش و خاوەن سەلیقەی مۆسیقایی بوو. ئەو گۆرانییەکانی هەڵدەبژاردو دەورەکانی دابەش دەکردو سەرپەرشتی نیشاندانیشی دەکرد. ئاهەنگەکە، بەیانی رۆژی جەژنی سەری ساڵ لە گۆڕەپانی زیندانەکە سازکرا. ئاهەنگەکە چەندین گۆرانی و هەڵهەڵەی ئاسایی ئینگلیزی و ئەفریقی و هەندێ سروودی ئۆپۆزسیۆن بوون. بەڕێوەبەرایەتی بایەخی بە بەرنامەی ئاهەنگەکەو جۆری گۆرانییەکان نەدەدا، پاسەوانیش هەر لە خۆمان بوو، ئەوانیش وەک ئێمە زەوقیان لە ئاهەنگەکە وەردەگرت.

پێش ئەوەی سلبی بگیرێت، بەوە ناسراو بوو، گوایە بەرهەڵستارێکی جۆری کێش سووکە، بەڵام لەناو زیندانا ناخی راستی دەرکەوت، ئەو لەو کەسانەیە هاموشۆی لەبەر شیرین گوفتاری خۆشەو کەسی گیراو، زۆر پێویستی بە هاوڕێیەتی ئەوانە هەیە. زیندان، تاقیگەیەو لێرە ناخی پیاوان دەردەکەوێت، پیاوی وا هەیە زیندان خۆڕاگری و توندی فێر دەکات و پیاوی واشی تێدایە ئەوەی لە زیندان دەگەیشت بۆی دەردەکەوێت وا نییە.

بێجگە لە ئاهەنگەکە، پێشبڕکێی داماو شەترەنج و سکرابل «رێکخستنی وشە لە پیتی هەڵوەشاوە»و بروپۆچ «جۆرێکە لە یاری کاغەز»مان دەکرد، لە یاری دامادا، چەند ساڵ خەڵاتی یەکەمم بەرکەوت، خەڵاتەکەش پارچەیەک شیرینەمەنی بوو، من لەسەرخۆو بە بەرنامەو بە پێی ستراتیژی زۆر پارێزگاری یارییم دەکرد، هەموو ئەگەرەکانی جولاندنم ورد شی دەکردەوەو بیرم لە ئاکامەکەی دەکردەوەو زۆریش لە بڕیاردانا دوادەکەوتم و بۆ جولەیەکی تر کاتی درێژم دادەنا. جێگای سەرنج و سەرسووڕمانیشە من هەمان ڕێبازم لە کاری سیاسیش هەیە. گەرچی حەز ناکەم لێکچوون لەم جۆرە کارانە بکەم.

ئەوانەی یارییان لەگەڵ دەکردم، لەو هێمنی و لەسەرخۆ یاری کردنەم بێزار دەبوون، زۆرتر لەگەڵ دۆن دیفیز یارییم دەکرد، ئەو لە بزاڤی یەکێتی نائەوروپییەکان بوو، لە کیمبیرلی وڵاتی کانزاکانی ئەڵماس پەروەردەببوو، کابرایەکی بەهێز و پێشەنگ و ناسک بوو، لە یاری دامادا وریابوو، بەڵام ئەو بە پێچەوانەی ئوسلوبی من یاری دەکرد، بە شڵەژاوی و هەڵچوونی زۆرەوە یاری دەکرد، نیوچەوانی ئارەقەی دەکرد، یەکەکانی خێرا دەجولاندو هەر ئەو خێراییەبوو ئاکام و نرخەکەی دەنواند، زۆر جار یارییەکانی کۆتایی داما سالآنە لەنێوان ماندێلاو دیفیز دەبوو.

کە یاری دامام لەگەڵ دۆن دەکرد، دیراسەتی تەختەکەم دەکردو بیرم لە ئەگەرەکان دەکردەوە و پێش ئەوەی بجولێم دەمووت و هاوارم دەکرد -قیبو- واتە (هێرش)، ئینجا یارییم دەکرد، بۆیە ئەو



بۆ گاڵتەکردن بانگی دەکردم قیبو، زۆر دژی یەک یاریمان کرد، هەموو جارێ داوای دەکرد دەستێکی تر یاری بکەینەوە، خۆ ئەگەر لە دەستی یەکەم براوەش بوایە. ئەو حەزی لە یاریەکە نەدەکرد. بەڵام کە کەوتە بەرامبەری من و دۆڕاندی، بۆیە کۆڵی بەرنەدەدام و وای لێ هات زۆربەی کاتەکانم بە داما بەسەردەبردو کاریگەری لەسەر ئارەزووەکانی ترم هەبوو. ئەگەر لە تاقیکردنەوەی بابەتێک سەرنەکەوتبامە وەڵامم پرسیارەکەی بۆچی.. ئامادەبوو و تاوانەکەم دەخستە ئەستۆی دۆن دیفیزو هەموویان دەکەوتنە پێکەنین.

تیپی ئارەزوومەندانی نواندن لە دوورگەی رۆبین، ساڵانە، لە یادی جەژنی سەری ساڵدا کارێکی تایبەتیان نمایش دەکرد -ئەوەش وای کرد، ئارەزووی نواندنم بژیێتەوە، بۆ یەکەم جار دەوری جۆن ویلکس بووزم لەسەر شانۆی کۆلیژی فۆرت هێر بینی، بەرهەمەکە دەتوانرێت، ناوی بنرێت -پلەی خوارەوە-، شانۆگەریەکە تەنیا دەقێکی نوسراوبوو بەس، نە تەختەی شانۆ، نە دیمەن و نە جلوبەرگ هەبوو.

چەندین دەورم بینی، وەک دەوری کریۆن شای تیپ لە تراژیدیای ئەنتیگۆن لسوفوکلیس. زووتر چەند شانۆنامەی ئەغریقی کۆنم خوێندبۆوەو زانیبووم، ئاستی بەرزیان هەیە، لەوێ فێربووم کەوا بەرزی مرۆڤ لەوەدایە کە چۆن بەرگەی ژان و دەردەسەری بگرێت، پاڵەوان، ئەو کەسەیە بێ هیوا نەبێت و لە بەرامبەر کۆسپەکاندا چۆکی نەشکێ.

کە ئەم شانۆنامەیان هەڵبژارد، من رازی بووم دەوری شا پیرەکە وەرگرم کە دووچاری شەڕی ناوخۆ هات بۆ رزگارکردنی شارە خۆشەویستەکەی و تاجی وڵاتەکەی. کریۆن، کەسێکی راستگۆ و نیشتمانپەروەر بوو، سەرەتای ژیانی زانایی و هۆشیاری لێ دەرکەوتبوو، ئەزموونی ئەوەی هەبوو کەوا سەرکردەو بەس دەبێ دڵسۆزی میللەتەکەی بێت پێش ئەوەی دڵسۆزی هیچ کەسێ بێت، جارێکیان وتی:

بە هەرحاڵ، ناتوانرێت بە ئاسانی ناخی راستی مرۆڤێک بزانیت، مرۆڤ کەسایەتی و هەڵوێست و هۆشیاریی دەرناکەوێت هەتا بەرامبەر خەڵک سیاسەتی روون نەبێ و یاساکان دانەرێژێت، ئەزموون باشترین بەڵگەیە.

بەڵام کریۆن لەگەڵ دوژمنەکانی بێ رەحمانە رەفتاری دەکرد، فەرمانی دا کەوا تەرمی بولینیکس، برای ئەنتیگۆن ئەوەی دژ بە شارەکەی یاخی بوو بنێژرێت، ئەنتیگۆن لێی یاخی دەبێت چونکە بڕوای وابوو یاسایەک هەیە لە سەرووی یاساکانی دەوڵەت، بەڵام کریۆن گوێ لە

بۆچۆونەکەی راناگرێت، ئەو رەقی و بەرز نیگاکردنە لە کەسایەتی سەرکردە ناوەشێتەوەو دەبێ سەرکردە دادەوەری بە دلۆڤانی گۆش بکات، کەسایەتی ئەنتیگۆن خەباتی ئێمەی تێدا بەرجەستەیە، چونکە ئەو وای هەست دەکرد کە وا یاساکان لاریبیان زۆرەو بە شێوەی خۆی خەبات و دژایەتی کرد.

***

پاسەوانەکان دەستیان پێکرد قسەمان لەگەڵ بکەن. هەرگیز من حەزم نەدەکرد بیاندوێنم، ئەگەر پرسیاریان کردبایە وەڵامم دەدانەوە. چونکە خۆشە بزانی کەسێک حەز دەکات شتێ فێر بێت. پرسیارەکان تەنگاوییان تێدا بوو، ئەمەشیان بە پرسیارەکانیان دەلکاندو دەیانووت:

– باشە ماندێلا! بە روونی چیت دەوێت؟. یان دەیانووت.

– ئەی ماندێلا، تۆ نان و جێگات هەیەو لە هیچت کەم نییە، بۆچی سووری لە سەر ئاژاوە؟

ئەمەو ئەمانە بواری قسەکردنیان دەخولقاندو دەکەوتینە باسی سیاسەت، منیش سیاسەتی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقیم بۆ راڤە دەکردن و دەمویست شاراوەیی و توندڕەوییان برەوێنمەوەو ئەم تەونەیان لە هزر دووربخەمەوە.

لە ساڵی ١٩٦٩دا، پاسەوانێک هات، حەزێکی تایبەتی هەبوو من بناسێ، قسەی وا هەبوو، گوایە حیزب بە هۆی پاسەوانێک دەیەوێت من لە زیندانا بڕفێنێ -ئەم پاسەوانە ئاگاداری کردمەوە گوایە پلانی لە دەستدایە من لە زیندانا بفرێنێ.

هێدی هێدی پلانەکەی بۆ شیکردمەوەو وتی: شەوێکیان دەرمانێکی بێهۆشکەرە دەدەمە پاسەوانی منارەی دوورگە، پاشان بەلەمێک دەگاتە کەنار و کلیلێکم دەداتێ و دەروازەکە دەکەمەوە و دەچمە ناو بەلەمەکە، لەناو بەلەمەکە کەرستەی پێویستی نقوومبوونی مەلەوانی تێدایە و لەوێشەوە بۆ بەندەری کیپ تاون و لەوێش بۆ ناو فڕۆکەخانەو سوار دەکرێیت و بۆ دەرەوەی وڵات دەفڕێت.

گوێم لە وردەکاری پلانەکە راگرت و نەمووت، ئەوەیان لە خەون و نامەعقوول نزیکە. لەگەڵ وڵتەر باسی مەسەلەکەمان کردو وتمان. بڕواکردن بە پاسەوان باش نییە، بە پاسەوانەکەم نەووت، عەقڵم پلانەکەت ناگرێت، هاوکاتیش هیچ هەنگاوێکم بۆ جێبەجێ کردنیش نەنا، رەنگە مەزەندەکەش هەڵە بوو بێت، زۆری نەبرد پاسەوانەکە لە دوورگەکە گواسترایەوە.



مەزەندەکەمان تەواو دەرچوو، دوایی بۆمان دەرکەوت کەوا پاسەوانەکە وەکیلی ئیستخباراتی خوارووی ئەفریقیای ناسراو بە نووسینگەی ئاسایشی وڵات بوو. مەبەست لەو پلانەش بەکوشتدانم بوو بە دەستی پیاوانی ئاسایش پاش ئەوەی دەگەمە فڕۆکەخانە. پلانەکە لە یەکەمی تا دواییەکەی لە نەخشەی ئاسایشی وڵات بوو، هەتا ئەو پڕۆپاگەندەی بڵاوکرایەوە گوایە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی خەریکی پلان دانانە بۆ رفاندنم. ئەوەش دوا پلان نەبوو بۆ لەناوبردنم.

ماوەی کارکردنی بەرپرسی زیندان لە سێ ساڵ تێپەڕی نەدەکرد. بە هاتنی ساڵی ١٩٧٠ چەند ئەفسەر کرانە بەرپرسی زیندانەکە، ئەو ساڵە بەرپرسی دوورگەکە عەقید فان ئارد بوو، ئەو پیاوە، کەسێکی قسەخۆش و بێ وەی و سەلامەت بوو، سەردەمی ئەو، سەردەمی خۆشی و چاکە بوو، بەڵام لە کۆتایی ساڵەکە حکومەت ویستی رەوشی دوورگەکە بگۆڕێت، ئەویان لابردو عەقید بیر بادینهۆرست هات، ئەمەش گۆڕانێکی باش نەبوو، ئەو بە پیاوێکی توندوتیژ ناسرابوو، حکومەتیش ئەوەی کرد کە هەستی کرد رەوشی دوورگەکە شلۆق بووە وەک پێویست توندوتۆڵ نییە، ئەوەش پێویستی بە دەستێکی پۆڵایی هەیە بۆ گەڕاندنەوەی یاساو ئینزبات لە ناو زیندانا. بە هاتنی بادینهۆرست دەیانویست بمانگێڕنەوە سەردەمی -جانتاکە-.

کە بەرپرسەکەمان دەگۆڕا، داوای دیتنیم دەکرد، ئەوەش بۆ راڤەکردنی رەوای کێشەکەمان و ناسینی کەسایەتیەکەی، بەڵام کە داوای دیتنی ئەوم کرد، رازی نەبوو، ئەوە یەکەم بەرپرسی زیندانە داواکەم رەفز دەکاتەوە.

پێش هاتنی بادینهۆرست، هەستمان بە شوێنەواری کردبوو، رێنماییەکانی تایبەت بە خوێندن و کاتی بێ ئێشی و ئاسانکارییەکان و ئیمتیازەکانی کە بە خەباتێکی درێژخایەن دەستمان کەوتبوو، هەڵوەشاندەوە. پاسەوانە کۆنەکانی بە پاسەوانی لەسەر زەوقی خۆی گۆڕی، ئەوانیش تەمەنیان بچووکترو رەفتار رەقتر و پابەندتربوون بە یاساو رێساکان و سووریش بوون لەسەر تەنگاوکردن و ئازاردانمان و رووخاندنی ورەمان. پاش چەند رۆژێک، پاسەوانەکان هاتنە سەرمان و ژوورەکەیان پشکنی و کتێب و کاغەزەکانیان برد. بە بێ ئاگادارکردنەوە چەند ژەمی خواردنیان لابردو لە رێگای چونی گیراوەکان بۆ ژوورەکانیان پەلاماریان دەدان.

بادینهۆرست کاری بۆ ئەوەکرد کە رەورەوەی زەمەنی دوورگەکە بگەڕێنێتەوە سەردەمی سەرەتای شێستەکان. وەڵامی هەموو پرسیارەکانی منی بە نەرێ دەدایەوە، هەرکەسێ داوای دیتنی پارێزەرەکەی کردبایە دەگیراو دەخرایە ژووری تاکەکەسی، شکایەت و گلەیی پشتگوێ دەخست، بە

بێ پێشەکی و باسکردن سەردانی قەدەغەکرد، ئاستی خواردنیش بەرەو خراپی دەچوو و ئاستی چاودێریش بەرزکرایەوە.

هەفتەیەک بوو هاتبوو رۆژێکیان بە بێ پێشەکی و زانین، هات و لە دوورەوە لە ئۆتۆمۆبێلەکەی دابەزی و تەماشای کردین، ئێمە چاومان تێبڕی بوو، لە دوورەوە هاواری کرد: ماندێلا پەنجەت لە دەمت دەربێنە!

لە وشەکەی تووڕەبووم و رووبەڕووی چووم، پێش ئەوەی بگەمە لای خێرا بە ئۆتۆمۆبێلەکەی بۆی دەرچوو.

هەر بە لاسلکی ناو ئۆتۆمۆبێلەکەی، داوای کرد لە ماوەی چەند دەقیقەیەک لە هۆڵی «ب» ئامادەبین، لۆریەکی مشت پاسەوان گەیشتن، سواریان کردین و هاواریان کرد، بێدەنگ بین، لە گۆڕەپانەکەدا ئێمەیان دابەزاندو ریزیان کردین و بادینهۆرست لەبەردەم دەممان هاتووچۆی دەکرد. بادینهۆرست زاری پیس بوو، قسەی ناشرینی دەووت، هەر جنێوی دەدا رستەی نایابی (قوزی دایکتان)بوو.

لە راوەستانەکەدا، بادینهۆرست وتی، من زۆر تووڕەم لە بوونی ئەو تەمبەڵیەی لەناو زیندانەکەدا، بۆیە پلەی پۆلکردنتان یەک پلە دادەبەزێنم، گەرچی زۆربەمان رقمان لە پۆلکردنەکە دەبۆوە، بەڵام زۆربەمان پلەی (ج)مان هەبوو، کە بواری خوێندنەوەمان هەبوو، بەڕێوەبەرایەتی لە بواردانی خوێندنەوەمان پەشیمان بوو، بۆیە ئەو ویستی ئەو هەڵەیە چاک بکاتەوە.

کە هێوربووەوە، زانیم ئەو بە ئەنقەست ویستی زامدارمان بکات، ئەو بۆ ئەوە هاتبوو دوورگەکە کەوا یاساو رژێم پتەوتر بکاتەوە، واش دەبینرا گوایە من خولقێنەری هەموو ئاژاوە و گێچەڵەکانم، ئەویش وەک مامۆستای پۆلێکی بە ئاژاوە هاتبوو، پۆلەکە، دارکاری بکات و رەوشەکە ئاسایی بکاتەوە.

لە کۆتاییەکانی مایۆی ١٩٧١ دا، چەند پیاوی رێکخراوی میللی ئەفریقی خۆرئاوای خوارووی ئەفریقا «سوابو»یان هێنایە زیندانەکە، ئەو رێکخراوە یەکێکە لە هەڤاڵبەندەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کە خەبات دەکەن بۆ سەربەخۆیی نامیبیا، هەموویان خرانە زیندانی تاکەکەسی، لە سەرووی هەموویان، دامەزرێنەرو دێرنیترین خەباتگێڕی رێکخراوەکە ئەندیمبا توافو بوو، زانیمان لە دژی ژوورە تاکەکەسییەکان مانیان لە خواردن گرت و ئێمەش یەکسەر بۆ پاڵپشتی



ئەوان مانمان گرت، بڕیارەکەمان بادینهۆرست و بەڕێوەبەرایەتی زیندانی تووڕە کردو کارەکەیان بە نامەعقول و دووورە یاسا لە قەڵەم دا. لە درەنگی شەوی ٢٨ی مایۆدا بە هاوارو دەرگا لێدانی بەهێز بە ئاگایان هێناین، پاسەوانەکان هاواریان دەکرد، رابن لە خەو رابن، فەرمانیان دا خۆمان رووت بکەینەوەو لەناو حەوشەی زیندانا ریز بین، پاسەوانەکان بە رێبەری ئەو پاسەوانە سادییەی ناوی فوری بوو، بەڵام ئێمە ناومان لێنابوو، رێگر، کەوتنە جنێودانمان، هەرچی ناشیرین و شیاو نەبوو وتیان.

لەو شەوە ساردە، یەک سەعات بە رووتی لە حەوشەکەیان راگرتین، لە ژوورەوە کەلوپەلەکانیان دەپشکنین و لە دەرەوەش تێر جنێویان دەکردین، غوفان لە سەرما تووشی ژانەسینگ بوو و بورایەوە، ئەوەیان فوری ترساندو فەرمانی دا بگەڕێینەوە ژوورەکان.

لە ژوورەکان هیچیان نەدۆزیبیەوە، پشکنینەکەش هەر لەبەر زەوقی سادی فوری بوو و بەس، دوایی زانیمان لە بەشی گشتی پەلاماری گیراوەکانی دابوو، هەروەها بۆ رۆژی دوایی زانیمان، پاسەوانەکان پێش ئەوەی بێنە لای ئێمە زۆریان لە گیراوەکانی بەش گشتی داوەو پەلاماری ئەندیمبا توافویان داوەو ئەویش دەستی کردۆتەوەو پاسەوانێک لە تۆڵەی ئەوە زۆری لێداوە هەتا کەوتوتە سەر زەوی.

لەوەی روویدا وردو جوان کردمانە شکایەت و پێشکەشمان کرد، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی وەڵامی نەدایینەوە، ئەم رووداوە، گەرچی ئێمە رووداو نەبوو، بەڵام لە هزرم ماوەو لە بیرم ناچێتەوە. لە سەردەمی بادینهۆرست ئەم جۆرە پەلامارانە وەنەبێ جاروبار بووبێت، بەڵکو زۆر بوو.

کۆڵمان نەداو سووربووین لەسەر ئەوەی رەوشەکە ئاسایی بکەینەوە، چەندین نامەمان رەوانەی لای هەڤاڵانمان کرد لە دەرەوە تا ئیش بکەن، تا ئەو لە زیندانەکە بگوازرێتەوە، پێشنیارمان کرد، لیژنەیەک بێت و چاوی بە بادینهۆرست بکەوێت، پاش چەند مانگێک بڕیاردرا لیژنەکە گەڵاڵە بکرێت، لەهەر رێکخراوێک دووکەسی تێدا ئەندام بێ، لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی من و وڵتەری تێدابوو.

بادینهۆرست رازی بوو، دیدارمان بکات، لەوێ هەڕەشەی مانگرتنمان لە کارو خواردن لێکرد، پێمان وت ئەوەی لە دەستمان بێ دەیکەین، بە هەموو چەکی دەستمان خەبات دەکەین، ئەگەر هەموو مافەکانی جارانمان بۆ نەگەڕێتەوە. هەر ئەوەندەی وت، تەماشای داواکەت دەکەین، ئەم دیدارەمان بە سەرکەوتنێکی بەرز زانی، ئەو دیار بوو هەراسان ببوو، هەواڵەکە لە دەرەوەی زیندان

تەشەنەی کردبوو، زۆری نەخایاند بەرهەمی بوو.

پاش چەند هەفتەیەک زانیمان میوانێکی گرنگ سەردانی دوورگەکە دەکات، چونکە ئەو رۆژەو بۆ یەکەم جار بوار درا لە کاتی کاردا خۆمان لە باران بپارێزین، بۆ رۆژی دوایی وتیان، سێ دادوەر سەردانمان دەکەن، بەرێوەبەرایەتی داوای نمایندەیەکی کرد، منیان هەڵبژارد، لەو ماوەی خۆم بۆ ئەو دیدارە ساز دەکرد، زانیم لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو، زانیم لە بەشی گشتی، پاسەوانێک پەلاماری گیراوێکی داوەو زۆر خراپ لێیداوە.

دادوەران، یان ستاین و ئێم. ئی، تیرۆن و مایک کوربیت لە بەشی دادوەری هەرێمی کیپی دادی باڵا، لەگەڵ مفەوەزی زیندان و ژەنراڵ ستاین و عەقید بادینهۆرست هاتن و هەمان رۆژ لەگەڵیان دانیشتم.

ژەنراڵ ستاین منی بە دادوەرەکان ناساندو وتی، ئەو نمایندەی گیراوەکانە، ئەوانیش وتیان، کەواتە، دەبێ بە تەنیا لەگەڵیا دانیشین و دیدارێکی تایبەتی ساز بکەین، منیش وەڵامم دایەوە و وتم، ببوورن، من هیچی شاراوەم نییەو ئەوەی هەیە راستین و حەزدەکەم ژەنراڵ ستاین و عەقید بادینهۆرست ئامادە بن. کە گوێیان لەوە بوو سەرسام بوون، وایان هەست دەکرد، من بە تەنیا لەگەڵیان دادەنیشم و ئەوەی دژی ئەوان دەیڵێم، دادوەرەکان پێشنیارەکەی منیان قەبووڵ کرد.

ئەوەی دەمزانی و بیستبووم وتم، هەرچی پەلامارو لێدان لە بەشی گشتی کراوە باسم کرد، وتم تاوان دەرهەقمان زۆر کراوەو زۆریش پەردەی لەسەر دادەنێن و نیگەران بوو و بە توڕەیی و رەقیەوە وتی:

– تۆ چیت بە چاوی خۆت دیبیوە؟

منیش بە هێمنی وەڵامم دایەوە، من هیچم بە چاوی خۆم نەدیبیوە، بەڵام ئەوانەی بۆیان گێڕاومەتەوە، راست دەکەن و بڕوایان پێ دەکەم. بە رووم دا هەڵشاخی و پەنجەی لە رووی من بەرزکردەوەو وتی:

– ئاگادار بە، ماندێلا، قسەکردن لەسەر شتێ بەچاوی خۆت نەتدیبێ تووشی گێچەڵت دەکات، بێگومان دەزانی مەبەستم چییە.

گوێم نەدایە قسەکانی و رووی قسەکانم لە دادوەرەکان کردو وتم:

– بەرێزان، ئایا ئێوە بە چاوی خۆتان دەبینن ئەو پیاوە چۆن زیندانەکە بەرێوەدەبات. ئەگەر بە ئامادەیی ئێوە هەڕەشە لە من بکات، ئەی لە دووری ئێوە چی دەکات. دادوەر کوربیت رووی لە



هاوڕێیەکەی کردو وتی:

– گیراوەکە راست دەکات.

ئەو گلەیی و گازاندەی لەسەر خواردن و خوێندن و کار هەبوو بۆم ژماردن. دیاربوو بادینهۆرست تووڕە و پەست ببوو و زۆری لە دڵی خۆیدا هەڵگرت و هیچی نە ووت و لە کۆتایی دیدارەکە سوپاسی دادوەرەکانم کردو ماڵئاواییم لێ کردن و رۆیشتم.

نازانم پاش من دادوەرەکان چییان وت و چییان کرد. بەڵام، چەند مانگێک پاش دیدارەکەم لەگەڵ دادوەرەکان بادینهۆرست نینوکی کرابوو، مامەڵەی نەرمتربوو، پاش سێ مانگ زانیمان لە دوورگەکە دووردەخرێتەوە. پێش چەند رۆژێک بادینهۆرست بڕوات بۆ نووسینگەی سەرەکی بانگکرام و ژەنراڵ ستاین دەیویست گوێ لە گلەییەکانمان راگرێت، بە ئامادەبوونی بادینهۆرست لیستێک داواکاریم بۆ خوێندەوە، کە لە خوێندنەوەکە بوومەوە، بادینهۆرست وتی من دوورگەکە جێدەهێڵم و لە دواییدا وتی: داوای بەختەوەریتان بۆ دەخوازم.

بە بیستنی ئەوە سەرسام نەبووم بەڵام قسەکەم لا سەیر بوو، ئەو قسانە لە خودی بادنیهۆرستی مرۆڤ دێتە دەرێ، لایەنی تری کەسایەتی دەرکەوت ئەو کەسایەتییەی ئێمە هەستمان پێ نەدەکرد، منیش سوپاسم کردو سەرکەوتنم لە کارەکانی بۆ خواست.

دوایی زۆر بیرم کردەوە، کەوا ئێمە لە سەردەمی بادینهۆرست چەند رۆژانەی چەرمەسەری و ئاڵۆزیمان بینی، بەڵام، وا ئیمرۆ لایەنێکی تری ئەو دەرکەوت، ئەو کەسایەتییەی گەرچی هەبوو، بەڵام خنکاوبوو، بە بیرم هاتەوە کەوا لە ناخی دڕندەترین مرۆڤیش کەمێ دڵۆڤانی و مرۆڤایەتی هەیە. هەموو کەسێ دەتوانێ چاکە بکات ئەگەر بەرەو خێرو چاکە خۆی بسورێنێ و لایەنی چاکەی دڵ و خودی خۆی بەکار بێنێ. بادینهۆرست، پڕ بە پێستی وشە دڕندە بەدفەڕ نەبوو، بەڵام دڕندایەتییەکەی لە لایەن رژێمێکی نامرۆڤایەتی لەسەر چەسپابوو، بەرامبەر کارو رفتارە دڕندایەتیەکەی خەڵاتی وەردەگرت.

راگەیاندرا کەوا عەقید ویلیەمز لە جیاتی عەقید بادینهۆرست دەبێتە بەرپرسی زیندانەکە. کە هات، داوای دیدارم کردو پاش چەند رۆژێ چوومە لای لە نوسینگەکەی. گەرچی –وا دیارنەبوو– کەوا کەسێکی پێشکەتنخواز بێ، بەڵام کابرایەکی بەرێزو مەعقوول بوو، بەپێچەوانەی جاران بوو، هیوامان لا گەڵاڵە بوو کەوا سەردەمی بادینهۆرست کۆتایی هات و دووبارە نابێتەوە و ئەوەش گۆڕانێکی چاکە بۆ سەرجەم رەوشی زیندانەکان.

ھەروەھا دارودەستەکەی بادینھۆرست لە پاسەوانەکانیش گۆڕان و ڕەوشەکە بە تەواوی گۆڕا دەستمان بە چالاکییەکان کردەوە، بەڵام کە زانی ڕۆژانە بە قسەکردن کاتەکان بەسەردەبەین و ئەوەش تووڕەی کردو پاش چەند ھەفتەیەک بۆ نووسینگەکەی بانگی کردم و وتی:

– ماندێلا، تکایە یارمەتیم بدە، ھاوڕێیەکانت وەک پێویست کارناکەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکان نابن و ئەو کارەی لەسەر شانیانە جێبەجێ ناکەن، ئێوە لە زینداندن و دەبێ لێرە ئینزیبات ھەبێ، ئەوەش ھەر بۆ بەرژەوەندی من نییە، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی ئێوەش چاکە. ئەگەر یاساو ڕژێم پەیڕەو نەکرێت ئەوا بەڕێوەبەرایەتی ناچار ھەمان ڕێبازی بەرپرسی جاران پەیڕەو بکات.

قسەکەت جوانە، حەقتە، بەڵام پێش ئەوەی ھیچ بڵێم پێویستە لەگەڵ سەرجەم گیراوەکان قسەبکەم، بەڵام، لەناو زیندانا بوار بدرێت کۆبوونەوەی گشتی سازبکرێت ئاسان نییەو بڕیاردان لەسەری بەرپرسیەتی لەسەر شانە، بۆیە وتی، بۆ ئەمەیان بوارم بدەو با بیربکەمەوە.

لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ویلیەمز ئاگاداری کردمەوە کەوا بوار ھەیە کۆبوونەوە بکەن، بۆیە لە حەوشەکەداو بەبێ چاودێری پاسەوانەکان دیدارەکەمان بەست. قسەکەی ئەوم بە ھاوڕێیەکانم ڕاگەیاندو وتم، بچووکترین و کەمترین شلکردن لە لای ئێمە دوارۆژمان و ڕەوشی زیندانەکەمان باشتر دەبێ، ھەموویان ڕازی بوون، ھەر ھیچ نەبێ خۆیان وا نیشان بدەن کەوا کاردەکەن و ئەوەی لە وزەماندا بێ بیکەین و لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی ڕێکەوتین و ھیچ گازاندە و گلەییمان ئاراستە نەکرا و بەڕێوەبەرایەتیش ئیسراحەتی کرد.

لە ساڵانی ١٩٧١ و ١٩٧٢ دا چەندین سەربازی بزاڤی «ئەمکا» ھاتنە دوورگەکە، ئەوانەی لە شەڕەکان و ڕەوشی بزاڤەکە لە تاراوگە ئاگاداربوون، لەگەڵ ژان و خەمی زۆرم بۆ ھاتنیان، بە پەرۆش بووم دیداریان بکەم و گوێ لە ڕاپۆرتی تازەیان بگرم، زۆر پەرۆشی ھەواڵەکانی ئولیڤەر تامبو و سەربازگاکانی ڕاھێنان و دەستکەوتەکانی «ئەمکا»و نسکۆکانیان بووم.

ئەوانەی تازە ھاتبوون، کەسی توندو تووش بوون و ئاسانی یاساو ڕژێمەکانی زیندانیان وەرنەدەگرت. پێشەنگیان جیمی ئەبریل بوو، ئەوەی لەسەر دەستی جوسلوفو پەروەردەببوو و لە چەندین شەڕی دژواردا لە ڕودیسیا بەشداربوو. جیمی یەکێک لەوانەبوو لەلایەن بزاڤەوە چەندین ناسنامەو پسولەی ساختەی بۆ مانەوەی لە ناو خوارووی ئەفریقیا بۆ کرابوو، بۆیە بەوانەوە گیرا.

جیمی زۆر بەسەرھاتی بزاڤەکەو شەڕەکانی بۆ گێڕاینەوە، بەیەکەوە دانیشتین و باسی ناکۆکییەکان و کێشەکانی بزاڤەکەی بۆ کردم، ئەگەرچی من دامەزرێنەری بزاڤەکەو یەکەم سەرکردەی



باڵای بووم، بەڵام جیمی و ھەڤاڵانی تر شێلگیرانەو بە ڕوونی باسیان دەکرد، بۆی باسکردم کەوا سەربازەکان لە ئوردوگاکان بێزارن و بەرپرسانی بزاڤەکە سەرپێچیان زۆرە، داوام لێکرد باسیان نەکات و لەم ماوەیەدا بە نامەیەک ئاگاداری ئولیڤەرم کردەوەو ئامۆژگاریم کرد بە زووترین کات چارەسەری کێشەکانی ئوردوگاکە بکات.

ڕۆژێکیان دیدارم لەگەڵ بەرپرسی زیندانەکە ھەبوو، لەوێ چاوم بە جیمی کەوت، کە منی بینی وتی: نامەکەم نادەنێ، منیش وتم: بۆ؟ ئەویش وتی: بیانوویان ئەوەیە گوایە نامەکە شتی قەدەغەی تێدایە.

لە بەرپرسی نووسینگەکە چوومە ژووری بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەفسەرەکە، پێش ئەوەی یەک وشەم لە زار بێتە دەرێ، جیمی بە ژوورکەوت و ھاواری کردە سەری و داوای نامەکەی کرد!!

جیمی منی پاڵ داو ویستی بچێتە پێشەوەو نامەکە لە دەستی ئەفسەرەکە دەربێنێت، ئەفسەرەکە خۆی لە پشت من شاردەوە و نامەکەی گرتبوو، دیمەنەکە لە فلیمێکی گاڵتەجاری دەچوو، بەڵام لە دیمەنەکە بێزت دەبۆوە، بۆیە ڕووم لە جیمی وەرگێڕاو بە ھێمنی پێیم وت: تکا دەکەم واز بێنە، ھێمن بە، من بەڵێنت دەدەمێ نامەکەت بۆ وەردەگرمەوە، تکایە لە نووسینگە بڕۆ دەرەوە.

قسەکان سوودیان ھەبوو، جیمی دەرچوو، ئەفسەرەکە زۆر تووڕەبوو، ھەڵوێستەکە بۆ من زۆر نامۆبوو، من پێناوی دووکەس بکەم، یەکەمیان کەسێکی میللەتەکەمەو دووەمیشی دوژمنێکە چەند ساڵە شەڕی دەکەم، خەڵکی نوێ زۆر ھاتن بۆیە زۆرجار دووچاری ھەڵوێستی وا ھاتم، ئەو پیاوانەی لە مێژە شانازی بە خەبات و ورە و نەبەردییان دەکەم، وا لێرە زۆر تووشی شەرمەزاری و بێزاریم دەکەن، ھەڵسوکەوت و ھەڵوێستەکانیان لە ڕادەبەدەر بێتام بوون و نەدەکرا بەرگە بگرییت.
پاش ھەفتەیەک ئەفسەرەکە نامەکەی ھێنایەوە.

بەیانییەکیان بۆ گەڕانەوەمان لە جیاتی پیادەیی سواری لۆرییان کردین، لۆریەکە دەڕۆیشت و دەسوڕایەوە، پاش ڕۆیشتن چارەگە سەعاتێک فەرمانیان دا دابەزین، خۆمان لە ڕۆخ کەناری بەردینی ئەتلەسی دۆزیەوە، تیشکی خۆر لەسەر ئاستی ئاوەکە سەمای دەکرد. باڵاخانە بەرزەکانی کیپ تاون لە ئاسۆوە دیاربوون وتیشکی خۆریان دەگێڕایەوە، بە سەراب دەچوو، بەڵام شاخەکە لە پشت خۆی مەلاس دابوو، زۆر نزیک بوو، دەستت دەگەیشتێ.

ئەفسەرە بەرپرسەکەمان وتی، ھاتوون قارچک کۆبکەنەوە، ئەوانەی لەگەڵ شەپۆڵ ھاتوون و بە

بەردە مەرجانەکان و کەڤرەکان گیربووینە. قارچکەکان لووس و گەورەو لیچ بوون، ڕەنگیان بۆری نیمچە کەسک بوون، هەبوو کێشی سێ ڕەتڵ و درێژی هەشت پێ دەبوو. کە ئاومان دەرهێنان، بە درێژایی کەنارەکە درێژمان کردن و دوایی پاش وشک بونەوەیان لە لۆریەکە بارمان کردن، دوایی زانیمان، ئەوانە هەموویان بۆ ژاپۆن ڕەوانە دەکرێن و لەوێ بۆ پەینی کیمیاوی خاک بەپیتکردن بەکاردێن.

سەرەتا کارەکە زەحمەت نەبوو، بەڵام کە چەند هەفتەو مانگی خایاند وای لێ هات. بەڵام لەبەر ئەوەی ئاسۆ و دیمەنی جوانمان لێ دیار بوو، بۆیە کارەکە بێزاری نەدەکردین. زۆرمان دەبینی، پاپۆڕە زەبەلاحەکان چۆن سینگی دەریا دەبڕن و نەوت هەڵگرەکان لە ئاسۆکەوە دەلەنگێن، دیاربوو، چۆن نەورەس ماسی ڕاودەکات و گوڵەکانی دەریا یاری لەگەڵ شەپۆڵەکان دەکەن، زۆر بە تەیرەکانی بەتریقی عەنتیکە پێکەنین، کە دەرۆیشتن لە کاروانی ڕۆیشتنی سەربازی دەچوون، بینیمان چۆن ئاوو هەوا لەسەر شاخەکە دەگۆڕاو تەماشای هەورە بە جولەکەمان دەکردو چاومان لە خۆرە تایبەتیەکە دەکرد.

ئاوی دەریا هاوینان فێنک و خۆشە، بەڵام زستانان زەحمەتە بتوانی قاچەکانت لەبەر تەوژمی شەپۆڵی بەفرینی قوتبی بەستەلەکی خواروو ڕاگرێت، زۆرجار قاچمان بە بەردە دڕەکانی کەنارەکە زامدار دەبوو، کە رووبەرێکی پانی لەو بەردانە پێک دەهێنا، سەرەڕای ئەمانەش هەر حەزمان بەکاری سەر کەنارەکە دەکرد، نەک ژیانی ناو ژووری زیندانەکە، زۆریش نەدەمماینەوە، هەموو جارێ چەند ڕۆژێکی دەخایاند.

ئۆقیانوس گەنجینەیەکی بێ سنوورە، چەندین مەرجان و هێلکە شەیتانۆکەو سەدەف و بەردی جوانمان دەدۆزییەوە، هەندێکم بۆ یادگار دەهێنایەوە زیندان. جارێکیان یەکێکمان شووشەیەکی شەرابی نەشکاوی پڕی دۆزییەوە، تامی ترشی دەدا. بەڕێوەبەرایەتی بواریدا ئەندامی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی جیف ماسیمولای هونەرمەند و پەیکەرتاش، ئەو پارچە دارانە کۆبکاتەوە کە ئاو دەیانهێنێ و لە ژوورەکەیدا کاریان لەسەر بکات و چەندین شێوەو نیگارو پەیکەری جوانیان لێ دروست بکات و هەندێ لە پاسەوانەکانیش لێیان دەکڕی. بۆ منیش کتێبخانەیەکی دروستکردو بۆ ماوەیەکی زۆر بەکارم هێنا. بەڕێوەبەرایەتیش بە مێوانەکانمی دەووت، ئێمە بۆمان ئامادەکردووە.

کاری سەر کەنارەکە، خۆشترو بە زەوقتربوو لە کاری ناو زیندانەکان، حەزمان لەو کارەبوو، چونکە خواردنەکەشی باشتربوو، بەیانیان کە دەڕۆیشتین ئاوێکی زۆری شیرینمان لەگەڵ خۆمان



دەبرد، بەرمیلێکی گەورەشمان دەبردو وەک مەنجەڵێک بۆ کوڵاندنی ماسی و مارماسی و نەرمۆلەکانی تر.

ئەبالون، جۆرێک نەرمۆلەبوو، حەزم لێ دەکرد و خواردنی نایابی من بوو، ئەبالون توند بە بەردەکان وەدەنوساو لێکردنەوەی زەحمەت بوو و هێزی زۆری دەویست، ئەگەر کەمێک زۆرتر بکوڵابایە چڕتر دەبوو و نەدەخورا.

ئەوەی دەستمان کەوتبایە لە بەرمیلەکەمان دەکردو ویلتونیش سەرپەرشتی کوڵانی دەکرد، کە خواردنەکە ئامادە دەبوو، پاسەوانەکانیش بەشداری خواردنیان دەکردین، وەک ئەوەی لە سەیران بین وابوو، زۆر پێکەنین کە لە ڕۆژنامەیەک کە بە قاچاغ دەگەیشتە دەستمان خوێندمانەوە، کەوا لە ڕۆژی زەماوەندی شازادەی بریتانی ئان و دەستگیرانەکەی مارک فیلیبس لە ساڵی ١٩٧٣ دا خواردنی تایبەتیان لە ماسی و نەرمۆلە، وەک ئەوانەی ئێمە ڕۆژانە دەیانخۆین بۆ ئامادەکردوون.

ڕۆژێکیان لەسەر کەنار دانیشتبوین و خواردنمان دەخوارد، لە ناکاو مولازم تیرپیلانش لێمان پەیدابوو و خۆمان وا نیشان دا کار دەکەین و خۆمان سەرقاڵ کرد، بەڵام نەیخوارد، ئەویش سەری مەنجەڵەکەی هەڵدایەوەو پارچە ماسییەکی کوڵاوی دەرهێناو پارچەیەکی خواردو وتی: چەند خۆشە!!

***

لە فەرهەنگی خەبات دوورگەی روبین بە «زانکۆ» ناسرابوو، زۆر لە کتێبخانەکان فێربووین، زۆر لە گیراوەکان زمانی ئینگلیزی و ئەفریکانی و هونەرو جوگرافیاو ماتماتیکی لێوە فێربوون، زۆر کەس وەک بیللی نایرو ئەحمەد کاتراداو مایک دینگاکی ئادی دانیالز بڕوانامەی زانکۆیان تێدا وەرگرت، بەڵام ڕاستی ناونانمان، لەبەر ئەوە بوو زۆر لە یەکتری فێربووین، ئێمە بووینە، خوێندنگاو پەیمانگاو کولیژو ئوستادو بەرنامەو خولی فێربوون، جیاوازی نێوان خوێندنی ئەکادیمی ڕەسمی و خوێندنی سیاسی نارەسمیمان دەزانی.

زانکۆکەمان لەبەر پێویستی زۆرەوە دامەزرا. کە گەنجەکان گەیشتنە دوورگەکە، هەستمان کرد کەم لە مێژووی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی دەزانن، ولتر، یەکێکە لەوانەی ئاگاداری مێژووی حیزبە و لە ژیاندا ماوە، دەستی کرد بە وتنەوەی چەندین وانەی سەرەتای ڕێکخستن و گەشەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی، شارەزاو زانا بوو لە وتنەوەی مادەکەو توانی بە پێی ئاستی

تێگەیشتن و وەرگرتنی هەڤالان دەرسەکە بلێتەوە. لەگەڵ ڕۆژگارا دەرسەکەنی کرانە پرۆگرامێکی تەواو کە لە لایەن دەزگای بالاوە بۆ ناساندنی مێژووی کۆنگرەی نیشتمانی و بزاڤی خەباتەکەی ئامادەکرا و بۆ دوو ساڵ دەخوێندراو بە پرۆگرامی «ئاڵ» دەناسرا، پرۆگرامی (ئا) کرا بە خولێک ئەحمەد کاترادا لەسەر «مێژووی خەباتی هیندی» دەرسی تێدا دەوتەوەو هەروەها هەڤالێک بابەتێکی لەسەر مێژووی ڕەنگینەکان لە خوارووی ئەفریقیا ئامادەکردبوو و ماک ماهاراج پسپۆربوو لە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی (ئەڵمانیای خۆرهەڵات) خولێکی بۆ مارکسیەت کردبۆوە.

ڕەوشی خوێندنەکە وەک پێویست باش نەبوو، هەندێ جار لە کاتی کارکردندا دەرسەکان دەوترایەوە، یان پاشان خوێندکاران بۆی دەهاتن، شێوەی خوێندنەکەش لەسەر ڕێبازی سقرات بوو، بیردۆزو ڕامانەکان لە شێوەی پرسیارو وەڵام پێشکەش و ڕاڤەو شرۆڤە دەکران.

دەرسەکانی ولتر لە خولەکەدا پێشەنگی فێربوونمان بوو لە دوورگەکەدا، زۆر لە گەنجەکان لە مێژووی حیزب شارەزا نەبوون و نەیاندەزانی حیزب هەر لە بیستەکان و سییەکاندا هاتیتە گۆڕەپانی خەبات. ولتر هەر لە ساڵی **١٩١٢** بۆیان هاتەخوارێ هەتا ئیمڕۆ، ئەوەش بۆ گەنجەکان سەرچاوەی گرنگ بوو بۆ ناسینی مێژووی کاری سیاسی.

هەواڵی کردنەوەی ئەم خولە لەناو گیراوەکانی بەشی گشتی بڵاوبۆوەو ئێمەش لە ئەندامەکانمان پرسییەوەو ئەوەش هاندەربوو بۆ پەیدابوونی فێرکردنی ئەندامەکانمان بە نامەگۆڕینەوە لەگەڵ گیراوەکانی بەشی گشتی دا، دەرس و ڕاپۆرتەکان بە دزی دەگەیشتە دەستیان و ئەوانیش پرسیارو پێداچوونەوەیان هەر بە دزی ڕەوانە دەکردەوە.

ئەم دەرەنجامە بۆ هەردوولامان سوودبەخش بوو، گەرچی ئەو پیاوانە زانین و فێربوونی ڕەسمییان سنووردداربوو، بەڵام لە ڕۆژانەو ژانی ژیان چاک گەیشتبوون و لە زۆر خاڵ وریاو زانابوون، زۆریان لە پراکتیک دەزانی و کەمیش لە فەلسەفەی نەزەری. جارێک مامۆستایەک وتی: بنچینەی سەرەکی سوسیالیستی لەم بیردۆزەوە هاتووە کە دەڵێ:«هەر کەسێ بە گوێرەی دەسەڵاتی، بۆ ئەو کەسەی بە گوێرەی پێویستی»«لەوە پرسیارێ کرا» باشە ئەم قسەیە بە پراکتیک چی دەگەیێنێ و مانای چییە؟ ئەگەر من پارچە زەویەکم هەبێ و پارەم نەبێ، بەڵام هاوسێ یەکم پارەی هەبێ و زەوی نەبێ، کاممان پێویستترە کامیان زۆرتر پێویستمان بەوی ترە؟. ئەم پرسیارەو پرسیاری وا شرۆڤەو بیرکردنەوەی زۆرتری دەویست، بۆیە ناچاردەبووین بۆ وەڵامدانەوەی ئەم



پرسیارانە قووڵترو وردتر بیربکەینەوەو تێڕوانینی ئاراستەکراومان هەبێ.

من چەند ساڵ دەرسی ئابووری سیاسیم وتەوە، وە لە یەکەم هەنگاوو کاری ئابووری مرۆڤایەتیەوە دەستم پێکرد، هەر لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتییەوە هەتا قۆناغی دەرەبەگایەتی و دوایش سەرمایەداری و بۆ سوشیالیزم، من خۆم بە زاناو شارەزا نەدەزانی چ لە بابەتەکە، یان لە جۆری دەرس وتنەوەکەدا، کارەکەم کردە پرسیارو وەڵام، ڕێبازەکەشم عقائدی نەبوو، بەڵام بەرەو سۆشیالیزمی دەشکاندەوە، چونکە ئەوکات ئەم ڕێبازە باشترین ڕێکخستنی ژیانی ئابووری دەنواند.

بێجگە لە دەرس وتنەوە کاری پارێزەری و دادیشم دەکرد، هەندێ جار بیرم لەوە دەکردەوە لە ژووری زیندانەکەمدا لافیتەیەک هەڵواسم وناوی خۆمی تێدا بنووسم، چونکە ڕۆژانە چەند سەعاتێکم بە کاری ئامادەکردنی سکاڵانامەی قەزایی و گلەیی بۆ زیندانییەکان ئامادە دەکرد، زۆر لە گیراوەکانیش بۆ ئەم مەبەستە دەهاتنە سەردانم و گەرچی قەدەغەش بوو، بەڵام من پێیشوازیم دەکردن.

بە پێی یاسای خوارووی ئەفریقیا تاوانبار بۆی نییە مافی نواندنی یاسایی بەکاربێنێ، هەزارەها کەس لە ئەفریقییە ئەسلییەکان لەبەر ئەوە دووچاری گرتن هاتبوون و کەس بۆی نەبوو لەبەردەم قەزا نوێنەرایەتیان بکات. کەم ئەفریقی هەبوو بتوانێ پارەی پارێزەر دابین بکات، بۆیە زۆربەیان بە ناچاری بڕیاری دادگایان قەبووڵ دەکرد.

زۆربوون ئەوانەی لە بەشی گشتی دا گیرابوون، هەر لەبەر ئەوەی کەسێ نەبوو لە دادگادا پارێزەرییان بۆ بکات. بۆیە زۆریان لە من کرد داوای ئیستیئنافیان بۆ ساز بکەم. ئەوەش یەکەم جار بوو مامەڵە لەگەڵ پیاوانی یاسا بکەن.

لە گیراوەکانی بەشی کشتی چەندین نامەی یارمەتیم دەگەیشتێ، منیش داوام دەکرد زۆرترین وردەکاری کێشەکەو تاوانەکەی و سەلماندنەکانیم بۆ ڕەوانە بکات، لەبەر ئەوەی کارەکە بە نهێنی دەکرا بۆیە هاتن و گەیشتنی زانیارییەکان بە ناتەواوی و بە پچڕپچڕی دەگەیشتن، هەندێ جار ڕاوێژی یاسایی لە نووسینگەی ماندێلاو تامبۆی جاران کە کاری هەر نیو سەعات دەبوو، ساڵێک ، یان زیاتریشی دەخایاند.

ئامۆژگاری خاوەن کێشەکانم دەکرد لە دادگای باڵا داوای فایلەکانیان بکەن و ئەوەش بڵێین کەوا ناتوانم خەرجی هاتنی فایلەکان بکەم و داواکارم هاتنەکانیان بە خۆڕایی بێ و هەندێ جار

داواکانیان جێبەجێ دەکرا.

کە فایلەکەم تەماشا دەکرد لەبەر ڕۆشنایی لاریبیەک لە جێبەجێ کردنەکان، یان خوارکردنەوەی ڕاستییەک، یان کەمی سەلماندن، ڕاپۆرتێکم بۆ ئیستیئناف ئامادە دەکردو بە دەستخەتی خۆم نامەیەکم بۆ دادوەر دەنووسی و ڕەوانەی بەشی گشتیم دەکرد، لەبەر ئەوەی بە پێی یاساکانی زیندان نابێ داوا بۆ کەسێکی تر بنووسیت، بۆیە داوام لە گیراوەکە دەکرد بە دەست خەتی خۆی نامەکەی بنوسێتەوە، لەبەر ئەوەی زۆربەیان نەخوێندەواربوون، بۆیە داوام لە یەکێکی تر دەکرد نووسینەکەی بۆ بکاتەوە.

لەم کارە قەزایانە زۆرم زەوق وەردەگرت و زۆرجاریش کۆششەکانم تەواوی ئەحکامەکانی دەگۆڕی یان سزاکانی سووکتر دەکرد. ئەوەش جێگای ڕەزامەندی گەورەبوو، ئەگەر زیندان جێگای داماڵینی مرۆڤە لە هەموو هێزو وزەیەک، ئەوا وا ئیمڕۆ شتەکان پێچەوانەیە. من کەسم لەوانە نەدەبینی کە ئیشم بۆ دەکردن، بەڵام جاری وا هەبوو کە گیراوەکانی بەشی گشتی زۆرەی خزمەتی ئامادەکردنی خواردنیان بەردەکەوت ولێم نزیک دەبوون و دیانچرپاندە گوێم و سوپاسیان دەکردم.

* * *

دەسەڵاتداران وازیان نەدەهێنا لە چەوساندنەوەو بێزارکردنی ژنەکەم، لە ساڵی ١٩٧٢ ئەفسەرێکی پۆلیس هەڵیکوتایە ماڵی ژمارە ٨١١٥ لە ئورلاندو ویست و بەردێکیان لە پەنجەرەکە دابوو و تەقەشیان لە دەرگای دەرەوەی کردبوو، لە ساڵی ١٩٧٤دا تاوانبارکرا گوایە سەرپێچی قەدەغەی سەری کردووە کە بێجگە لە منداڵەکان و دکتۆرەکە ببینێت.

ئەو کاتانە لە نووسینگەی پارێزەرییدا کاری دەکرد، بۆیە بە کۆششی برادەرێک توانرا زینی و زیندزی لە نووسینگە لە کاتی پشوودانی نیوەڕۆدا بە دیداری دایکیان شادبن، ئەوەش وینی تاوانبار کرد و لە ئەنجامدا بە گرتنی شەش مانگ زیندانی سزادراو ماوەی گیراوەکەشی لە زیندانی کرونستادی بەسەربرد، کە ڕەوشی تێدا لە زیندانی بریتۆریا باشتربوو.

دوایی دەسەڵاتداران بواریان بە زینی و زیندزی دا لە پشووی کۆتایی هەفتەدا سەردانی دایکیان بکەن، لەوێ بۆی نووسیبووم، کەوا ئەمجارە لە زیندانا هەستم بە ستەم کرد و بڕیاریشم دا لەمەودوا لەسەر خەبات سوورتربم.

لە ساڵی ١٩٧٥ کە وینی ئازادکرا، بەهۆی نامەو پەیوەندی پارێزەرەکان پلانێکمان دانا تا



زیندزی بتوانێ لە زینداندا سەردانم بکات، پەیڕەوی زیندان وایە منداڵ لەنێوان تەمەنی دوو ساڵی هەتا شانزدە ساڵی بۆیان نییە بەسەردان بێنە زیندان، کە هاتمە دوورگەی ڕوبێن منداڵەکانم لە نێوان ئەم تەمەنانە دابوون، بیانووش ئەوەبوو، گوایە منداڵ تووشی دیاردەی نەفسی ئاڵۆز دەبێ ئەگەر سەردانی زیندان بکات، بە پێچەوانەش کاریگەری خراپیشی لەسەر دەروونی زیندانیەکەش دەبێ ئەگەر منداڵەکانی نەبینێ.

لە ساڵی ١٩٧٥ دا، زیندزی تەمەنی پازدە ساڵان بوو، بۆیە دایکی بەناچاری پسولەی لەدایکبوونی بە ساختەو بە تەمەنی شازدە ساڵی بۆ سازکرد، تا بتوانێ بێتە دیدارم، چونکە ئەفریقیەکان ڕۆژی لەدایکبوونیان بە وردی نەنووسراوە، بۆیە وینی بۆ ئەم کارە زەحمەتی نەهاتە پێش و داوای کرد تەمەنی یەک ساڵ بچووک بکاتەوە هەر زوو ڕەزامەندی لەسەر وەرگرتبوو.

لە مانگی دیسەمبەردا و پێش سەردانەکەی زیندزی بە چەند هەفتەیەک دایکی وینی هاتە سەردانم، لەناو قسەکاندا وتم، حەزدەکەم زیندزی بێتە لام، دایکی وینی جاران مامۆستا بووە، بۆیە بە سەرسامیەوە وتی: ناکرێ، ئێستا تەمەنی زیندزی پازدەیەو نابێ، یەکسەر بۆم ئاشکرا بوو کەوا ئەو ئاگاداری ئەو پلانە نییەو لەبەر ئامادەیی پاسەوانەکەم بۆم نەکرا پێی بڵێم، بە منگەمنگ وتم: خەمت نەبێ! مەسەلەکە ئاسانە.

* * *

لە بەیانی ڕۆژی دواتر و پاش نانخواردنی بەیانی، دوو پاسەوان لە ژوورەکەم بەژوورکەوتن وتیان، لە نووسینگەی سەرەکی داواکاریت هەیە، کە گەیشتمە نووسینگە بە پاسەوان دەورم گیرا، مولازم برنس و داواکاری گشتی زیندان چاوەڕییان دەکردم، ڕەوشەکە ئاڵۆز دیاربوو، داواکاری گشتی وتی:

– ماندێلا، زانیم دوێنێ زەوقت لە لاسارییەکەت وەرگرتووە، ئیمڕۆ ڕەوشەکە جیاوازە، بەوە تاوانبارکراویت گوایە جنێوت بە بەرپرسی زیندان داوە، ئەوەش تاوانێکی گەورەیە. بەڵگەنامەیەکی تاوانباری دامێ و وتی:

– هیچت هەیە، بیڵێیت؟

+ نەخێر، دەتوانی قسە لەگەڵ پارێزەرەکەم بکەیت.

برنس لێویشی نەجولاندو داوای لێکردم بگەڕێمەوە ژوورەکەم

یەکسەر ئەوەم بۆ هات داوایەک دژ بە هەموویان تۆمار بکەم، هەر لە مولازم برنس هەتا وەزیری داد و بە بەدرەوشتی و نارێکی بەڕێوەبردن تاوانباریبیان بکەم و هەموو رژێم و یاساکانی زیندان دووچاری قەفەسی تاوانباری بکەم و وەک دەزگایەکی نەژادپەرستی و لە ژێرسایەی دەسەڵاتی پیاوی سپی بناسێنم و کێشەکە بکەمە کێشەیەکی گشتی و ناچاریان بکەم لە داواکەیان دژ بە من پەشیمان ببنەوە.

داوام لە جۆرج بیزوس کرد بەرگریم لێ بکات و ئیشم بۆ ئەوەکرد لە نزیکترین بواردا دیدارمان ببێت، بە بەڕێوەبەرایەتیشم وت، کەوا چەند ڕێنمایی نووسراوی دەدەمێ، کە پرسیاریان کرد، ئەمەیان بۆچی، لە وەڵامدا وتم، هەست دەکەم ژوورەکەم لغمدارە و بە ئامێری گوێگرتن چاودێرە، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی بەوەیان رازی نەبوو، بۆیە بە ناچاری رازی بووم ئەوەی دەمەوێ بەزار پێی بڵێم و وتم، ئێوە بە هیچ مافێ ناتوانن لە نووسین قەدەغەم بکەن و هەر ئەوەش ئەوە دەگەێنێ کەوا بەڕێوەبەرایەتی بەرامبەر من لە هەڵسوکەوتا گومانی هەیە.

راستی مەسەلەکەش ئەوەبوو، کەوا بەڕێوەبەرایەتی لەوە دەترسا بەهۆی نووسینم بۆ جۆرج شتێ بە رۆژنامەکان دەگات، لە راستیش ئەوەیان بەشێکی ستراتیژیەکەمان بوو. گومانی ئەوەشیان هەبوو کەوا من جۆرج بکەمە کەناڵێکی گەیاندن بە ئولیڤێر تامبو لە لۆساکا، هەروەها گومانیشیان هەبوو کەوا من شتی ناسک و هەستیار دەنووسم، پێشتر من جۆرجم بۆ کاری لەم جۆرە بەکارهێنابوو، بەڵام ئەمجارە شتی لەم جۆرەی تێدانەبوو.

رۆژی دادگاییە تەئدیبەکە دانراو لە کیپ تاونەوە دادوەرێک بۆ سەرۆکایەتیەکەی هات، رۆژێک پێش دادگاییەکە ئاگاداریان کردمەوە کەوا پارێزەرەکەشم دەگاتە دوورگەکەو دەتوانی قسەکانی خۆتی بۆ بنوسیتەوە، بۆ بەیانیەکەی لە نووسینگەی سەرەکی جۆرجم بینی و لەسەر چەند خاڵێ قسەمان کرد. بەڵام، بە دەستپێکردنی دادگاییەکە پارێزەری داواکار رایگەیاند کەوا بەڕێوەبەرایەتی زیندان لە داواکەی پەشیمان بوویتەوەو دادوەریش دانیشتنەکەی هەڵگرت و لەبەر چاوان گوم بوو، بەسەرسامییەوە لەگەڵ جۆرجا تەماشای یەکترمان کردو پیرۆزباییمان بەو سەرکەوتنە لە یەکتری کرد، لەو کاتەی خەریکی کۆکردنەوەی کاغەزەکانم بووم، ئەفسەرێک لێم هاتە ژوورێ و هیمای بۆ کاغەزەکان کردو وتی: ئەم فایلەم بدەرێ.

منیش رازی نەبووم فایلەکەی بدەمێ و وتم، ئەوەیان فایلێکی تایبەتیە لەنێوان من و



پارێزەرەکەم و بە پارێزەری داواکارم وت:

– تکایە بەم پیاوە بڵێ ئەم فایلە پارێزراوە و لە نێوان پارێزەرەکەی و وەکیلەکەی دەمێنێتەوە و حەقی خۆمە نەیدەمێ.

پارێزەری داواکار پشتیوانم بوو، بەڵام لەبەرئەوەی دادگا هەڵسابوو بۆیە دەسەڵاتی نەبوو قسە بکات، لەم ژوورە ئاساییە دا دەسەڵاتی ئەفسەرێک بەرزترە لە دەسەڵاتی ئەو، بۆیە ئەفسەرەکە فایلەکەی لە دەست دەرهێنام و هیچیشم لە دەست نەهات. شاراوەش نەبوو کەوا هۆی روون و ئاشکرای بەڕێوەبەرایەتی بۆ هەڵوەشاندنەوەی دادگاکە تەنیا لەبەر ئەوەبوو تا دەست بەسەر ئەو بەڵگەنامانەدا بگرێت و هەندێ نهێنی چەنگ بکەوێت، بەڵام لە راستیدا، بەڵگەنامەکان هیچی وایان تێدا نەبوو لە لای ئەوان نەدیارو شاراوە بێ.

هیچ رۆژێک بیرمان لە هەڵاتن لە زیندان نەدەکردەوە، بەڵام لەوەتی لەم دوورگەیەدا گیراوین، ئەم مەسەلەیە زۆر بە بیرماندا دەهات، ماک ماهاراجاو ئادی دانیلز، ئەو پیاوە بە جەرگ و فێڵبازو زۆرزانە زوو زوو بەرنامەیان دادەڕشت و چەندین ئەگەرو پیلان نیشان دەدا، رامانەکانیان پڕ مەترسی بوون، سەرەڕای ئەگەری مەترسییەکان زۆرجار بیرمان لێیان دەکردەوەو شرۆڤەی تەنەکانمان دەکرد.

ماوەیەکی زۆر خەریکی ئەم بابەتانە بووین، کارمەندی دەستڕەنگینی جیف ماسیمولا توانی کلیلێک دروست بکات زۆربەی دەرگاکانی بەشەکەی دەکردەوە، رۆژێکیان پاسەوانێک کلیلەکانی لەسەر کورسیەک لەبیرچوو و ئەویش خێرا نموونەی بە سابوون لەسەر وەرگرت و لە سەری کلیلی دروست کرد. بەو کلیلە دەمانتوانی بچینە ناو ژوورە تاکە کەسیەکان و هەندێ لە مەخزەنەکانیش بکەینەوە، بەڵام بۆمان نەدەکرا ئەم کلیلە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەشەکە بە کاربێنین، چونکە دوورگەکە لەناو ئاوی دەریابوو و بۆ دەربازبوونمان هیچ بوارمان نەبوو.

لە ساڵی ١٩٧٤ دا هزرێک لەلای ماک گەڵاڵەبوو بۆ دەربازبوون بە خەرەندێک لە ئاوەکە. کە لە کیپ تاون سەردانی دکتۆری ددانی کردبوو، زانیبووی کەوا دکتۆرەکە ناسیاوی گیراوێکی سیاسییە، دکتۆرەکە دڵسۆز دیاربوو، رازی نەبوو وەک دکتۆرێک ماک ببینێت هەتا کۆتی پێی نەکەنەوە. ماک لە ژووری چاوەڕوانی نهۆمی دووەمی عیادەکەدا کە دەیڕوانییە کۆڵانێکی تەنگەبەر بیری لە هەڵاتن کردەوە.

کە ماک گەڕایەوە وتی وا باشە پێکەوە رۆژێک بۆ سەردانی دکتۆری ددان دابنێین، ئاگادار

کرابینەوە کەوا، من و ماک و ویلتۆن و ئەمکوای و گیراوێکی تر پێکەوە دەچینە کیپ تاون بۆ لای دکتۆری ددان، ئێمە هەرسێکمان بۆ هەڵاتن ئامادەییمان نیشان دا، بەڵام گیراوەکەی تر رازی نەبوو، بۆیە بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکە دوودڵ بووین.

ئێمە هەرسێکمان بە بەلەمێک و لەژێر چاودێرییەکی توندا گەیشتینە کیپ تاون بۆ لای دکتۆری ددان. لەبەرئەوەی هەموومان راهێنانی سەربازییمان کردبوو بۆیە بۆ جێبەجێ کردنی هەڵاتنەکە ترسمان نەبوو. ماک چەقۆیەکی بۆ کاتی پێویست هەڵگرتبوو. کە گەیشتین، پاسەوانەکان عیادەکەیان لە خەڵکی تر چوڵکردو داوایان کرد کۆتی پێمان بترازێنن و داواکەیان جێبەجێ کردین.

ماک لە پەنجەرەکەوە کۆڵانەکەی نیشان داین، بەڵام شتێکی بینی نیگەرانی کرد، کۆڵانەکە گەرچی لە جەرگەی شاری گەورەی کیپ تاون بوو، بەڵام چۆڵ و بێ رێبواربوو، ماک وتی، جارەکەی تر، ئەم کۆڵانە لە پیادەو ئۆتۆمبێل جمەی دەهات، بۆیە هەستی کرد، کەوا ئەمەیان داوە!!

منیش وام هەست کرد، بەڵام ویلتۆن سووربوو لەسەر هەڵاتن و ماکی بە شێواو ناساندو بە منی وت: مادیبا دیارە شێت بوبێت.

بەڵام منیش وەک ماک بیرم دەکردەوەو هەر ئەوەندەمان کرد ددانمان بە دکتۆرەکە نیشان داو گەڕاینەوە، بەڵام دکتۆرەکە بە دیتنی پاکی و خاوێنی ددانەکانم سەرسام بوو و لای سەیربوو کەوا من بۆچی هاتووم.

پلانەکانی ماک زۆرتر زانستی و پراکتیکی تر بوون و پلانەکانی ئادی دانیالز زۆرتر لە هەڵچوونی خەیاڵ دەچوون. هەتا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٠ فڕۆکەمان لە ئاسمانی دوورگەکە نەدیبوو، بەڵام وا فڕۆکە و هیلیکۆپتەر و ناقیلەی نەوتی زەبەلاحمان لێ دیارە و هاتووچۆیانە، رۆژێکیان ئادی هات و وتی، بیرۆکەیەکم هەیە، با حیزب فڕۆکەیەکی هیلیکۆپتەر پەیدا بکات و بە رەنگی سەربازی رەنگی بکات و لێرە سوارت بکات و لەسەربانی سەفارەتێکی دۆستی ولاتێکی هاوسۆز لە کیپ تاون داتبەزێنێت و ئەوانیش مافی پەنابەری سیاسیت دەدەنێ، بیرۆکەکە شێتانە نەبوو، بۆیە داوام لە ئادی کرد پلانەکە لە لۆساکا بگەیێنێتە ئۆلیڤەر، ئەویش جێبەجێی کرد، بەڵام وەڵامی نەبوو.

* * *

یادکردنەوەی جەژنی لەدایکبوون بۆ گیراوەکان لە دوورگەی رۆبین زۆر ئاسایی بوو، لەجیاتی



کێک و دیاری، هەموومان بەشێکمان لە خواردنەکانمان رۆژانە هەڵدەگرت و لە رۆژەکەداو بۆ یادی لەدایکبوونی یەکێک پێشکەشمان دەکرد، رۆژی لەدایکبوونی من و فیکیلی بام دەکەوتە رۆژی ١٨ی یۆلیۆ، ساڵانە بۆ یادی لەدایکبوونمدا برێ شیرنەمەنی کۆکراوەم دابەش دەکردو هەموومان لە ئاهەنگەکەدا دەمانخوارد، یادی پەنجا ساڵەی لەدایکبوونم لە ساڵی ١٩٦٨دا بەبێ ئاهەنگ و یادکردنەوە بەسەرچوو، بەڵام لە یادی پەنجاو حەوتەمینەکەی لە ساڵی ١٩٧٥دا، وڵتەر سیسولو و ئەحمەد کاترادا، پێشنیاری یادی شێست ساڵەی لەدایکبوونمیان باسکرد.

ئەوەی زۆر بە زیندوویی لە خەیاڵماندا دەمایەوە، پاراستنی یادی خەبات بوو لە دڵی خەڵکدا، لەو دە ساڵەی رابردوودا حکومەت هەموو رۆژنامە لیبرالییەکانی کپ کردبوو، دەنگ و وێنەو دووانی شۆڕشگێران لە ژێر چاودێری وردبوون، یان لە کونجی زیندانەکاندا دەست بەسەربوون، ئەوەی سەرپێچیشی کردبایە و سەرنووسەرێک دەنگی لێوەهاتبایە، یەکسەر خۆی دەگیراو رۆژنامەکەی بە یەکجاری دادەخرا.

رۆژێکیان لە حەوشەی زیندانا لەگەڵ وڵتەر و ئەحمەددا بووین، بۆ بیرەوەرییەکانت نانووسیتەوە، ئەحمەد وتی، ئینجا باشترین کاتیش بۆ بڵاوکردنەوەی جەژنی شێست ساڵەی لەدایکبوونت بێت وڵتەریش وتی، خۆ ئەگەر رۆژانەی خۆت بەراستی بنوسرێتەوە ئینجا میللەت تێ دەگات کە چۆن خەباتمان بۆیان کردووەو لە مەیدانی خەباتیش دەمێنینەوە و چاک دەزانن خەڵکانێک هەن کۆشش و خەباتیان بۆ دەکات. ئەوەش جۆشی نەوەی نوێ گەرمتر دەکات و سوورتر دەبن لەسەر خەبات، بیرۆکەکەم لا باش بوو، پاش گفتوگۆیەکی تر بڕیارم دا دەست بەکاربم.

من وام، کە بڕیاری پرۆژیەکم دا، یەکسەر ئیشی بۆ دەکەم، بە تەواوی خۆم بۆ پرۆژەکەم تەرخانکردو خشتەیەکی کارم بۆ خۆم دانا، شەوانە کارم دەکردو بە رۆژیش دەخەوتم، هەندێ جاریش ئێوارەکان کەمێ دەخەوتم و کاتژمێری دەی شەو رادەبووم و تا بەیانی دەمنووسی، رۆژانی ئیشکردنیش کە لەکار دەگەڕاینەوە، یەکسەر دەخەوتم و لە کاتی شێواندا رادەبووم و دەستم بە نووسین دەکرد، پاش چەند هەفتەیەک بە بەڕێوەبەرایەتیم راگەیاند کەوا من تەندروستیم دروست نییەو ناتوانم کاربکەم، بایەخیان بە مەسەلەکە نەداو یەکسەر رازی بوون و رۆژانە دەخەوتم.

من رۆژانە نووسینەکەم دەدایە ئەحمەد کاتراداو ئەویش پاش خوێندنەوەی دەیدایە وڵتەر و هەردووکیان تێبینییەکانیان لەسەر تۆمار دەکرد، هەردووکیان رەخنەو تێبینیان هەبوو، منیش بە سینگ فراوانییەوە تێبینییەکانم وەردەگرت و تۆمارم دەکردن، هەرسێکمان وەک تیمێک کارمان

دەکردو زۆرجار دەقەکەم لەسەر پێشنیارەکانیان دەگۆڕی، پاش یەکەم پێداچوونەوە، دەقەکە دەدرایە لالۆ شیبا بۆ کورتکردنەوەی بە نووسینی ورد، هەر هەشت لاپەڕەی لە یەک لاپەڕەدا دەنووسیەوەو لەم جۆرە نووسینە وردانە لێزان بوو، دوایی دەدرایە ماک ماهاراجا بۆ ئەوەی رەوانەی دەرەوەی زیندانی بکات.

پاسەوانەکان لە نەخەوتنی شەوانم سەرسام ببوون، سەریان لەوە دەرنەدەچوو، رۆژێکیان بە ماکیان وتبوو، ئەویش شانی بۆ هەژاندبوون و وتبووی، نازانم، بە رێژەیەکی خێرا دەمنووسی لە بەکارهێنانی رستەو زاراوە دوودڵ نەبووم، بە چوار مانگ مسوەدەی یەکەمم نووسی، رۆژانەی خۆم هەر لە منالێمەوە هەتا دوایی هاتنی دادگایی ریفۆنیاو هەندێ رووداوی رۆژانەی دوورگەی رۆبین.

کە رۆژانەکەم دەنووسیەوە، دووبارە لەگەڵیاندا دەژیامەوە، لە تەنیایی شەوەکاندا، ئەوەی لەتەمەنی لاویمدا لە قونوومکیکیژوینی کردبووم و بیستبووم هەمووم بەبیرهاتنەوە، دووبارە لەگەڵ خۆشیەکانی هاتنم بۆ جۆهانسبێرگ ژیامەوە، ئەدی باهۆزەکانی دامەزراندنی کۆمەڵەی گەنجان و دواخستنی بەردەوامی دادگای خیانەت و درامای ریڤونیا، وام دەزانی خەون دەبینم، لە زیندەخەودام. ئەوەی هەستم پێ دەکردو بەبیرم دەهاتەوە، هەمووم خستە سەرکاغەز، هەمووم بە سادەیی و راستگۆیی و بە روونی تۆمار کرد.

ماک توانی هەموویان لەبەرگە دەفتەرەکانی خوێندنی خۆیدا بیانشارێتەوە، کە لە ساڵی ١٩٧٦ ئازادکرا هەموویانی لەگەڵ خۆیدا رزگارکرد، وامان راگەیاند کەوا ماک بڵێ هەموو نووسینەکان بە دزی گەیشتوونەتە دەرەوەی وڵات و گومانی مانی پێنج سەد لاپەڕەکەی زیندان نەمێنێ، هیچ رێگامان نەبوو، بێجگە لە شاردنەوەیان لەناو باخچەی حەوشەکەی زیندانا، چونکە لەوێ چاودێری ورد نەبوو، زۆربەیان کاتیان بەقسەکردن لە بەشەکەی تری حەوشەکەدا بەسەردەبردو بەشی باکوورەکەی لە بەشەکەی تری دیارنەبوو، ئەوانیش جارجار دەهاتن.

هەمووم لە کاتی وەرزشی بەیانیاندا لەناو خۆڵدا شاردەوە، تا چاڵی گەورە هەڵنەکەنین و دیار نەبێ، سێ چاڵی بچووکمان لێداو لاپەڕەکانمان لە پلاستیک بەرگکرد و لەناو پاکێتی بەتاڵی کاکاونا، دەبوایە کارەکان زۆر خێرا ئەنجام بدەین، داوام لە جیف ماسیمولا کرد چەند ئامێری تیژم بۆ پەیدا بکات، لە ماوەی چەند رۆژێکدا چەند پارچە ئاسنی سەرتیژی بۆ هێنام.

بەیانییەکیان و پاش نانخواردن چووینە بەشی خوارووی گۆڕەپانەکە، من و ئەحمەد کاترادا و وڵتەر دانیالز بووین، خۆمان بە گفتوگۆ سەرقاڵ کرد، هەر یەکێکمان بەشێکی لەژێر کراسەکەی



شاردەبۆوە. کە وتم دەست بە هەڵکۆڵین بکەن، دەستیان پێکرد. من لە نزیک بۆری زێرابەکە چاڵێکم لێداو گەورەترین پاکێتم لەناودانا و ئەوانیش دوو چاڵیان لێداو بەشەکانیان شاردەوە.

لەگەڵ هاتنی کاتی چوونمان بۆ ژوورەوە کارەکەمان تەواوکرد، بە ئەنجامدانی ئەم کارە هەستم بە کامەرانی کردو چیتر بیرم لێیان نەکردەوە. پاش چەند هەفتەیەک بەیانییەکیان کە لە خەو رابووم گوێم لە تەقە تەقی خاکەناس و پێمەڕەبوو، لە کاتی دەرچوونمان بۆ شووشتن، چوومە پشتی کۆڵانەکەو لە کونی دەرگاکەوە تەماشای دەرەوەم کرد بینیم، وا چەند گیراوێک باخچەکە هەڵدەکۆڵن، ئەو شوێنەی بیرەوەریەکانمان تێدا شاردبۆوە، ئەوێندەرێیان هەڵدەکۆڵی. کە پرسیم و زانیم، بەڕێوبەرایەتی دیوارێک دروست دەکات تا چیتر نەتوانن لەگەڵ گیراوانی ژوورەوە لە حەوشەکەوە قسە بکەن. تیمەکە خەریکی لێدانی بناغەی دیوارەکەبوون.

وڵتەر و ئەحمەد کاترادام بە هەڵکۆڵینەکەی حەوشەکە ئاگادارکردەوە، کاترادا مەزندەی ئەوەی دەکرد کەوا کاغەزەکان بێجگە لەو بەشەی لە نزیک زێرابەکە شاردراوەنەتەوە رەنگە بدۆزرێتەوە. کە خواردنی بەیانی گەیشت، تا گیراوەکانی حەوشەکە لە بەشی گشتیدا هاتبوون دیدارمان نەبێ، ئەوانیان دوورخستنەوە. ئێمەش دەست و بردو هەرکەسە دەستی دایە قاپەکەی و بەرەو چاڵەکە رۆیشتین و جیف دانیالزیش هەستی بە شتێ کردبوو، بۆیە ئەویش بەدواماندا هات و بە پەلە دوو پاکێتە بچووکەکەمان دەرهێناو بۆ سێیەمیش بوار نەبوو، چونکە کات و هەڵکۆڵینی زۆری دەویست و دڵنیاش بووین هەڵکۆڵینەکەی ناگاتێ و شوێنەکەی ئەمینە. پاکێتەکانمان لە باخەڵمان شاردەوەو گەڕاینەوە ژوورێ، لەبەر ئەوەی ئەو رۆژە دانیالز لەکارکردن مۆڵەتی هەبوو، بۆیە هەر زوو پاکێتەکانمان دایە ئەو تا بەزووترین کات رزگاریان بکات. ئادی سەرەڕای بوونی مەترسی لەسەر گیانی بە کارەکە رازی بوو، کە پاکێتەکان رزگاریان بوو ئیسراحەتم کرد و ویستم لە بیری خۆمی ببەمەوە.

کە گەڕاینەوە، پێش ئەوەی بچمە گەرماو، چوومە سەر چاڵەکەو نیگایەکم لێکرد، کە بینیم ئەژنۆم شکا، بۆرییەکانی ئاوەکەیان لە بنڕا دەرهێناوەو گومانم نەما کەوا پاکێتە گەورەکەیان دەرهێناوە، بەبێ ئەوەی هەست بکەم، بە وردی چاودێرییان دەکردم، دوایی وتیان، کە تۆمان بە سەرسامی بینی، هەستمان کرد شتێ لەو شوێنە شاردراوەتەوە، گەڕامەوە ژوورێ و چوومە گەرماوەکەو بە وڵتەر و کاترادام وت، نووسینەکانیان دۆزیوەتەوەو گەڕامەوە لای ئادی و ئەویش هەر زوو هەردوو پاکێتەکەی تری لە ناوبردبوو.

بۆ بەیانی لە نووسینگەی سەرەکی بانگکرام، کە دیداری بەرپرسی زیندانم کرد، چەند گەورە بەرپرسانی تر تازە لە بریتوریاوە هاتبوون، ئەوانیش لە تەنیشتی دانیشتبوون، بەرپرسەکەی زیندانەکەمان، بێ پێشەکی و سلاو وتی: ماندێلا بیرەوەرییەکانتمان دۆزیوەتەوە. منیش وەلامم نەبوو و ئەوەیش دەستەیەک کاغەزی نیشان دام و پرسی:

– ئەوانە دەستنووسی تۆن، وایە؟ دڵنیایین کاری تۆن.

– دەبێ ئەمە بسەلمێنن.

گاڵتەیان بە قسەکەم هات و دڵنیاش بوون کەوا تێبینییەکان و پەراوێزەکانیش ئیشی وڵتەر سیسولو و ئەحمەد کاترادایە، منیش وتم، تا بتوانن سزامان بدەن دەبێ گومانەکانتان بسەلمێنن، بەرپرسەکە وتی:

– پێویست بە سەلماندن ناکات، بەڵگەمان لە دەستدایە.

گەرجی بەرپرسی زیندان ئەو رۆژە سزای نەداین، بەلام پاش ماوەیەکی کەم هەرسێکمانی لە پێش جێگری مفەوەزی بەرژەوەندی زیندانەکان ژەنراڵ رو راگرت و وتی، نووسینی ئەم بیرەوەریانە لە ئەنجامی ئەو ئازادییەوە پەیدابووە کە ئێمە لە زیندانا زۆرتر بە ئێوەمان بەخشیوە، بۆیە ئامادەکارییەکانی تایبەت بە خوێندنتان تا ماوەیەکی دیارنەکراو رادەگیرێت. ئەم راگرتنەش چوار ساڵی خایاند.

* * *

ماک ماهاراجا شەش مانگ پاش ئازادکردنی لەژێر چاودێری و دەستبەسەری لە خوارووی ئەفریقیادا مایەوە، بە هەڵکەوتنی بوارێک بیرەوەریەکانی رەوانەی ئەنگلتەرا کرد، توانیشی بە دزی بگاتە لۆساکاو دیداری ئۆلیڤەر تامبۆ بکات، دواییش خۆی گەیاندە لەندەن و شەش مانگ لەوێ مایەوە ولەم ماوەیەداو بە هاوکاری خانمە سکرتێرەکەی توانی دەقەکە بە چاپ بنووسێتەوەو جوان ئامادەی بکات، پاشان گەڕایەوە لۆساکاو دایەوە ئۆلیڤەر. هەواڵی بیرەوەرییەکانم نەماو نەمزانی لە لای ئۆلیڤەر لە لۆساکا چی لێ هات. گەرچی بیرەوەریەکان لە ماوەی گیرانمدا بلاونەکرانەوەو کرا بە بناغەی سەرەکی ئەم کتێبە.

* * *



لە ساڵی ١٩٧٦ مێوانێکی زۆر نائاساییم هات، ئەویش جیمی کروگر وەزیری زیندانەکانی خوارووی ئەفریقیا و ئەندامی دیاری حکومەت بوو، وەنەبێ بایەخی کرۆگر تەنیا لەسەر سیاسەتی زیندانەکان هەبووبێت و بەس، بەڵکو ستونێکی گەورەی حکومەت بوو، لەسەر مامەڵەکردیان لەگەڵ بزاڤی رزگاری لە خوارووی ئەفریقیا.

شتێکی کەمم لە هۆیەکانی سەردانەکە دەزانی، حکومەت کۆششێکی مەزنی پیادە دەکرد تا سیاسەتە تایبەتیەکەی بۆ گەشەپێدانی ناوچە نەژادییە لاتەریبەکان و ناوچە نیمچە سەربەخۆیەکان، دەڤەری هەرێمی ترانسکای کە لەژێر قەڵەمڕۆیی کیە دی ماتانزیمای خزمم بوو، کە رۆژانێک لە جیاتی باوکم بەرپرسم بوو، ئەو دەڤەرە نموونەی یەکەم بوو کە حکومەت شانازی پێوە دەکرد. ماتانزیما هەموو بەرهەڵستکارێکی شەرعی دژ بە دەسەڵاتەکەی سەرکوت کردبۆوە، تا رۆژێکیان لە بیرمە بەرپرسی زیندانەکە بە گاڵتە وتی:

– ماندێلا بۆ تۆ لە هەموو شت باشتر ئەوەیە، خۆت خانەنشین بکەیت و لە ترانسکای بە خۆشی و دوورە کێشە دانیشیت.

وا دەزانم جیمی کروگریش هەر بۆ ئەم پێشنیارە هاتبوو.

کروگر، پیاوێکی قەڵەوی قسە رەق بوو، ئەندام و دەم و چاو و زاری لە وەزیری نەدەوەشایەوە. ئەم دانیشتنەم بە فرسەت زانی، باسی کێشەو گلەیی و رەوشەکانی خۆمانم بۆ کرد، دیار بوو گوێی راگرتبوو و بایەخیشی بە قسەکانم دەدا. بە بیرم هێنایەوە کەوا لە ساڵی ١٩٦٩دا بیرخەرەوەیەکمان بۆی ناردو وەلامی نەبوو، بێ متانە شانی هەڵتەکاند. بە وردی باسی خراپی گوزەرانی ناو دوورگەکەم بۆ کردو پێم وت، ئێمە تاوانبارنین، ئێمە گیراوی سیاسین و حەق نییە وا مامەڵەمان لەگەڵ بکەن، بەلام کروگر گاڵتەی بە هەموو قسەکانم هات و وتی:

– واز لەوانە بێنە، ئێوە هەمووتان شیوعی و تیرۆریستن.

پاشان، هاتمەسەر باسی مێژووی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و هۆیەکانی بەکارهێنانی توندوتیژیم بۆ ژمارد. دیار بوو شتی وای لەسەر مێژووی حیزبمان نەدەزانی. ئەو هەر ئەو پرۆپاگەندانەی دەزانی کە لە رۆژنامە راستڕەوەکان بلاوی دەکەنەوە. کروگر زۆر تووڕەبوو کە وتم، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، رێکخراوێکە لە حیزبی نیشتمانی دەسەڵاتدار کۆنترە. ئەگەر دەتەوێ بەراستی بزانی ئێمە شیوعین یان نا، برۆ بەڵگەنامەی ئازادی بخوێنەوە!! چاوی لێم زەق

کردەوە، دیار بوو ناوی ئەم بەڵگەنامەی هەر نەبیستبوو، منیش لە بێ ئاگایی وەزیرێکی حکومەت زۆر سەرسام و ئەبلەق بووم، دەبوایە سەرسامیش نەبم چونکە پیاوانی حیزبی نیشتمانی رەوشتیان وایە واش ناسراون هەموو شتێ رەتدەکەنەوە کە لێی حاڵی نەبن.

ئاماژەم بە کێشەی یاخیبوونەکەی ئەفریکانی ساڵی ١٩١٤دا کە چۆن پەنایان بردە بەر توندوتیژی گەرچی نوێنەریشیان لە پەرلەمان هەبوو و دیانتوانی کۆبوونەوەش بکەن و دەنگیش بدەن، بۆیە ئازادکردنی خۆمانم بە بیرهێنایەوە کە چۆن ژەنراڵ دو فیت و ژەنراڵ کیمب بە تاوانی خیانەتی مەزن گیران، پاش ئەوەی دوازدە هەزار سەربازی بن دەستیان بە شارو گوندەکان وەرکرد و چەندین کەسیش لەم رووداوە کوژران و دوایش هەردووکیان ئازادکران. هەروەها کێشەی روبی لیبرانتم بەبیرهێنایەوە کە چۆن رێکخراوێکی نهێنی دامەزراندو کۆششی کرد دژ بە بەشداربوونی خوارووی ئەفریقیا لەگەڵ هاوپەیمانان لە شەڕی جیهانی دووەم و پاش گیرانی بۆ هەتاهەتایێ زیندانی بۆ بڕایەوە، بەڵام زۆری نەخایاند ئازادکرا، بەڵام وا دیاربوو، کروگر لەو رووداوانە نابەڵەد بوو، کەسێ راستی و رووداوی پابەند بە نەتەوەکەی نەزانێ، چ لە بەڵگەنامەی ئازادی دەزانێ؟! چۆن دەکرێ دانوستان لەگەڵ کەسێ بکەیت لە چوارچێوەی هزرو تێڕوانینی تۆدا نەبێت؟

کروگر قسەکانی لادایە لایەک و وتی:

– ئەوانە کۆن و مێژوون، واز لە مێژوو بێنە، ئەوەی رۆیشت، تەواو.

لە پێشنیارەکەی گەیشتم، گەرچی قسەکانی خێرا و پچڕپچڕ بوون، بەڵام بە رەوشتەوەو زۆر بەرێزەوە وتی، ماوەی زیندانیەکەت زۆر کورت بکرێتەوە ئەگەر دان بە حکومەتی شەرعی ترانسکای و ئامادەش بیت لەوێ نیشتەجێ بیت.

منیش زۆر بەرێزەوە تا قسەکانی تەواو کرد گوێم لێی راگرت، دوایی وتم، من لە بنەڕەتدا سیاسەتی رژێمی بانتوستان بە تەواوی رەفز دەکەمەوەو بەهیچ شێوەیەک پشتیوانی ناکەم و دووەمیش من لە جۆهانسبێرگەوە هاتووم و هەر دەگەڕێمەوە جۆهانسبێرگ.

ئەویش زۆر نەرم بوو لەگەڵما، بەڵام بێ سوود بوو، پاش مانگێک هەمان پێشنیاری پێشکەشکردمەوە، دووبارە رەفزم کردەوە. پێشنیارەکەی کەسێ قەبوڵی دەکات، یان یاخی بووبێت، یان لادەر بێت.

* * *



گەرچی بە وردی هەواڵ و زانیارییەکانمان کۆدەکردەوە، هێشتا زۆر رووداوو هەواڵی وا هەبوو ئاگاداری نەبووین، زۆرجار دیمەنەکانی دەرەوەمان بە شێواوی دەگەیشتێ، زۆریان بە پڕۆپاگەندەی راپۆرتی رۆژنامەکان یان بە تێڕوانینی مێوانێک دەشێوا.

لە یۆنیۆی ساڵی ١٩٧٦دا گوێمان لە هەواڵی بەرپابوونی راپەڕینێکی سەرتاسەری لە خوارووی ئەفریقیا بوو، پڕۆپاگەندەی وامان دەگەیشتێ خەیاڵی بوون، بۆیە زەحمەت بوو بڕوایان پێ بکەین، دەیانووت، گەنجەکانی سویتو، حکومەتیان رووخاندو سەربازەکان چەکیان فڕێ داو هەڵاتن، هەواڵی راست و دروستمان نەدەزانێ، هەتا چەند گەنجی بەشداربووی راپەڕینەکەی ١٦ی یۆنیۆ گیران و رەوانەی دوورگەکەمان کران.

لە رۆژی ١٦ی یۆنیۆی ١٩٧٦ پازدە هەزار خوێندکار لە دژی بڕیاری حکومەت بۆ خوێندنی نیوەی دەرسەکانیان بە زمانی ئەفریکان رژانە شەقامەکان. نە خوێندکارو نە مامۆستاکانیان نەیاندەویست بە زمانی حکومەتی داگیرکەری بخوێنن و ئامۆژگاری و تکای باوکیان سوودی نەبوو. کەتیبەیەکی تەواوی پۆلیس رووبەڕوویان بۆوەو تەقەی لێکردن و لە ئەنجامدا خوێندکاری تەمەن سێزدە ساڵان هیکتور بیترسون و چەند خوێندکاری تر کوژران، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم رووداوە، خوێندکاران بە دارو بەرد وەڵامیان دایەوەو ئاکامەی سەدان خوێندکار کوژراو بریندار بوون و بە بەردیش دوو پیاوی سپیش کوژران.

کە ئەم هەواڵە لە وڵات بڵاوبۆوە، هەموو وڵاتی گرتەوە، بە پانی و درێژی وڵات کاری توندوتیژی رووی دا، کات و شوێنی ناشتنی قوربانیەکان دەبووە پەیدابوونی کۆبوونەوەو نارەزایی و رووبەڕووبوونەوەی جەماوەری، ئەوەش نارەزایی و روحی تۆڵەی گەیاندە گیانی هەموو گەنجان و لە هەموو وڵاتدا بڕیاریان دا لە خوێندنگاکانیان دابڕێن، هاوکات، پیاوانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی چوونە ناو جەماوەری خوێندکاران و هاوکارییان نواند.

تەماری فێربوونی بانتۆ پەیدابۆوە بۆ خولقاندنی ترس لە دڵی دامەزرێنەرەکانی، وا خوێندکارانی تورەی ئەو کاتە پێشەنگی بەرهەمەکەیە.

لە سەرەتای مانگی سبتێمبەر زیندانە تاکەکەسیەکان پڕ ئەو گەنجانەبوو کە لە رووداوی راپەڕینەکە گیرابوون. لەوانەو لە سەرچاوەی ئەسڵی مەسەلە و بە چرپەی نێوان دیوارەکاندا راستی و وردەکاری راپەڕینەکەمان زانی، بەو هەواڵانە دڵشادبووین، لە هەفتاکان گیانی یاخیبوونی میللی بوژایەوە، وەک ساڵانی شێستەکان نەبوو کە هەر سست بوو. زۆربەی ئەو گەنجانە بۆ هاتنە ناو

ریزی هێزەکانمان روویان لە دەرەوەی وڵات کرد، هەزارەها کەس لەو گەنجانە راهێنانی سەربازییان
لە ئۆردووگاکانمان لە تانزانیا و ئەنگۆلاو مۆزەمبیق کرد، هیچ شتێ ورە و جۆشی گیراو رەوشن
ناکات، وەک ئەوەی بزانێ لە دەرەوە کەسانێ هەیە پاڵپشتی کێشەکەی دەکەن، هاوشان بۆ هەمان
مەبەست کە ئەو بۆی گیراوە خەبات دەکات.

ئەو کاروانە گیراوە تازانە وەک کاروانەکانی تر نەبوون، هەموویان ئازاو خۆڕاگربوون، سەرپێچی
فەرمانەکانیان دەکرد، هەربۆیان بگونجابایە سلاوی حیزبیان بە دەستیان دەکرد و دەیانووت ئەماندلا
«هێز». حەزیان لە بەرهەڵستی دەکرد، نەک یارمەتی، بەرێوەبەرایەتی هەراسان ببوو، دوورگەکەیان
شێواندبوو، لەبیرمە لە دادگاکەی ریڤونیا بە ئەفسەرەکەم وت، ئەگەر حکومەت سیاسەتەکەی
بەرامبەرمان راست نەکاتەوە، ئەوا نەوەی تازە کە روو لەم دوورگەیە دەکەن، وایان لێ دەکەن زۆر
غەریبی ئێمە بکەن و سەدخۆزگە بە ئێمە بخوازن. بەڵێ، وا ئەم رۆژە هات و دوورگەکە دووچاری
ئەم رۆژە هات.

ئەم گەنجانە گیانی بەرخۆدانی تووڕەیان هەبوو، چەند مانگ پێش راپەرینەکە وینی لە
سەردانێکیدا پێی وتم و ئاگاداری کردبوومەوە، ئەو بە زمانێکی شفرە حاڵی کردم، کەوا نەوەی
گەنجەکان بە هەڵوێستی نەتەوەی ئەفریقی جۆش دراون و وتی، ئەوانە رەوش و جۆری خەباتیان
گۆڕی، پێویستە ئەوە چاک بزانیت و هەست بە بوونیان بکرێت.

کە رەوشی زیندانی دوورگەکەیان بینی، بەو ژیانە رازی نەبوون، نارەزایی توندییان نواند پێمان
وتن، ئێستا زۆر باشترە لە رەوشمان لە زیندانەکانی ساڵی ١٩٦٤، بە چاوێک تەماشای ئێمەیان
دەکرد، زۆر جیاوازی نەبوو لە دیدییان بۆ بەرێوەبەرایەتی زیندان. کە ئامۆژگاریمان دەکردن و
داوامان دەکرد هێمن بن، تووڕە دەبوون، ئەوانەیان بە نیشانەی ترسنۆکی و چۆکدادان دەزانی.

بێگومان، ئێمەی ناسراو بە کەسانی دادگای ریڤونیا یان بە کەسانی نەرمرەو دەزانی، ئەوەش
جێگای سەرسامی بوو، ئێمەی کە جاران بە رادیکالی و شۆڕشگێڕ دەناسراین، وا ئێمرۆ وامان
دەناسێن، بۆ هەڵسوکەوتم لەگەڵ ئەو گەنجانە دوو بوارم لە پێش بوو، یان بەرامبەری
لاسارییەکانیان ئازاریان بدەم، یان گوێیان بۆ راگرم، منیش بواری دووەمم پەیڕەوکرد.

داوام لە سترینێ مودلی لە رێکخراوی خوێندکارانی خوارووی ئەفریقیاو ساتس کوبر لە
کۆنگرەی میللی رەشەکان کرد راپۆرتێکم لەسەر بزاڤەکەو جووڵانەوەو کاریان بۆ ئامادە بکەن،
دەمویست بزانم، هۆکارەکانی بەشداربوونیان لەم رێبازە چییەو چۆن نیگا لە دوارۆژ دەکەن و



مەبەستیان چییە.

پێش هاتنی ئەو گەنجانە، بەرپرسی زیندانەکە، جارێکیان داوای لێکردم قسە لەگەڵ گیراوەکان
بکەم و پێیان بڵێم، زیندان یاسای تایبەتی خۆی هەیە ودەبێ پەیڕەوی بکرێت و رێز لە رژێمەکانی
بگیرێت. منیش وەڵامم دایەوە من کاری وا ناکەم، ئەگەر کاری وام کرد بە هاوکاری دوژمنی
غەدارم دەزانن.

گەنجەکان پابەندی ئاساییترین رژێمەکانی زیندان نەدەبوون، رۆژێکیان لە نووسینگەی بەرپرسی
زیندان دەهاتمە دەرێ، یەکێکیانم بینی تەمەنی نەدەگەیشتە هەژدە ساڵ لەگەڵ بەرپرسێکیان
راوەستابوو و بە ئامادەبوونی ئەفسەرێک کاسکێتەکەی هەر لەسەری بوو و کە ئەفسەرەکەش هاتە
ژوورەوە سەری کۆت نەکرد، بەمەیان دووجار رێنماییەکانی زیندانی پێشێل کرد. ئەفسەرەکەی پێ
وت:

- تکایە سەرت رووتکە.

گەنجەکە بایەخی بە قسەی ئەفسەرەکە نەدا. بۆیە ئەمجارە ئەفسەرەکە بە تووڕەیی داوای
لێکرد، گەنجەکە رووی تێ کرد و وتی: بۆ؟

ئەوەی بیستم هی بڕوانەکردن بوو، پرسیارەکەی یاخیبوونی پێوەبوو، ئەفسەرەکەش سەرسام بوو
و وتی: ئاوا سەرپێچی یاسایەکانە.

لە وەڵامدا، گەنجەکە وتی: باشە، ئەو یاسایانە بۆ دانراون؟ مەبەست لە دانانیان چییە؟
ئەفسەرەکە چیتر نەیتوانی گوێ لە قسەکانی رابگرێت بۆیە لە ژوورەکە دەرچوو و وتی:

- ماندێلا تۆ تێیگەیێنە.

بەڵام من لە جیاتی ئەوەی قسەیەکی لێ بکەم سەرم بۆی هەژاند، گوایە منیش هاوشانی
بۆچوونەکەی ئەوم.

ئەمەیان سەرەتای یەکتر ناسینمان بوو لەگەڵ بزاڤی هۆشیاری بە ناسنامەیەکی رەشەوە، ئەو
بزاڤە توانی بۆشایی خەباتی گەنجان پڕبکاتەوە، ئەوکاتانەی بۆ کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و
کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی و حیزبی شیوعی گونجاو نەبوو. بزاڤەکە لە جیاتی رێکخستن و
کۆشش دەیویست رێبازێکی فەلسەفی بگەیێنێ و خودو گیانی رەشەکان لە هەستکردن بە کەم
خۆزانین رزگار بکات، کە لە ئەنجامی دەسەڵاتی سێ سەد ساڵەی سپییەکان دووچاری هاتبوون.
بەوەیان رەشەکان بڕوایان لا گەڵاڵەبوو و جۆشیان بە خەبات دا. کە بزاڤەکە کۆششی بۆ

کۆمەڵگایەکی بێ نەژادپەرستی دەکرد، هاوکاتیش بواریان نەدا سپییەکان بۆ ئەم مەبەست و بۆ ڕەخساندنی ئەم کۆمەڵگایە کار بکەن.

وەنەبێ ڕامانەکان بۆ من تازەو نامۆبن، لەلای من شێوەی ئەو ڕامانانە هەبوون بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەی لاوانی سەر بە کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی پێش چارەگە سەدەیەک. من ئەو کاتانە هاوسۆزی نەتەوەیی ئەفریقی بووین، سووریش بووین لەسەر ناسنامەی نەژادیمان و بڕواشمان بە نەژادی خۆمان پتەوبوو و هاوبیر نەبووین لە خەباتا لەگەڵ سپییەکان کاربکەین. ئەو بزاڤەش ئێستا ڕەنگدانەوەی هەمان ئەو کێشانەن کە جاران و ئێستاش هەن و هەستیان پێ دەکرێت.

دڵنیام ئەو گەنجانەی ئێمڕۆ هەموو ئەو تەگەرانەی ڕێکخراوەکەیان بۆیان دروستی دەکات گوزەری دەکەن، وەک چۆن ئێمە جاران کۆسپەکانی بیردۆزی ناو کۆمەڵانی لاوانمان گوزەرکرد. بە سۆزێکی گەرمەوە پێشوازیم لە ئازایەتی و گیانە پۆلاییینەکەیان کرد، بەڵام فەلسەفەی دوورەپەرێزبوونیان لە نەژادی سپی بە بۆچوونی من هزر و بۆچوونی کاڵ و نەگەییون. دەوری خۆم بە دەوری بێگەردە گەورەکە دەناساند بۆ نزیککردنەوەی تێڕوانینی ئەوان لە تێڕوانینی بزاڤی کۆنگرەی نانەژادپەرستی. چاک دەمزانی ڕۆژی دێ بێزاری تەنگیان پێ هەڵدەچنێ و لە بزاڤی هۆشیاری بە ناسنامەی ڕەشیان بێهودا دەبن، چونکە لە بەرنامەی کار و هۆکارەکانیان هیچ پێشکەوتنێ نابینن و بۆ یاخیبوون و گلەییەکانیان بوارێ نابێ.

گەرچی کادیرەکانی بزاڤەکەمان بە کێڵگەیەکی بە پیت دەزانی بۆ بوونیان بە ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، بەڵام ئێمە ئەمەمان نەکرد، چونکە ڕەنگە ئەوانەو دۆستانی تری ڕێکخراوەکانی تریش ناو دوورگەکەمان لێ بڕەوێنەوەو ئیشمان هەر ئەوە بێ، باشە هاوسۆزیان بین و یارمەتیان بدەین و پشتیوانی لە دەستکەوتەکانیان بکەین، نەک هانیان بدەین بێنە ناو ڕیزەکانی حیزبمان. ئەوەی پرسیاریش لەمەڕ سیاسەتی حیزب بۆ سیاسەتی ڕژێمی بانتوستان و بەڵگەنامەی ئازادی هەبوایە ئەوا بە سینگ فراوانییەوە وەڵاممان دەدایەوەو زۆریش پرسیاری وامان ئاراستە دەکرا.

بە نامەی قاچاغ پەیوەندی زۆرم بە گەنجان کرد، هەبوو پرسیاری لە ڕەوشی زێدی من ترانسکای دەکرد. هەروەها نامەم لەگەڵ زۆر لە هاوڕێیانی ڕێباز گۆڕییەوە. زۆرمان لە پاڵەوانیە ترسناکییەکانی پاتریک لیکوتای یەکێک لە سەرکردەکانی ڕێکخراوی خوێندکارانی خوارووی



ئەفریقیا بیستبوو، کە هاتە دوورگەکە بە نامەیەک بە خێر هاتنم کرد.

لیکوتا نازناوی ترسناکی لە گۆڕەپانەکانی تۆپی پێ وەرگرتبوو، هەروەها لە بواری دەمەتەقێ و گفتوگۆشدا شارەزاو لێزان بوو. سەبارەت بە نەژادپەرستی لەگەڵ هاوڕێکانیدا ناکۆکی هەبوو، هەر ئەوەش وای کرد لە هزرەکانی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی نزیک بکەوێتەوە. کە گەیشتە دوورگەکە ئامادەیی هاتنە ڕیزەکانی حیزبمانی ڕاگەیاند، ئێمەش زۆر هانمان نەدا، نەک لەبەر ئەوەی ئەومان ناوێت و حەز ناکەین، بەڵکو لە ترسی پەیدابوونی گرژی و ئاڵۆزی گەورە لەنێوان گیراوەکانی بەشی گشتی.

بەڵام لیکوتا، سووربوو لەسەر بڕیارەکەی و هاتنە ناو حیزبی ڕاگەیاند، پاش ئەوە بە دەستی ئەندامانی بزاڤی هۆشیاری بە ناسنامەی ڕەشی لە باخچەکەدا بە خراپی پەلاماریان دا. بەڕێوەبەرایەتی زیندان بە ڕەسمی دەستدرێژکەرەکانی دایە دادگا، ئیمەش بە لیکوتامان وت، داوایان دژ تۆمار مەکەو داوای کێشەکە بکێشەوە، چونکە ئەم جۆرە ڕووداوانە تەنیا خزمەتی حکومەت دەکاو کۆششم کرد، گەنجەکان وا بزانن چەتری کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بۆ هەموو بزاڤ و هزرێکە کە بۆ ئازادی تەواو خەبات دەکەن.

ناکۆکی نێوان گیراوەکانی بەشی گشتی پەرەی سەند، دۆستانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و کۆنگرەی نەتەوەیی و بزاڤی هوشیاری بە ناسنامەی ڕەشی کەوتنە دژایەتی یەکتری، چەندین ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانی پەلاماردران و بەڕێوەبەرایەتیش داوای بۆ بەرزکردنەوەو کاتی دادگایی لە دوورگەکەش دیارکرا، ئەندامانی حیزب لە دەرەوەی زیندان پارێزەرێکیان بۆ بەرگری خۆیان ناساند. گەرچی من لە شەڕەکە ئاگادارنەبووم، بەڵام هەر بە دەستنیشانکردن منیان بۆ شاهیدی هەڵبژارد، ئەوەش بۆ من هەڵوێستێکی ناشایستەبوو. من بۆ شاهیدی بۆ هاوڕێکانم دوودڵ نەبووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەنەبووم ناکۆکی و گرژییەکانی نێوان حیزبمان و ڕێکخراوەکانی تر گەرمترو ئاڵۆزتر بکەم.

من خۆم هەر بە ڕابەرێکی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی نەدەزانی و بەس، من خۆم بە داواکاری یەکێتی دەزانی، خۆم بە داواکاری ئاشتی و چاکەی نێوانیان دەزانی. خۆم دوور ڕادەگرت بۆ لایەنگیرکردنی لایەنێک، جا ئەگەر لایەنەکە حیزبەکەی خۆشم بوایە، ئەگەر خۆم لە ڕیزی بەرگریکردن لە حیزبەکەم ببینم، ئەوا نەمتوانی چاکەو ئاشتبوونەوەیان لەنێواندا بکەم بڕوای بە یەکێتی هەبێ، با لەسەر حیسابی هاوڕێکانیشم بێ لەناو حیزبدا.

بڕیارمدا، وەک شاهیدێک لە دادگا ڕانەوەستم، ئەوەش هاوڕێکانمی تووڕەو بێزارکرد ومنیش ئەوەم لەبەرچاوگرتبوو و دەمزانی دڵیان دەشکێت. کاری گرنگتر ئەوەبوو گەنجەکانی بزاڤی هۆشیاری وریابکەمەوە بە ناسنامەی ئەفریقی و پێیان ڕابگەیێنم کەوا خەباتەکە یەکەو جیاو کەرت نابێ و هەموومان ڕووبەڕووی یەک دوژمن بووینەتەوە.

بەڕێوەبەرایەتی سەرقاڵ و نیگەران بوو، مێردمناڵەکان هەراسانیان کردبوون، ناچار وازیان لێ هێناین، بووە دوو ساڵ نیوە مانمان لە کارکردن گرتووە و داواکارین کاری دەستی بە تەواوەتی لە زینداندا نەمێنێ، داوامان دەکرد لەو کاتانەدا بخوێنین، یان ئیشی دەستی جۆراوجۆرمان فێر بکەن. بەڕاستی کارکردنمان لەبیرنەماو هەر خەریکی دەمەتەقێ و بەزم و ڕەزم بووین. لە سەرەتای ١٩٧٧دا بڕیاریان دا بە یەکجاری کاری دەستی نەمێنێ. بۆیە بە درێژایی ڕۆژەکان لە بەشەکەمان دەماینەوە، بەڕێوەبەرایەتی تا بە بەزییوی خۆی نیشان نەدات، کاری سووکی بۆ دۆزینەوە، وەک کۆکردنەوەی گەڵای تو.

ئەو سەرکەتنەمان لە ئاکامی ناڕەزایی بەردەوام حەق و گونجاوی داواکانمان هاتەدی. بەڕێوەبەرایەتی حەزی دەکرد بۆ هەر سێ گیراوێک پاسەوانێک تەرخان بکات، هەر پێش ڕووداوەکانی سوێتو و هاتنی ژمارەی گیراوی زۆر پاسەوانیان کەم بوو، کە ئەو گەنجانە هاتن، پێویستیان زۆر بە پاسەوان هەبوو، هەریەکێکیان پاسەوانێکی دەویست. کە لەناو بەشەکەماندا ماینەوە، ئەوەش لە کەمی ژمارەی پاسەوانەکانیان بوو. نەمانی کاری دەستی، کات و ئازادی زۆرتر کردین و بواری نووسین و خوێندنەوەو دەمەتەقێ و نووسینی یاداشتی یاسایی و دووانی هاوڕێکانم زۆرتر بوو، هەروەها بوارم بۆ ڕەخسا، هەردوو ئارەزووەکەم نمایش بکەم، وەک بەخێوکردنی باخچەیەک و یاری تێنس.

بۆ ئەوەی مرۆڤ لە ژیانی زیندانا ڕابێت، دەبێ بە کارێ، یان شتێ خۆت مەشغول بکەی. زۆریش جل شوشتن و ڕێکخستنی ژوورەکەی و خاوێن کردنەوەی ساڵۆنەکە خۆی لە بیردەباتەوەو سەرقاڵی دەکات. کە مرۆڤ لە دەرەوەیە، کارێ، یان پیشەیەکی زەوق و تاقەتی پێ دەبەخشێ، هەمان شت پیاوی گیراویشی لەناو زیندانا زەوق لە جوڵانەوەو چالاکیەکانی وەردەگرێت.

هەر کە گەیشتمە دوورگەکە داوام کرد بوارم بدەنێ زەوقی خۆم باخچەیەک دروست بکەم، بەڵام، ئەوان بەبێ هۆ لاریبیان دەگەیاند، بەڵام لە کۆتاییدا ڕازی بوون بواریان دا لە بەشی خوارووی حەوشەکەدا باخچەیەک دروست بکەین. زەوی حەوشەکە چەقێن و بەردبوو، دەبوایە پاکی بکەمەوە



تا بتوانم شتێ بڕوێنم، هەندێ لە هاوڕێیان وتیان، لە ڕاستیدا بە ڕۆژ کرێکاری کانزاییت و کاتی پشوودانیشت هەر خەریکی کۆڵینیت لە باخچەکەتدا.

بەڕێوبەرایەتی هەندێ تۆی بۆ چاندن بۆ دابینکردین، وەک تۆی تەماتە و بیبەر و پیواز، ئەوانە زۆر پێویستیان بە زەوی بە پیت و چاودێری زۆر نییە. سەرەتا بەرهەمەکەی کەم بوو، بەڵام لە دواییدا و هێدی هێدی زۆربوو، بەڕێوەبەرایەتی لە بڕیارەکەی پەشیمان نەبوو، چونکە توانیم پاسەوانەکان بە تەماتەو پیوازی چاک خەنی بکەم. لە مێژە حەز بەکاری باخچە دەکەم، بەڵام هەر لە پشت شیشبەندەکانەوە و ئەم ئارەزووەم بۆ گونجاوە. یەکەم کارم لەم بوارەدا لە کۆلیژی فۆرت هێر وەک بەشێکی بەرنامەی پراکتیک بۆ چالاکییەکانی دەستی کارم تێدا کردبوو، ئەو دەمە لە باخچەی مامۆستایەکمان ئیشم کردو زەوقی زۆرم لە ئاوێتەبوونم لەگەڵ خاکا وەرگرت و ئەمەش ئەرکی قورسی هزرمی سووک دەکرد. بەڵام کە گەیشتە جۆهانسبێرگ بە خوێندن و دوایش بە وەزیفە سەرقاڵ بووم و نە زەوی چاندن و نە کاتیش هەبوو ئەم کارو ئارەزووەم بکەم.

داوای کتێبی چاندن و جۆرەکانی و پەین و سوودەکانیم کرد، ئەوانەی دەمخوێندەوە دەستمان نەدەکەوت، بۆیە زۆر لە هەڵەو ئەزموونەکان فێر بووم.

ویستم فولی سودانی بڕوێنم، جۆرەها خاک و پەین و تۆم بەکارهێنا، سوودی نەبوو، بۆیە وازم لە بیرۆکەکە هێنا، ئەوەش نموونەیەکە کە تێدا سەرنەکەوتم.

باخچە، یەکێکە لەو شتانەی لەناو زیندانا دەکرێت چاودێری بکرێت، تۆبە دەچێندرێت و گەورە دەبێت و بەردەگرێت و هەستێکی خۆش لە دەروون دروست دەکات و لە ناخی مرۆڤیش کاریگەری توندیش دەبێت، هەستم کرد ئێستا من خاوەن باخچەیەکی بچووکم و هەستیارێکی بەشکۆم بە ئازادی باخچەکە گوزارشتێکی مەجازی بوو لە زۆر لایەنی ژیانمدا، پیاوی سەرکردە دەبێ باخچەکەی بەخێو بکات، تۆ دەچێنێ و چاودێری بڕکەکە دەکات و لە دواییشدا بەرهەمی دەخوات، سەرکردەش وەک جوتیارە و بەرپرسی ئەوەیە کە چاندویەتی و دەبێ پارێزگاری کارەکەی بکات و لە چاوی دوژمنانیش بیپارێزێت و چاوی لە چاکەکەی بێت و لە خراپەش دووری بکاتەوە.

دوو نامەم بۆ وینی نووسی، لە نامەکاندا باسی بڕکە تەماتە جوانەکەم بۆکرد، کە چۆن خزمەتی دەکەم، بڕکێکی ورد بوو، گەشەی کردو بەری سووری تۆخی دا. بەڵام، لەناکاو سیس بوو، چەندین کۆششم کردو خەریکی بووم، سوودی نەبوو و مرد. کە مرد، لە خۆڵەکە هەڵمکێشا و خاوێنم کردەوەو لە گۆشەیەکی باخچەکەمدا شاردمەوە.

زۆر بە وردی باسی ئەم دارەم بۆ کرد، جا نازانم ئەو چەند تامی لێ وەرگرت، بەڵام کە دمنووسی، هزر و سۆزی ئاوێتەم لا دروست دەبوو، نەمدەویست بە هیچ جۆرێ پەیوەندییەکانی ژیانم نەتوانم خزمەت بکەم، زۆرجار مرۆڤ ناتوانێ شتێ لە مردن رزگار بکات، یەکێک لە ئاکامەکانی نەمانی کاری دەستمان زیادکردنی کێشم بوو. گەرچی لەو ساڵانەی دواییدا کارەکەش کەم بوون، بەڵام چوون و هاتنەوەمان زۆر باش بوو بۆ کۆکی جەستەم.

بڕوام وایە وەرزش بەردەوام و بە هەموو جۆرەکانی کلیلی جەستەو عەقڵە. لە سەرەتای ژیانمدا ئەوەندەی رقم لەزۆرانبازەکان بوو، ئەوەندە رقم لە پیاوانی پۆلیس نەدەبۆوە. راهێنانە وەرزشیەکان تووڕەیی و نیگەرانی دەمڕێت، ئەوانە دوژمنی هزر پاکی و هێمنی دەروونن، هەرچەندی تەندروستی و جەستەم ساغ بوایە، هەستم دەکرد زۆرتر بۆ کار و بیرکردنەوە باشتر دەگونجێم. بۆیە راهێنانە وەرزشیەکان بوونە بەشێک لە ژیانم، لەناو زیندانا هەوا گۆڕین پێویستەو بۆ منیش کە هەستم بە دڵتەنگی و بێزاری دەکرد، بۆیە وەرزش بۆ من پێویست و گرنگ بوو.

پرۆگرامی وەرزشم، لە دووشەموان هەتا رۆژانی پێنج شەموان بوو، رۆژانی تری هەفتەش پشوودان بوو. لە دوورگەکە لەسەر ئەم پرۆگرامە رۆیشتم. بەیانیان بۆ ماوەی چل و پێنج دەقیقە لە ناو ژوورەکەمدا غارم دەداو دواییش چەند راهێنانی وەرزشی هەمەجۆرم بە ماسولکەکانی دەست و پێیەکانم دەکردو ئەو راهێنانەم چەندین جار دووبارە دەکردەوە.

لە نامەکانم کە بۆ منالەکانم دەنووسین، وەرزش بکەن، خۆیان فێری وەرزشێکی تایبەت بکەن، وەک یاری باسکە، یان تۆپی پێ، تەنس، زۆر بیر لە رووداوەکانی ژیان نەکەنەوە، گەرچی نەمتوانی کار لە منالەکانم بکەم، بەڵام توانیم چەند هاوڕێی سست و تەمبەڵم هوشیار بکەمەوە. راهێنانی وەرزش لەناو نەوەی ئێمە لە ئەفریقیادا باو و ناسراو نەبوو، بەڵام وای لێ هات زۆر کەس هەتا لە گۆڕەپانی زیندانەکەدا وەرزشیان دەکرد. لە بیرمە هەندێ لە هاوڕێییەکانمان، ئەوانەی لە ئێمە گەنج تر بوون، هەر لەبەر ئەوەی خۆیان وانیشان بدەن دەتوانن وەرزش باشتر بکەن هاتنە گۆڕەپانی وەرزش و راهێنان.

لە دیدارەکانم، لەگەڵ کۆمەڵەی خاچی سوورو رێکخراوەکانی تر و هەتا لەلای بەرپرسەکانیشمان جەختم لەسەر ئەوە دەکردەوە کەوا بواری وەرزشمان بۆ خۆش و گونجاو بکەن. بەڵام هەتا ناوەندی هەفتاکان هیچیان بۆ نەکردین، ئەوەش پاش کۆششی کۆمەڵەی خاچی سوور هاتە کایەوە.



رۆژێکیان، کە لە کارکردن دەستمان هەڵگرت، پاسەوانێک پێشنیاری کرد گۆڕەپانی تەنس دروست بکەین و وتی، ئەم گۆڕەپانە شیاو و چاکە. زیندانیەکانی بەشی گشتی حەوشە چیمەنتۆیەکەیان بە رەنگی کەسک رەنگ رێژکردو بە پێی بناغەکانی ئەم یارییە هێڵکاری کرا. بە چەند رۆژێک لە بەر دەرگای ژوورەکەمان یاریگەیەکی تەنسی تایبەتی دامەزراو یاریگەکە بە یاریگەی ویملدونی ناودار دەچوو.

لە فورت هیر یاری تەنسم کردبوو، بەڵام چاکم نەدەزانی، پەلارەکانی پێشەوەم چاک بوون، بەڵام پەلارەکانی دواوەم بێ هێزو لاوازبوون، هەر بۆ راهێنانی جەستەم یاریم دەکرد، ئەو یارییە باشترین بوار بوو لەجیاتی چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەمان. من یەکێک بووم لەو کەسە دەگمەنانەی بە بەردەوامی خولیای تەنس بووم. لە دووری تۆڕەکە یاریم دەکردو کەم دەهاتمە پێش، تەنیا گوزرێکم وەشاندبایەو بمزانیایە بردنەوەم مسۆگەرە.

کە ئیشی دەستیان نەهێشت، بواری دەرس وخوێندنەوەم زۆر بۆ رەخساو دەستیشم نەدەگەیشتە کتێبەکانی جارانم، لەکاتی دادگای ریڤۆنیا خەریکی ئامادەکردنی لیسانسی یاسابووم لە زانکۆی لەندەن، وا ئەم هەلەشم لەدەست چوو و چوار ساڵ لە خوێندن دابڕام و ئەوەش وای کرد بە پلەیەکی بەرز بتوانم بۆ بڕوانامەکە خۆم ئامادە بکەم.

دابڕانم لە خوێندن سوودی زۆری لێ کەوتەوە، ئەوەش دیارنەبوو، چونکە لەو ماوەیەدا کتێبی وام خوێندنەوە، ئەگەر وانەبایە بواری خوێندنەوەم نەدەبوو، لەجیاتی کتێبە وشکەکانی یاسا چەندین رۆمان و چیرۆکم خوێندەوە.

کتێبخانەکەی دوورگەکە چەندین کتێبی سنووورداری تێدابوو، چەندین رۆمانی پۆلیسی تێدابوو، بەرهەمەکانی دافنی دو موربیر و هی تری تێدابوو. کتێبی سیاسی و شیوعی و سۆشیالیزمی تێدانەبوو، چاودێرەکە هەر کتێبی وشەی «سوور»ی بۆ نموونە تێدا بوایە، قەدەغەی دەکرد، کتێبی شەڕی جیهانەکانی ئاتشی دجی ویلزی تێدا قەدەغەبوو، کتێبەکە کتێبی خەیاڵی زانستی بوو، چونکە وشەی «شەڕ»ی لە ناونیشانەکەی هەبوو.

کتێبی زۆرم لەسەر خوارووی ئەفریقیا، یان ئەو کتێبانەی نووسەرەکانیان هاووڵاتی خوارووی ئەفریقیا بوون، خوێندنەوە، هەموو رۆمانەکانی قەدەغە نەکراوی نووسەر نادین گوردیمرم خوێندەوە. لەو کتێبانە لە هەست و تێڕامانی سپیە لیبرالییەکان شارەزا بووم، رۆمانە ئەمریکیەکانم خوێندەوە، وەک رۆمانی «هێشووەکانی تووڕەیی»ی نووسەر جۆن شتاینبک، لەم رۆمانەدا، دیارە

که ڕەوشی کرێکارە بێگانەکان بە ڕەوشی وەرزێرەکانی خوارووی ئەفریقیا دەچێت.

جار لە دوای جار ڕۆمانە مەزنەکەی تۆلستۆی شەڕو ئاشتیم خوێندنەوە «گەرچی وشەی شەڕیشی تێدابوو، بەڵام قەدەغە نەکرابوو» زۆر بە کەسایەتی ژەنڕاڵ کوتوزوف سەرسام بووم، ئەو ژەنڕاڵەی هەموو داروستەی کۆشکی رووسی بە چاوی سووکەوە تەماشایان دەکرد. سەرەڕای ئەو بەکەم زانینەی کۆشکەوە توانی بەسەر ناپلیۆندا زاڵ بێ و توانی بە پشتیوانی پیاوەکان و زانیارییەکانی بڕیار بدات، لەوەوە فێر بووم، هەرکەسێ سەرکردایەتی میللەتێ بکات، دەبێ چاک بیانناسێت.

دوایی زانیم وینیی خێزانم و هاوڕێیی دێرین و دکتۆری تایبەتیم دکتۆر ئەنتاتو موتلانا دەوری دیاریان هەبوو لە سازکردنی کۆمەڵەی باوکانی خوێندکارانی ڕەش لە کاتی سەرهەڵدانی خوێندکارانی سویتو، ڕێکخراوەکەش ئەندامەکانی کەسانی کارمەندو پێشەوای کەنیسە ناوخۆکان بوو، کۆمەڵەکە قسەکەرو ڕێنیشاندەریان بوو، دیارە کەوا حکومەتیش، وەک چۆن لە خوێندکارەکان دڵپڕبوو، لە کۆمەڵەکەش دڵپڕبوو، پاش کەمتر لە دوو مانگ بە پێی یاسای ئاسایشی ناوخۆ وینی پێنج مانگ گیراو خرایە گیراوخانەی قەڵای جۆهانسبێرگ، لەو ماوەیەدا نامەم بۆ وینی و هەردوو کیژەکەم کە لە سوازیلاند دەیانخوێند نووسی و تێدا هاوکاریم بۆیان نواند، بە گیرانی وینی خەمگین بووم، کە ئازادکرا زانیم ئازاریان نەداوە، بەڵام ئەو لەسەر خەبات و تێکۆشین هەر گەرم بوو.

وینی سەرەڕای قەدەغەی سەری، خەباتی سیاسی گەشەپێکرد، بە تایبەتی لەناو گەنجانی سویتو، حکومەتیش، بۆ ڕاگرتنی بڕیاریان دا هەر لەناو وڵاتدا نەفی بکەن. لە ١٧ی مایۆی ١٩٧٧ لۆریەکی سەربە پۆلیس هاتبووە پێش ماڵەکەمان لە ئورلاندو ویست کەلوپەلەکەیان بارکردبوو. ئەمەیان نە لێپرسینەوەو نەگرتن و نە دەست بەسەراکردن بوو، بەڵکو وینی بۆ دەڤەری براندفۆرت ی دوور لە هەرێمی فری ستایت نەفی کرا. ئەوەشیان کاترادا ئاگاداری کردمەوە، ئەویش بە هۆی پیاوێکی ئاییینی هندۆسی کە لە زیندان سەردانی کردبوو زانیبووی.

براندفۆرت دەکەوێتە ٢٥٠ میل خوارووی جۆهانسبێرگ و لە باکووری بلومفونتاین ی هەرێمی فری ستایتە. پۆلیس وینی و زیندزی و کەلوپەلەکانیان بە گەشتێکی دوورو پڕ ماندووبوون گەیاندە پێش خانوویەکی سێ ژووری بە تەنەکە لە گەڕەکی براندفورتی ئەفریقیاییە هەژارەکان. وینی لەوێ خۆی بە نامۆو بێکەس و ترساو بینی، لەو گەڕەکەدا خەڵکەکەی بێزارو لانەواز لەژێر چەپۆکی



سەرمایەدارە سپییەکاندا دەژیان و زمانەکەشیان سیسوتو بوو کە ئەو نەیدەزانی.

بەو ڕەوشەی وینی کە دووچاری هات، تووڕەبووم. کە لە سویتودا دەژیا، دەمزانی لە چێشتخانەیەو خەریکی خواردن ئامادەکردنە، یان لە ژوورێکدا دانیشتووەو خەریکی کتێب خوێندنەوەیە، وام دەهێنایە پێش خۆم، خانووەکەم دەناسی، شارەزای ژوورەکان بووم، بەڵام ئیمڕۆ لەم پرسەدایە، دڵتەنگ و بێزارە، گەرچی لەوێش چاویان لەسەربوو، بەڵام بوتی برادەرو خزمەکان سێبوریان دەدایەوە، بەڵام، لە براندفورد ئەوو زیندزی تەنیان و دوورخراونەتەوە.

جارێکیان بە گەڕەکی براندفۆرددا گوزەرم کرد، بێجگە لە بێزاری و لانەوازەیی خەڵکەکە هەستم بە هیچی تر نەکرد، ئەوکات نەمدەزانی ڕۆژێک دادێت خانووی ژمارە ٨٠٢ لەم گەڕەکەدا دەبێتە جێگای بایەخ و سەرنجی من. وام دەزانی وینی وەک من لە زینداندایە، وینی لە نامەکانیدا بۆی دەنووسیم، کە چۆن دانیشتوانی ئەم گەڕەکە لە چ زەڵکاوێکدا دەژین. خانووەکەیان، بێ کارەباو ئاوو زێرابە، گەڕەکەکە فرۆشگای بازرگانی تێدا نییەو دوکاندارەکانیش بەچاوی دوژمنداری تەماشای ئەفریقیەکان دەکەن و دانیشتوانی گەڕەکەکەش زۆربەیان سپین و بە زمانی ئەفریکانی دەپەیڤن.

وینی و زیندزی بە بەردەوامی لەژێر چاودێری ئاسایشدا بوون و تەنگیان پێ هەڵدەچنین. پاش چەند مانگێک زیندزی–ئەگەرچی لەژێر چاودێری سیاسیش نەبوو– لە هەڵسوکەوتی دەسەڵاتداران بێزاربوو. بە هاوکاری پارێزەری وینی لە مانگی سێپتەمبەردا بە داوایەکی بە پەلە داوام کرد چیتر هێزەکانی ئاسایش کیژەکەم هەراسان نەکەن بۆم سەلماندن کەوا پۆلیس چوونەتە سەریان و هەڕەشەیان لە زیندزی کردووە، لە ئەنجامدا دادوەرەکە بڕیاری دا زیندزی مافی خۆیەتی ئازادانە پێشوازی میوانەکانی بکات.

وینی هەر زوو لەگەڵ ڕەوشی تازە دەگونجێ، لەگەڵ دانیشتوانی گەڕەکەکە هاموشۆی پەیداکرد لەوانە چەند کەسێکی سپی هاوسۆز. بەهاوکاری ڕێکخراوی «بزاڤی قەڵاچۆکردنی برسیەتی» توانی خواردەمەنی بۆ دانیشتوانی گەڕەکەکە دابین بکات و بۆ زارۆکانیش دایانگەی دامەزراندو پیتاکیشی بۆ دروستکردنی مەڵبەندێکی تەندروستی لە گەرەکەکە کۆکردەوە، ئەو گەڕەکەی دانیشتوانی دکتۆریان نەدەناسی.

لە ساڵی ١٩٧٩ دا، گەورە کیژی من و وینی شووی کرد، مێردەکەی شازادە تامبومزی کوڕی شاسوبوزای شای سوازیلاند بوو، کە لەوێ دەیخوێند ناسیبووی. لەبەر ئەوەی من لە زیندان بووم،

بۆیە لەم بۆنەیەدا وەک باوک نەمتوانی بەکاری باوکایەتی پێویست هەڵسم. دابونەریتی ئێمە وایە، دەبێ باوکی بوکێ زاواکە هەڵسەنگێنێ و مارەیی و پارەکەی زاوا دابنێت و لە رۆژی بە زاوابووندا باوک دەبێتە وەکیلی کیژەکەو لە بەرێ کردنیشدا ئامادە دەبێت. من لە دەستنیشانکردنی کوڕەکە گلەییم نەبوو و لە هاوڕێ و راوێژکاری یاساییم جۆرج بیزوسم داواکرد لە جیاتی من دەورەکان ببینێت و دیدار لەگەڵ شازادە بکات و پرسیاری ئەوەی لێ بکات، چۆن لە دوارۆژدا کیژەکەم دەژێنێت.

جۆرج لە نووسینگەی خۆی شازادەی بینیبوو و دوایی بۆ گفتوگۆ هاتەوە دیدارم، لەبەر ئەوەی زینی تەمەنی لەژێرەوەی بیست و یەک ساڵیدابوو، بۆیە دەبوایە بەپێی یاسا من لەسەر مارەکردنەکە رەزامەندی بدەم، لە دیدارم لەگەڵ جۆرجدا، پاسەوانەکەش ئامادەبوو، بۆیە وتی: نابێ کەس لەگەڵمان بێت و دیدارەکە خێزانییەو یاسایی نییە. منیش بەگاڵتەوە بە جۆرجم وت، لەنێوان من و پاسەوانەکاندا هیچی شاراوامان نییە.

جۆرج پێی راگەیاندم، کەوا ئەڤینێکی قووڵ لەنێوان زینی و دەستگیرانەکەی هەیەو دوارۆژیش گەش دیارە، باوکیشی شاسیوزا سەرکردەیەکی تەقلیدیەو لە رۆشنفکرەکانەو ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقیشە. هەروەها جۆرج هەندێ داواکاری ماڵی زاوای پێ راگەیاندم و وتی، ئەوە بزانە کەوا کیژەکەت شوو بە کوڕی شایەک دەکات، منیش وتم، تۆش پێیان بڵێ، ئەویش شازادەیەکی تیمبوی هێناوە.

زینی کە مێردی بە کوڕێکی بنەماڵەی سوازی مەلەکی کرد، سوودی زۆری هەبوو، وەک، لەو رۆژەوە، کیژەکەم مافی دبلوماسی وەرگرت و بواری وەرگرت ئازادانەو کەی بیەوێت بێتە سەردانم. لە زستاندا لەگەڵ مێردەکەی و کیژە نۆبەرەکەیان هاتن. لەبەر ئەوەی کوڕەکە شازادەبوو، بۆیە دیدارەکەمان لە ژووری پێشوازی سازکرا، نەک لە ژوورەکانی تایبەت بە سەردانەکان کە لە نێوانماندا شووشەبەند هەیە، ئەو رۆژە، زۆر بە سۆزەوە چاوەڕوانی هاتنیانم کردن.

ئەو کاتەی هاتنە ژوورەکە، کاتێکی جوان بوو، کە هاتن، هەڵسامەوە سەر پێیان، زینی، کۆرپەکەی هاویشتە باوەشم و بەرەو رووم هات و خۆی لە باوەشم کرد. ئەو لە تەمەنی کیژەکەیدابوو کە دواجار لە باوەشم کردبوو، وا دووبارە پاش ئەوەندە ساڵە لە باوەشی دەگرمەوە. زۆری نەمابوو سەرم بسووڕێت، هەستم کرد وا زەمەن وەک لاپەڕەکانی رۆمانە خەیاڵیەکان دەپێچرێتەوەو دیسان کیژەکەم، کە ئیمرۆ بوویتە ژنێک لە باوەش دەکەمەوە.



پاشان، کوڕەکە، مێردی کیژەکەم لە ئامێزکردو ئەویش کۆرپەکەی لە باوەشم دانایەوەو هەتا ماوەی سەردانەکە تەواوبوو هەر لەباوەشم مایەوە. کۆرپە ناسکەکە لەناو دەستێکی دڕ دایە، کە چەند ساڵە بێجگە لە داس و خاکەناس هیچی تری پێ نەگیراوە. بێ سنوور دڵشادبووم، ئەم ساتانە دڵشادترین مرۆڤ بووم.

ئەوان بۆ کارێکی رەسمی هاتبوون، هاتبوون ناوێک لە کۆرپەکەیان بنێم، دابونەریتەکە وابوو، ناوی «زازیوی» واتە «هیوا»م بۆ هەڵبژاردن، ئەو ناوە بۆ من مانای هەبوو، چونکە من هیچ کاتێ بێ هیوا نەبووم و هزرم وابوو، کەوا هەرگیز هیوا لە من جیانابێتەوە، دڵنیاش بووم کەوا ئەو منداڵە گەورە دەبێت و بە چاوانی خۆی دەبینێت نەژادپەرستی لە خوارووی ئەفریقیا نەماوە، منیش هەر بەو خەونە دەژیام.

پاش ساڵی ١٩٧٦ دوو ساڵ لە جیهانی خەیاڵات و خەون و بیرەوەرییەکاندا ژیام، نازانم ئەمانە دەرەنجامی سەرهەڵدانەکەی سویتو بوو کە رەوشی زیندانی هەژاند، یان لە ئەنجامی گۆڕان و هەژانەکانی دووچاری خێزانەکەم هاتن، لە زیندانا مرۆڤ بواری هەیە دوێنێ و رابردووی نمایش بکاتەوەو ئەوەش لە یەک ساتدا دوو رووی دۆست و دوژمنی دێتە پێش. ساتە شیرین و تاڵەکانم بەبیردەهاتەوە، خەونی وا هەبوو، یەک شەوی دەخایاند، ئەم شەوە لە دەریای شادی، یان لە گۆمی بۆگەنیدا دەمامەوە.

دووچاری کابوس دەهاتم، وا لە زیندانی جۆهانسبێرگم و ئازاد دەکرێم و دەروازەم بۆ دەخرێتە سەرپشت و کەسیش لە پێشوازیمدا نییەو تەنیا. شارەکە چۆڵە، نە سەیارەیەکی تاکسی، هیچ کەسێ لەم شارەدا نابینم. بە پیادەیی بەرەو سویتو دەڕۆم، چەند سەعاتێک دەڕۆم و پێش ئەوەی بگەمە ئورلاندو ویست، رێگا پێچم پێ دەکاتەوە بەرەو ژمارە ٨١١٥ و خانووە چۆڵەکەم دێتە پێش، خانووە، یان تارمایی، دەرگاو پەنجەرەکان لەسەر پشتن و ژیانی تێدا نییە، چۆڵە.

هیچ خەونم، وەک ئەو خەونە تاڵ و رەشبین نەبوو، لە ساڵی ١٩٧٦دا بۆ وینیم نووسیبوو کەوا خەونێکی شیرینم دیوە، وتبووم: شەوی ٢٤ی فێبرایەر لە خەونمدا چوومە پێش ژمارە ٨١١٥ لەماڵەکەدا چەندین گەنجم بینی، هەموویان سەمایان دەکرد و دڵیان خۆش بوو. کە منیان بینی هەندێکیان دڵشادبوون و بە خۆشییەوە پێشوازییان کردم و هەندێکیشیان لە شەرمان هەڵاتن. هەموو خزم و برادەرە خۆشەویستەکانمان لە ژووری نووستندا کۆبوونەوە. تۆ لەسەر چوارپایەکەدا

پاڵکەوتبوویت و ماکگاتوی کوڕم روو لە دیوارا خەوی لێکەوتبوو. ماکگاتو گەنجێکی تەڕ دیاربوو.

هەر لەو خەونەدا مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩٥٦م بە بیرهاتەوە. ئەو کاتانە ماکگاتو تەمەنی شەش ساڵان بوو کە ماخولوی دایکی ژنی یەکەمم ئیفیلین بە تەنیا جێهێشت. ئەو دەمە ماکگاتو لەگەڵ دایکی لە ئورلاندودا دەژیان، بەڵام چەند رۆژ پێش هاتنەوەم گەڕایەوە لای ماخولو و شەوان لەسەر چوارپایەکەی مندا دەخەوت، لەبەر ئەوەی زۆر منی خۆش دەویست، بۆیە کە لە شوێنەکەمدا دەخەوت هەستی بە سۆزی من دەکرد.

ئەو دەمانە ساتە شیرینەکەم بەبیردەهاتەوە. دڵتەنگ و ژان لە دڵیش بووم بەوەی کە خێزانەکەم چەند لەمێژە لە دووری من ژیان دەبەنە سەر، لە نامەیەکمدا لە ساڵی ١٩٧٦ وام بۆ نووسیبوون:

ئەو رۆژانە تۆ وەک خوشک و دایک و هاوڕێ و شوانیت، تۆ ئاگادار نیت کە چۆن تۆ بە گیان بە جەستە وێنەت لە هزرمدا نەخشاوە، قسە شیرینەکانی تۆم هەر لە بیرەو لەبیریش ناچێتەوە کە تۆ هەرگیز لە هەڵسوکەوتە قۆڕەکانم زویر نەدەبوویت، وەک ژنانی تر نەفرەتت لێم نەدەکرد. لە بیرمە ئەو دەمانەی زیندزیت لە سک بوو و بە زەحمەتی نینۆکت دەکرد، ئەو رۆژانەم هەموو لە بیرەو شەرم دەکەم و هەست بە تاوان دەکەم کە من کەمتەرخەمیم دەرحەقت کردووە و دەبوایە لە نینوک کردنەکانتدا یارمەتیت بدەم. نازانم ئەوانەم کە نەکردووە ئەنقەست بووە یان نەء، بەڵام زمانحاڵم هەر دەیووت: تۆ بە ئەرکەکانت هەڵساویت وا منالێکی ترمان لە رێگایە، ئەو ناخۆشیانەی لە ئاکامی سکپڕبوونتدا دووچاری هاتوویت ئەوانە لە ئەستۆی خۆتە و پەیوەندی بە من نییە، پرسەی یەکەمم ئەوەیە کە من زۆر سەرقاڵ بووم و بواری هەتا بیرکردنەوەشم نەبووە، بەڵام لە خۆم دەپرسم: دەبێ شتەکان چۆن بە رێگاوە بڕوات ئەگەر بگەڕێمەوە ماڵەوە؟ وێنە جوانەکەت لەلای چەپمەوە لێمەوە دیارە کە ئەم نامەی دەنووسم هەموو رۆژێ تۆزی لێدەوەشێنم و لە ئامێزی دەگرم وەک ئەو رۆژانەی کە پێکەوە بووین و لە ئامێزم دەگرتی، ئەوەش هەستێکی شیرینە، وا لووتم بە لووتتەوە دەنووسێنم و هەست بە هەمان تەزووی کارەبایی جاران دەکەم کە لە خوێنمدا گوزەر دەکات، هەروەها نولیتاش لەسەر مێزەکەم لەبەرامبەرمە، بۆیە خەم ناتوانێ بێتە ئەم سنوورەو بۆی ناکرێت لەنێوانتاندا دزە بکات و چاوی جوانی هەردووکتانە بەشەو و بە رۆژ دەمپارێزێت.

وێنەی نولیتا، یەکەم وێنەیە، بێجگە لە وێنەی ئەندامەکانی خێزانەکەم کە لە زیندانا هاوشانمن، لە نامەیەک بۆ زیندزی لە ساڵی ١٩٧٦ دا ناسنامەی نولیتام بۆی ئاشکراکردو نووسیبووم:



ئایا دایکت باسی نولیتای هاوڕێی دڵسۆزی زیندانم لە زیندانی دوورگەکانی ئەندامان بۆ کردوویت؟ وێنەی ئەویش هاوشانی وێنەی تۆو زینی و ندیندی و ناندی و ماندلا «هەرسێکیان نەوەم»و ماکی ووێنەی دایکتە. دەزانم تاکە بابەتە دایکت بە کورتی باسی دەکات، چونکە دڵی لێی پیسەو بە منافسی خۆی دەزانی و بڕواش ناکات وێنەکەم لە گۆڤاری ناشیوناڵ جیوگرافیکەوە وەرگرتووە.

زۆر بیرم لەو رۆژە دەکردەوە کە لە زیندانا ئازاد دەکرێم، هەر بە خەیاڵ بیرم لەو کارو جووڵانەوەیەش دەکردەوە کە ئەو رۆژە ئەنجامی دەدەم. ئەوانە، جوانترین خەونی من بوون کە لە ساڵی ١٩٧٦ لەسەر کاغەز تۆمارم کردبوون:

هیواداربووم لە گەشتە درێژەکەی رۆژی ١٢ی یۆنیۆی ١٩٥٨ لەگەڵم بوایت، هیوام وابوو ئەمجارە تەنیا بواین. زۆر لەمێژە لە یەکتری دابڕاوین، یەکەم هەنگاو ئەنجامی دەدەم، ئەویش دەستی تۆ دەگرم و دوور دەڕۆین، لەو دەوروبەرە خنکاوە دوور دەکەوینەوە هەوای بێگەرد هەڵدەمژین وتام لە دیمەنە جوانەکانی خواروی ئەفریقیا وەردەگرین و تەماشای رووبارە بە لەنجەو لارەکان و ئاژەڵە کێوییە ئازادەکانی باخچەو مەزراکان دەکەین، لە رۆخی شەقامەکانیش خەڵکە سادەکان دەدوێنین، یەکەم وێستگە دەچێتە سەر گۆڕی دایە رادیبی و سی کیە «هەردووکیان دایک و باوکی وینین». هیوام وایە لە تەنیشت یەکتری شاردرابنەتەوەو دوعای خێریان بۆ بکەین و لەبەر ئەوەی لە نێوچەوانی ئەوانە، وا ئیمڕۆ دڵشادین بۆیە سوپاسیان بکەین، لەوێ هەموو ئەو چیرۆک و رازانەی لە دڵمایە بۆتی دەگێڕمەوەو بەڵێنت دەدەمێ هەموو بابەتە شیرینەکانت بۆ بگێڕمەوە، لەوێشەوە دەچینە مفاکانیسواو نوسکینی «دایک و باوکە» لەوێش دووبارەی دەکەینەوە، پاشان هێزو سۆز وەردەگرین و دەگەڕێینەوە بۆ ژمارە ٨١١٥ .

کە بەڕێوەبەرایەتی بواری دا وێنەی خێزانی وەرگرین، وینی ئەلبومی وێنەی سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەمی نارد، هەمووم جوان پاراست، ئەو ئەلبومە بووە جوانترین وپیرۆزترین سامانم و هەرکاتێ نیگەران و دڵتەنگ بوامە سەیرم دەکردو یادی کەسە خۆشەویستەکانم دەکردەوە.

بەڵام لە زیندانا، لەگەڵ هەموو شتێ ژانیش هەیە، هەرجارێ پاسەوانەکان ژوورەکەیان دەپشکنی ئەلبوکەیان دەبرد، دوایی وازیان هێناو ئەلبومەکە بە وێنەی خزمەکان و ئەندامانی خێزانەکەم گەورە بوو.

لە بیرم نییە کێ لە گیراوەکان یەکەم کەس بوو ئەلبومەکەی لێ خواستم، بەڵام هەموو، هەتا

گیراوەکانی بەشی گشتیش دەیانزانی ئەلبومێکی خێزانیم لەلایەو هەموویان تەماشایان دەکرد.

کەم گیراوی بەشی گشتی میوان سەردانیان دەکرا، بۆیە حەزم دەکرد بە وێنەی جیهانی دەرەوە ئاشنام دەکردن و نیشانم دەدان. تا وای لێ هات، ئەلبومەکە دڕاو چەند وێنەی نایاب کە دووبارە نابنەوە فەوتان. دیارە کەوا پیاوان حەزدەکەن ژوورەکەیان بە وێنەی سروشت و شەخسی بڕازێننەوە، بەڵام کەسیش خۆی پێ ڕاناگیرێت وێنەیەک هەڵگرێت، کە هەندێکیان گوم ببوون، هێدی هێدی کۆم کردنەوە.

گیراو هەبوو، تەنیا داوای یەک وێنەی دەکرد، ڕۆژێکیان گەنجێکی سەر بە بزاڤی هوشیاری بە ناسنامەی ڕەشەکان کە لە بەشی گشتی هاتبوو بۆ خواردن سازکردن، منی جیا کردەوەو وتی:

– مادیبا، من وێنەیەکم لە وێنەکان دەوێت؟!

منیش بەڵێنم دا وێنەکەی بۆ ڕەوانە بکەم، ئەویش بە کلۆفەوە وتی:

– کەی؟

منیش وتم لە کۆتایی هەفتەدا، ڕازی بوو و ڕۆیشت، بەڵام دوای کەمێک ڕۆیشتن، ڕاوەستاو گەڕایەوەو وتی:

– مادیبا، گوێت لێ بێت، وێنەی پیرەژنەکەم ناوێت، وێنەی یەک لە کیژەکان، زیندزی یان زینیم دەوێت، چاک بیربکەوە، وێنەی پیرەژنەکەم بۆ ڕەوانە نەکەییت.

لە ساڵی ١٩٧٨ و پاش پازدە ساڵ مشتومڕو داواکاری و ویستنی بیستنی هەواڵەکان، لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی گەیشتینە چارەسەریەکی مام ناوەندی لەجیاتی وەرگرتنی ڕۆژنامەکان، یان بیستنی ئیستگەکانی دەرەوە، بڕیاریان دا ئیستگەیەکی ناوخۆمان بۆ دامەزرێنن و کورتەی هەواڵەکانمان بە ڕژێمێکی ناوخۆی پەیوەندی لەناو زیندانا بۆ پەخش بکەن.

بەرنامەکان لە ڕاستی دووربوون، چاودێرەکان، هەواڵەکانیان هەڵبژاردو هەمووشیان لە ڕوانگەی بەرژەوەندیەکانی حکومەتدا بوون و بە توندییش دژایەتی ئۆپۆزسیۆنیان دەکرد.

یەکەم ڕاپۆرتیان لەسەر مردنی سەرکردەی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەی ئەفریقی ڕۆبرت سوبوکوی بوو، پاشان هەواڵی سەرکەوتنی هێزەکانی ئەیان سمێس لە ڕۆدیسیاو گرتنی کەسانی ئۆپۆزسیۆن لە خوارووی ئەفریقیایان بلاوکردەوە.

گەرچی هەواڵەکان ئاراستەکرابوون، بەڵام هەرخۆشیان دەبەخشی و دەمانتوانی لەنێوان



هەواڵەکان و دێرەکاندا شتێ بەرهەم بهێنن و مەزەندەی شتێ بکەین و بۆشاییەکان پڕبکەینەوە.

هەر ئەو ساڵە بوو، زانیمان بیدەلیو بۆتا لەجیاتی جۆن فۆرستر کرایە سەرۆک وەزیران، ئیستگەکە نەیوت فۆرستر دەستی لەکارکێشایەوە لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەگەری دەستێوەردانی ئەویان لە پارەی وەزارەتی ڕاگەیاندن ئاشکرا کردو بلاویان کردەوە، من زۆرم لەسەر بۆتا نەدەزانی، هەر ئەوەندەم دەزانی جاران وەزیری بەرگری بوو و زۆر لایەنگیری هێزو سەربازی بوو دژ بە ئەنگۆلا لە ساڵی ١٩٧٥ دا. ئەو کاتەنە هیچمان سەبارەت بە چاکسازی و خێرخوازی ئەو نەبیستبوو.

لە کتێبخانەی زیندانا کتێبێکم لەسەر ژیانی فۆرستر خوێندەوە، لەوێ دەردەکەوێت کەوا پیاوێکە ئامادەیە لەپێناوی هەڵوێستەکانی قوربانی بدات. لەسەر لایەنگیری کردنی ئەڵمانیادا لە شەڕی دووەمی جیهانیدا گیرابوو، بۆ ماڵئاواییەکەی دڵگران نەبوون، چونکە زۆری بۆ دژایەتی ئازادی کرد، ئاسۆکانی چەوساندنەوەو زوڵم و کۆیلایەتی بەرین کردبوو.

سەرەڕای پەخشی هەواڵی ئیستگەکەمان، زۆر هەواڵی وامان دەگەیشتێ بەڕێوبەرایەتی پێیان خۆش نەبوو و حەزیشیان نەدەکرد ئاگاداربیان بین.

سەرکەرتنی شۆڕشەکانی ڕزگاری مۆزامبیق و ئەنگۆلای ساڵانی ١٩٧٥م بیست، ڕزگاربوونی ئەم دوو دەوڵەتەو پەیدابوونی حکومەتی شۆڕشگێڕی لەم وڵاتانەدا، شەپۆڵەکەی گەیشتە ئێمە.

لە چوارچێوەی گۆڕانەکاندا سینەما هاتە دوورگەکە، هەفتانە فلیمێکمان دەبینی، پێش پەیداکردنی شاشەیەک، فلیمەکەیان لەسەر پارچە قوماشێک لە ژوورێکی گەورەدا نیشان دەداین، فلیمەکان زەوقیان پێ دەبەخشین و خەمی زیندانی لەبیر دەبردینەوە. فلیمی بێدەنگ و فلیمی هۆڵیۆدی ڕەش و سپی و فلیمی ئەمریکی کاوبۆی لەخۆم بە تەمەنترم بینی، لەوانە فلیمی مارکەی زۆربوو، پاڵەوانەکەی دۆگلاس فیربانکس بوو، ئەم فلیمە لە ساڵی ١٩٢٠ بەرهەم هێنرابوو، بەڕێوبەرایەتی خۆی لە هێنانی فلیمی مێژووی خاوەن پەیامی ئەخلاقی دەدزییەوە، دوایی فلیمی ڕەنگاورەنگی نوێمان بینی، لەوانە دە ئامۆژگارییەکە، کە هونەرمەند چارلتێن هیستون دەوری موسێ تێدا بینیبوو، هەروەها فلیمی من و شا، کە یۆل برینار دەوری تێدا بینیبوو، فلیمی کیلوپاترای هونەرمەند ریتچارد بیرتۆن و ئەلیزابێت تایلور دەوریان تێدا بینیبوو.

بە هێنانی فیلمی من و شا سەرسام بووین، چونکە فلیمەکە ناکۆکی و بەربەرەکانێی ڕەوشتی خۆرهەلات و خۆرئاوا نیشان دەدا، لە فلیمەکەدا وا دەردەکەوێت کەوا دەرسی زۆر لە خۆرهەلات هەیە پێویستە خۆرئاوا فێرییان ببێت، فلیمی کیلوپاترا مشتومڕی زۆری دروستکرد، زۆریان وت،

چۆن ئەکتەرێکی قژ ڕەش و چاو بەنەوشەیی ئەمریکی دەوری شای میسر ببینێت -ئەگەرچی زێدە جوان بوو- وتیان، فلیمەکە دەیەوێت ئاکاری ئەفریقی کیلۆپاترا بشارێتەوەو ئەوەش پرۆپاگەندەیە بۆ خۆرئاوا. منیش هاوشانیان بووم، کە سەردانی میسرم کردبوو، بینیبووم پەیکەرەکەی کیلۆپاترا ڕەنگی پێستی ڕەش بوو.

پاشان چەندین فلیمی خۆماڵییان نیشان داین، فلیمەکان ئەکتەری ڕەشی خوارووی ئەفریقیا دەورییان تێدا بینیبوو، ئێمەش لە سەردەمی زوودا دەمانناسیین، بە دەرکەوتنی ئەو ئەکتەرانە لە فلیمەکاندا، دەبووە هەراو چەپڵەو هاوار. دوایی فلیمی بەڵگەنامەییان نیشان داین، کە من زۆر حەزم لێیان بوو، گەرچی فلیمی سۆفیا لۆرینم دەرباز نەدەکرد، بەڵام زۆرتر شەیدای بەڵگەنامەکان بووم، زۆربەی فیلمە بەڵگەنامەکان لەلایەن ئەحمەد کتراداوە هەڵدەبژێردران چونکە ئەو بەرپرسی کتێبخانەی بەشەکە بوو.

دیمەنی شەڕە دەریاییەکانی شەڕی دووەمی جیهان سەرنجی ڕاکێشام، لەم شەڕانەدا کە لە فلیمێک نیشانمان دران، یابانییەکان کەشتی جەنگی برینس ئۆف ویلزمان تەفروتونا کرد. کە بینیم وینستۆن چەرچەل بۆ کەشتیەکە دەگریا هەستی جولاندم و بۆ ماوەیەکی زۆر لە خەیاڵمدا مایەوە. ئەوەش دەبێ وا بێ، سەرکردە دەبێ خۆی دڵتەنگ نیشان بدات و هیچ لە گەورەیی کەم ناکاتەوە.

بەرنامەیەکی ئەمریکیم بە ناوی فریشتەکانی دۆزەخ بینی، بەرنامەکە لەسەر دەستەیەکی ئەمریکی شەیدای ماتۆڕسواری بوو، خۆیان دوورەپەرێز لە کۆمەڵ ڕاگرتبووو شەیدای توندوتیژی بوون، لەوێدا پۆلیس وەک دەزگایەکی بەرەوشت و نیازپاک بەرکەوتبوو، کە فیلمەکە تەواو بوو، دەمەتەقێ لەسەر مەبەستەکەی کرا، هاوڕێکانم هەر هەموویان گازاندەیان لەم دەستەیە هەبوو کە ڕێز لە یاسا ناگرن.

لەناکاو سترینی مودلی، کە یەکێک بوو لە گەنجانی بزاڤی هوشیاری بۆ ناسینی ڕەشە زیرەکەکان، هاتە زمان و ئامادەبووانی بەوە تاوانبارکرد کەوا هەموویان هاوشانی ڕێڕەوی ڕۆژگارنین چونکە «فریشتەکانی دۆزەخ» خوێندکارانی سوێتوی ساڵی ١٩٧٦ن کە لە ساڵی ١٩٧٦ لە دەسەڵاتداران یاخیبوون، ئێمەش بە توندی وەڵامان دایەوە، کەوا ئێمە پێرە ڕووناکبیرانی چینی ناوەندنین و هاوشانی دەسەڵاتدارانی ڕاستڕەوین، خۆمان بە هاوشانی دەستەی «فریشتەکانی دۆزەخ» نازانین.

بۆچوونەکانی سترینی نارەزایی توندی لە ناو گیراوەکان دروستکردو وتیان ئەمە ستەمە ئێمە



بەرگری لەو دەستەیە بکەین، کە هەڵسوکەوتیان دژ بە کۆمەڵەو توندتیژن و ڕەوشتیان نییە. زۆرم بیر لە بۆچوونەکانی کردەوە، گەرچی هاوشانی نەبوم، بەڵام بەرگریم لێ کرد، هەرچۆنی لێکدەدرێتەوە هەڵوێستەکانیان دژ بە حکومەت و دەسەڵاتدارەکان بوو.

دەستەی «فریشتەکانی دۆزەخ»و هەڵسوکەوتەکانیان و بۆچوونەکانی سترینی هیچیان بۆ من نەدەگەیاند، بەڵام هەستم دەکرد، هزرو رامانەکانمان سڕببوون و ڕوحی شۆڕشگێڕییان تێدا نەمابوو. ئەوە پازدە ساڵە لە زیندان داین، من وا نزیکەی هەژدە ساڵە گیراوم، دونیا گۆڕاوە وەک سەردەمی پێش گیرانمان نییە، وامان لێ هاتووە دووچاری مەترسی بوینە لە جیهانی زەمەندا، زیندان خاڵێکی کپە لە جیهانێکی بزۆزو گۆڕان، زەحمەتە هیچ کەسێ بتوانێ لە زیندانا نەجولێت و جیهان دەگۆڕێت و پێش دەکەوێت.

کۆششم کرد هزرم بۆ شتی نوێ بکەمەوەو شتەکان قەبووڵ بکات و بابەتی نوێی گۆڕان وەرگرێت. توانیمان هێڵی دانوستان لە نێوانماندا بپارێزین و بەردەوام بین، هزری تازەم بۆ شرۆڤەکردن و وردکردنەوەو لێکۆڵینەوە پێشنیارکرد، لەگەڵ ڕووداوەکانا مامەڵەمان دەکردو ئاوێتەیان بووین نەتەزین.

گەرچی لە دوورگەکەدا گۆڕان وکراوەیی هەست پێ دەکرا، بەڵام هێشتا حکومەت نەیدەویست سیاسەتەکەی بگۆڕێت، سەرەڕای ئەوەش دڵنیابووم ڕۆژێ دادێت ئازاد دەبم، ئێمە لە یەک پێگەدا دەژیایین و وەستابووین، بەڵام جیهان بۆ بەرژەوەندی و چاکەی ئێمە دەگۆڕا، نەک بۆ قازانج و رووی کەسانی تر. دەمزانی بەو بەرنامەیەوە ڕۆژێ دێت لە زیندانا دەردەچم و بە ئاکارێکی سیاسی تازەوە رووبەڕووی خەڵکەوە دەبم و سیاسەتە وشکەکەی جارانیش لەگەڵ زەمانا ڕۆیشت.

پاش تێپەڕبوونی پازدە ساڵ بەرێوبەرایەتی زیندان لە ساڵی ١٩٧٦دا بە هۆی ئێستگە ناوخۆییەکەوە ڕایگەیاند کەوا خواردنی ئەفریقیەکان و ڕەنگینەکان و هیندییەکان یەک جۆر دەبێت، لەجیاتی ئەوەی بەشە خواردنی ئەفریقییەکان زیاد بکەن، بەشە خواردنی ڕەنگینەکان و هیندییەکانیان کەم کردەوە.

بەشە شەکرەکەش بۆ هەموومان وەک یەک وابوو، یەک کەوچک و نیو بوو، پێش ئەوە ئەفریقییەکان بەیانیان نانیان وەردەگرت و لە نێوان خۆیاندا بەشیان دەکرد، بۆیە ئەوەش کاریگەری نەبوو، چونکە ڕاگەیاندنی یەکسانییەکە درەنگ هات، بۆیە وەک نەبوون وابوو، ئاشکراش بوو

راگەیاندنەکەش لەژێر فشار و پاش دواکەوتنێکی زۆرەوە دیارکرا.

ئەوە دوو ساڵە خواردنەکەمان چاک ببوو، ئەوەش بە خۆشی بەڕێوەبەرایەتی نەبوو، پاش ڕووداوەکانی سویتو، بڕیاریان دا دورگەکە بکەنە مەڵبەندی «زیندانەکانی هێمنی» لە خوارووی ئەفریقیادا. ژمارەی بەشی گشتی زۆر کەم کرایەوە، گیراوە سیاسییەکان کاریان لە چێشتخانەکان جێبەجێ دەکرد، کە ئەوانە بەرپرسی چێشتخانەکانیان کەوتە دەست، ڕەوشی خواردن و ئاستی چاک بوو، ئەوەش لەبەر ئەوەی چیتر خواردنەکان بۆ چاوپۆشین و ڕازی کردنی پاسەوانەکان لەلایەن گیراوەکانی بەشی گشتی نەدەدزراو ویژدانی پێ نەدەکرا، ڕێژەی گۆشت و سەوزە لە خواردنەکاندا زیادی کردو ئینجا زانیمان دەبوایە چەند ساڵە خواردن لە زیندانا بەم شێوە بێت.

* * *

لە هاوینی **١٩٧٩**دا لە کاتی یاریکردنی تنس قاچی چەپم تووشی ژانێکی قورس هات وای لێکرد چیتر نەتوانم یاری بکەم، کە دکتۆرم بینی، منی نارده کیپ تاون بۆ چارەسەرکردن، بەڕێوەبەرایەتی پەرۆشی تەندروستی گیراوەکان بوو، نەوەک یەکێک لە زیندانا بمرێت و بکەوێتە بەر سەرزەنشتی ڕای گشتی.

گەرچی زۆر حەزم بە سەردانی کیپ تاون دەکرد، بەڵام بە گیراوی نا، لە گۆشەیەکی بەلەمەکەداو لەژێر چاودێری پێنج پاسەوانی چەکدارا بووم، دەریاکە شێت و هاربوو و دەیویست بەلەمەکە وەرگێڕێت، لە پشتەوەی دوو پاسەوانەکە چاکێتێکی ڕزگاربوونم بینی، ئەوەم بەبیردا هات بەلەمەکە وەرگێڕم و چاکەکە هەڵگرمەوەو گیانی پاسەوانەکان بکەمە قوربانی خۆم و ئەو تاوانە ئەنجام بدەم، بەڵام وامزانی ئەوە ئەوندە ناهێنێ.

لە بەندەرەکەدا چەند پاسەوانی چەکداری ترو خەڵکێکی زۆر لە پێشوازیمدابوون، هەستم بە شەرمەزاری کرد کە بینیم خەڵکەکە بە دیتنی گیراوێک و پاسەوانەکانی ترس دەیانگرێت، ویستم تا دیمەنەکە نەبینم سەرم شۆڕکەم و چاوم بزر بکەم، بەڵام هەستم کرد ئیشەکە جوان نییە.

دکتۆرە گەنجەکە منی بینی و پرسیاری کرد کەوا پێشتر پاژنەی پێم ئاوا ئازاری بەرکەوتووە، منیش وتم، بەڵێ جارێکی تر لە کولیژی فۆرت کە یاری تۆپی پێم دەکرد ئازارم خواردووە. منیان بۆ نەخۆشخانەی ناوخۆ گواستەوە، ئەوا یەکەم جارە وەک نەخۆش و بۆ دیتنی دکتۆرێک دەچمە



نەخۆشخانەیەک، کە گەنج بووم دکتۆری ڕەش نەبوو و دیتنی دکتۆری سپیش خەیاڵ بوو.

ئەوکاتانە دیتنی دکتۆرم بە شوورەیی دەزانی و وام دەزانی ئەوەیان ئیشی پیاوان نییەو وەرگرتنی چارەسەرکردنێک شوورەیی زۆرتری دەگەیاند، لەوێ دکتۆر بۆ کردنی نەشتەرگەرییێک ئامۆژگاری کردم و منیش ڕازی نەبووم و بۆیە وەڵامی دامەوەو وتی:

– تۆ ئازادی، بەڵام ئەم ژانەو لە تەمەنی تۆ خراپ دەکەوێتەوە.

لە ئەشیعەکەدا دەرکەوت، کەوا چەند پارچە ئێسکی ورد لە قاچمدا هەیە، ڕەنگە هی سەردەمی یارییەکەی کولێژی فۆرت هیر بێت!

دکتۆرەکە وتی، بە سڕکردنی شوێنی دەکرێت دەریانبێنم، منیش یەکسەر ڕازی بووم، نەشتەرگەرییەکە بەسەرکەوتوویی ئەنجام دراو دکتۆرەکە ئامۆژگاریشی کردم، کەوا ئاگاداری قاچم بم، پاسەوانەکەم قسەی دکتۆرەکەی بڕی و وتی، دەبێ یەکسەر بگەڕێیتەوە دوورگەکە، بەڵام دکتۆرەکە بە دڵنیاییەوە وتی:

نابێ نەخۆشخانە جێبێڵێت و دەبێ ئەمشەو لێرە بمێنێتەوە، ئەگەرچی پاسەوانەکە زۆری لەلا ناخۆش بوو، بەڵام بە ناچاری گوێڕایەڵی قسەی دکتۆرەکە بوو.

ئەمشەو یەکەم شەو بە ئاسوودەیی لە نەخۆشخانەکەدا مامەوە، سستەرەکان زیاد لە پێویست خزمەتیان کردم و خەوێکی خۆشم لێکەوت، بەیانیەکەی یەکێک لە سستەرەکان وتی، دەتوانی بیجاماکە لەگەڵ خۆتا ببەیت، منیش سوپاسم کردو وتم، هاوڕێکانم ئەوە ببینن حەسوودیم پێ دەبەن.

گەشتەکەم سوودی زۆری هەبوو، لە نەخۆشخانەکەدا هەستم کرد گرژی نێوان ڕەش و سپی تاواوەتەوە، دکتۆرو سستەرەکان مامەڵەی جوانیان لەگەڵ کردم وا دیاربوو، کەوا ڕەشەکان هەر وا مامەڵەیان لەگەڵ کراوە، ئەوەش بۆ من شتێکی تازەو نامۆبوو، شتێکی دڵخۆشکەرو گەشبینانەبوو، لە مێژە من هەر وتومە و بڕواشم هەر وابووە، کەوا فێربوون و خوێندەواری نەژادپەرستی و توندڕەوی ناهێڵێ، وا دیارە دکتۆرو سستەرەکان کە خوێندەوارن بواری جیاخوازی و ڕێگەی نەژادپەرستی نادەن.

دڵتەنگ بووم کە نەمتوانی پێش دەرچوونم بۆ نەخۆشخانە ئاگاداری وینی بکەمەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەکان نووسیبوویان کەوا من لەسەر سەرینی مردندام، بەڵام دوایی بۆم نووسی

کەوا گەڕاومەتەوە دوورگەکە.

لە ساڵی ١٩٨٠دا بوارمان درا رۆژنامە بکڕین، ئەوەش دەستکەوتێکی بە نرخ بوو، بۆمان، رێنماییە نوێیەکان بوارییان دا کەوا هەموو گیراوێکی جۆری «ئا» مافی ئەوەی هەیە رۆژنامەیەک بە زمانی ئینگلیزی و یەکێک بە زمانی ئەفریکانی بکڕێت، بە مەرجێک هیچ گیراوی جۆری تر رۆژنامەکە نەبینێ، بە پێچەوانەش مافەکەی لێ زەوت دەکرێت.

بۆ ئەم مەرجەش ناڕەزاییمان نیشان دا، بەڵام سوودی نەبوو.

هەردوو رۆژنامەی کیپ تایمز و دی بیرگری پارێزگارمان وەردەگرت، ئەفسەرانی ئاسایش بە وردی بابەتەکانیان تەماشا دەکردو ئەو بابەتانەی بە دڵیان نەبوایە دەیانقرتاند، رۆژنامەکانمان بە کونکراوی وەردەگرت، پاشان رۆژنامەی ترمان وەرگرت، وەک ستارو راند دیللی میل و ساندای تایمز، ئەوەی دواییان زۆرتر چاودێری دەکرا.

رۆژنامەی جۆهانسبێرگ ساندای پۆست لە مارسی ١٩٨٠دا راپۆرتێکی بەناونیشانی «ماندێلا ئازاد بکەن» بڵاوکردەوە، لە رۆژنامەکەدا بیرخەرەوەیەکی پێوەندبوو، تێدا داوای تەوقیعی خوێنەرانی دەکرد بۆ ئازادکرنی من و هاوڕێیانی تری زیندانە سیاسیەکان، لەوکاتانەی وێنەو ناوی من قەدەغە بوو، رۆژنامەکە فتیلی ئاگری هەڵمەتێکی گشتی کردەوە بۆ گفتوگۆ و مەسەلەی ئازادکردنم.

سەرچاوەی بیرۆکەکە ئولیفەر تامبو و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بوو لە لوساکا. هەڵمەتەکە بەردی گۆشەی ستراتیژییەکی نوێ بوو بۆ دانانی گێشەکەمان لەسەرووی لیستی بایەخەکانی رای گشتی. حیزبەکە بڕیاری دا هەڵمەتێکی بەربڵاو و بۆ ئازادکردنی کەسی من بەرپابکات. بێگومان ئەو ملیونەها کەسانەی بۆ هەڵمەتەکە تەوقیعیان کردبوو، هیچیان سەبارەت بە نیلسون ماندێلا نەدەزانی (وتیان، گەنجی وا هەبوو لە لەندەن لەبەر ئەوەی نووسرابوو -فری ماندێلا، وایان زانی بوو من ناوم فری یە، واتە بە ئینگلیزی، ماندێلا ئازاد بکەن، هەندێ لە گیراوەکان گلەییان لە دەستنیشان کردنی من بۆ ئازادبوون کردبوو، گوایە ئەمەیان خیانەتە دەرحەق بە رێکخستن و خەبات ئەنجام دەدرێت، بەڵام زۆربەیان، ئەوەیان بە وەسیلەی کۆکردنەوەی میللی زانیبوو.

ساڵی رابردوو خەڵاتی جەواهیر لال نەهرۆ مافەکانی مرۆڤم لە هیند بەرکەوت، ئەوەش بوارێکی



تر بوو بۆ وەرگرتنی ژیانەوەی خەباتم، دیارە من و وینیان بوارمان نەدرا سەفەری هیند بکەین بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە ئەمەش ئولیفەر لەجیاتی من ئەرکەکەی کەوتە ئەستۆ، هزری ئەوەم لا گەڵاڵەبوو حیزب لەسەر بناغەیەکی نوێیەوە بژێنمەوە، هاوکات بزاڤی ئامخوتنو وی سیزوی «ئەمکا» نەبەردییە فیداکارییەکانی گەشەی سەند، لە مانگی یۆنیۆدا، پیاوانی ئەمکا ئێستگەی پاڵاوتنی گەورەی ساسولبێرگی خوارووی جۆهانسبێرکیان تەقاندەوە، وایلێهات هەفتانە شوێنێکی ستراتیژتیان دەتەقاندەوە، تەقینەوەکان لە ئێستگەکانی وزەی ترانسفال و بنکەکانی پۆلیس لە جیرمستون و دایفیتون و نیوبرایتون، روویان دەدا. هەروەها بنکەی سەربازی دەڤەری بریتۆریایشی گرتەوە، شوێنەکان، هەموویان بنکەی ستراتیژی بوون و سەرنجی رای گشتی رادەکێشاو حکومەتی سەخڵەت کردبوو، وەزیری بەرگری ژەنراڵ ماگناس مالان بە هاوکاری سەرۆک وەزیران بیدەبلیو سیاسەتێکی تازەی بەناو «هێرشی هەمەلایەن» راگەیاند، ئەویش کردنی وڵات بە سەربازگەیەکی گەورە دژ بە بزاڤی خەباتی رزگاریخوازی.

هەروەها هەڵمەتی «ماندێلا ئازاد بکەن» بەردەوام بوو، لە ساڵی ١٩٨١دا لەگەڵ شازادە ئان کیژی شای بریتانیا و جاک جۆنز سکرتێری گشتی یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی بەریتانیا. بە پلەی دووەم و بە ٧١٩٩ دەنگ کەمتر لە شازادە کرامە سەرۆکی شانازی زانکۆی لەندەن. بۆ وینیم نووسی، هیوادارم بوو پلەکەم بەر بکەوێت تا کوخە بچووکەکەت بکەمە کۆشکێکی گەورەی وەک کۆشکی «ویندسور»ی شاهانەی بەریتانی.

هەڵمەتەکە هیوای لە دەروونمدا زۆرترکرد، لە سەرەتای حەفتاکاندا، کە حیزب دووچاری نەمان و گومبوون بوو لە گۆڕەپانەکەدا، خۆمان رادەگرت و کۆڵمان نەدەدا.

هەڵەبووین ئەگەر وامان دانابایە کە لە هەفتەکاندا خوارووی ئەفریقیا دەبێتە وڵاتێکی دیموکراسی بێ نەژادپەرستی. بەڵام هیواکە وا لە سەرەتای هەشتاکاندا سەرهەڵدەدات، رۆژی وا هەبوو، بەیانیان رووبەڕووی نەورەس و چۆلەکەو دار و گەڵاو سەوزایی دەبوومەوەو بە روومدا پێ دەکەنین، ئەوەش جیهانێکی بچووکی بۆ دەرەخساندم، ئەگەرچی لە سووچێکی دووری ئەم گەردوونەدا دابڕابووم، بەڵام دڵنیابووم رۆژێ دادێت خۆم و میللەتەکەم سەربەست و ئازاد دەژیین.

* * *

وەک چۆن باوکم لە منالییەوە بۆ راوێژکاری مەلیک تیمبو پەروەردەکرابوو، منیش هەر بۆ ئەم

مەبەستە گەورەبووم، گەرچی من ڕێگای ترم بۆ ژیان هەڵبژارد، بەڵام وا بە شێوەیەکی تر بۆ ئەم مەبەستە کاردەکەم.. لە زیندانەوە پەیوەندیم بە مەلیکەوە هەرمابوو و گوێشم لە ئامۆژگارییەکانی رادەگرت، کە گەورە دەبووم هزرەکانم بەرەو ترانسکای وبەرزاییە سەوزەکان دەچوو. گەرچی من رازی نەبووم لەژێر سێبەری حکومەتدا لەوێ بژیم، وا ئیمڕۆ حەزدەکەم ئازادانە لەوێ بژیم. ژان گرتمی و تەزیم کە زانیم لە ساڵی ١٩٨٠دا، کیە دی ماتانزیمای خزمم، سەرۆک وەزیرانی ترانسکای، مەلیک دالینوبیوی سەکردەی مەزنی تیمبوی رووخاندووە.

دەستەیەک پیاوچاکانی تیمبو داوایان کردبوو بێنە سەردانم، حکومەت بواری پێ دان و هاتن، حکومەت لە رازیکردنی هۆزەکان دوودڵ نەبوو، کە بواریشی دان بێنە لام، بۆ ئەوەی بوو من زۆرتر بەرەو بایەخی کاروباری هۆزم راکێشێ و لە خەباتی رزگاریخوازی دوورم بخاتەوە.

حکومەت کاری بۆ ئەوە دەکرد تا جەماوەری حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کەم و لاوازتر بکات، ئەوەش بە بایەخدان بە سەرکردە تەقلیدیە عەشایرەکان. گەرچی زۆر لە هاوڕێکانم خۆیان لەوانە دوور دەخستەوەو دوورەپەرێز دەبوون، بەڵام من بە پێچەوانەی ئەوانەوە، پەیوەندیم توندترو هاموشۆم زۆرتر دەکرد. من هیچ ناکۆکیم لەنێوان رەوشتەکانی عەشیرەت و ئەندامیەتی حیزب نەدەبینی. لە دوورگەکەدا، زۆرمان دانوستان و گفتوگۆ لەسەر بەشداری حیزب لەو دامەزراوانەدا کرد کە حکومەت هاوکارییان دەکات، زۆربەیان وایان دەزانی بەشداریکردن واتە بەزین، منیش هەر دەمووت، دەبێ هەڵوێست و ئوسلوب لە یەکتری جیابکرێتەوە. من لایەنی ئوسلوبم بە گرنگتر دەزانی لە هەڵوێست، پرسیاری راستیش ئەوەبوو، ئایا بەشداری حیزب لەو دامەزراوانە بەهێز دەبێت یان لاوازی دەکات. منیش هەر دەمووت، بەشداریمان حیزب بەهێز دەکات.

لە ژوورێکی تایبەتی گەورەی بەشی تایبەتدا دیدارم لەگەڵ پیاوچاکانی عەشیرەتدا بوو، باسی کێشەکانیان کردو دڵیان لەگەڵ ساباتا بوو و لە ماتانزیما دەترسان، منیش ئامۆژگاریم کردن پشتیوانی چاکی ساباتا بکەن و دژی ماتانزیما بن کە بە نارەواو نامەردانە دەسەڵاتیان لە مەلیک زەوت کردووە، هاوسۆزییان بووم و هاوبیری ماتانزیماش نەبووم. وتم بە ساباتا رابگەیێنن هاوشانیانم و بە ماتانزیماش بڵێن لە کردەوەکان رازی نیم.

هەروەها ماتانزیماش دەیویست بێنە دیدارم و باسی کێشەی خۆیان لەگەڵ ساباتا بکەن، چەند ساڵ بوو داوایان کردبوو من ببینن، بەڵام سەردانەکەی ئاکامی سیاسی لێ دەکەوتەوە، داواکەم نیشانی دەزگای بەرزی حیزب لە بەشەکەدا، هەندێکیان وتیان، ئەوانە خزمی خۆت و مافیان هەیە



بێنە سەردانت، بەڵام ریمۆندو گوفان و ئەحمەد کاترادا وتیان: گەرچی سەردانەکە تایبەتییە، لە ناوەوە و دەرەوەدا دەبێتە پشتیوانی پیاوەکەو بە هەڵوێستێکی سیاسی دەناسرێت و مەبەستی سەردانەکەی ماتانزیماش قەبووڵ نییە.

لە مەبەستی هاوڕێیان گەیشتم و زۆربەی خاڵەکانیشیان راست بوون، بەڵام دیدارەکەی مانزیمام قەبووڵ کرد. من بایەخ بە دیداری رووبەڕوو دەدەم، بڕواشم زۆر بە خۆمەوە هەبوو کەوا بتوانم لە دانیشتنی وادا بەرامبەرەکەم رازی بکەم و هەڵویستی بگۆڕم و لەو سیاسەتە دابەزێت و هیواشم زۆر بوو.

هاوڕێیانی بەشەکە رازی بوون ڕێگای سەردانەکەم نەگرن، هەر بۆ ڕێزگرتنی زانینە دیموکراسیەکان پرسم بە هاوڕێیانی بەشی گشتی کردو هەموویان بە توندی دژبوون، گەورە کەسایەتی حیزب لە بەشی گشتیدا ستیف تشویت پێشوازەکەی ماتانیمای ماتانزیما کە باوکی دامەزراندوە ئەوەش هێمای پشتیوانی ئێوەیە بە پشتیوانی زانی و بە توندی دژی بوو و وتی، ئەمەیان نابێ ئەنجام بدرێت، برادەریش هەبوو، وتی ماتانزیما، کولۆمبس مادیکیزیلای لە حکومەتەکەی کردۆتە وەزیری کشتوکاڵ، بۆ رازی کردنی تۆیە. بۆیە لەبەر نارەزایی زۆر و نەبوونی هاوسۆزم بۆ ئەو دیدارە بە بەرێوەبەراتیم وت، نامەوێ ماتانزیما ببینم.

لە مارسی ١٩٨٢دا، بەرێوەبەراتی زیندان پێیراگەیاندم، کەوا ژنەکەم ئۆتۆمۆمبێل لێیداوەو براوەتە نەخۆشخانە و هیچ لەسەر تەندروستی و هۆی کارەساتەکە نازانین، منیش بەرێوەبەرایەتیم بەوە تاوانبار کرد، کەوا زانیاریم لێ دەشارنەوەو وەک چەکێک دژم بە کاری دەهێنن و خێرا داوای دیتنی پارێزەکەم کرد. لەبەر ئەوەی هیچم لەسەر تەندروستی وینی نەدەزانی بۆیە نیگەران بووم، تا رۆژی ٣١ی مارس، پارێزەو هاوڕێم دوللە عمر هاتە سەردانم و دڵنیایی کردمەوە کەوا تەندروستی باشە.

سەردانەکە کورت و خێرا بوو، بۆیە هەر نیگەران مامەوە و هەستم بە بێ دەسەڵاتی کرد کە ناتوانم لە تەنیشت ژنەکەمەوە راوەستم و خزمەتی بکەم. کە گەڕامەوە ژوورەکەم، پاش گاڤێکی کورت، لەسەردانێکی نائاساییدا، بەرپرسی زیندانەکەو هەندێ بەرپرسی تر هاتنە لام، بەرپرسی زیندانەکە هەرگیز لە ژوورەکاندا سەردانی گیراوانی نەدەکرد، هەڵسامەوە سەرپێ و بەرپرسەکە هاتە ژوورێ، هەستم بە تەنگاوی کرد و وتی:

– ماندێلا دەمەوێ، بارگەت بپێچیتەوە، پرسیم و ئەویش بە سادەیی وتی:

– بڕیاری گواستنەوەی تۆمان داوە.
– بۆ کێندەرێ؟
– دەسەڵاتم وەرنەگرتووە، پێت بڵێم بۆ کێندەرێ.

شێلگێرانە داوام کرد. بۆیە وتی، لە بریتۆریاوە ئاگادارکراینەوە کەوا بەخێرایی بۆ دەرەوەی دوورگەکە بگوازرێتەوە. بەرپرسەکە لە من دوورکەوتەوەو بەرەو ولترسیسولو و ریمۆند و مهلابا و ئەندرو ملانگینی چوو و هەمان ئاگادارییەکەی پێ ڕاگەیاندن.

نیگەران بووم و هەستم بە دڵتەنگی کردو وتم، دەبێ بەرەو کێندەرێ ببەن، لە زینداندا، پیاو هەر ئەوەندەی لە دەست دێت، هەندێ لاساری بکات و سەرپێچی بۆ بڕیارەکان رابگەیێنێ، بەڵام دوا بژار هەر ئەوەیە، دەبێ رازی بی ئەوە هەژدە ساڵە وا لەم دوورگەیدام وا بە خێرایی و یەکسەر بگوازرێمەوە.

کارتۆنی گەورە گەورەیان بۆ شتەکانمان داینێ، چەند کارتۆن بۆ شتی ئەو چەند ساڵانەمان بەسە، بەنیو سەعات خۆم ئامادە کردو بوارمان نەبوو هەموو ئەو برادەرانەی کە چەندین ساڵمان لەگەڵ یەکدا رابوارد خوداحافیزیان لێ بکەم، ئەوەش یەکێکە لە لایەنە خراپ و شوورەییەکانی زیندان. هاوڕێیەتی و دڵسۆزی نێوان گیراوەکان بۆ بەرپرسان هیچ ناگەیێنێ.

لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا، خۆمان لەسەر پشتی بەلەمێک دۆزییەوەو بەرەو کیپ تاون رۆیشتن. دوانیگام ئاراستەی دوورگەکە کرد کە هێدی هێدی لێمان دووردەکەوتەوە، بەڵام، نەمدەزانی ئەوەیان دواجارە، یان جارێکی تر بۆی دێمەوە. مرۆڤ لەسەر هەموو شتێ رادێت، لە دوورگەکە راهاتبووم، نزیکەی بیست ساڵم تێدا بەسەربرد، گەرچی زێدی من جۆهانسبێرک بوو، نەک ئێرە، بەڵام لێرە هەستم بە ئیسراحەت کرد، گۆڕان بۆ من زەحمەتە، بەم جۆرە لە دوورگەکە رۆیستم واش رۆیشتم گەرچی لە ژیانی ئێرەدا، جار بە جارێ دڵتەنگ و خەمگینیش دەبووم.

لە بەندەرەکەدا، پاسەوانی چەکدار دەوریان داین و یەکسەر سواری لۆرییەکی داخراوی بێ پەنجەرەیان کردین، یەک سەعات زیادو بە تاریکی و لەسەر پێیان لۆرییەکە ئێمەی برد، چەند خالی پشکنینمان بڕی، لۆرییەکە راوەستاو دەرگاکەی پشتەوەی کرایەوەو لە شوێنێکی تاریک دابەزین و بە قالدرمەیەکی چیمەنتۆ سەرکەوتین و لە دەرگایەکی ئاسن بۆ ناوچەیەکی ئاسایش چووینە ژوورێ، لە یەکێک لە پاسەوانەکانم پرسی، ئێمە لە کێندەرێین؟

ئەویش وتی: ئێوە لە زیندانی بولسمور



## بەشی چوارەم

# دانوستان لەگەڵ دوژمن

زیندانی (بوللسمور)ی ئاسایش، لە زیندانە پلە یەکەمەکانە و دەکەوێتە سەرووی گەڕەکی (توکای)و چەند میلێک لە خوارووی خۆرهەڵاتی (کیپ تاون) دوورە. (توکای)گەڕەکێکی خۆشی تایبەت بە سپیەکانە و خانووەکانی نایاب و زەوییەکەی سەوزە، زیندانەکە دەکەوێتە ناوەندی ناوچەیەکی جوانی هەرێمی (کیپ) لە نێو شاخەکانی (کونستاشیابێرگ) شاخەکان لای باکووریەتی و چەند رەزەترێی گەورەشی دەکەوێتە خواروی. ئەم جوانیەش گیراوی پشت دیوارە چیمەنتۆ بەرزەکان هیچیان نابینن، یەکەم جارە تێ دەگەم کەوا نووسەری ناوداری بەریتانی (ئۆسکار وایلد) جوانی پێناسە کردووە کە وتوویەتی: گیراوەکان بە رەشماڵە شینەکەی سەریان دەووت، ئاسمان.

ئاکاری زیندانەکە نوێ دیارە، بەڵام دڵی کۆن و پاشکەوتووە، بەشی تایبەتی پاسەوان و فەرمانبەرەکانی پاک و نوێیە، بەڵام، بەشی گیراوەکان کۆن و پیس و بە پیسایی گیراوە، گیراوەکانی (بوللسمور) هەموویان پیاوکوژ و مامەڵەی توندیان لەگەڵ دەکردن، لە ئێمەیان جیاکردنەوە و مامەڵەی ئێمە جیاوازبوو.

بەشەکانی بەشە نوێیەکەمان نەدیبوو، بۆ بەیانی کە چووین، چوار ژووری چاکی زیندانەکەیان بۆ ئێمە تەرخانکرد، ژوورەکە گەورەو لاکێشی بوو، درێژی پەنجا پێ و پانیشی سی پێ دەبوو، لە نهۆمی سەرەوە –نهۆمی سێیەم، ئێمە تەنیا بووین لەم نهۆمەدا. ژوورەکە نوێ و پاک بوو،

بەشێکی جیایی بۆ توالیت و حەوزی میزکردن و دوو حەوزی خۆشوشتن و دوو گەرماوی دوشی تێدابوو. لە ژوورەکەدا، چوار قەرەوێڵە بە هەموو پێویستییەکانی وەک چەرچەف و خاولی تێدا بوو، دیارە بۆ پیاوی وەک ئێمە تەرخانکرابوو، ئێمەی هەژدە ساڵمان لەسەر یاتاغی خراپ و لەسەر ئەرزی رەق بەرێکردبوو. ژوورەکە، لەچاو ژووری دوورگەی (روبین)، ژوورێک بوو لە ئوتێلی پێنج ئەستێرە دەچوو.

لە نهۆمەکەدا، باڵکۆنێکی فراوان هەبوو، باڵکۆنەکە لە یاریگەیەکی بچووک دەچوو. دیوارە چیمەنتۆیەکەی سپی و لووس بوو، دیوارەکەی دوازدە پێ بەرزبوو، ئاسمان وچەند لوتکەی شاخی (کونستانتینیتابێرگ) بەتایبەتی لوتکەی ناسراو بە چاوی فیل لە ئاسۆکەی دیاربوو. بە رۆژ روومان لە باڵکۆنەکە دەکردو هەموو جارێ لە جیاتی هەموو جیهان تەماشای ئەم شاخەم دەکرد.

ئەمە گۆڕانێکی دوورو لەناکاو بوو ولێکدانەوەمان بۆی نەبوو، مرۆڤ لە زیندانا چاوەڕوانی گۆڕانی لەناکاو دەکات بەڵام دەستگیری ناکات. گەرچی وا دەشتی سەرەکی وڵاتین، بەڵام هەست بە تەنیایی دەکەین، لە دوورگەکە راهاتبووین وهەر ئەویش ستوونی خەباتمان بوو، هەر یەکێکمان لەلای ئەوی تر لە دلۆڤانی دەگەڕا و هەفتەکانی یەکەمی هاتنمان بە دوایی ئەوەی بۆچی ئێمەیان لە دوورگەکە گواستەوە ئێرە دەگەڕایین و وێڵ بووین. ئەوەمان دەزانی کەوا دەسەڵاتدارەکان لە بوونی ئێمە لەناو گەنجەکان نیگەران بوون و دەترسان نەوەک کاریان لێ بکەین، بەڵام رەنگە گواستنەوەمان هۆکاری ستراتیژی هەبێ و دەوڵەت دەیەوێت بەوە سەری حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە دوورگەی (روبین) ببڕێت، چونکە دوورگەکە ببووە نیشانەی خەبات و وەک ئەفسانەیەک تەماشای دەکرا بۆیە ویستی هێماکان دووربخاتەوە، (ولتر و ریموند) وەک من ئەندامی باڵای دەزگاکە بوون، بەڵام بوونی ملانگینی جێگای سەرنج بوو، ئەو ئەندامی دەزگاو ئەندامێکی بەرزی حیزب نەبوو لە دوورگەکە، رەنگە ئەگەری ئەوەش هەبێ کەوا حکومەت لە رووی ئیستخباراتی رێکخستنەکانی لاواز بێ و هەستی بەوە نەکردبێ لە هەندێ لایەندا.

بە هاتنی ئەحمەد کاترادای ئەندامی باڵای دەزگا پاش چەند مانگێک بۆ زیندانی بوللسمور مەزندەکانمان پشت ئەستوور کرد. چونکە لە هەموویان گرنگتر ئەوەبوو، کاترادا بەرپرسی پەیوەندییەکانی نێوان ئێمە و گیراوە نوێیەکان بوو.

چەند هەفتەیەک لە پاش هاتنی کاترادا، گیراوێکی گەنجی پارێزەری ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە هەرێمی کیپی خۆرهەڵاتمان بۆ هات، ئەویش پاتریک ماقوبیلا بوو، ئەو لە دوورگەی روبینەوە نەهاتبوو. ماقوبیلا لەسەر دەستی پیاوی یاسای پایەدار گریفیش مزینگی



پەروەردە ببوو، ئەو بەرگری زۆری لە ئەندامانی حیزب لە دادگا گردبوو و پێش ساڵێک لە نزیک (دوربان) تیرۆرکرا، ماقوبیلا بە تاوانی خیانەت بیست ساڵ زیندانی بۆ بڕابۆوە و لە دایبکلوی جۆهانسبێرگ لەبەر کێشەو چالاکییەکانی حیزبی لەناو زیندانییەکان دا گواسترایەوە زیندانی بوللسمور.

بە هاتنی ئەم میوانە تازەیە گومانمان پەیداکرد کەوا دەسەڵاتداران ئەویان لە ناو ئێمەدا چاندووە. بەڵام هەر زوو بۆمان ئاشکرا بوو کەوا گومانەکە لە جێگەی خۆیدا نییە. پاتریک هۆشمەند و خۆش مەجلیس و چاونەترس بوو.

پەیوەندیمان خۆش بوو، بۆ ئەویش زەحمەت بوو، بکەوێتە نێو چەند پیرەمێردێک و کەسایەتیان لەسەر جۆرە رەوشتێک چەسپیوە و بیست ساڵێکە هاوژینن پێکەوە.

کەوتینە ناو جیهانی بەردو چیمەنتۆ و خۆزگەم بە جوانی سروشتی فراوانی دوورگەی روبین دەخواست، لەوێ چاک راهاتبووین، بەڵام لەجیاتی ئەوە خواردنمان باشتربوو، ئەوەیان تۆڵەی بۆ کردبووینەوە. لەجیاتی خواردنی هەویری گەنمەشامی رۆژێ سێ جار، لێرە لە بوللسمور لەبەر زۆری سەوزەو گۆشت، هەر ژەمێک خوانێکی چاک بوو، هەروەها بواریش دراین چەند گۆڤار و رۆژنامەی وەک تایمی ئەمریکی و گاردیانی هەفتانەی لەندەنی بخوێنینەوەو ئەوەش کردنەوەی پەنجەرەیەک بوو لەسەر جیهانی گەورە، رادیۆییکیان بۆ هێناین، تەنیا ئێستگە ناوخۆییەکانی وەردەگرت و ئەو ئێستگەی کە ئێمە دەمانویست وەک (BBC)ی بەریتانی وەرنەدەگرت، کاتی نان خواردن پاسەوانەکان لەنێوان دوازدە تا دووی پاش نیوەڕۆ نەبێ، ئەگەرنا بە درێژایی رۆژ لە باڵکۆنەکە بووین، ناچاریش نەدەکراین هیچ کارێ بکەین، لە تەنیشتمان ژوورێکی بچووک هەبوو، کورسییەک و مێزێک و دۆلابێکی کتێبی تێدابوو، ئەوێم بە رۆژ بۆ نووسین و خوێندنەوە بەکاردەهێنا.

بەیانیان کاتژمێر پێنج بە ئاگا دەهاتم و سەعاتێک و نیو لە ژوورەکەدا خەریکی راهێنانی وەرزشی دەبووم. هەر وەک جاران راهێنانەکانی وەک هەروەلە و یارییەکانی سویدی و پاژدان لەسەر گوریسم دەکرد. هاوڕێکانم زوو بە ئاگا نەدەهاتن بۆیە تێگەیشتم ئەوەیان بێزاریان دەکات و حەزم لێ ناکەن.

لە بوللسموردا وینی هاتە سەردانم، لێرە کامەران بووم، چونکە ژووری سەردانەکە پاک و باشتربوو لە ژووری سەردانی دوورگەی روبین، شوشەکەی نێوانمان گەورەتر بوو و دەتوانرا بەشی سەرەوەی لاشەی مێوانەکەت چاک ببینیت. هەروەها مایکرۆفۆنەکان نزیکتربوون و دەنگەکە چاک

و روون دەبیسترا، پەنجەرە گەورەکە، زۆرتر رەحەتی و هاموشۆیی لەگەڵ میوانەکەت دەبەخشی. ئەو هەستەش گیانی زۆرتر دەخستە خۆشی و سەرفرازی ئەگەرچی خەون و تەونی خەیاڵ بوو.

هاتن بۆ بوللسمور، لە هاتنی دوورگەی روبین ئاسانتربوو، بۆ وینی و ئەندامانی تری خێزانەکەم ئاسانترو خۆشتر بوو، لە رووی مرۆڤایەتییەوە سەردانەکان کەمتر چاودێری دەکرا، ئەفسەر جایمس گریگۆری کە لە دوورگەکە رەقیب بوو سەرپەرشتی سەردانەکەی وینی کرد، من چاکم نەدەناسی، بەڵام ئەم لەبەر چاودێری هاتوو رۆیشتووی نامەکانی دەکرد، بۆیە منی زۆر باش دەناسی.

لە بوللسمور، زۆرتر شارەزای گریگۆری بووم و بۆم دەرکەوت پاسەوانێکی رەزاقورس نییە، پیاوێکی بە رەوشت بوو، لەسەرخۆ قسەی دەکرد و مامەڵەی لەگەڵ وینی بەرێزو ناسک بوو، لەجیاتی ئەوەی بە هاوارێکی تاڵەوە پاش کۆتایی ماوەی سەردانەکە، بەرێزەوە دەیووت:

– بەرێز ماندێلا پێنج دەقیقەتان ماوە.

لە کتێبی پیرۆزی مەسیحیەتدا هاتووە، باخچە لەلایەن باخچەوانەوە دروستکراوە، بەڵام لە بوللسمور بەپێچەوانە بوو، لە بوللسموردا باخچەیەکم دروستکرد، لەوێ جوانترین چالاکی و کامەرانیم دەدۆزییەوە، بەوە لە کۆڵ بەردو چیمەنتۆ بوومەوە، جوان لە بۆشاییەکەی پێشمان وردبوومەوەو کە زانیم تیشکی خۆری بە چاکی بەردەکەوێت، داوام لە بەرێوەبەرایەتی کرد، بوار بدەن تێیدا باخچەیەکی لێ دروست بکەم، هەروەها داوام کرد شازدە بەرمیلی بەتاڵی روونم بە قەبارەی چل و چوار گالۆن بۆ پەیدابکەن، بەرمیلەکانیشم بۆ بکەنەوە دوو کەرتی وەک یەک و پڕی بکەن لە خۆڵی بە پەین، بەوەش سی و دوو مەنجەڵی گەورەم بۆ چاندنی گوڵ و سەوزە دەست دەکەوێت.

باخچەیەکی گەورەترم لە باخچەکەی دوورگەی روبین دروستکرد، نزیکەی نۆسەد رووەکم چاند، وەک پیاز، باینجان، کەرنب، قەرنابیت، فاسۆلیا، سپێناخ، گێزەر، ئاروو، خاس، تەماتە، بیبەرو زۆری تر.

تۆیەکانم هەندێکیان کڕی و هەندێکیان بەرپرسی زیندان عەمید مانرو و ئەو پاسەوانانەی حەزیان لە رووەک و سەوزە بوو بۆیان دابینکردم، هەروەها پەینی کیمیاوی باشتریان بۆ هێنام.

بەیانیان کڵاوەکەم لەسەردەکردو پەنجەوانەکانیشم لە دەست هەڵدەکێشاو رووم لە باخچەکەم دەکرد و دوو سەعات کارم دەکرد. هەموو رۆژانی یەک شەممان هەندێک سەوزەم دەدایە چێشتخانە بۆ خواردنی گیراوانی بەشی گشتی زیندانەکە. پاسەوانەکانیش هەگبە و جانتایان دەهێنا بۆ وەرگرتنی بەشی سەوزەکانیان.



لە بوللسمورا کێشەمان کەمتربوو لە دوورگەکە، عەمید مانرو پیاوێکی چاک بوو، ئەوەی لە دەستی هاتبایە، داواکانمانی جێبەجێ دەکرد.

سەرەڕای ئەوانە، کەسانی وامان هەبوو کێشەی بچووکی گەورە دەکرد، لە یەکێک لە سەردانەکانی وینی لە ساڵی ١٩٨٣ وتم، پێڵاوەکەی بۆت هێنا بووم، تەسک بوو پێڵاوەکە قاچی ئازار دام، ئەوە دڵگیری کرد، دوایی زانیمەوە رۆژنامەیەک نووسیبووی گوایە پەنجەیەکی پێم بڕاوەتەوە. لەبەر ئەوەی پەیوەندیمان بە دەرەوە زۆر ئاسان نەبوو بۆیە زیادکردنی زانیاری و گۆڕینی هەواڵ و گەورەکردنیان زۆربوو و راستکردنەوەیان ئاسان نەبوو، خۆ ئەگەر ئەمجارە تەلەفۆنێ هەبوایە و قسەم لەگەڵ ژنەکەم کردبایە، ئەوا زوو هەواڵەکەم راست دەکردەوەو پڕۆپاگەندەی واش بڵاونەدەکرایەوە. پاش ماوەیەکی کورت هیلین سوزمان هاتە سەردانم و لە پەنجەی پێی پرسیم. لە دڵی خۆمدا وتم، ئەوەی بیستی نەیبینی، گۆریەکەم لە پێ کردەوەو قاچی رووتم بۆ بەربەستە شووشەکە بەرزکردەوەو پەنجەکانم جووڵاند وبۆم سەلماند کەوا پەنجەکانم سەلامەتن.

گلەییم لە شێداری ژوورەکەم کرد و وتمان سارده، ئەوەش رۆژنامەکان نووسیان کەوا ژوورەکەمان کەوتۆتە ژێرئاو، شێوەی سەردانمان گۆڕا، ئەمجارە ئەفسەر گریگۆری منی بردە ژوورێکی بێ بەربەستی شووشەو لە ژوورە سەربەخۆکەدا مێزێکی بچووکیش دانرابوو، ئەفسەرەکە چرپاندیە گوێم و وتی حکومەت سیاسەتی سەردانی گۆڕی بۆ یەکەم جار لە مایۆی ١٩٨٤دا پێشوازی وینی و زینی کچم و کچی بچووکی زینیم لەو ژوورە تایبەتیە کرد. ئەوە یەکەم جارە، ژووری ئاسایی بۆ سەردانمان بەکار بێت. داواشمان کرد بوار هەبێ لەگەڵ گیراوانی تردا دیدارمان هەبێ و شێلگیرانە داواکاربووین مامەڵەی گیراوی سیاسیمان لەگەڵ بکەن.

لە من دوورکەوتەوە و بانگی وینی کردو داوای لێ کرد بە تەنیاو لە ژوورێکی تر قسەی لەگەڵ بکات، دڵم ترسا، وتم: شتێکم بەسەرهاتووە. لە ژوورەکەدا هاتەدەرێ و یەکسەر بۆ باوەشم و پاش چەند ساڵ تامەزرۆیی بۆ یەکەم جار ماچی کردم، ئەو ساتە هەزارو یەک خەونم بینی و هەستم کرد خەونەکە درێژە، تەسلیمی بووم و هەموو شتێکم لەبیرچوو، تەنیا دەنگی دڵی من و دڵی ئەو دەهات، لەبەر تامەزرۆیی لەباوەش کردنی کیژەکەم نەبوایە بەرم نەدەدا، کیژەکەم و کیژەکەییم لە ئامێز گرت. پاش بیست و یەک ساڵ جارێکی تر دەستم بە دەستی ژنەکەم کەوتەوە.

* * *

له بوللسمور زۆرتر ئاگامان له رووداوەکانی دەرەوە هەبوو، زانیمان کلپەی خەبات گەشەی سەندووەو حکومەت درێغی ناکات له بەرپەرچدانەوەیان، له ساڵی ۱۹۸۱دا هێزەکانی بەرگری خوارووی ئەفریقیا هێرشیان کردە سەر بارەگاکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی له مابوتوی مۆزەمبیق و سێزدە کەسیان کوشت لەناویاندا ژن و زارۆکیش هەبوون. له دیسەمبەری ۱۹۸۲دا بزاڤی (ئەمکا) مەڵبەندی وزەی ناوکی کوبیرگیان تەقاندەوە، مەڵبەندەکە له گەڕەکەکانی کیپ تاون لەژێر دروستکردن بوو، هەروەها چەندین بنکەی سەربازی و دەزگای نەژادپەرستی له وڵاتدا دووچاری هێرش بوونەوە. هەروەها هێزە سەربازییەکان له هەمان مانگدا مەڵبەندێکی حیزبییان له ماسیروی لوسوتو کردە ئامانجی هێرشێکیان، لەوێ چل و دووکەس کوژران لە نێویاندا زیاتر دەیان ژن و زارۆک بوون.

له ئۆگستی ۱۹۸۲دا روت فیرست له مابۆتۆ کوژرا، ئەو خاتوونە له تاراوگە دەژیاو ئۆتۆمۆمبێلێکی بە مینچنراوی بە رووداو تەقێنرایەوە، روت خێزانی بەناوبانگترین و ئازاترین تێکۆشەری دژایەتی نەژادپەرستی جوسلوڤو بوو، روث چەند مانگ بوو له زیندان بوو، خاتوونێکی سەرنج راکێش و کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو، کە له زانکۆی ویسی دەمخوێند یەکترمان ناسی، بە ئاشکرابوونی تیرۆرکردنی لەلایەن دەوڵەتەوە، ئەوە رووی دڕندەی دەوڵەت بەرامبەر خەباتکەران روون و ئاشکراتربوو.

له مایۆی ۱۹۸۳ بزاڤی «ئەمکا» یەکەم ئۆتۆمۆمبێلی بە مینچنراویان له بنکەی ئاسمانی و نووسینگەی ئیستخباراتی سەربازی له جەرگەی بریتۆریای پایەتەختا ئەنجامدا. ئەمەش وەڵامدانەوەی هێرشە سەربازییەکان بوو بۆ سەر مەڵبەندەکانی حیزب له ماسیرو و شوێنی تر و هەروەها نیشانەی گەشەسەندنی کاری چەکداری بوو. له هێرشەکەدا، نۆزدە کەس کوژران و زیاتر له دوو سەد کەسیش بریندار بوون.

کوشتنی هاووڵاتیان رووداوێکی بەژان بوو، بە زیادبوونی ژمارەی قوربانییەکان زۆر دڵگران دەبووم و دەمزانی ئەوەش ئەنجامی بەردەوامی خەباتی چەکدارییە، هەڵەی ئادەمیزاد بنچینەی سەرەکی شەڕەو له هەموو حاڵەتێکیشدا زیانی گەورە دەداتەوە. کە بڕیاری ترسناکی بەکارهێنانی چەکمان دا دەمانزانی ئەنجامەکەی وا دەکەوێتەوە، شەڕی چەکداری، وەک جارێکیان ئولیڤەر لەکاتی رووداوی کارەساتێک وتی، ئەو توندوتیژییەی دەرحەقمان دەکرێت وامان لێ دەکات هەبێت.



حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و حکومەت، لەسەر دوو تەوەری سەربازی و سیاسی کاریان دەکرد، له بەرە سیاسییەکەیدا حکومەت ستراتیژی پەرتکەو بلاوکەی لەنێوان ئەرفیقیەکان و رەنگینەکان و هیندییەکان پەیڕەو دەکرد. له ریفراندۆمێک کە له نۆڤێمبەری ۱۹۸۳دا کرا، سپیەکان پلانی بی دەبلیۆ بوتای دامەزراندنی پەرلەمانێک بریتی بێت له سێ ژوور بێجگە له سپیەکان دوو نوێنەری هیندی و رەنگینەکانی بەرجەستە کرد. مەبەست لەو پلانەش قۆزتنەوەی هیندی و رەنگینەکان له رژێمێکی سیاسیدا و دوورخستنەوەیان له ئەفریقیەکان. ئەو پرۆسەیەش هەر بەناو بوو، چونکە بڕیارەکانیان لەلایەن سپیەکان بە بڕیاری ڤیتۆ رەت دەکرایەوە. هەروەها پلانەکە دەیویست جیهانی دەرەوەش دەستخەڕۆ بدات کەوا حکومەت دەیەوێت چاکسازی له رژێمی نەژادپەرستیدا بکات، بەڵام، فێڵەکەی بوتا له کۆمەڵانی خەڵک گۆڕانی نەکرد. بۆیە لەسەدا هەشتای دەنگدەرانی هیندی و رەنگینەکان له هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ۱۹۸٤ بەشدارییان نەکرد.

لەو سەردەمانەدا چەندین بزاڤی سیاسی بەهێز لەناو خوارووی ئەفریقیادا سەریان هەڵدا، ئەو بزاڤانە پەیوەندییان بە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هەبوو، لەوانە بەرەی دیموکراتی یەکگرتوو و منیان بە سەرۆکی هەڵبژارد. بەرەکە بۆ ئەوە دامەزرا تا نارەزاییەکان دژ بە دەستووری نەژادپەرستیی نوێی ساڵی ۱۹۸۳ و هەڵبژاردنی پەرلەمانی سێیەمی جیاکراوەی ساڵی ۱۹۸٤ رێک بخات. زۆری نەخایاند، بەرە بووە رێکخراوێکی بەهێزو زیاتر له شەش سەد رێکخراوی دژ بە نەژادپەرستی وەک سەندیکاکانی کرێکاران و کۆمەڵە میلیەکان و یەکێتییەکانی خوێندکاران و کەنیسەکانی هاتە ژێر باڵی.

حیزب گەشەیەکی میللی نوێی بەخۆیەوە بینی، بە پێی راوەرگرتنەکان دەرچوو ناودارترین و بەکارترین رێکخراوی سیاسییە لەناو هەموو ئەفریقیەکان ئەگەرچی ئەوە چارەگە سەدەیەکە کاری سیاسی لێ قەدەغە کراوە. خەبات دژ بە نەژادپەرستی له خوارووی ئەفریقیا له هەموو جیهان دەنگی دایەوە. له ساڵی ۱۹۸٤دا قەشە دیزمۆند توتو خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بەرکەوت «دەسەڵاتداران نامەی پیرۆزبایی کە بۆم نووسیبوو بواریان نەدا بگاتە دەستی». حکومەتی خوارووی ئەفریقیا لەبەر پەیڕەویان رژێمی نەژادپەرستی ئابڵوقەی ئابووری جیهانیان خرایە سەرو ئەوەشیان کاری زۆری لێ کرد.

بە پێناوی وەزیریان کروگر، حکومەت چەند جار ویستی له نیازم بگات و داوای دەکرد له

ترانسکای نیشتەجێم بکات، ئەویشیان شێوەیەکی دانوستان نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوەبوو تا لە حیزبم دوور بخاتەوە و چەند جار کروگر پێی وتم:

– ئەی ماندێلا دەتوانین هاوشانیت بین، بەڵام ناتوانین ئەوەیان لەگەڵ هاوڕێکانت بکەین، خۆت بگونجێنە و بیسەلمێنە.

بە کۆشش و پێشنیارەکانیان رازی نەبووم، بەڵام نەپچڕانی رەوشەکە، نەک پەلار و توانج، نیشانەی دانوستانی راستەقینەی دەگەیاند.

حکومەت دەستی بە تاقیکردنەوەی رەوشەکان کرد، لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٥، دوو کەسایەتی دیاری سیاسی خۆرئاوا هاتنە سەردانم، یەکێکیان، لۆرد نیکۆلاس بیشیل، ئەندامی جڤاتی پیرانی بەریتانی و ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپی و دووەمیشیان، ساموئیل داش مامۆستای یاسا لە زانکۆی جۆرج تاون و راوێژکاری جاران لە لیژنەی وترگێت لە جڤاتی پیرانی ئەمریکی بوو. هەردوو سەردانەکە بە رەزامەندی وەزیری دادی نوێ کوبیکوتس بوو، ئەو وەک کەسایەتی نوێی ئەفریکەکان دروست ببوو.

لە نووسینگەی بەڕێوەبەرایەتی زیندان دیدارم لەگەڵ لۆرد بشیل سازکرد، لە ژوورەکەدا وێنەیەکی گەورەی سەرۆک بوتا بە دیوارا هەڵواسرابوو، بیشیل، پیاوێکی قسەخۆشی چوارشانەبوو، هەر لە یەکەم دیتندا گاڵتەم لەگەڵ کرد کە دەستم گووشی و وتم دڵێیی لە نەوەی وینستۆن تشیرشلی، دڵشادبوو و پێدەکەنی.

لە وەزعی ناو زیندانی پرسی، بە وردی وەڵامم دایەوە، باسی خەباتی چەکداریمان کردو بۆم روون کردەوە، کەوا بوونی توندوتیژی دەگەڕێتەوە سەر حکومەت و ئەوان بەرپرسن و ئێمە مەبەستمان بنکە سەربازییەکانەو گیانی هاووڵاتیانی بێ تاوان دەپارێزین لە هێرشەکانماندا. لە ژوورەکەدا، رائید فریتز ڤان سیتیرت بۆ گوێگرتنی قسەکان ئامادەبوو و ئێشارەتم بۆ کردو وتم:

– بۆ نموونە، من بوار نادەم ئەندامانمان رائید فریتز بکوژن.

فریتز کەم دوو و بەڕێز بوو بەم ئیشارەتە راچڵەکی.

لە دیدارم لەگەڵ مامۆستا داش روونم کردەوە، ئەگەر حکومەت هەنگاوی وەک، یەکخستنەوەی زەوییەکان و هەڵوەشاندنەوەی ئۆردووگاکانی جوداخوازی و نەهێشتنی هەڵبژاردنەکانی نەژادپەرستی و دابینکردنی دەنگدانی هەموو هاووڵاتییەک، باوێت و پەیڕەوییان بکات، ئەوانە کەمترین ئاماژەی دەوڵەتی یەکسانی و نەمانی نەژادپەرستییە لە وڵاتدا. داش پرسیاری ئەوەی لێ



کردم، بڕیارەکانی حکومەت، وەک، ئەگەری هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی ژنهێنانی تێکەڵ و چەندین بڕیاری تری نەژادپەرستی، چۆنە؟ منیش وتم:

– ئەم هەنگاوانە بایەخیان نییە، رۆژێ نایێ چاوم لە هێنانی ژنێکی سپی بێت، یان بچمە گەرماوی سپییەکان، ئێمە داواکارین لە رووی سیاسی هاوشان بین و یەکسانی سیاسی بەرقەرار بێ.

بە ئاشکرا بە داشم راگەیاند، ئێمە ئیمڕۆ هێزی وامان نییە بتوانین لە مەیدانی شەڕدا حکومەت بشکێنین. بەڵام دەتوانین وای لێ بکەین بەڕێوەبردنی وڵاتیان لا زەحمەت بێت.

دوو نووسەری رۆژنامەی واشنتۆن تایمزی ئەمریکی پارێزگار هاتنە سەردانم، سەردانەکە خێری نەدایەوە، نەهاتبوون پرس و راو بۆچوونم بزانن، هاتبوون شیوعییەت و تیرۆریزمم لەسەر بکەنە ماڵ. پرسیارەکانیان ئەم مەبەستانەیان دەپێکا. کەویستیشم تێیان بگەیێنم من نە شیوعی و نە تیرۆریستم، وتیان، کەواتە تۆ مەسیحیش نیت، وتیان، هیچ رۆژێ قەشەی ئەمریکی رەش مارتن لۆسەر کینگ پەنای نەبردۆتە بەر توندوتیژی. منیش وتم، ئەو رەوشەی ئەو خەباتی لێ دەکرد، لەگەڵ رەوشی ئێستای ئێمە جیاوازە. چونکە ئەمریکا، وڵاتێکی دیموکراتییەو لە دەستووریدا هاوشانی و یەکسانی لە دەستوور هەیەو یاساش پارێزگاری مافەکان دەکات «سەرەڕای بوونی نەژادپەرستی دژ بە رەشەکان»، سەبارەت بە وڵاتی خوارووی ئەفریقیا، وڵاتێکی پۆلیسیەو دەستوورەکەی پارێزگاری لە نەژادپەرستی دەکات و سوپاکەش بە چەک وەڵامی پرۆسەی ئاشتی دەداتەوە. هەروەها وتم، بەدرێژایی ژیانم من مەسیحی بوومە، مەسیحیش بواری تری نەدۆزیەوە بێجگە لە هێز کە مەرابییەکانیان لە پەرستگا دەرکرد. مەسیح پیاوی توندوتیژی نەبوو، کە رووبەڕووی خراپەکاری و فێڵ کرایەوە بۆیە پەنای بردە بەر هێز، بەڵام بە قسەکانم قەناعەتیان نەکرد.

بی دەبلیوبوتا لەناوەوە دووچاری قەیرانەکان هاتبوو و لە دەرەوەش زۆریان بۆ هێنابوو بۆیە بەناچاری چارەسەرێکی مام ناوەندی ساردی پێشنیار کرد، بۆیە لە دیداری پەرلەمانی رۆژی ٣١ی یەنایری ١٩٨٥دا سەرۆک رایگەیاند کەوا ئامادەن من ئازاد بکەن «ئەگەر من توندوتیژیم وەک شێوەیەکی سیاسی و بەبێ بەرامبەر سەرکۆنە کرد»، ئەوەش هەموو گیراوە سیاسییەکانی گرتەوە، دوایی وەک ئەوەی بە ئاشکرا تحەدای من بکات وتی:

– ئیمڕۆ حکومەتی خوارووی ئەفریقیا بەربەست نییە لە ئازادی بەڕێز ماندێلا، بەڵکو خۆی

بوویتە بەربەست لەبەردەم ئازادی خۆی.

هێمای ئەوەم بۆ دەهات، گوایە حکومەت نیازی ئازادکردنی هەیە، بەڵام بڕوام نەدەکرد ئەوەیان بە دوانێکی رەسمی لەلایەن سەرۆکی حکومەتەوەو لەبەردەم پەرلەمانیش بێ. بە مەزندەی من، لەو دە ساڵەی رابردوو ئەوەیان شەشەمین پێشنیاری مەرجدارە ئاراستەم دەکرێت. کە لە رادیۆ گوێم لە هەواڵەکەبوو، داوام لە بەڕێوەبەری زیندان کرد خێرا وینی ژنم و ئیسماعیل ئەیوبی پارێزەرم پێش ئەوەی وەڵامی سەرۆک بدەمەوە ببینم.

بۆ سەردانەکەی وینی و ئیسماعیل هەفتەیەکی ویست تا رێگایان پێدان، لەو ماوەیەدا نامەیەکم ئاراستەی بیک بوتای وەزیری دەرەوە کرد کەوا بەو مەرجانەیان رازی نیم بۆ ئازاد کردنم. هەروەها خۆم بۆ وەڵامدانەوی سەرۆکیش ئامادەکرد، دەبوایە نامەیەک زیاتر لە مەبەستێکی تێدا بێ، چونکە ئەو دەیویست بزمارێک لەنێو من و هەڤاڵانم بکوتێ وام لێ بکات بە مەرجی وا رازی بم حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی قەبوڵی نییە، ویستم بە حیزب و ئولیڤەر تامبویش رابگەیێنم کەوا دڵسۆزیم بۆ حیزب قسەی لەسەر نییە. حەزم کرد، ئەوەش بە حکومەت بگەیێنم، کە مەرجەکانیان قەبوڵ ناکەم،وەنەبێ شەڕ لە دانوستان بە باشتر بزانم، بوتا دەیویست تاوانی توندوتیژیەکە بخاتە ئەستۆی من و منیش بۆ جیهانم سەلماندبوو کەوا هێز بەکارهێنانمان لە ناچارییەو بەرپەرچی هێز دەدەینەوە. ئەو رەوشەی کە منی تێدا گیرا هەر ماوەو بۆیە چالاکی و کارەکان هەر دەبێ بەردەوام بن ئەگەر ئازادیش بکرێم، وام ئاراستە کردن.

رۆژی هەینی وینی و ئیسماعیلم بینی، بڕیاریش وابوو، بەرەی یەکگرتووی دیموکراتی رۆژی یەک شەممە لە ئەستادیابولانی لە سویتو کۆبوونەوەیەکی جەماوەری ساز بکات و لەوێ وەڵامە رەسمییەکەی من بۆ حکومەت ئاشکرا بکات، ئەم سەردانە لەلایەن پاسەوانی نوێ چاودێری دەکرا، من نەمدەناسین، کە ویستم باسی وەڵامەکەم بۆ سەرۆک بکەم یەکێکیان قسەکەی پێ بڕیم و وتی، بێجگە لە بابەتی خێزانی باسی لایەنی تر مەکەن. گوێم نەدایێ و پاش چەند دەقیقەیەک لەگەڵ پاسەوانێکی پلە بەرزتر هاتەوە، ئەویشم نەدەناسی و فەرمانی دا، نابێ باسی سیاسەت بکەین، منیش وتم، باس لە مەسەلەیەک دەکەین پەیوەندیدارە بە داوای سەرۆکی حکومەت و کێشەکە لە رووی نەتەوەییەوە گرنگەو ئەگەر بیەوێت قسەکەم ببڕێت، ئەوا دەبێ رەزامەندی سەرۆک وەرگرێت و بەتوندی وەڵامم دایەوە و وتم:

– ئەگەر تەلەفۆن بۆ سەرۆکی دەوڵەت نەکەیت، هەر ئێستا ئەوا قسەکەم نابڕم و داواکارم



جارێکی تر قسەم مەبڕە.

پاسەوانەکە رۆیشت و وتارەکەم دایە ئیسماعیل و وینی، لە وتارەکەدا سوپاسی بەرەی یەکگرتووی دیموکراتیم کرد، پیرۆزباییشم ئاراستەی قەشە توتو کردو پێم وت، ئەو خەڵاتە هی هەموو میللەتە، پاش ئەوەی بیست ساڵ حکومەت وتارو دەنگی منیان قەدەغەکرد، وا رۆژی یەکشەممە ١٠ی فێبرایەری ساڵی ١٩٨٥ زیندزی کچم لەناو چەپڵەریزانی گەرمەوە وتارەکەم دەخوێنێتەوە. زیندزی وەک دایکی قسەکەرێکی بە توانابوو، پێشەکی وتی، باشتر بوو باوکم لێرە، لەو گۆڕەپانە بوایە خۆی وتارەکەی خوێندبایەوە، بەڵام من بە خوێندنەوەی وتارەکەم لەلایەن ئەوەوە سەربەرزبووم. ئەوەی خوارەوە لە وتارەکەمدا هاتبوو:

من ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقیم، هەتا لە ژیاندا مابم هەر لەو حیزبەدا دەمێنمەوە، ئولیڤەرتامبو زیاتر لە پەنجا ساڵە خۆشەویستترین هاورێ و برادەرم بووە، ئولیڤەر ئازادکردنی من دەخوازێ و دەزانم ئامادەیە خۆی بکاتە قوربانی ئازادکردنم. من سەرسام دەبم کە حکومەت مەرجی وا بۆ ئازادکردنم دادەنێ، من پیاوی توندوتیژی نیمە. ناچارکراوین چەک هەڵگرین و بەرگریمان لە مانی خۆمان کردووە. با بوتا بیسەلمێنێ ئەو جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانی پێشوو، ئەو وەک مالان و سترایدوم و فیرفورد نییە. با بلێ نەفرەت لە شەڕ و ئیش بۆ قەلاچۆکردنی نەژادپەرستی بکات و قەدەغەیی لەسەر رێکخراوی هەموو میللەت: حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هەڵگرێت و هەموو زیندانە سیاسییەکان ئازاد بکات و ئاوارەو دوورخراوەکان بگەڕێنەوە، با بوتا دابینی ئازادکاری سیاسی بکات و بوار بدات میللەت بڕیار بدات کێ حوکمی بکات.

من شانازی بە ئازادکردنی خۆم دەکەم، بەڵام، بۆ ئازادی ئێوە پەرۆشترم، لەوەتی من گیراوم، خەڵکی زۆر کوژران، زۆر بۆ ئازادی ماندووبوون، من قەرزاری بێوەژنەکان و کوڕە هەتیمەکان و دایکە جگەرسووتاوەکان و باوکەکانیانم، ئەوانەی فرمێسکی زۆریان رشت. هەر من نیم چەند ساڵە ئازار دەچێژم، من لەوان زۆرتر شەیدای ژیان نیم، وەنەبێ لە مافی رەسەنی خۆم خۆش بم و ئامادەش نیم لە مافی ئەو میللەتە لە ئازادییان خۆش بم

تامی چییە ئەو ئازادییەی کە پێشکەشم دەکەن و حیزبی هەموو میللەت قەدەغەی لە سەر بێ؟ ئەو ژیانە چی دەهێنێ لەگەڵ بنەماڵەکەم و هێشتا ژنەکەم بۆ براندفورد دوورخراوەتەوە؟ ئەوە کەی ئازادییە، بۆ هەڵبژاردنی شارێک کە تێدا بژیم مۆڵەتی رەسمی بوێت؟ ئەوە کەی ئازادییە هێشتا

جیهان ڕێزی ناسنامەی هاوولاتی خوارووی ئەفریقیاییم ناگرن؟ .

کەسانی ئازاد دەتوانن دانوستان بکەن، کەسانی گیراو ناتوانن ڕێککەوتننامە مۆربکەن، بۆیە هەتا گیراوبم بەڵێنی هیچ نادەم، هەتا ئێوەش ئازاد نەبن، ئازادی ئێوە، ئازادی منەو لەیەکتری جیاناکرێتەوە ... من دەگەڕێمەوە ........

* * *

لە ساڵی **١٩٨٥** خۆم نیشانی دکتۆرێ دا و ئەویش ڕەوانەی لای نۆژدارێکی کۆئەندامی میزی کردم و ئامۆژگاری کردم نەشتەرگەری پرۆستات بکەم، ئەم نەشتەرگەرییە ئاسان و ڕۆتینییەو لەگەڵ خێزانەکەم قسەم کردو بڕیاری نەشتەرگەرییەکەمان دا.

لەژێر چاودێری توندا گواسترامەوە نەخۆشخانەی فولکس لە کیپ تاون، وینی بە فڕۆکە پێش نەشتەرگەرییەکە گەیشتە لام، لەناکاو و لە سەردانێکی چاوەڕوان نەکراودا کوبیکوتسی وەزیری داد هات، پێش ئەوە نامەیەکم بۆی ناردبوو، تێیدا داوام کردبوو کۆشش بۆ دیدارێکی حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بکات. ئەم بەیانییە و بەبێ ئاگادارکردنەوە وەک ئەوەی بێتە سەردانی برادەرێکی کۆنی هاتە لام، زۆر بەڕێزو بە ڕەوشت بوو، زۆربەی کاتەکەمان بە گفتوگۆ بەسەربرد، بە بێ ئەوەی پێمەوە دیار بێ، زێدە سەرسام بووم، دیارە حکومەت بە هەنگاوی لەسەرخۆ و بە بێ ڕاگەیاندن وا خەریکە لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کەوتۆتە دانوستان، سەردانەکەی کوتسی لقە زەیتونێ بوو لەم پرۆسەیەدا.

باسی سیاسەتمان نەکرد، هەر باسی ڕەوشی خێزانەکەم کرد، وینی لە ئۆگۆستدا بۆ چارەسەری چووبووە جۆهانسبێرگ، ئەو ناتوانێ لە سنووری براندفورد دوورکەوێتەوە، بەس دەتوانێ بۆ چارەسەری و بۆ سەردانی من دووربکەوێتەوە، ئەو ماوەیەی لە جۆهانسبێرگ بووە، ماڵەکەی دراوەتە بەر نارنجۆک دووچاری ڕووخان هاتووە، ئێستا بێ خانووە، سەرەڕای ئەوەی نیشتەجێیی لە جۆهانسبێرگ قەدەغەیە، بەڵام ئەو لە بێ جێگایی ماوەتەوە. پاش چەند ڕۆژێ نامەیەکی لە پۆلیسی ئاسایش بەدەست گەیشت، گوایە خانووەکەی چاک کراوەتەوەو بۆی هەیە بگەڕێتەوە، بەڵام ئەو ڕازی نەبووە، منیش داوام لە کوتس کرد بوار بدەن وینی لە جۆهانسبێرگ بمێنێتەوەو ناچار نەکرێت بگەڕێتەوە براندفورد، ئەویش وتی، بەڵێنی هیچ نادەم، بەڵام ئیشی بۆ دەکەم و منیش سوپاسم کرد.



بۆ حەسانەوە، چەند ڕۆژێ لە نەخۆشخانە مامەوە، کە کاتی دەرچوونم هات بەڕێوەبەری زیندان عەمید مانرو خۆی هات و هاوڕێیەتی کرد، ئەوەش شتێکی نامۆ بوو، گومانم لا دروست بوو.

لە ڕێگادا مونرو بە ڕوونی پێی وتم: ماندێلا ناتگەڕێنینەوە لای هەڤاڵەکانت، وتم، یانی چی؟ وتی: لەمەودوا تەنیا دەبیت، وتم بۆ؟ وتی:

– نازانم، تازە لە سەرکردایەتییەوە ئەم فەرمانەمان پێگەیشت.

گۆڕانێکی لەناکاوو خێراو بێ پێشەکی و لێکدانەوە.

لە بوللسمور گواسترامەوە زیندانێکی تر و لە نهۆمی سەر زەوی و سێ ژوور و گەرماوێکی جیاوازیش لە بن دەستمدابوو، ژوورێکیان بۆ خەوتن و یەکێکیان بۆ خوێندنەوەو سێیەمیشیان بۆ چالاکی وەرزشی، بە پێوانەی زیندان، لە کۆشکێکدا بووم، بەڵام ژوورەکان کەمێک شێداربوون و تیشکی خۆریان کەم بەردەکەوت، هیچم لە عەمید نەپرسی، وەک خۆی وتی، من هیچ نازانم و فەرمان لە سەرکردایەتییەوە هاتووە، بۆیە دەبوایە بیر لەم داهاتە تازەیە بکەمەوە و حکومەت نیازی چییە و هۆکارەکان چین و چ لە پشت ئەم گۆڕانکارییەدایە!؟

زێدەڕۆیی دەکەم ئەگەر بڵێم ڕشتەکان هەموویان لەناکاوبوون، لە ڕۆژان و هەفتەکانی داهاتوودا زانیم پێشهاتەکان خێربوون، شەڕنەبوون. بە دوورکەوتنەوەم لە هەڤاڵەکانم دڵشاد نەبووم، هەستم بە غەریبی دەکرد بۆ باخچەکەم و بۆ ئەو باڵکۆنەی نهۆمی سێیەم کە تیشکی خۆری زۆر بەردەکەوت، بەڵام ئەو تەنیاییە وای کرد بتوانم ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەم کە لەمێژە بەنیازی بووم، ئەویش دانوستانە لەگەڵ حکومەت. گەیشتمە ئەو بڕوایەی کەوا دەبێ ڕەوتی خەبات بە ڕێگای دانوستان بەرەو پێشەوە ببەم، ئەگەر بەم زووانە دانوستان نەکەین ئەوا هەردوولامان بەرەو شەوەزەنگی ستەم و توندوتیژی و کوشتار دەڕۆین. ئەم هەوارەم، هەنگاوی یەکەمە بۆ بڕینی ئەم ڕێگایەو دوور لە دیدی خەڵکانی تر کە زۆرجار پلانەکانمیان لەباردەبرد.

سێ چارەگە سەدەیە شەڕی حوکمی کەمینەی سپی دەکەین و ئەوە بیست ساڵیشە شەڕی چەکدارییان دەکەین، لە هەردوولامان قوربانی زۆربوو، دوژمن هەر بەهێزە، گەرچی تانک و تۆپی هەیە، بەڵام وا دیارە بیری کردبێتەوە کەوا لەم ڕێگایەدا هەڵەی مێژوویی مەزن دەکات و حەق لەلای ئێمەیە، بەڵام هێزمان نییە، ئەوەشم بۆ ساغ بۆوە کەوا ئێمە سەرکەوتنی سەربازیمان پێ ناکرێت و ئەوەش ئەگەری موستەحیل نەبێ، ئەوا خەونێکی دوورە. نە مەعقوول و نە هۆشمەندییە لە هەردوولامان هەزارەها کەس لەناوبچێت –ئەگەر ملیۆنەهاش نەبێ– دیارە حکومەت بڕوای بەوە

هێناوە کەوا کاتی دانوستان هاتووە.

دانوستان، بابەتێکی هەستیارو زۆر ناسکە، هەردوولا بە نیشانەی لاوازی و خیانەتی دادەنێن، هەردوولا دانانیشن ئەگەر بەرامبەرەکەی تەنازولی زۆر نەکات. حکومەت چەندین جار وتوویەتی کەوا ئێمە رێکخراوێکی شیوعی تیرۆریستین، ئەوەش بەشێک بووە لە بڕوای حیزبی نیشتمانی دەسەڵاتدار.حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هەر دەیووت و دەیووتەوە کەوا حکومەت فاشی نەژادەپەرستە و ئەگەری دانوستانی لەگەڵ نییە هەتا قەدەغەی سەر حیزب هەڵنەگرێت و زیندانە سیاسییەکان بەبێ مەرج ئازاد نەکات و هێزەکانی لە شار و گوندەکانی ئەفریقیاییەکان نەکێشێتەوە.

بڕیاری دانوستان لەگەڵ حکومەت بایەخی تایبەتی هەیە و ئەگەر بکرێت دەبێ لە لۆساکا بێ، سەرکرادیەتی حیزب لەوێیە، پێویستە دانوستانەکە دەست پێبکرێت بۆ پەیوەندی کردن بە ئۆلیڤەر کات و بوارم نەبوو. دەبوایە یەکێک لە ئێمە هەنگاوی یەکەم باوێت، ئەم هەوارەشم ئازادی و بڕوای بۆ سازکردم ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ ئەمەیان بکەم و دەستپێشخەریەکەش با بە نهێنی بێت.

بەڕاستی کەوتمە تەنیاییێکی خەیاڵاوی، سێ نهۆم لە هەڤاڵەکانم دوورم بووم، بەڵام وەک ئەوەی لە جۆهانسبێرگ بن وابوو پێویستم بە سەردانیان هەبوو، ئەوەش رەزامەندی نووسینگەی سەرەکی لە بریتۆریای دەویست و رەنگە ئەوەش چەند هەفتەی دەویست. سەردانیشم کردبانە دەبوایە لە ساڵۆنی دیدار بوایە، ئەوەش سەیر دەبوو، هاوڕێی دوێنێ ئیمڕۆ مێوانە، چەند ساڵ پێکەوە بووین، رۆژانە چەند سەعات قسەمان پێکەوە دەکردو ئیمڕۆش بۆ دیداریان پێویستمان بە مۆڵەتی رەسمی هەیەو دیداریش لەلایەن پۆلیسەوە چاودێری دەکرێت.

چەند پاش گواستنەوەم بۆ زیندانە نوێیەکەم، داوام لە بەڕێوەبەری زیندان کرد هەڤاڵەکانم ببینم، بەڕێوەبەری زیندان رازی بوو و لەسەردانەکەدا باسی هۆکارە شاراوەکانی گواستنەوەمانیان کرد. ولتر و ئەحمەد و ریموند تووڕەبوون و دەیانویست نارەزایی بنووسن و داوا بکەن رەوشەکە وەک خۆی لێ بێتەوە. بە پێچەوانەی چاوەڕوانییان من لە بۆچوونەکەیان سەرگران بووم و وتم پێویست بە نارەزایی ناکات. ئاماژەم بە رەوشی زیندانی تازەم کردو وتم ئەگەری ئەوە هەیە رەوشی هەموو گیراوە سیاسییەکان چاک و خۆش بکرێت و دوایی بە پێچ و پەناوە وتم:

– ئەگەری ئەوە هەیە، ئەوەیان خێری زۆر بداتەوە، من ئێستا لە پلە یەکدام حکومەت رەنگە



پێشنیارو شتی تازەم نیشان بدات.

هەڤاڵەکان بەو شرۆڤەیە کامەران نەبوون، واشم چاوەڕوان دەکرد.

بڕیارم دا ئەوەی بە نیازم بیکەم بەکەس نەڵێم، نە هەڤاڵانی نهۆمی سێیەم و هەڤاڵانی لۆساکا ئاگادار بکەمەوە. راستە، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی رێکخراوێکی هەرەوەزییە، بەڵام حکومەت بڕیاری کۆمەڵی بە ئەرکێکی موستەحیل دەزانی، بوار و کاتی گونجاوم نەبوو تا لەگەڵ رێکخستنا گفتوگۆ بکەم.

گومانم نەبوو، کەوا هەڤاڵانی نهۆمی سێیەم پێشنیارەکەیان لا پەسەند نەبوو و ئەوەش وای دەکرد هزرەکە بەر لە لەدایکبوونی بمرێت، کەش و رەوشی وا هەیە، سەرکردە ناچار دەکات پێش لە هەڤاڵەکانی بگرێتەوەو رەهەندەکەی بگۆڕێت، چونکە دڵنیایە کەوا ئەو بە بوارێکی راستدا گوزەر دەکات و قازانج دەداتەوە. خۆ ئەگەر بە پێچەوانەش کەوتەوە، ئەوا رێکخستن لێی بێ بەرییە. ئەوکات دەکرێ بگوترێت، ئەو پیرەمێردە کە لە رەوشێکی تەنیایی خراپ دەژیا و بڕیارەکانی هی تاکە کەس بوون و نوێنەری حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی نەبووە.

* * *

پاش چەند هەفتەیەکی کەم نامەیەکم بۆ کوبی کوتیس نووسی، تێیدا پێشنیاری دیدارم کرد بۆ دانوستان، وەک جاران وەڵامم نەدرایەوە سەرسام و رەشبین بووم، دوایی تێگەیشتم کەوا ئەوەیان هەلێکی لەبارو باشە ئەگەر لەلایەن حکومەتەوە هاتە پێشم، ئەوەش بە راستی لە سەرەتاکانی ١٩٨٦ هاتەدی.

سەرکردەی وڵاتانی کومونویلسی بەریتانی لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٥ لە ناسودا لە کۆبوونەوەیەکدا هیچ سەبارەت بە گەمارۆیە نێونەتەوییەکانی سەر خوارووی ئەفریقیا نەگەیشتنە هیچ رێکەوتنێک، ئەوەش لە ئەنجامی بۆچوونی توندی سەرۆک وەزیرانی بەریتانی مارگرێت تاتشەر کە دژ بە گەمارۆکان بوو. بۆ دەرچوونیان لەم تەنگژەیە نوێنەری وڵاتەکانی بەشدار بڕیاریان دا وەفدێک لە چەند کەسایەتی ناودار رەوانەی خوارووی ئەفریقیا بکەن و راپۆرتێک ئامادە بکەن بۆ ئەوەی بزاندرێت بە گەمارۆیە ئابوورییەکانی سەر خوارووی ئەفریقیا رژێمی نەژادپەرستی نامێنێ، وەفدەکە لەم حەوت کەسایەتییە پێکهاتبوو، ناودارەکان ئەوانە بوون، ژەنەراڵ ئولوسیغوث ئوباسانجو رابەری سەربازیی نێجیریای پێشوو و مالکۆلم فرایزر سەرۆک وەزیرانی ئۆستراڵیای

پێشوو، لە سەرەتاکانی ساڵی **١٩٨٦** بۆ دیتنی ڕاستییەکان گەیشتنە خوارووی ئەفریقیا.

لە فێبرایەردا ژەنراڵ ئۆباسانجو بۆ شرۆڤەکردنی ئەرکی وەفدەکە هاتە سەردانم و ئامادەییشی نیشان دا بۆ دیدارم لەگەڵ ئەندامانی تری وەفدەکە، پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی حکومەت بۆ ئەم مەبەستە دیدار لە مایۆ دانرا، لەبەر ئەوەی بڕیاربوو وەفدەکە پاش دیداری من لەگەڵ حکومەت کۆببێتەوە، بۆیە ئەم هەلەم بە باش زانی بابەتی گفتوگۆی من و حکومەت بێتە سەر مێز.

حکومەت مەسەلەی دیداری من و وەفدەکەی بە هەند وەرنەگرتبوو، پێش دوو ڕۆژی دیدارەکە ژەنراڵ مونرو بە هاوڕێیەتی بەرگدوورێک هاتە لام و وتی:

– ئەی ماندێلا ئێمە دەخوازین دیدارت لەگەڵ وەفدەکە بە شکۆ بێ و حەز ناکەین بە جلوبەرگی زیندان پێشوازییان بکەیت، ئەم بەرگدوورە قاتێک جلی تازەت بۆ دروست دەکات، کە شیاوی تۆ بێت.

دیاربوو بەرگدوورەکە کارامەو زیرەک بوو، ڕۆژی دوایی گەڕایەوەو قاتێکی نازداری یەک بە بەرمی بۆ هێنام، قاتەکەو قەمیسێک و ملپێچێک و پێڵاوو گۆریە و جلی ناوەوەم لەبەرکرد، بەڕێوەبەری زیندان بە ئاکاری تازەم سەرسام بووو بە پێکەنینەوە وتی:

– ماندێلا ئێستا گیراو نیت، بە سەرۆک وەزیران دەچیت.

لەگەڵ لیژنەی کەسایەتی وەفدەکە، دوو چاودێری گرنگ ئامادەبوون، ئەوانیش کوبی کوتس و فەریق دەبلیو ئاتش ویلیامزی مەفەوەزی زیندان بوون، کاری دوو چاودێرەکە، وەک کاری بەرگدوورەکە وابوو، ئەوانیش هاتبوون پانی و درێژیم بپێون، ئەگەرچی لە پاش دەست پێکردنی دیدارەکە بە ماوەیەکی کورت ئەوان ڕۆیشتن، زۆر داوام کرد بمێننەوەو وتم، من هیچم نییە شاراوە بێ بەڵام هەر ڕۆیشتن، بەڵام پێش دەرچوونیان وتم، کاتی ئەوەش هاتووە حیزب و حکومەت لە سەریەک مێزی دانوستان دانیشن، بەسە کوشتاری.

لیژنەکە چەند پێشنیاری سەبارەت بە توندوتیژی و گفتوگۆ و گەمارۆیە نێونەتەوەییەکان ڕاگەیاند. من لە سەرەتای دیدارەکە وتم:

– من بەرپرسی حیزب نیم، بەرپرسی بزاڤەکە ئۆلیڤەر تامبۆیەو لە لۆساکا دەژی و دەتوانن بچنە لای و بۆچوونی تایبەتی منیشی پێ ڕابگەیێنن و ئەوەش بزانن، ئەوە تەنیا بۆچوونی منەو هەڤاڵانی ترم لە زیندانا وەک من بیر ناکەنەوە، دوایی من ئەوەش دەڵێم، من لەگەڵ ئەوەم حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لەگەڵ حکومەت بکەوێتە دانوستان.



هەندێ ئەندامانی لیژنەکە لە هەڵوێستی سیاسیم و سروشتی خوارووی ئەفریقیا وەک دەوڵەت و لەژێر سەرکردایەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، منیش وتم، من کابرایەکی نەتەوەپەرستم و شیوعی نیم و خەڵکی نەتەوەپەرستیش جۆرەها بۆچوونیان هەیەو لە جۆرەها قوتابخانەن. من گرێدارم بە کۆمەڵگەیەکی بێ نەژادپەرستی، هەروەها وتم، من بڕوام بە جاڕنامەی ئازادی هەیە ئەگەر سەرەتاکانی دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ دابین بکات و ئەوەش بەرنامەی سۆسیالیستی نییە، من دڵنیام کەوا کەمینەی سپی لە خوارووی ئەفریقیای نوێ بە ئارامی دەژین، هەموو کێشەو تەنگژەکانمان هۆیەکەی دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی دیدار لەنێوان حکومەت و حیزبمان نییە، و زۆربەیان چارەسەر دەکرێت ئەگەر ئەم دانوستانە هەبێت

ئەندامانی لیژنەکە زۆر پرسیاریان لەسەر توندوتیژی کرد، ئەوکاتە من ئامادە نەبووم دژی توندوتیژی هیچ بڵێم، بەڵام بە وشەی زۆر کاریگەرانە دەرمبڕی کەوا دوا چارەسەری بۆ بنبڕکردنی ئەم دیاردەیە لە یەکتر گەیشتنە بە هۆی دانوستان و سروشتی مرۆڤیش وایە. دووبارە بۆچوونی تایبەتی خۆم، نەک بۆچوونی حیزبم ڕاگەیاند، کەوا ئەگەر حکومەت هێزەکانی پۆلیس وسوپای لە چواردەوری شارەکان دووربخاتەوە، ڕەنگە حیزب ڕازی بێ خەباتی چەکداری ڕاگرێت و بوار بۆ دانوستان خۆشی بێ.

لیژنەکە بڕیاریدا لە لۆساکا دیداری ئۆلیڤێر بکات و لە بریتۆریاش بەرپرسەکان ببینێت، لە قسەکانیدا دەمویست بە حکومەت ڕابگەێنم کەوا ڕەوشی ئێمە لەبارە بۆ دانوستان و هەروەها ئۆلیڤێریش بزانێ هەڵوێستی من و ئەو یەکە.

بڕیاریش درا دوا دیدارم لەگەڵ لیژنەکە لە مایۆ بێت، من گەشبین بووم، بە چوونی لیژنەکە بۆ لۆساکاو بریتۆریا، دەکرێ تۆوی دانوستان لە خاکێکی بەپیت بچێندرێت. بەڵام حکومەت ڕۆژێک بەر لە دیدارم بە لیژنەکە، کارێکی وای کرد دەیویست هەموو هیواکان لەبارببات، ئەویش هێزەکانی بەرگری خوارووی ئەفریقی و هێزە تایبەتیەکان بە فەرمانی سەرۆک بوتا هێرشیان کردە سەر مەڵبەندی حیزبمان لە بۆتسواناو زامبیاو زمبابۆی. ئەو هێرشانە ڕەوشەکەیان ژەهراوی کردو لیژنەی کەسایەتیەکان بە دەست بەتاڵی خوارووی ئەفریقیایان جێهێشت. وا جارێکی تر کۆششەکانم بۆ ڕەخساندنی کەشی دانوستان لە نێوان هەردوولا لەناکاو بەفیڕۆچوون.

ئۆلیڤێر تامبۆ و سەرکردایەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی داوایان لە میللەت کرد لە وڵات ئاژاوە بنێنەوە، میللەتیش ئامادەبوون بڕیارەکە جێبەجێ بکەن، وڵات بەر لێشاوی ڕق و

ناڕەزایی کەوت، سەرجەم شارو گوندە ڕەشنشینەکان هەڵچوون، لە تەک ئەمەشدا پاڵەپەستۆی جیهانیش لەسەر حکومەت زیادی کرد، ناچار حکومەت لە ڕۆژی ١٢ی یۆنیۆی ١٩٨٦ باری نائاسایی بۆ بەرقەرارکردنی ڕەوشەکە ڕاگەیاند. هەموو دیاردەکان ئەوەیان دەگەیاند کەوا ڕەوشەکە بۆ دانوستان لەبار نییە. بەڵام وەک هەموو جارێک وایە کە قەیرانەکان گەورە و ترسناک دەبن، ئاسۆی دەربازبوونیش سەرهەڵدەدات و ساتەکانی بێ هیوایی و نا ئومێدیش باشترین بوارە بۆ هەنگاوی ئازایانە، لەو ساتانەی هەموو لایەک چاویان بڕیبووە ئاسۆیەک بۆ هیواو دەربازبوون، لەو مانگەدا نامەیەکی کورتم بۆ بەڕێوەبەرایەتی زیندان ژەنراڵ ویلیەمز نووسی و تێدا وتبووم: ئارەزوومە سەبارەت بە بابەتێکی وڵات قسەت لەگەڵ بکەم. نامەکەم ڕۆژی چوارشەممە دایە عەمید مانرو.

لە کۆتایی هەفتە پێیان ڕاگەیاندم، کەوا ئامادەی دیداری ژەنراڵێک بە لە بریتۆریا بۆ دیدارت دێت. دیدارەکە پێویستییە ڕۆتینەکانی نەویست و کۆبوونەوەکەش لە بەشی سەردان نەبوو، من چوومە خانوویێکی تەنیشتی زیندانەکە، ژەنراڵەکە لەوێ نیشتەجێ بوو.

ویلیەمز بە توندی بەناوبانگ بوو. یەکسەر چووینە ناو کاکڵی بابەتەکە. پێم وت، من دەمەوێ دیداری کوبی کوتسی وەزیری داد بکەم، کە پرسی بۆ وەڵامەکەی دوودڵ بووم، چونکە نەمدەویست گفتوگۆ لەگەڵ بەرپرسانی زیندان لەسەر سیاسەت بکەم، بەڵام بە ڕوونی پێم وت:

– دەمەوێ وەزیر ببینم بۆ گفتوگۆ لەسەر مەسەلەی دانوستانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و حکومەت. وەڵامی دایەوەو وتی:

– ماندێلا، تۆ دەزانی من سیاسەتمەدار نیم، من ناتوانم قسە لەو مەسەلانە بکەم، ئەو مەسەلەیە لە دەرەوەی دەسەڵاتی منە، بێدەنگ بوو، دوایی وەک ئەوەی بیرۆکەیەکی تازەی بۆ هاتبێ وتی:

– خۆشبەختانە، وەزیر وا بەڕێکەوت لە کیپ تاونە، ڕەنگە بواری هەبێ دیدارت بکات، بۆ ئەمە ئیش دەکەم.

ژەنراڵ تەلەفۆنی بۆ وەزیر کرد و هەندێ قسەیان کردو و سەماعەکەی داناو ڕووی لە من کرد و وتی:

– وەزیر ئامادەی دیدارتە، هەر کاتێ تۆ دەتەوێت.

پاش چەند دەقیقەیەک خۆم لەناو ئۆتۆمۆبێلی ژەنراڵ دیتەوەو بەرەو ماڵی وەزیر دەڕۆیشتین و



کەم ڕەچاوی دابین کردنی ئاسایشی ڕێگاکە کرابوو، هەر یەک ئۆتۆمۆبێلی ئاسایشمان بەدواوەبوو، ئەوەم بە بیرداهات، کەوا بۆ ئەم دیدارە پێشتر پلانی بۆ دانراوە چونکە شتەکان هەمووی خێرا جێبەجێ کران، ئەوانە زۆر گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە هەنگاوی یەکەم لە ڕێگای دانوستان بواری هەبێ.

کوتسی لە ماڵی خۆی لە شاری بەگەرمی پێشوازی کردم و لەسەر کورسی چاک دانیشتین. من بە جلی زیندان بووم، بۆیە داوای لێبوردنی لێکردم کەوا بواری نەدام جلەکانم بگۆڕم، سێ سەعات لەگەڵی دانیشتم، بە ژیری و گوێڕایەڵی و هۆشمەندی سەرسام بووم، پرسیاری زیرەکانەو هەستیارانەی لێکردم، دیاربوو لە ناکۆکییەکانی حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی شارەزاو بە ئاگابوو. لە ناوەڕۆکی بەبابەتەکە دوور نەدەکەوتەوە. ئەو ڕەوشانەی چین کە خەباتی چەکداری ڕادەگرێت؟ ئایا بە ناوی هەموو حیزب قسە بکەم یان نا؟ پێشبینی ئەوە هەیە دەستوور مافی کەمینەکان لە خوارووی ئەفریقیادا دابین بکات؟

بە هەمان ئەو ڕۆحەی کە وەڵامی لیژنەی کۆمۆنوێلسم پێداوە، وام وەڵام دایەوە، هەستم کرد ئەو دەیەوێ ناکۆکییەکە یەکلابکاتەوە. بۆیە پرسی:

– بە بۆچوونی تۆ هەنگاوی یەکەم چییە ..؟

وتم حەز دەکەم سەرۆکی دەوڵەت و وەزیری دەرەوە بیک بوتا ببینم، ئەویانی لە دەفتەرە بچووکەکەی تەنیشتی نووسی و وتی، من داواکەت بە کەناڵە ڕەسمییەکان دەگەیێنم، دەستی یەکترمان گوشی و گەڕامەوە هەوارەکەم لە نهۆمی سەرزەوی زیندانی بوولسمور. هەستم بە گەشبینییەکی بەهێز کرد، هەستم کرد کەوا حکومەت دەخوازێ تەنگژەکانی وڵات چارەسەر بکات و دەزانی دەبێ لە هەڵوێستی کۆن دابەزێت، لەئاسۆکەدا چارەسەری گونجاوم لەلای هەردوولا دەبینی.

بە کەسم نە وت و دەمویست باسی دیدارەکە و شتەکان ڕێگای سروشتی خۆی بگرێت تا لە کەسانی ترەوە ئاشکرا دەبێت، هەندێ جار پێویستە مرۆڤ هەڤاڵەکانی بخاتە ئەمری واقیع، دڵنیابووم هەڤاڵانی زیندان و ئەوانەی لە لۆساکا کە دەگەنە پنچ و ڕاستییەکانی و چاک لە بابەتەکە ورد دەبنەوە پشتیوانیم دەکەن، بەڵام، وەک جاران، بابەتەکە بێدەنگ مایەوەو وەک سەرەتاکەی نەبوو، چەندین هەفتەو مانگی بەسەرداچوو یەک وشەم لە کوتسیی گوێ لێ نەبوو، بێزاربووم و نامەیەکی ترم نووسی.

* * *

هیچ وەڵامم لە کوبی کوتسی بەدەست نەگەیشت، بەڵام هەستم کرد کەوا حکومەت دەیەوێ هەندێ گۆڕانکاری لە ئاکاری کەسایەتیم بکات، رۆژی پێش جەژنی لەدایکبوونی مەسیح موقەدەم گاویی مارکس لێم هاتە ژوورێ و بە روونی وتی:

ئارەزووی گەشتێکت هەیە لە چواردەورەی شاردا؟

بە راستی تێ نەگەیشتم مەبەستی چییە، هەستم کرد ئەگەر رازی بم هیچ زیان ناگەیێنێ، بۆیە بیرۆکەکەم لا باش بوو، داوای کرد بە دوای کەوم، لە هەر پازدە دەرگا ئاسنینەکەی نێوان زیندانەکەم و دەروازەی سەرەکی لە تەنیشتی رۆیشتم، لە دەرەوە بینیم ئۆتۆمۆبێلەکەی چاوەڕێمان دەکات.

بەرەو شاری کیپ تاون رۆیشت و ئۆتۆمۆبێلەکە ئێمەی بردە شەقامێکی جوانی تەنیشت کەنار، لە شەقامەکان سووڕاینەوە، وەک ئەوەی گەشتێکی گەشتوگوزار بکەین، دەڕۆیشتن، بێ ئەوەی شوێنێکی دیاریکراومان هەبێ بۆی بچین، تەماشای ئەو خەڵکەم دەکرد کەوا بۆ کاروباری پێویستی خۆیان دەهاتن و دەچوون، پیرەژن و پیرەمێردم بینی خۆیان دابووە بەرخۆر، ئەو ژنانەی بازاڕیان دەکردو ئەوانەی سەگیان پێبوو، ئەو دیمەنانە ئاساییێن، بەڵام لە کەسی گیراو گومن، وەک ئەوەی بێگانەیەکم و بۆ دیتن و سەردان هاتبم وابووم. پاش سەعاتێک مارکس لە پێش دوکانێکی بچووک و لە شەقامێکی هێمندا راوەستاو وتی:

– حەزدەکەیت شتێکی سارد بخۆیتەوە..؟

بە بەڵێ سەرم بۆی هەژاندو ئەویش دابەزی و منیش تەنیا لە ئۆتۆمۆبێلەکە مامەوە، ساتێک بێ ئاگابووم، لەناکاو هەستم بە شڵەژان کرد، ئەوە یەکەم جارە پاش بیست ساڵ من لە دەرەوەی زیندانم و پاسەوانم لەسەر نییە. بیری ئەوەم بۆ هات لە ئۆتۆمۆبێلەکە دابەزم و هێدی هێدی برۆم و هەتا لەبەر چاوان گوم دەبم، لەناوەوە وام هەست دەکرد، لە بەرامبەرمدا ناوچەیەکی چڕی بەدارم بینی و لەوێ دەشاردرێمەوە. زۆر شڵەژام و هەموو گیانم بووە ئاوو ئارەقەیەکی زۆرم کردو پرسیم، کوانی ئەفسەرەکە؟

خۆم راگرت و بیرم کردەوە ئیش وا لە هەستیاری دوورە، ئەمە کارێکی بەرەڵلاییە وپڕ مەترسییە. بیریشم لەوەکردەوە، کەوا رەنگە ئەمەیان هەموو پلان بێ و منی پێ تاقی بکەنەوەو بزانن ئەگەر بوارم بۆ برەخسێت رادەکەم، یان نا رەنگە واش نەبێ، شڵەژانەکەم بە هاتنەوەی



ئەفسەرەکە تەواوبوو، گەڕایەوە ئۆتۆمۆبێلەکەو دوو کۆکاکۆلای لەدەست بوو.

پاش ئەو گەشتە، چەندین جاری تر لەگەڵ ئەفسەرەکە دەرچووم و سەردانی چەند شوێنی جوانی کیپ تاون و ناوچەیەکی ترمان کرد، چەند جار چووینە ناوچەی «باخچەکان»، ناوچەیەکی جوانی نزیک بەندیخانەکەیەو چەندین رەزو باخچەی میوەو سەوزەی لێیەو چێشتخانەی زیندانەکەمان سوودی لێ وەردەگرێت، تامی زۆرم لە جوانی سروشت و دیمەنەکانی ئاسۆ و گەرمی خۆر وەرگرت کە لە شانمی دەدا.

رۆژێکیان لە باخچەکان پیاسەمان دەکرد، رۆیشتینە ناو تەویلەیەک دوو پیاوی سپی بە جلی کرێکاری لێبوو، لێیان چوومە پێش و سەیری ئەسپەکەم کردو لە پیاوەکەم پرسی، ئەم ئەسپە ناوی چییە، شڵەژاو چرپاندیە گوێی ئەفسەرەکە، پرسیارەکەم لە پیاوی دووەمیش کرد دیاربوو ئەویش هەر هەندی ئەوی تر قسەی کرد، کە گەڕاینەوە زیندان رەوشی نامۆی هەردوو پیاوەکەم لە ئەفسەرەکە پرسی و ئەویش پێ کەنی و وتی:

– دەزانی **ماندێلا**، ئەوانە هەردووکیان گیراوی سپین و هەرگیز بە ئامادەبوونی ئەفسەرێ قسەیان لەگەڵ گیراوێکی رەش نەکردووە.

لە شار دوورکەوتینەوە، لە لێواری کەناردا دانیشتین و قاوەو چامان لە چەندین قاوەخانە خواردەوە، کەس منی نەدەناسی و دوا وێنەم بڵاوکرابێتەوە هی ساڵی ١٩٦٢ بوو.

لەو گەڕانانەدا زۆر شت فێربووم. منی لەوەتی دوورم ژیان، چەند گۆڕاوە، سەردانی هەندێ شوێنی سپییەکانمان کرد، بینیم کەوا سپییەکان چەند دەوڵەمەندن و چۆن بەخۆشی و تێری دەژین، ئەوان وا دەژین و رەشەکانیش لەناو هەڵچوونی جەماوەری و مەترسی رووداوانی شەڕی ناوخۆیی و شڵەژان رۆژەکانیان بەسەردەبەن و ژیانی سپییەکانیش ئارام و بێ وەی و دوورە لە گۆڕان و ئاژاوە، جارێکیان پاسەوانێک منی بردە ماڵەکەی و ژن ومناڵەکانیم بینی و ئێستاش پەیوەندیمان هەرماوە و کارتی جەژنانەی سەری ساڵی هەر بۆ دەنێرم.

گەرچی تامی زۆرم لەو گەڕان و گەشتانە وەردەگرت و ئەوەم چاک دەزانی کەوا حکومەت لە سەرقاڵ کردنم مەبەستێکی هەیە، لەلایەک حکومەت دەیەوێ دووبارە بە ژیانی ئاسایی خوارووی ئەفریقیای ئیمڕۆم ئاشنا بکاتەوەو بوارێکم بۆ برەخسێنێ، لەلایەکی تریش، تۆزێک ئازادیم بداتێ تا بۆ ئازادی تەواو زۆرتر لە داواکانم دابەزم و ملکەچی زۆر داوایان بم.

* * *

لە ساڵی ١٩٨٧ دووبارە لە ماڵی کوبی کوتسی دیداری تایبەتیمان دروستبۆوە، لە کۆتاییەکانی ئەم ساڵە حکومەت یەکەم پێشنیاری سنوورداری پێشکەش کردم، کوتسی وتی، حکومەت بە تەمایە لیژنەیەک لە گەورە بەرپرسان دابنێ، تا دانوستانی تایبەتیت لەگەڵ سازبکەن، سەرۆکی دەوڵەتیش لە هەموو شتێ ئاگادارە، کوتسی خۆی بەرپرسی لیژنەکەیەو مفەوەزی زیندان ژەنراڵ ویلیەمز ئەندامە لەو لیژنەیە و هەروەها بەڕێوەبەری گشتی بەرژەوەندی زیندانەکان فانی فان دیر میرو و دکتۆر نیل بێرناردی ئەکادیمی پێشوو و بەڕێوەبەری دەزگای ئیستخباراتیشی تێدایە، سێ ئەندامی لیژنەکە لە دەزگای بەرژەوەندی زیندانەکان بوو، ئەوەش بۆ ئەوە حکومەت وای سازکردبوو تا ئەگەر دانیشتنەکان و دیدارەکەیان سەرنەکەوت، یان هەواڵەکەی بڵاوبۆوە، بڵێ، دیدارەکان کراوەو تایبەت بوونە بە چەند کێشە و بابەتی تایبەتی ناوەخۆی زیندان و بەس.

بەڵام بوونی دکتۆر بێرنارد لە لیژنەکە مەسەلەکەی لای من گرنگ کرد، چونکە ئەو سەرۆکی دەزگایەکە هەندی ئاژانسی ئیستیخباراتی مەرکەزی ئەمریکی دەبێت و لە ئیستیخباراتی سەربازیش دەوری هەیە، بۆ من زۆر زەحمەت بوو بتوانم هەڤاڵەکانم رازی بکەم کەوا ئەو ئەندامی لیژنەکەیە، بوونی ئەو کەشی دانوستانەکان ئاڵۆز دەکات و خشتەی کاری درێژو پان دێنێتە ئاراوە، داوام لە کوتسی کرد بۆ ئەمە یەک شەو مۆڵەتم بدات بۆ بیرکردنەوە.

ئەمشەو هەموو ئەگەرو پێشهاتەکانم شیتەڵ کرد، دەمزانی بی. دەبلیو. بوتا دەزگایەکی نهێنی بەناوی جڤاتی ئاسایشی وڵات پێکهێناوەو لە جڤاتەکەدا چەندین زاناو پسپۆڕی ئاسایش و بەرپرسی ئیستیخباراتی تێدایە، رۆژنامەکانیش ئاماژەیان بەم دەزگایەداو نووسییان کەوا ئەم دەزگایە دەسەڵاتی حکومەت سنووردار دەکات و پاڵپشتی زۆرتری دەسەڵاتی سەرۆک دەکات، دکتۆر بێرنارد دەورێکی دیاری لەم جڤاتە هەبوو و دەوترا کەوا لە داروودەستەی نزیکەکانی سەرۆک بوتایە، بۆیە دوورخستنەوەی بێرنارد لەم دانوستانە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سەرۆکی دەگەیاندو ئەوەش رەوشەکەی ترسناک دەکرد. ئەگەر سەرۆک بەشێک نەبێ لەم چێشتە، ئەوا یەک هەنگاو پێش ناکەوێ، بۆیە ئاگاداری کوتسیم کردەوە کەوا من پێشنیارەکەم پەسەندە.

سێ هەنگاوی گرنگم لە پێش بوو و دەبوایە لێیان دەربازبم، یەکەمیان؛ دەبوایە لەگەڵ هەڤاڵانی نهۆمی سێیەم گفتوگۆیێ بکەم، دووەمیان؛ پێویستە ئۆلیڤەر بە وردی لە شتەکان ئاگادار بکەمەوە.



سێیەمیش؛ بیرخەرەوەیەک ئامادە بکەم و تێدا بۆچوونی خۆم و حیزب لە کێشە جەوهەریەکان روون بکەمەوە. ئەمەشیان بۆ دوارۆژ دەبێتە بناغەی هەموو کۆبوونەوەکان.

کە داوای دیداری هەڤاڵەکانی نهۆمی سێیەمم، زۆرم لا سەیر بوو کە داواکەمیان قەبووڵ نەکرد. ئەو هەڵوێستەیان نیگەرانی کردم و ئەوەم لا گەڵاڵەبوو کەوا دیدارە نهێنیەکان بۆ دوارۆژی حکومەت سەبارەت بەدیدارەکان نیگەرانێکی زۆری دروستکردووە. گلەییم لە بەرپرسە پلە یەکەمەکان کرد، پاش کۆششی بەڕێوەبەرایەتی رازی بوو، بەڵام بە مەرجێک هەڤاڵەکانم یەکە یەکە ببینم و هەموویان بە یەکەوە نەبین.

لە بەشی مێوانداری هەڤاڵەکانم بینی و هەموو وردەکاریەکانم پێ رانەگەیاندن، نەمووت لیژنەی دانوستان دانراوەو نیازی دانوستانمان هەیە، هەر ئەوەندەم کرد گوێم لە بۆچوونەکانیان راگرت، یەکەم جار لەگەڵ ولتر قسەم کرد و پێم وت، کەوا نامەیەکم بۆ مفەوەزی زیندان نووسیوەو داوای دیداری کوتسیم کردووەو پێشنیاری دانوستانم لەگەڵ حکومەت تێدا ویستووە و حکومەتیش ئارەزوومەندە دانوستان بکات، داواشم لێکرد بۆچوونی خۆیم پێ رابگەیێنێ.

لەگەڵ ولتردا لە خەباتی شیرین و تاڵدا هاوشان بووین، پیاوێکی زیرەک و وریاو زانیارە، لەم دونیایەدا کەس وەک منی ناناسێت، بۆچوونی ئەوم لە بۆچوونی خۆم زۆر چاکتر و پیرۆز دەزانی، ولتر وتی، بیر لە مەسەلەکە دەکەمەوە، بەڵام نائارامیم لە ئاکاری بینی، یان بڵێم ساردیم بینی، ولتر وتی:

– من وەک هەڵوێست دژی دانوستان نیم، بەڵام وای دەبینم، ئەگەر حکومەت پێشنیاری کردبایە باشتربوو، نەک ئێمە داوای بکەین.

منیش وەڵامم دایەوە، کە دژی دانوستان نیت، زیانی چی هەیە کێ داوای بکات، گرنگ لە ئەنجامەکەیەتی، نەک شێوەکەی، من وای دەبینم، با دەست بە دانوستان بکەین و گرنگ نییە کامیان لە دەرگاکەمان داوە، لە وەڵامدا وتی، وا دیارە تۆ ناوت لێناوەو من لە رێگات راناوەستم و داواکارم وریا بیت و بزانە چۆن کار دەکەیت.

پاشان نۆرەی ریمۆند هات، بۆ ئەویش هەموو بابەتەکەم باس کرد، ریمۆند خۆی کەم دووە و کەمێ بیری کردەوە و چاوی لە چاوم بڕی و وتی: چی وای لێ کردی ئەم بابەتە تا ئیمڕۆ دوابخەیت و چاوەڕێی چیت دەکرد؟ دەبوایە چەند ساڵە هەنگاوی وات هاویشتبوایە.

سەبارەت بە ئەندرۆ ملانگینی، ئەویش بۆچوونی وەک ریمۆند وابوو، کە نۆرەی ئەحمەد کاثرادا

هات، ئەو لەگەڵ نەبوو و دژی بیرۆکەکەبوو، ئەویش وەک ولتر وای بۆ دەچوو، کە ئێمە پێشنیار دەکەین، وەک ئەوەیە بە یەکجاری تەسلیمیان بین، ئەویش دژی دانوستان نەبوو، بۆیە هەمان وەڵامی ولترم دایەوە.

ئەحمەد لەسەر بۆچوونەکەی خۆی سووربوو و هەستی دەکرد من ڕێگام گوم کردووە. سەرەڕای هەموو دوورکەوتنەکەوەکانی ڕێگای پێ نەگرتم.

زۆری نەخایاند بە دەستی پارێزەرێکم نامەیەکی ئۆلیڤێرم بەدەست گەیشت تێدا گلەیی و نیگەرانی خۆی ڕاگەیاندبوو سەبارەت بەو دیدارە نهێنیانەی لەگەڵ حکومەت سازم کردوون، ئەوەشم زانیوە کەوا ماویەکە تەنیا دەژیت و لە هەڤاڵەکانت دابڕاویت، دەکرێ لە سەلامەتی مێشکت پرسیارێ بکەین، نامەیەکی کورت و پوخت بوو. بابەتی باسکراوی نێوان تۆو حکومەت چییە؟

بڕوا ناکەم ئۆلیڤەر هەست بکات من کێشەکە دەدۆڕێنم، ئەو لەوە نیگەران بوو نەوەک من شتەکانم بەهەڵە لێکدابێتەوە، ناوەڕۆکی نامەکەی من وای تێگەیشتم.

بە کورتی وەڵامی ئۆلیڤێرم دایەوەو بۆم نووسی، من لەگەڵ حکومەت قسەم کردووە تا بوار بۆ دانوستانی لیژنەی تەنفیزی گشت حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و حکومەت ساز بکەم، وا دەزانم ئیمرۆ کاتی ئەم بابەتە هاتووەو من بە هیچ جۆرێ لە ڕێکخستن دوورەپەرێز نیم. لەبەر ئەوەی بڕوام بە هۆکاری پەیوەندیەکە نەبوو بۆیە زۆر نەچوومە ناو وردەکارییەکان.

کە نامەم بۆ ئۆلیڤێر دەنووسی، هاوکات بیرخەرەوەیەکم بۆ سەرۆک بوتا ئامادە دەکرد، زۆر بە پەرۆش بووم ئۆلیڤێریش ئاگاداربێ، بە دیتنی ئەو بیرخەرەوەیە، ئۆلیڤێرو لیژنەی تەنفیزی دڵنیادەبوون کەوا من ڕێگام وێڵ نەکردووە، لە مێژە حیزب داوای دانوستان لەگەڵ حکومەت دەکات، بەڵام بە ڕاستی ڕووبەڕووی ئەم شتە نەبووینەوە، قسەکردن وەک بیردۆز شتێکەو چوونەناو وردەکارییەکەی لە ڕووی پراکتیکەوە شتێکی ترە.

***

یەکەم کۆبوونەوەی ڕەسمی دەستەی کاری نهێنی لە مایۆی ١٩٨٨ لە یانەیەکی گەورەی ئەفسەران لە نزیک زیندانی بولسمور سازکرا. زووتر کوتسیی و ویلیەمزم دیبوو، بەڵام دیدارم لەگەڵ فان دیرمیرو و دکتۆر بێرنارد نەبوو. ڤان دیرمیرو پیاوێکی هێمن و کەم دوو بوو، تەنیا لە



کاتی پێویستدا دەهاتە قسە، دکتۆر بێرنارد تەمەنی لە سەرووی سی ساڵ بوو، پیاوێکی زیرەک و زۆرزان و خۆگربوو.

دیداری یەکەم بە شپرزەیی و نیگەرانی بەڕێوەچوو، بەڵام دانیشتنەکانی تر بە ئازادی و ڕاشکاوی بەڕێوەچوون، بۆ چەند مانگێک هەفتانە دیدارمان هەبوو، پاشان دیدارەکان لە ڕووی کاتەوە بە بەرنامە نەبوو. حکومەت خشتەی کاتی دادەنا، بەڵام زۆرجار لەسەر داوای من دەبوو.

هەر لە دانیشتنەکانی یەکەمەوە تێگەیشتم بێجگە لە دکتۆر بێرنارد هیچیان زۆریان لەسەر حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی نەدەزانی، هەموویان لە ئەفریکییە ڕۆشنبیرەکان بوون و لە کەسانی تری هاونیشتمانیەکانیان کراوەتر بوون، بەڵام بونەتە قوربانی پڕۆپاگەندە ڕەسمییەکان، دەبوایە من شتەکان لە شوێنی ئاسایی خۆیان ڕێز بکەم، هەتا دکتۆر بێرناردیش زۆر لە زانیارییەکانی سەبارەت بە حیزب لە ڕاپۆرتەکانی پۆلیس و موخابەرات و فایلەکانیان وەرگرتبوو ئەوانەش زۆربەی وردنین و ئەوانەی ئامادەیان کردوون بە لایەنگیریکردن و نەژادپەرستی چڵکنیان کردوون، بۆیە ئەویش شوێنەواری نەژادپەرستی پێوەبوو.

بۆ ڕوونکردنەوەی مێژووی حیزب و تێڕوانین و جیاوازییەکانی مەسەلە سەرەکییەکانی ناکۆکی نێوان حیزب و حکومەت بۆ من کاتی ویست، پاشان ڕوومان لە کێشە ناسکەکان کرد وەک، خەباتی چەکداری و هاوپەیمانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی لەگەڵ حیزبی شیوعی و دەسەڵاتی زۆرینەو ڕامانی ئاشتبوونەوەی نەژادو ڕەگەزەکان.

خەباتی چەکداری لەبەر زۆر بۆچوون یەکەمین و گرنگترین مەسەلەی باس و لێدوان بوو، ئەمەش گفتوگۆی چەند مانگی ویست لایەنی حکومەت سووربوو لەسەر ئەوەی حزب نەفرەت لە توندوتیژی بکات و واز لە خەباتی چەکداری بێنێ، ئینجا دانوستان دەست پێ بکات. پێش ئەوەی سەرۆک بوتا ببینم، ڕایان وابوو کەوا توندوتیژی ڕەوشتێکی تاوانبارییەو حکومەت بەهیچ شێوەیەک قبوڵی ناکات.

منیش وەڵامم دایەوە، کەوا حکومەت لە مەسەلەی توندوتیژی بەرپرسی یەکەمە و ئەوان لایەنی زۆردارن و بە هیچ شێوەیەک زۆرلێکراون نین، هەر ئەویشە شێوەو هۆکاری پردەکاتەوە. چونکە ئەگەر زۆردار توندی نواند، ئەوا زۆرلێکراو بە ناچاری بەرگری لە خۆی دەکات، هەروەها بە ناچاری هەمان ڕەفتاردەکات و ئاشتی بۆ چارەسەرکردن پەیڕەو دەکات. پێم وتن: ئێوە لە بوونی توندوتیژی بەرپرسن، نەک ئێمە.

بڕوا دەکەم، هەندێ خاڵی شاراوەو تاریکم بۆ ڕوونکردنەوە، ئەوەش وای کرد دانوستانە فەلسەفییەکە بە دانوستانی پراکتیکی گۆڕا. کوتسیی وەزیرو دکتۆر بێرنارد، حیزبی نیشتمانی دەسەلاتدار، هەر وتویەتی کەوا دانوستان لەگەڵ حیزبێ ناکات توندوتیژی پەیڕەو بکات. وا ئێمڕۆش و لەناکاو دانوستانیان دەست پێکرد بە بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی بڕواکردنیان دەستگیر کردبێ، تا حیزبی نیشتمانی دانوستان لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی دەست پێبکات، ئەوە پێویستی بە چەندین دابەزین هەیە تا حکومەت ئابڕووی لە بەرامبەر هەڤالانی نەچێت.

من جوان لەو خاڵە تێگەیشتم، بەڵام نەمدەتوانی دەروازە بۆ ڕزگاربوونیان بدۆزمەوە، پێم وتن، لە هەموو شتێ باشتر ئەوەیە بە میللەتتان بڵێین لە خوارووی ئەفریقیادا ئاشتی بەرقەرار نابێ هەتا ڕووبەڕوو لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی دادەنیشن و دوایی لەبەرگەمدا نەماو وتم:

– بەڕێزان، ئەرکی من کێشەتان چارەسەر بکەم، بەڵام دڵنیام دۆستەکانتان لە ڕەوشەکە دەگەن.

خاڵی دووەم کە سەخڵەتی کردبوون، هەڤاڵبەندی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و حیزبی شیوعی بوو، حیزبی نیشتمانی دەستەلاتدار هەڵوێستێکی توندی بەرامبەر یەکێتی سۆڤیەت هەر لە سەرەتای شەڕی سارد لە پەنجاکاندا وەرگرتبوو و یەکێتی سۆڤیەتی بە ئیمپراتۆریەتی بەدکاری دەناسی. ئەوەش ئاسان نەبوو ئەم هەڵوێستە بگۆڕن، ئەوان دەیانووت، حیزبی شیوعی دەسەلاتی تەواوی لەناو حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی هەیەو دەبێ لەیەکتری بترازێنین.

وەڵامم دانەوە وتم:

بڕوا ناکەم هیچ تێکۆشەرێکی بەڕێز ئەوە قەبووڵ بکات حکومەتێکی نەیار فەرمانی لەسەر پچەسپێنێ و ناچاری بکات واز لە هەڤاڵێکی دێرین بێنێ، هەروەها پێم وتن، هەردوو حیزب، لەبەرنامەو کاریان سەربەخۆ و جیاوازن، بەڵام لە خەبات بۆ نەهێشتنی ڕژێمی نەژادپەرستی و بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی بێ جیاوازی نەژادی لە خوارووی ئەفریقیادا هاوبەشن، ڕاستە هەردوولامان لەمێژە هاوڕێبازو هاوبەرژەوەندین، بەڵام یەک حیزب نین.

چەند مانگێک لەسەر ئەمە گفتوگۆمان کرد، بۆم دەرکەوت ئەوانیش وەک زۆرینەی ئەفریکیەکان وا هەست دەکەن، کەوا زۆربەی شیوعیەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی سپین، یان هیندین و ئەوانیش دەتوانن کار لە ڕەشەکان بکەن، چەند جار بۆم دووپاتکردنەوە، کەوا زۆرجار لە زۆر بۆچوون جیاوازیمان هەبووەو لە دواییدا سیاسەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی سەرکەوتووە، بەڵام، هەر سووربوون لەسەر قسەی خۆیان و بۆیە لە ساتێکی تووڕەییدا وتم:



– بەڕێزەکان، ئێوە خۆتان بە زیرەکیش دەزانن، وایە؟ خۆتان بە خاوەن بەڵگەو وزەی ڕازیکردن دەزانن، وایە؟ باشە، ئێوە چوارکەسن و من یەک کەسم و ناتوانن پێم بسەلمێنن. چۆن بڕوا دەکەن ئەوەی ئێوە بەرامبەر ئێمە پێتان نەکرا، بە شیوعیەکان کراوە؟

کێشەی خۆماڵیکردن، زۆر باسکرا، ئەوان دەیانووت، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و بەرەی ئازادی، خۆماڵی گشتی لە خوارووی ئەفریقیادا دەکەن. بۆم ڕوونکردنەوە کەوا ئێمە پەیڕەوی دابەشکردنی یەکسانین لە داهاتی هەندێ لە پیشەسازییەکان، ئەوانەی تا ئیمڕۆش دەستیان بەسەرداگیراوە، یان ئەوانەی کەمێکیان خوماڵی کراون، نموونەی ئەو وتارەم بۆ هێنانەوە کە لە ساڵی ١٩٥٦دا لە گۆڤاری لیبیراشن تێدا نووسیبووم، کەوا بەرەی ئازادیی، بەرنامەیەکی ڕژێمی سیۆسیالیست نییە، بەڵکو بناغەیەکی سەرمایەدارییە لە شێوەیەکی ئەفریقیدا و وتم، ئێستاش هەر ئەو بۆچوونەم هەیەو نەگۆڕاوم.

گفتوگۆکەمان گەیشتە دەسەلاتی زۆرینە، ئەوان وتیان، مافی کەمینەکان لە دەسەلاتی زۆرینەدا دەکەوێتە مەترسی، پرسیاریان لە هۆکارەکانی پاراستنی مافی کەمینەی سپیەکان لەچوارچێوەی بەرنامەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کرد، منیش وتم، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی حیزبێکی هاوچەرخی تازەیە لە مێژووی خوارووی ئەفریقیاداو کۆشش دەکات بۆ یەکێتی هەموو کۆمەلانی خەڵک بە جیاوازی نەژادو تیرەکانیەوە و نموونەش بە پێشەکی بەرەی ئازادی هێنایەوە کە دەڵێت:

خوارووی ئەفریقیا، وڵاتی هاووڵاتیانی سپی و ڕەشە. هەروەها وتم:

سپیەکانیش ئەفریقین و هەرگیز زۆرینە لە هیچ ڕژێمێکی دەسەلاتدا دەستبەرداری کەمینە نابێت.

دوایی وتم:

– ئێمە نامانەوێت لە دەریاتان بکەین.

***

دانیشتنەکان سوودیان هەبوو، لە زستانی ١٩٨٨دا، ئاگادارکرامەوە کەوا سەرۆک بوتا لە کۆتایی ئۆگستۆسدا دەمبینێت، حکومەت باری نائاسایی لەسەر وڵات لە ساڵی ١٩٨٨ وەک ساڵی ١٩٨٧ دانا، پاڵەپەستۆی نێونەتەوەیی هەر بەرەو زیادبوون دەچوو. چەندین کۆمپانیای جیهانی

پرۆژەکانیان کێشایەوە. کۆنگرێسی ئەمریکی بڕیاری ئابڵوقەی گشتی دژ بە خوارووی ئەفریقی راگەیاند.

لە ساڵی ١٩٨٧دا، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ئاهەنگی یادی حەفتاوپێنجەمینی دامەزراندنی کردو بە ئامادەبوونی وەفدی زۆرتر لە پەنجا وڵات، لە تانزانیا کۆنگرەی بەستا، لەوێ رایگەیاند کەوا حیزب خەباتی چەکداری گەرمتر دەکات، تا حکومەت دانوستانمان لەگەڵ دەکات، تا وڵات لە رژێمی نەژادپەرستی رزگاری بێت. یەکەم جارە حیزب لیژنەی تەنفیزی گشتی لە جۆرەها نەژادو تیرە هەڵبژێرێت، لە یادی سی ساڵەی دامەزراندنی بەرەی ئازادی حیزب لە کابوی زامبیا پێش دوو ساڵ کۆنگرەی سازکردبوو، لەوێ رایگەیاندبوو کەوا دانوستان لەگەڵ حکومەت ناکەین هەتا حکومەت سەرجەم گیراوە سیاسیەکان ئازاد نەکات.

گەرچی کاری توندوتیژی و شەڕ گەرمتربوو، حیزبی نیشتمانی دەسەڵاتدار هەر بەهێزبوو ولە هەڵبژاردنی گشتیی مایۆی ١٩٨٧ لە ناو سپیەکاندا زۆرینەی دەنگی هێنابوو. لەوەش خراپتر حیزبی پارێزگاران شوێن حیزبی یەکێتی پێشکەوتنخوازی رزگاری وەک حیزبی ئۆپۆزسیۆنی رەسمی گرتەوە. حیزبی پارێزگاران دەستەراستی حیزبی نیشتمانی بوو و حکومەتی بەوە تاوانبار دەکرد کەوا خەمسارده بۆ لێدانی ئۆپۆزسیۆنی رەشەکان.

هەرچەندی بڕوام بە دانوستانە نهێنیەکان هەبوو، بەڵام قوناغەکەم بە زحمەت دەبینی. وینی هاتە سەردانم و پێیڕاگەیاندم، کەوا زۆرنابێ خانووی ژمارە ٨١١٥ ئۆرلاندو ویستمان، ئەو خانووەی ژنم تێیدا گواستەوەو بەخانووی تایبەتی خۆم دەزانی، بە ئەنقەست و لە کارێکی تێکدەرانەدا سوتێنرا. لەوێ چەندین لاپەڕەو گەنجینەی بە نرخ و وێنەی خێزانیمانی تێدا فەوتا، هەموویان پیرۆزبوون و دووبارە پەیدا نابنەوە، وینی پارچە کێکێکی رۆژی گواستنەوەی هەڵگرتبوو تا لە رۆژی بەردانمدا پێشکەشم بکاتەوە، ئەویش فەوتا، هەموو جارێ دەمووت، ئەگەر بەربووم، ئەوا بە خەیاڵی وێنە و نامەکان دەژیمەوە. بەڵام هەموویان لەناوچوون. راستە زیندان ئازادی کۆت کردبووم، بەڵام بیرەوەرییەکانمی پێ کۆت نەکرابوو، بەڵام وا ئیمرۆ، دوژمنانی خەبات و تێکۆشان ویستیان لە بیرەوەرییەکانیشم بکەن.

زۆرم سەرمابوو، بۆیە نەمدەتوانی راهێنانە وەرزشییەکان بکەم، چەند جار لەلای بەڕێوەبەرایەتی گلەییم لە شێداری زیندانەکەم کردبوو و کەسیش وەڵامی نەدابوومەوە، رۆژێکیان کە ئیسماعیلی پارێزەرم هاتبووە لام، نەخۆش کەوتم و دکتۆر بینمی و هەر زوو چاک بوومەوە، پاش



چەندێ دکتۆرێک و پاسەوانەکان لێم هاتنە ژوورێ و دکتۆرەکە تەماشای کردم پاسەوانێکیان وتی، دەتبەنە نەخۆشخانە، لەگەڵ کاروانێک سەیارەی سەربازی و ئاسایش و دوازدە پاسەوان سواریان کردم بۆ نەخۆشخانە.

منیان بردە نەخۆشخانەی تایگربیرگ لە گەرەکی زانکۆی ستیللینبوش کە دەکەوێتە ناوچەیەکی خۆش و سەوزی کیپ تاون، دوایی زانیم کەوا حکومەت نیازی بوو بمگوازێتەوە نەخۆشخانەیەکی تر، نەوەک خوێندکاران هەست بە بوونی من بکەن و لە نەخۆشخانەکە کۆببنەوە، پاسەوانەکان نهۆمێکی نەخۆشخانەکەیان چۆڵکردو چەندین پاسەوانی چەکداریش لە کۆڵانەکە ریزبوون.

دکتۆرێکی گەنجی بەرێزی مامۆستای کۆلیژی پزیشکی زانکۆکە منی بینی، پشکنینە سەرەتاییەکانی کردو وتی تەندروستیت باشە، دوایی بە بزەیەکەوە وتی: زۆرباشی دەتوانی بەیانی بگەڕێیتەوە.

کە زانیم تەندروستیم باشە، دڵشادبووم، چونکە دانوستانەکەمان لەگەڵ حکومەت تەگەرەی ناکەوێتە پێش. دکتۆرەکە داوای چای بۆ کردم، پاش چەند دەقیقەیەک سستەرێکی رەشی باڵابەرز لەسەر سینیەکدا چای بۆ هێنام، بەڵام کە پاسەوانە چەکدارەکانی بینی شڵەژاو سینیەکەی لە دەست بەربۆوەو کەوتە سەر سەرینەکە.

لەژێر چاودێرییەکی توند، ئەم شەوەم لە نەخۆشخانەو تەنیا لە یەک نهۆمدا بەڕێ کرد، پێش نانی بەیانی دکتۆرێکی تر هاتە سەرم، ئەو لە دکتۆرەکەی تربە تەمەنتربوو، بەرپرسی بەشی هەناو بوو لە نەخۆشخانەکە، ئەو وەک دکتۆرەکەی رۆژی پێشتر نەبوو، جددی بوو، بە قسەی خۆش نەیخافڵاندم، دوێنێ دکتۆر وتی: تەندروستیت باشە. بە گرانی وەڵامی دامەوەو وتی؛ ماندێلا تەماشای سینگت بکە.

ئەشیعەکانی سینگی نیشاندام و وتی؛ سەیرکە چۆن لایەکی لە لایەکی تر گەورەترە، ئەوەش دیارە کەوا شلەی تێدایە.

لە یەکێک لە سستەرەکان داوای شرنقەیەکی کرد، کە بۆیان هێنا لە سینگمی راکردو شلەیەکی بۆری لێ دەرهێناو پرسی: نانی بەیانیت خواردووە؟

– نەخێر.

– باشە، کەواتە یەکسەر بۆ ژووری نەشتەرگەریت دەبەین.

دکتۆرەکە ئاگاداری کردمەوە کەوا شلەیەکی زۆر لە سینگمدا هەیەو دەبێ زوو لە کۆڵت بێتەوە.

بێهۆش کرام و نەشتەرگەریش تەواوبوو، کە بەهۆش هاتمەوە، دکتۆرەکەم لە تەنیشت بوو، هێشتا تەواو هۆشیار نەبیوومەوە، دکتۆرەکە وتی، دوو لتری شلەمان لە سینگت دەرهێنا و پاش پشکنین بۆمان دەرکەوت، نەخۆشی سیلت هەیە، بەڵام نەخۆشیەکە سەرەتایەو هێشتا سییەکەت تووشی هیچ زیانێ نەهاتووەو وتی، پاش دوو مانگی تر چاک دەبیتەوە، دیارە بوونی شێ لە ژوورەکەتدا هۆکاری تووشبوونتە.

شەش هەفتە بۆ چارەسەری و پشوودان لە نەخۆشخانەی تایگربێرگ مامەوە، لەدێسەمبەردا گواسترامەوە خانەی کونستانتیتابێرگ ی پشوودانی نایابی نزیک بوڵلسمور کە هەرگیز نەخۆشی رەش رووی تێنەکردبوو، بەیانی رۆژی یەکەم کوبیکوتسی بە هاورێیەتی رائید ماریسی جێگری بەرپرسی زیندانەکان و چاودێری ئاگادارم هاتە سەردانم، پاش سڵاوو هەواڵ پرسین نانی بەیانییان هێنا.

لەبەر ئەوەی نەخۆش بووم و جارانیش هەستم بە پاڵەپەستۆی خوێن دەکرد بۆیە دەبوایە خواردنەکەم کولسترۆلی کەم بێ، بەڵام دیاربوو ئەم رێنماییە نەگیشتبووە چێشتخانەکە، بۆیە خوانەکەم هێلکە و سێ پارچە بیکون و چەند پارچە نانی بە کەرەبوو، منیش لەبەر ئەوەی لەمێژبوو خواردنی چەورم نەخواردبوو، بۆیە ئارەزووم بۆیان نەچوو، بەڵام دەستم بۆیان درێژکرد، ماریسی وتی:

– ماندێلا، بۆت نییە ئەم خواردنانە بخۆیت،ئەمانە بە پێچەوانەی رێنماییەکانی دکتۆرە.

– ببوورە، جەنابی رائید ئەمە خواردنی منە و بۆ من هاتووەو دەیخۆم ئەگەر بشمرم، ئیمڕۆ ئامادەم رربەڕووی مردن ببمەوە.

کە لە خانەکە جێگیربووم، دیدارم لەگەڵ کوبیکوتسی و لیژنە نهێنیەکە بەردەوام بوو، کوبی وتی، لەماوەی داهاتوودا تۆ لە نێوان ئازادی و زیندانا دەبیت، ئەگەرچی چاک تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، بەڵام بە هەژاندنی سەرم رەزامەندیم راگەیاند، ئەوەندە خۆش باوەڕو ساویلکە نەبووم بڕوابکەم ئازاد دەکرێم، بەڵام هەستم کرد هەنگاو هەیە بۆ ئازادکردنم.

لە خانەدا زۆر ئیسراحەتم کرد، شوێنەکەم زۆر خۆش بوو، سستەرە سپیەکان، یان رەنگینەکان – هەرگیز ئەو شوێنە سستەری رەشی تێدانەبووە– زۆریان خزمەت دەکردم و بە وردی چاودێرییان دەکردم، شیرنەمەنی و سەرینی خۆشیان دەهێنا، هەتا کاتی پاش دەوامیش بۆ خزمەتم دەمانەوە. رۆژێکیان سستەرێک وتی:



– ئەمشەو ئاهەنگێکمان هەیە، حەز دەکەین بەشداریمان بکەیت.

جێگای شانازییە بەشداریتان بکەم، بەڵام رەنگە دەسەڵاتداران بوارم نەدەن، بەڵام ئەوان نەوەک بوارم نەدەن و من نەتوانم بەشداربم و ئارەزوویان بوو من لەگەڵیان بم، بۆیە ئاهەنگەکەیان لە ژوورەکەی من سازکرد.

ئەم شەوە، سستەرە نازدارەکان ژوورەکەیان پڕکردو کێک شیرنەمەنی و دیاری زۆریان هێنا. ئەمەو پاسەوانەکان نیگەران بوون و بەڵام بۆیان نەکرا جوولەیەک بکەن. کە یەکێکیان ویستی قەدەغەیان بکات، من هاتمە قسەو وتم، دیارە هەست بەشەرم و غیرەت دەکەیت کە دەبینی پیرەمێردێکی وەک من بەو هەموو کیژە نازدارە دەوری گیراوە.

* * *

لە سەرەتای دێسمبەری ١٩٨٨دا لە خانەکەی حەوانەوەمدا پاسەوانیم لەسەر توندکرا، هەستم کرد رەوشەکە بەرەو گۆڕان دەچێ، لە ئێوارەی نۆی دێسمبەردا رائید ماریسی لێم بە ژوورێ کەوت و داوای لێم کرد، خۆم بۆ بارکردن ئامادەکەم، بەڵام نەیووت، بەرەو کام هەوار. خۆم کۆکردەوەو چاوم لە سستەرەکان بۆ ماڵئاوایی گێڕا، بەداخەوە هیچیان دیارنەبوون، زۆرم لاگران بوو بێ خوداحافیزی بڕۆم.

هەر بە پەلە رۆیشتین و پاش سەعاتێک خۆم لە زیندانی فیکتۆر فیرستیری شاری بارلی هۆڵەندی ئاکار دۆزییەوە، شارەکە سی و پێنج میل لە باکووری خۆرهەڵاتی کیپ تاونی ناودار بە رەزە ترێیە، زیندانی فیکتۆر فیرستیر بە زیندانێکی نموونەیی دەناسرێت. لەناو زیندانەکەدا بە رێگایەکی قیرتاونەکراودا بەرەو خانوویەکی یەک نهۆمی لەناو دارستانێک رۆیشتین، خانووەکە بەشی پشتەوەی زیندانەکە بوو.

رائید ماریسی بانگی ژوورێی کردم، لە ناوەوە، ساڵۆنێکی گەورەی دانیشتن و چێشتخانەییێکی کراوەو ژوورێکی نووستنی گەورەبوو، کەلوپەلی پوختی لێ بوو، بەڵام کۆن بوون. پێش گەیشتنم خانووەکە پاک نەکرابۆوە، پیس بوو، زیندەوەری زۆری تێدابوو، هەندێکیانم هەر نەدیبوو. ئەم شەوە سەرینەکەم لە زیندەوە پاک کردەوەو چاک خەوم لێکەوت.

بۆ بەیانیەکەی خانووەکە گەڕام، بینیم حەوزێکی مەلەوانی ودوو ژووری تری نووستنی تێدابوو،

له دەرەوە خانووەکەو له پەنا سێبەری دارەکاندا پیاسەیەکم کرد. له شوێنەکە هەستم بە تەنیایی کرد. شوێنەکە جوان بوو. بەڵام تێل و دیوارە بەرزەکەو پاسەوانەکانی دەروازەکە دڵی کوشیم و جوانیەکەی کوشتبوو، ماڵەکەم لەنێوان زیندان و ئازادی خۆی دەنواند.

پاش نیوەڕۆکەی، کوبیکوتسی هاتە سەردانم و لە گەڵ خۆیدا دیاری ماڵە تازەکەم سەندوقێک ترێی هێنابوو. جێگای سەرسوورمانە خاوەن زیندان دیاری بۆ زیندانکراو بێنێ، وەزیرەکە زۆر خەمی خۆشی و پشوودانی منی بوو، لەناو خانووەکە سووڕایەوەو بۆ سەلامەتی منیش داوای کرد دیوارەکە بەرز بکەن، هەروەها وتی، ئێرە، ئەم زیندانە تا ئازادکردنت دوا هەوارتەو ئێرەش بۆ ئیسراحەت و دیداری تایبەتیت گونجاوە.

ڕاستە، لەم شوێنەدا هەستم بە ئازادی کرد، دەتوانم بخەوم کەی ویستم، خۆم بشۆم، کەی ویستم. خواردن بخۆم، کە برسی بووم، ئەوانەش هەمووی هەستی جوانن، لە هەموویان گەورەتر ئەوەیە، هەرکاتێ بموێت لە خانووەکە دەرچم دەتوانم. چی تر شیشەبەند لە پەنجەرکانمدا دیارنین، چی تر ڕۆژانە کلیل و دەرگاو داخستن و ڕۆژێ چەند جار نابینمەوە، ئەوانە هەموویان هەستی جوانن، بەڵام هێشتا هەست دەکەم لەناو قەفەسێکی زێڕینم.

بەڕێوەبەرایەتی زیندانەکە چێشتلێنەرێکی بە پلەی ئەفسەر بە ناوی سوارت بۆ دانام، ئەو ئەفریکانی بوو، پیاوێکی باڵابەرزو هێمن بوو و ڕۆژانێک لە دوورگەی روبێن پاسەوان بوو، من بە بیرم نایێتەوە، ئەو دەیووت، چەند جار ئەو لۆریەم دەهاژوت کە ئێوەی دەگواستەوە گرتووخانە، بە ئەنقەست بەسەر بەردو کەندو کۆسپدا دەڕۆیشتم تا ئێوە ئازار بخۆن، منیش پێکەنینم هات، پیاوێکی ڕووخۆش بوو، دەمارگرژ نەبوو، وەک برایەکی بچووکی خۆم تەماشام دەکرد.

ئەو کاتژمێری حەوتی بەیانی دەهاتە سەرکارو چواری ئێوارە دەگەڕایەوە، ژەمی بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارانی بە پێی ئامۆژگاری دکتۆر بۆ ئامادە دەکردم، خواردنی چاک ئامادە دکرد، ژەمی ئێوارانی ئامادە دەکردو دەڕۆیشت، خۆم بە ئامێرێکی تازە لەلای من«مایکرۆوایف» گەرم دەکردەوە.

سوارت نانی دەکردو بیرە و شتی خۆشی دروست دەکرد، کە میوانم دەهات، ژەمی تایبەتی ئامادە دەکرد، میوانەکانم خواردنی دەستی ئەویان لا خۆش بوو و زۆریش ستایشیان دەکردو زۆریش ئێرەییان پێم دەهات، بەهاوڕێیانی حیزبی کونگرەی نیشتمانی ئەفریقی و بەرەی دیموکراسی یەکگرتووو بزاڤی دیموکراسی میلیم دەوت، ئێوە لەبەر خواردن دێنە سەردانم و دەستاوی سوارتان لا خۆشە بۆیە هەر زوو زوو دێنە سەردانم.



ڕۆژێکیان کە نانم خوارد ویستم قاپ و قازانەکان بشۆم، بەڵام سوارت ڕازی نەبوو و وتی:

– نا ، نا ، وا مەکە ، ئەوەیان کاری منە ، تۆ دەبێ بەس لە ساڵۆنەکە دانیشیت و ئیسراحەت بکەیت.

زۆرم کرد تا یارمەتی بدەم و وتم، تۆ خواردن ئامادە بکە و منیش قاپەکان دەشۆم، بەڵام ڕازی نەبوو، دوایی بۆمی سەلماند کەوا کەمێ وردە ئیش لە چێشتخانەکە بکەم. بێجگە لەوەش ڕازی نەبوو بەیانیان جێگەکەی خۆشم چاک بکەمەوەو وتی، ئەوەشیان کاری منە، لەبەر ئەوەی ئەوە چەند ساڵە ئەم کارەم بە خۆم کردووە بۆیە لێ ڕاهاتبووم، داوام لێکرد کەوا هەندێ خواردنی تایبەتی بەخۆم ئامادە بکەم، وەک تەشریبی گەنمە شامی بە فاسولیا ، لە منداڵییەوە زۆرم حەز لێبوو ، ڕۆژێکیان پێم وت:

– حەز دەکەم برنجێکی ئەسمەرم بۆ لێنێیت.

بەوەڵامەکەی سەرسام بووم کە وتی:

– برنجی ئەسمەر چییە ؟

پێم وت، برنجی ئەسمەر ناوکی ڕەسەنی برنجی پێش پێگەیشتنی، لە ڕۆژانی شەڕدا ئەوەمان دەخوارد، ئەوکاتە برنجی سپی پەیدا نەببوو، بە قسەکانم ئەبلەق ببوو، بەڵام دوایی لە بازاڕدا پەیداکردبوو و بۆی ئامادە کردم، زۆر تامم لێی وەرگرت، دەمزانی بۆ تەندروستی لە برنجی سپی باشترە، بەڵام سوارت، لای خۆش نەبوو و وتی، ئەگەر حەزت لە خواردنی کرد ئەوا بۆ خۆت ئامادەی بکە.

ئەگەرچی خۆم مەشروبخۆر نەبووم، بەڵام حەزم دەکرد پێشکەشی میوانەکانمی بکەم. جارجاریش بە هەوەسی ئەوان دەمخواردەوە، بەڵام خۆشترین جۆری شەڕاب لەلای من ئەوەیە کە لە خوارووی ئەفریقیادا ساز دەکرێت، بە شیرینی ناودارە.

داوام لە سوارت دەکرد شەڕابی نیدیربێرگ بکڕێت، جاران تامم کردبوو، دەمزانی شیرین و بەتامە، ڕۆژێکیان چەند هاوڕێ و پارێزەرەکانم هاتنە سەردانم، وەک، دوللە عومەر و جۆرج بیزوس و ئیسماعیل ئەیوب، لەگەڵ نانخواردندا داوام لە سوارت کرد هەندێ شەڕابی نیدیربێرگ بکڕێت، با جۆرج بیزوس کە موسڵمان نییە بیخواتەوە، حەز دەکات، بەڵام ترشیم لە دەم و چاوی بینی کە خواردیەوە، منیش لە سوارتم پرسی، ئەویش وتی:

– بەڕێز ماندێلا، من لەسەر داوای تۆ ئەم جۆرە شەڕابە دەکڕم، لە ڕاستیدا خەراپترین جۆری

شەڕابە.

منیش بە بیرم هێنایەوە کەوا من مەشروبخۆر نیم، ئەگەر شەڕابەکە شیرین نەبێ. منیش دڵنیابووم کەوا جۆرج جۆرەکانی شەڕاب جیاناکاتەوە. سوارت بزەی هاتێ و پێشنیارێکی مام ناوەندی کرد کەوا شەڕابی قارورتین بکڕێت، کە شەڕابێکی شیرینە لەگەڵ شەڕابی نیدیربێرگ و لە میوان بپرسین، کامیان چاکترە.

هێشتا لەسەر مێز دانیشتبووین، سوارت دەست بە قارورتین هاتە ژووری و وتی:

– بەرێزەکان، کام لەم دوو شەڕابە هەڵدەبژێرن؟

جۆرج بەبێ ئەوەی چاو لە من بەرزبکاتەوەو بەبێ دوودڵی ئاماژەی بۆ شووشە تاڵەکە کردو سوارتی ئەفسەریش بزەیەکی پانی لەدم و چاوی نواند.

* * *

دیدارم لەگەڵ لیژنەکە بەردەوام بوو، دیسان لەسەر مەسەلەکانی وەک خەباتی چەکداری و حیزبی شیوعی و دەسەڵاتی زۆرینە راوەستاین. زۆر داوام لە کوتسی کرد، دیدارێکم بۆ لەگەڵ سەرۆک بوتا ساز بکات، بەڕێوەبەرایەتی زیندان رازی بوون پەیوەندی سنووردارم لەگەڵ هاوڕێیانم لە بوللسمورو دوورگەی روبین و سەرکردایەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە لۆساکا هەبێ، گەرچی چەند هەنگاو هاوڕێیەکانم جێهێشتبوو، بەڵام نەمدەویست لێیان دووربکەومەوە، چونکە لە مەیدانی دانوستانا تەنیا دەبم.

لە ینایەری ١٩٨٩دا، چوار هاوڕێیەکەی بوللسمور هاتنە سەردانم و سەربارەت بەو بیرخەرەوەی بەنیازم پێشکەشی سەرۆکی دەوڵەتی بکەم، قسەمان لەسەر کرد، لەم بیرخەرەوەیەدا شتی تازەی تێدا نەبوو، هەر ئەوانەبوو، کە لەگەڵ لیژنەکەدا گفتوگۆمان لەسەرکردبوون، بەڵام من دەمویست سەرۆک لە زاری خۆم گوێ بیستی بێت و تێبگات، ئێمە پیاوانی هۆش و راستین، نەک تیرۆریست.

وام بۆ سەرۆک بوتا نووسیبوو: منیش وەک خەڵکێکی زۆری ئەم وڵاتە دەترسێم، لە تارمایی دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا دەترسێم، ئەم وڵاتە بوویتە دوو سەربازگەی دژ بە یەک، یەکێکیان سپی و ئەویتریش رەش، هەردوولا کەوتوونەتە ناو یەک و سەری یەکتر دەبڕن». جا بۆ ئەوەی لەم دەردە کوشندەیە دوورکەوینەوەو مەیدانی دانوستان گەرم کەین. داوام کرد هەرسێ داواکەیان کە حکومەت لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ویستبوو بکەینە مەرجی دانوستان، ئەوانیش،



نەفرەت لە توندوتیژیی و سەربەخۆییتان لە حیزبی شیوعی و وازهێنان لە دەسەڵاتی زۆرینە.

سەبارەت بە نەفرەتکردنی توندوتیژی وتم، کێشەکە ئەوە نییە حیزبمان نەفرەت لە توندوتیژی بکات، چونکە راستیەکە ئەوەیە کەوا، حکومەت ئامادە نییە دەسەڵات لەگەڵ رەشەکان بەش بکات، بۆ وازهێنانمان لە حزبی شیوعی وتم، ئێمە چۆن دەتوانین لەسەر داوای نەیارمان واز لە دۆستی خەباتی دێرینمان بێنین و چ رووێکمان بەرامبەر میللەتەکەمان دەمێنێ؟ ئەوەشم بۆ ئەوە بوو کەوا بۆی روون بکەمەوە کەوا ئێمە لە ژێر فەرمانڕەوایەتی ئەواندا نین. هەروەها وتم کە حکومەت دەسەڵاتی زۆرینە رەتدەکاتەوە، ئەوە کۆششی بێ پەنایە کەوا واز لە دەستەڵات ناهێنن. سووربووم لەسەر رووبەڕووبوونەوەی رەوشەکە، بۆیە وتم: دەسەڵاتی زۆرینە و ئاشتی ناوخۆ، دووڕووی یەک پارەن، پێوستە سپیەکانی خوارووی ئەفریقیا ئەو راستیە چاک بزانن کەوا لەم وڵاتەدا ئاشتی و هێمنی بەرقەرار نابێ هەتا راستی دەسەڵاتی زۆرینە بە چاکی نەچەسپێ.

لە کۆتایی بیرخەرەوەکەمدا، چوارچێوەیەکی گشتیم بۆ دانوستان بەم شێوەیەی خوارەوە دانا. پێوستە لە دوو کێشەی سەرەکی دا دەست بەکار بین، یەکەمیان، داوای حکومەتی زۆرینە لەناو یەک وڵاتدا، دووەمیشیان، مەترسی سپیەکان لەم داوایە، بۆیە لە ترسی دوارۆژی خۆیان داوای دڵنیایی و بەڵێن دەکەن و دەسەڵاتی رەشیش، ئەوە ناگەیەنێ کەوا زەبریان لەسەر سپیەکاندا دەبێ. گونجاندن و سازکردنی ئەم کێشەیە بۆ حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کارێکی قورس و گرانە. بۆیە پێشنیارم کرد، با ئەمەیان بە دوو قۆناغ بێ.

قۆناغی یەکەم. گفتوگۆکردن بۆ سازکردنی رەوشێک تا بواری دانوستان ئاسان و ئامادە بکات، دووەمیشیان، دانوستانەکە خۆی. بۆیە وتم: باشە پێتان بڵێم ئەو هەنگاوەی من هاتوومەتە پێش، بوارێکی چاکە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئاڵۆزەکەی ئیمڕۆ و دەربازبوون لە گێژاوەکەو دانانەوەی رەوشی ئاسایی بۆ وڵات تا لە رووی سیاسیەوە بێتەوە سەر رەوشی سروشتی خۆی، بۆیە داوا دەکەم ئەم دەرفەتە بە زووترین کات و بەبێ دواکەوتن بقۆزنەوە.

تا دوابکەوێت، شتێ دێتە پێش. لە مانگێ یەنایەردا سەرۆک بوتا جەڵتەی لێدا، ئەگەرچی دەیتوانی کاربکات، بەڵام مەزاجی ئەندامانی حکومەتەکەی و بۆچوونیان هاندەری نەبوون بۆ کارکردن، لە فێبرایەرداو لە کارێکی چاوەڕوان نەکراودا، بوتا لە سەرۆکایەتی حیزبی نیشتمانی دەستی کێشایەوە، بەڵام وەک سەرۆک دەوڵەت هەرمایەوە، ئەوەش رەوشێکی نا ئاسایی بوو لە مێژووی خوارووی ئەفریقیادا، چونکە یاسای پەرلەمان وا هاتووە، کەوا سەرۆکی حیزبی زۆرینە،

دەبێتە سەرۆکی دەوڵەت، هەندێ ئەوەیان بە باش ناساندو وتیان، بوتا دەخوازێت لە دەرەوەی بینینی سیاسەتی حیزبدا بێ تا بتوانێ گۆڕانکاری بنەڕەتی لە خوارووی ئەفریقیادا بکات.

ئەمەو فشاری دەرەوەو توندوتیژی سیاسی گەشەی کرد، گیراوە سیاسیەکان لەسەرانسەری ولاتدا مانیان لە خواردن گرت و ئەوەش ئەنجامی باشی لێ کەوتەوە، وەزارەتی یاساو رژێم ناچاربوو زۆرتر لە نۆ سەد گیراویان ئازاد بکات. لە ساڵی **١٩٨٩**دا بەرەی دیموکراسی یەکگرتوو هەڤاڵبەندی لەگەڵ یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی خوارووی ئەفریقیا کردو ناونرا بزاڤی دیموکراسی میللی، بۆ رێکخستنی هەڵمەتێکی یاخیبوونی گشتی مەدەنی دژ بە رژێمی نەژادپەرستی دەست بەکاربوون. لەسەر ئاستی دەرەوەش ئۆلیڤەر تامبو دیداری لەگەڵ حکومەتەکانی تیانا و یەکێتی سوڤیەت سازکرد. هەروەها لە یەنایەری **١٩٨٧**دا دیداری لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکی جورج شولتز لە واشنتۆن سازکرد. لەوێ ئیدارەی ئەمریکی دانی بەوەنا کەوا کێشەکانی خوارووی ئەفریقیا بە هاوکاری حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی چارەسەر دەکرێت. گەمارۆکانی نێونەتەوەیی هەر مایەوەو زۆرتریش بوو.

توندوتیژیبە سیاسیەکان ئاکامی خراپیشیان هەبوو، لەگەڵ زۆربوونی ئەم دیاردەیە ژنەکەم قەبوولی کرد چەند گەنجێک لەگەڕانی لەناو سویتودا پاسەوانی بکەن. ئەو گەنجانەش راهێنان و بەرنامەیان لەم کارەدا نەدیبوو، ئەوەش لە ئەنجامی کاری دوور لە رەوشتی شۆڕشگێڕییدا فێرببوون، یەکێک لەو گەنجانە بە تاوانی کوشتنی برادەرێکی گیراو بۆ وینی سەرئێشەو قەیرانی دادگای تووش هات، ئەم رووداوانە بۆ من شوێنەواری خراپ و شێواندنی هەبووە و ئەگەری دروستبوونی دووبەرەکیش لەناو بزاڤەکە هەبوو، کە بۆ ئێمە یەکێتی مەسەلەیەکی بنچینەیی بوو. بە هەموو شتێک پاڵپشتی ژنەکەم کردو دڵنیابووم کەوا بێ ئاگایەو دەمزانی کەمتەرخەمیش لە نواندنی مەسەلەکان هەبوو.

لە یۆلیۆداو بەبۆنەی جەژنی هەفتاو یەکەمی لە دایکبووندا نزیکەی هەموو ئەندامانی خێزانەکەم لە گرتووخانەی فیکتور فیرستر هاتنە سەردانم. ئەوەش یەکەم جارە ژن و مناڵ و نەوەکانم لێم کۆدەبنەوە، بە راستی بۆنەیەکی جوان و کامەران بوو. سوارت، ژەمێکی پوختی ئامادەکردو بێزاریش نەبوو کە مناڵەکان شیرنەمەنیان پێش خواردن خوارد. پاش نانخواردنی نیوەڕۆ، مناڵەکان تەماشای فلیمێکی ترسیان کردو گەورەکانیش کەوتنە باسی هەواڵ و سەربردەکان. بە بینینی هەموو ئەندامانی خێزانەکەم مایەی دڵشادی و کامەرانی بێ سنوورم بوو، دڵتەنگ و خەمگینیش



بووم کەوا چەند ساڵە لەم خۆشییە بێ بەری ببووم.

بە ١٤ ی یۆلیۆ، ژەنراڵ ویلیەمز هاتەلام و پێیڕاگەیاندم کەوا بەیانی سەرۆک بوتا سەردانێکی هەواڵپرسینت دەکات، داوای کرد کاتژمێر پێنج و نیوی بەیانی ئامادە بم بۆ بەرێ کەوتن، دڵشادی خۆم دەربڕی و داوام کرد قات و ملپێچێکم بۆ دیداری سەرۆک ئامادە بکەن «قاتەکەی کە پێشوازی مێوانەکانی لیژنەی کۆمنویلسم پێکرد، دیار نییە» یەکسەر رازی بوو و هەر زوو بەرگدوور هات و پێوانەکانی وەرگرتم، پاش نیوەڕۆکەی قات و ملپێچ و قەمیس و پێڵاوێکیم وەرگرت، پێش رۆیشتنی ژەنراڵ لە جۆری خوێنمی پرسی، ئەوەش بۆ سبەی بوو، نەوەک شتێکی لەناکاو و رێکەوتم تووش بێ.

ئەوەندەی پێم کرا بۆ دیداری سەرۆک خۆم ئامادە کرد، بیرخەرەوەکەو تێبینیەکانم تەماشا کردەوە، زۆرترین رۆژنامەو گۆڤارم خوێندنەوە، تا چاک ئاگاداری هەواڵ و رووداوەکان بم. کە سەرۆک بوتا دەستی لە سەرۆکایەتی حیزب کێشاوە، ئاف دی دو جێگای گرتەوە و قسەش هەبوو گوایە ناکۆکی و ململانێیان لەنێواندا هەبوو. هەندێ ئەم دیدارەیان وا شرۆڤەکرد، گوایە سەرۆک دەیەوێت بەرە لە بن پێی نەیارەکەی ئاف دی دو کلیرک راکێشێ. بەڵام، بۆ من ئەمەیان هیچ ناگەیەنێ. لە هزری خۆمدا بیانووەکانی دیدارەکەم رێزدەکرد و وەڵامیشم ئامادە دەکرد، بۆ مرۆڤ پێویستە لە دیداری نەیاریدا، بزانێ وردو جوان چی دەوێت و چی لە دڵە پێی رابگەیەنێ.

پێش دیدارم بە بوتا شڵەژابووم، ئەو بە تیمساحی مەزن ناسرابوو، زۆرم لە سەر تووڕەیی و توندی بیستبوو. مەزندەم لەسەر، وەک نموونەی پیاوێکی ئەفریکانی پتەوی کەللەرەق بوو، بڕوای بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ پێشەواکانی رەش و گفتوگۆکردن و وەرگرتنی بۆچوونەکانیان نەبوو، بە پێچەوانە بڕوای بە سەپاندنی مەرج و پڕکردنەوەی بە پێی مەزاجی خۆی بوو. دیارە ئەو جەڵتەی بەم دواییەی لێیدا، هیچ لە رەوشەکانی نەگۆڕی، بەڵکو توندی و کەللەرقی زۆرترکردبوو، وام بڕیاردابوو، ئەگەر وا هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکات بە هەمان شێوە وەڵامی دەدەمەوەو ئەگەر پێویستی کرد، ئەوا لە دیدارەکەدا دەکشێمەوەو داوای دواخستنی دەکەم.

رائید ماریسی، بەرپرسی زیندانی فیکتور فیرست لە کاتژمێر پێنج و نیوی تەواو هات و گەیشتە ژووری دانیشتن و منی بە ئامادەیی و چاوەڕوان و بە قاتە نوێیەکە بینی، دیقەتی دامێ و سەری باداو بە سەرسامییەوە وتی: نا، ماندێلا، ملپێچ وا نابەسترێت.

ملپێچەکەم چۆن هات وام بەستا، ئەوە چەندین ساڵە نەمبەستاوە، لە بیرم چووە، هیواداربووم

کەس هەستی پێ نەکات، رائید ماریس قۆچپەکانی قەمیسەکەمی کردەوە و گرێی ملپێچەکەشی داکەلاندو هاتە پشتم و سەرلەنوێ بۆی بەستامەوە، وەک ملپێچی ویندسور بەستای، لە پێشم راوەستاو دوو هەنگاو گەڕایەوەو تەماشای دیمەنەکەی کردو وتی: بەڵێ، ئەوا زۆر باشە.

بە ئۆتۆمبێل چووینە ماڵی ژەنەڕاڵ ویلیەمز، ژنەکەی نانی بەیانی بۆ هێناین، دوایی بە کاروانێکی بچووکی چووینە توینهویس، لە نووسینگەی سەرۆکداو لە نهۆمی ژێر زەویدا ئۆتۆمبێلەکەمان راگرت، ئاواش کەس هەستمان پێ ناکات. نووسینگەکە لە باڵەخانەیەکی نازداری بیناسازی سەدەی نۆزدەی هۆڵەندی دابوو، بەڵام، ئەو رۆژە هەمووم نەبینی، هەر بە فڕاندن منیان بۆ بەشی سەرۆک رفاند.

بە مەسعەدە کارەباییەکە بۆ نهۆمی سەرزەوی سەرکەوتین، چووینە سالۆنێک دیوارەکەی تەختەی داربوو، لەوێ بۆ نووسینگەی سەرۆک کوبیکوتسی و نیل بارنارد و چەندین بەرپرسی زیندان پێشوازییان کردین، پێشتر، کوتسی و دکتۆر بارنارد بەدرێژی باسی ئەو کۆبوونەوەیان بۆ کردم و وتیان، لەگەڵ سەرۆکدا باس لە مەسەلە ناسکەکان مەکە، لەو ساتەی چاوەڕوانی چوونە ژوورەوەبووین، دکتۆر بارنارد بینی قەیتانی پێڵاوەکەم توند نەکراوە، بۆیە هەر بە خێرایی دانیشت و بۆی توند کردمەوە، هەستم کرد هەموویان شڵەژاون و ئەوەش من هێور ناکاتەوە، دەرگا کرایەوەو چوومە ژوورەوەو رەچاوی خراپترین ئەگەرو چارەنووسم دەکرد.

لە پشتەوەی کورسیە نایابەکەی بەرەو ڕووم هات، وەک ئەوەی ژماردبێ، وا هات، لەنیوەی رێگاکە گەیشتە من، بە رووێکی بە بزەوە دەستی کوشیم، لە یەکەم ساتدا لە راستیەکانی داماڵیم، زۆر بەڕێزو بە رەوشت خۆی نواند.

دەست لەناو دەست بۆ وێنەی یادگاری وێنەمان گرت، پاشان کوبیکوتسی و ژەنەراڵ ویلیەمز و دکتۆر بارناردیش هاتن و لەسەر مێزێکی لاکێشە دانیشتین، چا هات و کەوتینە قسە. باسی سیاسەتمان نەکرد، دیاربوو، ئەوەیان دەرسێک بووو سەرنجی هەموومانی راکێشا. باسی مەسەلە سەرەکییەکانمان نەکرد، باسی مێژوو کەلتووری خوارووی ئەفریقیامان کرد. من باسی وتارێکم کرد کە لەو نزیکانە لە گۆڤارێکی ئەفریکانی بڵاوکرابۆوە وتارەکەش باسی یاخیبوونەکەی ئەفریکەکانی ساڵی ١٩١٤ی دەکرد کە چۆن چەندین شاریان لە هەرێمی فری ستایت گرتووە.

هەروەها وتم، خەباتی ئێمەش بەو بزاڤە ناودارە دەچێت. باسی مێژووی ئەم ماوە کورتەی رووداوەکانمان کرد. رەش و سپی بە دوو گۆشەی جیاواز تەماشای مێژووی خوارووی ئەفریقیا



دەکەن، ئامادەبوان وتیان، یاخیبوونەکەی ئەفریکەکان ناکۆکی بوو لەنێوان چەند برایەک، بەڵام، خەباتەکەی تۆ، بزاڤێکی شۆڕشگێڕانەیە. منیش وتم، دەکرێ ئەوەش وا تەماشا بکرێت کەوا خەباتێکە لەنێوان برایان، بەڵام لە دوو رەنگی جیاواز.

دیدارەکە لە کەشێکی خۆشەویستی و خۆشیدا، نیو سەعاتی خایاند، لە دیدارەکەدا، یەک ساتی تەنگاوی هەبوو، ئەویش کە داوام لە سەرۆک کرد بە بێ مەرج هەموو گیراوە سیاسیەکان ئازادبکات، یەک لەوانە من. ئەویش داوای لێبووردنی کردو وتی، ناتوانم.

باسی ئەوەش کرا، ئەگەر هەواڵەکە بڵابۆوە، چۆن وەڵامی بدرێتەوە. هەر بە خێرایی ئەوەمان گەڵاڵە کرد، دەڵێین، دیدارێکی چا خواردنەوە بوو بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی لە وڵاتدا. دوایی بوتا هەڵسایەوەو دەستی کوشیم و کامەرانی بۆ دیدارەکە نواند، منیش هاوسۆز وەڵامم دایەوەو سوپاسم کردو نووسینگەکەم جێهێشت.

وەک دانوستان بایەخی گرنگی نەبوو، ئەم دیدارە، بەڵام بۆ مەبەستی تر بەهاداربوو. بەڕێز بوتا وتی، بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵتان توانرا هەنگاوێکی بۆ بهاوێژین، بەڵام هێشتا لە توینهایس نەکرا لەم قەیدە دەربازمان بێ، لەم دیدارەدا، هەستم کرد لە ئیمڕۆوە، گەڕانەوە بۆ دواوە نییە.

لە ئۆگستۆسی ١٩٨٩، پاش زۆرتر لە مانگێک لە دیدارم بە سەرۆک کۆمار، بوتا دەستی لە کاری سەرۆکایەتی هەڵگرت. لە وتارە ماڵئاوییەکەی کە لە تەلەفزیۆندا پەخش کرا، وتارەکەی کراوەو روون نەبوو، تێیدا ئەندامانی حکومەتی بەوە تاوانبار کرد، کەوا کەوتوونەتە داوی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، بۆ رۆژی دوایی، دوکلیرک سوێندی جێگری سەرۆکی خواردو بەڵێنی دا گۆڕانکاری و چاکسازی لە وڵاتدا بکات.

دی کلیرک، بە نیسبەت ئێمە کەسایەتیکی تەماوییەو بۆن و رەنگ و تامی نییە. ئەو تەنیا پیاوی حیزبەو بەس، لە مێژووی سیاسیدا هیچ چاکسازی لەگیانیدا بەدی ناکرێت، کە وەزیری فێرکردن بوو، بواری نەدا خوێندکاری رەش روو لە زانکۆکانی تایبەتی سپیەکان بکەن. لەو کاتەی سەرۆکایەتی حیزبی نیشتمانی وەرگرت بە وردی چاودێری هەنگاوەکانیم دەکرد، گوێم لە وتارەکان رادەگرت و نووسینەکانیم دەخوێندنەوە، هەستم کرد لەگەڵ ئەوەی پێش خۆی زۆر جیاوازە، کابرایەکی عەقائدی نییە، بەڵکو پراگماتیکی واقیعییەو بڕوای بە گۆڕان هەیە. لەو رۆژەی کرا بە سەرۆکی دەوڵەت بە نامەیەک داوای دیدارم کرد.

لە وتاری وەرگرتنی دەسەڵاتی وتی، حکومەت بڕوای بە چەسپاندنی ئاشتی هەیەو گفتوگۆ لەگەڵ دەستەیەک دەکات بڕوای بە ئاشتی هەبێ، بەڵام هەڵوێستەکانی بە گۆڕانی ڕەوشەکان دەگۆڕێت، وەک ئەوەی کە ئەسقف توتو و ئەسقف ئالان بوساک لە کیپ تاون خۆپیشاندانێکیان دژ بە دڕندەیی پۆلیس سازکرد، دیارکەوت کەوا بوتا سەرۆکی جاران بواری ئەمەی نەداو ئەگەری ڕوودانی ڕووبەڕووبوونەوەی دژواریش هەبوو. بەڵام سەرۆکی نوێ قەیدەکانی سەر دیدارە سیاسیەکانی کەم کردەوەو بواریی سازکردنی ڕێپێواندا، بەڵام داوای کرد هێمن بن و توندوتیژی پەیڕەو نەکەن. ڕاستە، وا دیارە کەشتیوانێکی نوێیە، کەشتیەکە داژوات.

***

پاش بوونی دوکلیرک بە سەرۆکی وڵات، دیدارە نهێنیەکانی لەگەڵ لیژنەی دانوستان هەر بەردەوام بوو، گیریت فیلیون وەزیری دەستکاری دەستوور هاتە ناو لیژنەکە، کابرایەکی زێدە زیرەک بوو دکتۆرای لە کلاسیکییەکان هەبوو، کاری ئەوەبوو دانوستانەکەی دەخستە ناو قالبێکی دەستووری، بۆ نیشاندانی نیازپاکیان زۆر داوام لە حکومەت کرد هاوڕێییەکانم لە بوللسمورو دوورگەی ڕوبین بەبێ مەرج ئازاد بکات و ئەگەر ئەمە بکات، وا دەزانم کارو هەڵوێستی گونجاوی تریش دەکات. ئازادکردنی گوفان ئەمبیکی بە بێ مەرج لە ساڵی ١٩٨٧ نیشان و سەلماندن بوو.

لە ١٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٩دا سەرۆک دوکلیرک، ولتر سیسولوو هەفت هەڤاڵی تری وەک ڕیموند مهلاباو ئەحمەد کاثراداو ئەندرو ملانگینی و ئەلیاس موتسولیدی وجیف ماسیمولاو ویلتون ئەمکوای و ئۆسکار ئەمبیتای ئازاد کرد. ولتر و ئەحمەد کە لە زیندانی بوللسمور گیرابوون بۆ بەیانییەکەی هاتنە خوداحافیزی کردنم، ئەوساتانە بە سۆزو بەجۆش بوون، منیش دڵنیابووم کەوا من لە پاش ئەوان ئازاد دەکرێم، پاش پێنج ڕۆژ ئەم پیاوانە بە ڕەسمی لە زیندانی جۆهانسبێرگ ئازاد کران. ئەم هەنگاوەی جێگای باس بوون، چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوە، منیش نامەیەکی دەست خۆشی و سوپاسم بۆ دوکلیرک بەرزکردەوە.

بە ئازاد کردنی ولتر و هەڤاڵەکانی زۆر کامەران بووم، ئەو ڕۆژەبوو کەوا چەند ساڵە بۆمان خەبات دەکرد، دوکلیرک قسەکانی خۆی جێبەجێ کردو ئەو پیاوانەی بەردا بەبێ ئەوەی چاودێری بخاتە سەر کاری سیاسییان و توانیان بەناوی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی کار بکەن، بە پێی



پێشهاتەکان وای لێ هات قەدەغەیی لەسەر حیزب نەما. ئەوەش نیشان و سەلماندنی ڕەوای خەباتی سیاسیمانە کەوا چەندین ساڵە پابەندی ڕێبازەکەین.

دوکلیرک بە بەرنامەیەکی ڕێکوپێک خشت خشت باڵای ڕژێمی نەژادپەرستی هەڵدەوەشاندەوە، کەنارەکانی خوارووی ئەفریقیای بۆ هەموو هاووڵاتییان بەبێ جیاوازی نەژادو تیرەکانیان کردەوە، هەروەها ڕایگەیاند کەوا بەم نزیکانە یاسای پارێزگاریکردنی شوێنە گشتیە تاکەکان نامێنێ. ئەم یاسایە لە ساڵی ١٩٥٣ وەک بنچینەیەک لەژێر ناوی «نەژادپەرستی بچووککراوە» پەیڕەو دەکرا، ئەوەی سپییەکان لە نەژادەکانی تر لەبەکارهێنانی باخچە گشتیەکان و شانۆ و چێشتخانەو ئاهەنگە گشتیەکان و کتێبخانە گشتیەکان و تەوالێت و شوێنی تری خزمەتگوزاریەکان جیادەکردەوە. لە مانگی نۆڤێمبەردا دەزگای بەڕێوەبردنی ئاسایشی نەتەوەیی هەڵوەشاندەوە، ئەم دەزگایە بنکەیەکی نهێنی بوو لە سەردەمی سەرۆکی جاران بوتا بۆ بەرپەرچدانەوەی هێزە بەرهەڵستەکانی نەژادپەرستی دامەزرابوو.

لەسەرەتای دیسەمبەردا پێیان ڕاگەیاندم کەوا لە بیست ودووی ئەم مانگەدا دیدارم لەگەڵ سەرۆک دوکلیرک دەبێ. لەگەڵ ئەم بەروارەدا ئازاد بووم توانیم لەگەڵ هەڤاڵە کۆن و نوێیەکاندا گفتوگۆ بکەم. لە خانووەکەی خۆمدا دیدارم لەگەڵ هەڤاڵە کۆنەکان و سەرکردەکانی بزاڤی دیموکراسی میللی و بەرەی دیموکراسی یەکگرتوو بوو، هەروەها پێشوازیم لە پیاوانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە هەرێمەکان و وەفدەکانی بەرەی دیموکراسی یەکگرتوو و یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی خوارووی ئەفریقیا، لەوانە سیریل ڕامافوسا سکرتێری گشتی سەندیکای نیشتمانی کرێکارانی کانزاکان، کە یەکێکە لە چاپوکترین سەرکردەی نەوەی نوێ، هەڤاڵانی دوورگەی ڕوبین هاتن، وەک پاتریک لیکوتاو توکیو سیکسویلی و لەگەڵیان نانی نیوەڕۆمان خوارد، هەردووکیان زۆرخۆرن، بۆیە سوارتی چێشتلێنەر، لێیان هاتە شکایەت و وتی:

– ئەوانە تەڕو وشک دەخۆن.

لەگەڵ هەندێ لە هەڤاڵان باسی پێشکەشکردنی بیرخەرەوەیەکم کرد کە پێشکەشی سەرۆک دوکلیرک بکەم، وەک ئەوەی پێشکەشی سەرۆکی پێشوو بوتام کرد، بابەتەکەی دانوستانی حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بوو، بە سەرۆکم وت، ڕەوشی ئێستا ناکۆکی و ئاژاوەیەو خوارووی ئەفریقیا بەرەو گۆمی خوێن دەبات، تاکە چارەش دانوستانە.

وتم کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بە هیچ مەرجێ ڕازی نییە بۆ دەستپێکردنی دانوستان،

مەرجەکەش بە تایبەتی راگرتنی خەباتی چەکداری، داوام لە حکومەت کرد، راستگۆیانە پابەندی ئاشتی بێت و بۆ دانوستان لەسەر ئەم هەڵوێستە ئامادەین.

بە سەرۆک دوکلیرکم راگەیاند کەوا وتارەکەی دانانت بە سەرۆک جێگای بایەخی من بوو، چونکە جەختت لەسەر بەرژەوەندی و ئاشتبوونەوەی نیشتمانی کردو، وشەکانت هیوای بەخشی بە وڵات و دەرەوە بۆ لەدایکبوونی خوارووی ئەفریقیای نوێ، هەروەها وتم هەنگاوی یەکەم پێویستە رژێمی نەژادپەرستی و هەموو رێنمایی و یاساکانی هەڵبوەشێتەوە.

وتم، بەڵام گیانی ئەم وتارەتان لە واقیع لەم رۆژانەدا رەنگی نەداوەتەوە، زۆرن دەبێژن، کەوا سیاسەتی حکومەت پەیرەوی رژێمی جارانە بەڵام بەشێوەی نوێ، حکومەت زۆری سەرفکردووە بۆ قسەکردن لەگەڵ هەندێ لە پێشەوای رەشەکان و توانی دەستەمۆیان بکات و بوونە ئەستوندەی جاران و زۆرینەی رەشەکانیش نەفرەتیان دەکردن.

دووبارە پێشنیارم کردەوە، کەوا دانوستانەکان بە دوو قۆناغ جێبەجێ بکرێت، پشتیوانی خۆم بۆ هەڵوێستەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە بەیانی هەراری ساڵی ١٩٨٩ راگەیاند، کە حکومەت بەرپرسە لە مانەوەی ئەو کۆسپانەی بوار لە دانوستان دەگرێت، هەروەها داواکاریان بۆ ئازادکردنی سەرجەم گیراوە سیاسییەکان و هەڵگرتنی بەربەستی سیاسی لەسەر هەموو رێکخراوەو کەسەکان و نەهێشتنی باری نائاسایی و کشانەوەی هێزە سەربازییەکان لە چوار دەوری شارەکان کە رەشەکانی تێدا نیشتەجێن. یەکەم هەنگاو بۆ بنبڕکردنی ناکۆکییەکان راگەیاندنی راگرتنی شەڕە، بەبێ ئەوە ناکرێت یەک هەنگاو رەوشەکە پێش بکەوێت. بیرخەرەوەکەم رۆژی پێش دیدارەکەم گەیشتبووە دەستی.

لە بەیانی رۆژی ١٣ی دیسەمبەر، جارێکی تر چوومە نووسینگەی سەرۆک لە وتینهویس بۆ دیداری دوکلیرک، هەر لەم شوێنەدا دیدارم لەگەڵ سەرۆکی پێشوو ببوو. کوبیکوتسی و ژەنراڵ ویلیەمز و دکتۆر بارنارد و هاوڕێیەکەی مایک لوم لەگەڵ بوو، پیرۆزباییم لێکردو هیوام خواست بتوانین هاوشان کاربکەین، دوکلیرک دلۆڤان دیاربوو و ئەویش هاوسۆز بوو. لە یەکەم چرکەدا هەستم کرد، دوکلیرک جوان گوێم لێ رادەگرێت و ئەوەش بۆ من ئەزموونێکی تازەبوو، چونکە سەرکردەکانی حیزبی نیشتمانی دەسەڵاتدار وا راهاتبوون، تەنیا ئەو ئاخاوتنەی بەدڵیان بوو گوێیان لە سەرکردەی رەشەکان رادەگرت. بەڵام دوکلیرک کۆششی زۆری دەکرد تا زۆر گوێ راگرێت و قسە وەرگرێت.



یەکێک لەو بابەتانەی قسەمان لەسەر کرد، پلانەی پێنجیەکە بوو، کەوا تازە حیزبی نیشتمانی سەبارەت بە بابەتی «مافی کۆمەڵە نەژادەکان» پێشکەشی کردبوو، کەوا دابینی یەکسانی مافەکان دەکات لەنێوان هەموو نەژادو تیرەکانی خوارووی ئەفریقیا، گەرچی حیزب چەمکەکەی وا دانابوو گوایە مافی ئازادی کەمینەکان دەپارێزێت، بەڵام لە راستیدا چەسپاندنی دەسەڵاتی سپییەکانی دەخواست. بە دوکلیرکم راگەیاند ئەم چەمکە لەلایەن حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی پەسند ناکرێت ولە بەرژەوەندیدا نییە پشتیوانی لەم چەمکە بکات، چونکە ئەم بیرۆکەیە نەک نەژادپەرستی هەڵناوەشێنتەوە بەڵکو گەشەی پێ دەدات، ئەوەش ئاکاریی من و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی لەدیدی هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ناو وڵات و دەرەوەی دەشێوێنێ، رژێمی کۆن -وتم- ناگۆڕێت و چاک نابێ بۆیە پێویستە بەلا بندرێت و رووی لێ نەکرێتەوە «ئاماژەم بە سەروتاری رۆژنامەی زمانحاڵی حیزبی نیشتمانی لە کیپ تاون دای بێرگر دا کە تازە خوێندبوومەوە، کەوا ئەم چەمکەیە پشتیوانی نەژادپەرستی دەکات بەڵام لە دەرگای پشتەوە، ئەگەر رۆژنامەی حیزبی دەسەڵات ئەمە وا شرۆڤە بکات، ئەدی ئێمە چۆنی شرۆڤە دەکەین ..؟ هەروەها وتم، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی حەفتاو پێنج ساڵ خەباتی قەڵاچۆکردنی نەژادپەرستی نەکردووە تا ئیمرۆ بە دڵنیاییەوە بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر نیازتان وایە مافی کۆمەڵە نەژادەکان بکەنە داردەستی پارێزگاری لە رژێمی نەژادپەرستی، دیارە راستگۆنین لە ناوبردنیشی.

لەو رۆژەوە بۆم دەرکەوت کەوا بەرێز دوکلیرک تووڕەنابێ و زووش وەڵام ناداتەوەو جوامێریشی لەوەدایە گوێ لە قسەکانت رادەگرێت و وتی:

– ماندێلا، بڕوا دەکەیت، منیش وەک تۆ بیردەکەمەوەو ئامانجم وەک تۆیە، لە نووسینەکەتدا بۆ بوتات نووسیبوو، کەوا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و حکومەت هاوکارین بۆ چارەسەرکردنی مەترسی سپییەکان لە دەسەڵاتی رەشەکان، بیرۆکەی مافی کۆمەڵە نەژادەکان کورتکراوەی رامانمانە بۆ رروبەڕووبوونەوەی ئەم کێشەیە.

وەڵامەکەم بە دڵ بوو، بەڵام، وتم: چەمکی مافی کۆمەڵە نەژادەکان لەجیاتی دڵنیاکردنی سپییەکان، رەشەکانی ترساند، بۆیە دوکلیرک وتی:

– باشە با دەستکاری بکەین.

پاشان باسی رەوشی تایبەتی خۆم کردو وتم، ئەگەر سبەینێ ئازادبم، نابمە شوان وناچمە بەرگەڕانێ، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە، ئەگەر ئەو رەوشەی منی تێدا گیرا هەربمێنێ، ئەوا بەناچاری

دووباره دەست بەکاردەبەمەوە، باشترین ڕێگاش بۆ نەمانی ئالۆزییەکە، هەڵگرتنی باری نائاسایی لەسەر حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و هەموو ڕێکخراوە سیاسییەکانی ترو هەڵگرتنی باری نائاسایی لەسەر وڵات و بەردانی گیراوە سیاسییەکان و گەڕانەوەی دوورخراوەکان لە دەرەوە، خۆ ئەگەر حکومەت قەدەغەیی لەسەر کاری حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی هەڵنەگرێت، ئەوا هەرکە من ئازادکرام خۆم بە ئەندامی حیزبێکی قەدەغەکراو دەزانم و وتم:

– بۆیە دەبێ دووبارە بگیرێمەوە، هەر لە دەرگای زیندانەوە..

دیسان دوکلیرک گوێی لە هەموو قسەکانم ڕاگرت، وەنەبێ پێشنیارەکانم بۆ ئەو تازە بێ، وتی، هەموو بابەتەکان جێگای بایەخن، بەڵام بەڵێنی هیچی نەدا، مەبەست لە دیدارەکەش دۆزینەوەی تێڕوانینی یەکتربوو و بەس و ئاشکراشە ئەو هەموو کێشانە بە دانیشتنێک چارەسەر ناکرێت، بەڵام دانیشتنەکە زۆر جێگای بایەخ بوو. وەک چۆن لە دوورگەی روبین چەندین جار بەرپرسی زیندانەکەم لە ناخەوە دەوروژاند، ئەواش ناخی دوکلیرکم وروژاند، بۆ هەڤاڵەکانم لە لۆساکا نووسیم، تێڕوانینی دوکلیرک لەگەڵ سەرکردەکانی تری حیزبی نیشتمانی زۆر جیاوازەو بە قسەیەکی مارگرێت تاتچەر نموونەم بۆ هێنان، کە سەبارەت بە میخائیل گۆرباتچۆڤ وتبووی، ئەمەیان کەسێکی ترەو دەتوانین کاری لەگەڵ بکەین، دوکلیرک وایەو دەکرێت کاری لەگەڵ بکرێت.

* * *

لە ڕۆژی ٢ی فێبرایەری ١٩٩٠دا، لەسەر سەکۆی پەرلەمان و بۆ یەکەم جار و کەس نەکردوو، ئاف دەبلیو دوکلیرک لە وتاری کردنەوەی ئاسایی پەرلەماندا، هەنگاوی یەکەمی هەڵوەشاندنەوەی ڕژێمی نەژادپەرستی و دەروازەی وڵاتێکی دیموکراسی بۆ خوارووی ئەفریقیا ڕاگەیاند. بە چەند وشەی بە جۆشی دوکلیرک قەدەغەی سەر حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی وحیزبی شیوعی و سی و یەک ڕێکخراوی تری سیاسی هەڵگرت. هەروەها ئازادکردنی زیندانییە سیاسیەکان و ئەوانەی بەکاری توندوتیژی پابەندنین ڕاگەیاندو هەروەها سزای لەسێدارەدان و لێپرسینەوە لە چوارچێوەی باری نائاسایی هەڵوەشاندەوەو وتی:

– ئێستاش کاتی دانوستان هاتووە.

ئەو قسانە هەست و نەستی خستە جۆش، دوکلیرک بەیەک چالاکی ئازایانە توانی باری



سروشتی خوارووی ئەفریقیا بژێنێتەوە، لەنێوان شەوو ڕۆژێکدا، جیهانی ئێمەی گۆڕی. پاش چل ساڵ ترسناکی و قەدەغەیی، وا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بۆوە حیزبێکی شەرعی، هیچ ئەندامی بە تاوانی ئەندامیەتی ئەم حیزبەو بە تۆمەتی هەڵواسینی لافیتەی ڕەنگین بە ڕەنگی کەسک و زەرد و ڕەش، یان ناوهێنانی حیزب، ناگیرێت. پاش سی ساڵ توانرا، وتارو وێنەم لە ڕۆژنامەکانی خوارووی ئەفریقیادا بڵاوکرایەوە، هەروەها وێنەو وتاری هەڤاڵەکانی ڕێبازی خەباتیشم ئازادانە پەخش دەکرێت. کۆمەڵگەی جیهانی پێشوازی گەرمیان لەم هەنگاوە ئازایانەی دوکلیرک کرد، بەڵام، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی گلەیی هەبوو، گوایە بارە نائاساییەکە تەواو هەڵنەگیراوەو فەرمان نەدراوە هێزە سەربازییەکان لە چواردەوری شارە ڕەشنشینەکان بکشێتەوە.

لە ٩ی فێبرایەر، ئاگادارکرامەوە کەوا دوکلیرک دەبینم، کاتژمێری شەشی ئێوارە گەیشتمە توینهیوس و دوکلیرک بە بزەیەکی خۆشیەوە پێشوازی کردم و دەستی کوشیم و وتی بەیانی ئازاد دەکرێیت. گەرچی ڕۆژنامەکانی ناوەوە و دەرەوەش پێشبینییان کردبوو، بەڵام بە زانینی ئەم هەواڵە شاگەشکەبووم و چاوەڕوانی بیستنی هەواڵی وا نەبووم و نەمزانی بۆ پێڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە منی بانگ کردووە.

کاردانەوەیەکی توند کەوتە نێوان هزرو خوێنم، حەزم دەکرد هەرچی زووترە ئازادبکرێم و لە زیندانا دەربچم، بەڵام هیچ حیکمەتی وا خێراییم بەدی نەدەکرد، سوپاسی دوکلیرکم کردو وتم، ئەگەر بەیانی دەربچم، هەست بە شڵەژان دەکەم، بۆیە داواکارم ئەمەیان هەفتەیەک دوابخەن تا خێزانەکەم و ڕێکخراوەکەم خۆیان ئامادە دەکەن، پاش بیست و حەوت ساڵ زیندان هیچ نابێ ئەگەر هەفتەیەکی تریش بێتە سەری.

بەم قسەیە دوکلیرک سەرسام بوو بەردەوام بوو باسی بەرنامەی بەردانی منی کرد، بە فڕۆکە دەچیتە جۆهانسبێرگ و لەوێش بە ڕەسمی ئازاد دەکرێیت قسەم بڕی و گازاندەی خۆم پێ وت، من دەمەوێ لە دەروازەی زیندانی فیکتور فیرسترەوە بێمەدەرەوە و سوپاسی ئەوانە بکەم کە خزمەتیان کردم ورێزیش بۆ میللەتی کیپ تاون پێشکەش بکەم. گەرچی من خەڵکی جۆهانسبێرگم، بەڵام وا کیپ تاون بوویتە ماڵم و سی ساڵە تێیدا دەژیم. من بە ئارەزووی خۆم، نەک بە ویستی حکومەت دەگەڕێمەوە جۆهانسبێرگ و وتم: کە ئازادبووم، کاروباری خۆم بە خۆم بەڕێوە دەبەم.

دیسان سەرسام بوو، بەڵام ئەمجارە داوای کرد پرسێ بە ڕاوێژکارەکانی بکات، ڕۆیشت و پاش دە دەقیقە بە ئاکارێکی تاڵەوە گەڕایەوەو وتی:

– ماندێلا، درەنگە و ناتوانرێت بەرنامەکە بگۆڕدرێت.

منیش وتم، من وەڵامی خۆم دایەوەو بەرنامەکەم بە دڵ نییە، ڕەوشەکە ئاڵۆزبوو، سەیرە، گیراو بەردەدرێت و داوای دواخستنی دەکات و خاوەن زیندانیش بە پەلەیەو دەیەوێ بە زووترین کات ئازادی بکات.

دوکلیرک ڕۆیشت و پاش دە دەقیقەی تر بە چارەسەرێکی مام ناوەندی گەڕایەوە، باشە لە زیندانی فیکتور فیرستر ئازادت دەکەین، بەڵام کاتەکە ناگۆڕین.

حکومەت کاتی بەردانەکەمی بە ڕۆژنامەگەری جیهانی ڕاگەیاندبوو، بۆیە نەدەکرا دوا بکەوێت، تێگەیشتم، گفتوگۆ سوودی نییەو لە دواییدا بە چارەسەرییە مام ناوەندیەکە ڕازی بووم، دوکلیرک دوو پێکی ویسکی پڕکردو لە خۆشی ڕێکەوتنەکەمان داوای کرد سەرو پێک هەڵدەین، پێکەکەم هەڵگرت و وام نیشان دا کەوا دەخۆمەوە، چونکە من حەز بە خواردنەوەی کحول ناکەم.

دوای نیوەی شەو گەڕامەوەو بە هەڤاڵەکانی کیپ تاونم ڕاگەیاند کەوا بەیانی ئازاد دەکرێم. ئاگاداری وینیم کردەوەو تەلەفۆنم بۆ بولتر لە جۆهانسبێرک کرد کەوا بەیانی بە فڕۆکە بگەنە کیپ تاون، هەر ئەم شەوە ئەندامانی لیژنەی گشتی پێشوازی لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بۆ داڕشتنی ئەو وتارەی دوای ئازادبوونم پێشکەشی دەکەم هاتن وهەتا بەرەبەری بەیانی مانەوە، لەو ڕۆژە بە جۆش و خرۆشەوە خەوێکی قووڵم لێ کەوت.

## بەشی پێنجەم

# ئازادی

لە رۆژی بەربوونەکەمدا، کاتژمێری چوارونیوی بەیانی بە ئاگاهاتم، ئەو شەوە هەر چەند سەعاتێک خەوم لێکەوت، رۆژەکە، یازدەی فێبرایەری ١٩٩٠ بوو، دوا رۆژەکانی هاوینی کیپ تاون بوو. بەرنامە ئاساییەکانی بەیانم تەواوکرد، وەک، چەند راهێنانی وەرزشی و دەم و چاوشوشتن و نان خواردن، دوایی چەند تەلەفۆنم بۆ چەند پیاوێکی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی و بەرەی دیموکراتی یەکگرتوو لە کیپ تاون کرد. داوام لێکردن بۆ بەربوونەکەم و وتار پێشکەشکردنەکەم خۆیان ئامادە بکەن، دکتۆرەکەی بەندیخانە هات و فەحسی وردو گشتی کردم. من بە بەربوونەکەم زۆر سەرقاڵ نەبووم، بەڵام ئیشەکە هەندێ وردەکاری و فەرمانی پێشینەی ویستبوو، زۆرجار سروشتی ژیان وا دەکات بۆنەی گەورەو نەمر لەژێر قورسایی رەسمیەت و وردەکارییەوە گوم دەبێت.

سەدان کاروباری پێویست بە دانوستان و ئامادەکاری بۆ ماوەیەکی کورت هاتنە پێش. هەندێ لە هاوڕێیەکانی پێشوازی زوو و بە ئامادەیی چاکەوە گەیشتن، لەوانە سیرل رامافوساو تریفر مانویل. دەمویست وتارەکەم بەوە دەست پێ بکەم کە سوپاسی دانیشتوانی دەڤەری بارل بکەم لەسەر ئەو چاودێری و خزمەتەی لە کاتی گرتنمدا پێشکەشیان کردبووم. بەڵام، لیژنەی پێشوازی ئەوەی بە باش زانی کەوا سوپاسی هاوولاتییانی سپیی ناوچەکە بکەم، هەروەها لیژنەکە ئەوەی بە باش زانی کەوا لە گۆڕەپانی گراند باراید بۆ هاوولاتییانی کیپ تاون قسە بکەم.

ئەو کێشەیەی دەبوایە یەکالای بکەمەوە ئەوەبوو، ئایا یەکەم شەوی دەرەوەی زیندانم لە کێندەرێ بەسەر بەرم. من حەزم دەکرد ئەوشەوە لە دەڤەری کیپ فلاتس بەسەربەرم. ئەو ناوچەیە



تایبەتە بە هاوولاتییانی رەش و رەنگینەکان، ئەوەش بۆ هەڤاڵبەندی و هاوکارییان بوو.

بەڵام هاوڕێکانم و دواییش ژنەکەم سووربوون لەسەر ئەوەی ئەو شەوە لە ماڵی قەشە دیزموند توتو بم لە بیشوبس کورت، ماڵەکە خانوویەکی قەشەنگ بوو لە گەڕەکێکی سپییەکان. ناوچەکە بۆ چوونی من پێش گیرانم قەدەغە بوو، بۆیە هەستم کرد کەوا یەکەم شەوی من لەو خانووەو لەم گەڕەکە رەنگدانەوەی خراپی دەبێت، بەڵام لیژنەکە هەر وتیان، ناوچەکە لەسەردەمی ئەم قەشەیە گۆڕاوەو کەسانی جۆرەها تیرەو رەگەزی تیا نیشتەجێکراوەو نموونەی کۆمەڵگایەکی دوور لە نەژادپەرستییە و بۆ هەموو لایەک کراوەتەوە.

بەڕێوەبەرایەتی زیندان چەندین باوڵ و قەفەسی دابوومێ بۆ هەڵگرتنی کەلوپەلەکەم، لەو بیست ساڵەی رابردوودا لە زیندانا چەند شتی کەمم کۆکردبۆوە. بەڵام لەو چەند ساڵەی دواییدا زۆرم کردبوون بە کتێب و کاغەز بارەکەم زۆرببوو. شتەکان هەمووی لە دوازدە باوڵ و قەفەسی پەستا.

کاتی رەسمی بەربوونەکەم سەعات سێی عەسر بوو، بەڵام ئەو فڕۆکەی وینی و ئەوانەی لەگەڵیابوون لە جۆهانسبێرگ هەتا سەعات دوو نەگەیشت، چەند کەسێک گەیشتنە خانووەکە، شوێنەکە وەک ئاهەنگێکی لێهات. ئەفسەر سوارت دوا ژەمی خواردنی بۆ هەموو ئامادەبوان سازکرد، منیش لەبەر ئەوەنا کەوا دوو ساڵە خواردنم بۆ ئامادە دەکات،سوپاسم کرد، بەڵکو زۆرتر لەبەر ئەوەی رەفتاری لە من خۆش بوو، هەروەها ئەفسەر جامیس گریگۆریش هاتە خانووەکەو لەئامێزم گرت، ئەو چەند ساڵەی چاودێری منی لە بوللسمورو دواییش لە فیکتور فیرستر دەکرد هەرگیز باسی سیاسەتمان نەکردو پەیوەندییەکی وا لەنێوانمان پەیدابوو، هەر باس ناکرێت، بە دوورکەوتنەوەم لەو هەست دەکەم هێمنی بە ئامادەبوونی دەدۆزمەوە. کەسانی وەک سوارت و گریگۆری و براند وایان لێ کردم بڕوا بە بنچینەی خۆڕسکی مرۆڤ بکەم، هەتا ئەوانەی بیست و حەوتی تەواو منیان فڕێدایە پشتی شیشبەندی زیندانەوە.

کاتەکە بەشی خوداحافیزی و ماڵئاوایی یەکەیەکەی خەڵکی نەدەکرد، ئاگاداری بەڕێوەبەری بەندیخانەم کردەوە، کەوا، من پاسەوان و بەرپرسی پاسەوانەکان و ئەوانەی خزمەتیان کردووم لەگەڵ خێزانەکانیان لە دەروازەی بەندیخانەکە دەیانبینم و یەکە یەکە ماڵئاواییان لێ دەکەم. بەرنامەکە وابوو، لە ماڵەکەم لەگەڵ وینی بە سەیارە دەچێنە دەروازەی بەندیخانەکە و لەوێش ماڵئاواییان لێ دەکەم.

بەچەند چرکەیەک پێش سەعات سێ، بێژەرێکی دامەزراوی ئێستگەی خوارووی ئەفریقیا

تەلەفۆنی بۆ کردم کەوا چەند هەنگاوێک بە پیادەیی لە دەروازەکە دووربکەوەمەوەو کامیراکانی تەلەفزیۆنی وێنەم بگرن وێنەی هەنگاوەکانم بەرەو ئازادی بگرن. پێشنیارەکەم بە دڵ بوو رازی بووم. هەر لەو ساتەدا وام بۆ هات کەوا بەرنامەکە وا بەرێوە ناچێ وەک چۆن دارێژراوە..!

سەعات گەیشتە سێ و نیو و بەرنامەکە جێبەجێ نەکرا، نیگەران بووم، بە لیژنەی پێشوازیم وت، بەسە، قەبووڵ ناکەم، خەڵکی وا بیست و حەوت ساڵە چاوەڕوانم دەکەن، چیتر نامەوێت چاوەڕێم بکەن. ماڵەکەم بە کاروانێکی گچکە جێهێشت، سەعات پێش چوار بوو، سەیارەکە لە دووری چارەگە میلێک لە دەروازەکە راوەستابوو، دابەزیم و وینی دابەزی و هەردووکمان بە پیادەیی بەرەو دەروازەی بەندیخانەکە رۆیشتین

لە یەکەم نیگادا دیار نەبوو و هەستم نەدەکرد چی دەبێ، کە گەیشتینە دەروازەکە بینیم حەشامەتێکی زۆر لە خەڵک راوەستاون، سەدان وێنەگرو کامێرای تەلەفزیۆنی و رۆژنامەنووسان و هەزارەها کەسیش بۆ پیرۆزبایی هاتبوون. سەرسام بووم و راچڵەکیم، من هەستم نەدەکرد ئەو هەموو خەڵکە ئامادە دەبێ، من عەقڵم هەر بۆ چەند سەد کەسێک و دارودەستەی بەندیخانەکەو خێزانەکانیان و بەس. بەڵام ئەمە هەر سەرەتا بوو، ئێمە پێشبینی شتی وامان نەکردبوو وەک پێویست خۆمان ئامادە نەکردبوو.

کە لە دەروازەکە نزیک کەوتینەوە، دەنگی کامێرا هەندی دەنگی مێگەلێک دەهات، پرسیاری رۆژنامەنووسەکان بەلێشاو بەرەو رووم بوونەوە، تیمە تەلەفزیۆنەکان چوار دەوریان گرتم، لەناو ئەو ئاپورەیەی دەنگی هەڤالانی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەی ئەفریقیایی دەهات. کەشەکە بە جۆش و خرۆش بوو، گەرچی قەرەباڵغ و هەرا بوو، بەڵام کەیف و زەوقی تێدابوو، لەناکاو ئامێرێکی رەشی درێژ لە کەولی دەکرد بینی وام زانی ئەوەش جۆرە چەکێکەو تازە لە ماوەی گیرانمدا دۆزراوتەوە، لێی ترسام، بەڵام وینی تێیگەیاندم کەوا ئەمە مایکرۆفۆنی دەنگە.

گەیشتمە ناو قووڵایی حەشامەتەکە و مەچەکەم بەرزکردەوەو ئامادەبوان هاواریان کردو دڵشادییان نواند، ئای کە هەستم بە سەرفرازی کرد پاش بیست و حەوت ساڵ، خۆشی لە دەمارەکانمدا گەڕان، چەند دەقیقەیەک لەناو حەشامەتەکەدا ماینەوەو دوایی سواری سەیارەکە بووین و بەرەو کیپ تاون بەرێ کەوتین، گەرچی زۆر دڵشادو کامەران بووم، بەڵام هەستم بە دڵتەنگی کرد کە نەمتوانی وەکو پێویست پاسەوانەکان بەرێ بکەم. کە دەروازەی بەندیخانەکەم جێهێشت بیرم لەوە کردەوە کەوا منی تەمەن حەفتاو یەک ساڵی وا دەست بە ژیانی تازە دەکەمەوە.



کەشتەکەم بۆ کیپ تاون چل و پێنج دەقیقەی خایاند، پێش گەیشتنمان بە گۆڕەپانی گراند بارایدی ئاپورەی خەڵکمان بینی. شوفێرەکە لەجیاتی ئەوەی لە خەڵکەکە خۆی لابدات، رووی لە خەڵکەکە کرد، هەموویان بەرەو روومان هاتن، ناچار سەیارەکە راوەستا. خەڵکەکە لە دەرگاو جامەکانی سەیارەکەیان دەدا، وامان لێ هات وات دەزانی لەناو چاوی باهۆزم، پاش گاڤێ، گەیشتینە سەر سەیارەکەو سەیارەکەیان دەهەژاند، بە راستی ترسام لەوەی خۆشەویستی خەڵکەکە بمکوژێت.

شوفێرەکە نیگەران بوو، هەستی بە ترس کرد، ویستی بێتە خوارێ و ئامۆژگاریان بکات، بەڵام من بوارم نەداو وتم، واز بێنە، با چاوەڕێ بین هەتا بە هانامانەوە دێن، ئاڵان بوساک و چەند کەسی تر ویستیان پەرتە بە ئاپورەکە بکەن، هەر ئەوەندەیان ویست، بوارێ بۆ دەرچوونی سەیارەکە بکەنەوە، بەڵام بۆیان نەکرا، لەناو سەیارەکە گیرمان خوارد، بە راستی نەدەکرا دابەزین، یەک سەعاتی تەواو لەناو بەندیخانەی خەڵکدا ماینەوەو لەکاتی وتارخوێندنەوەکەی چاوەڕوانکراودا دواکەوتین. پۆلیس هات و کەم کەم بوارەکەیان خۆش کرد. هەر کە لەناو ئاپۆرەکە دەربازمان بوو، شوفێرەکە بە ئاستی پێچەوانەی هۆڵی شارەوانی بە خێرایی بۆی دەرچوو، بۆیە من بە تووڕەییەوە لێم پرسی.

– ئەتۆ، بۆ کێ دەچیت..؟ «بە رەقی وەڵامی دامەوە».

+ نازانم، لە ژیانی خۆمدا شتی وام نەدیوە.

هەر رۆیشت و دوایی هێوربۆوە و وتم بەرەو ماڵی هاوڕێی پارێزەرم دوللە عمر باژۆ، ماڵەکەی دەکەوێتە بەشە هیندیەکەی شارەکەو با لەوێ کەمێ پشووبدەین. ئەویش بۆ چوونەکەی منی پێ باش بوو، باش هات دوللە و خێزانەکەی لە ماڵەوە بوون، بە دیتنمان سەرسام بوون، لەجیاتی پێشوازی گەرم و بەخێرهاتنی من پاش دابڕانی بیست و حەوت ساڵ وتیان:

– ئەدی بڕیار نەبوو لە گۆڕەپانی گراند بارایدا بن..؟

ساردەمەنیمان لە ماڵی دوللە خواردەوەو پاش چەند ساتێ قەشە توتو تەلەفۆنی کرد، نازانم چۆن زانیبووی ئێمە لەوێین و وتی:

– نێلسۆن، دەبێ ئێستا لە گۆڕەپانی گراند بارایدا ئامادەبیت، جەماوەر هەست بە نیگەرانی دەکات، ئەگەر ئێستا نەگەیتە ئێرە، من بەرپرس نیم، من حەقم نییە، چی روو دەدات، رەنگە شۆرشێ بەرپابێ!!

منیش وەڵامم دایەوە، هەر ئێستا دێم.

کێشەم شوفێرەکەم بوو، دوودڵ بوو بۆ گەیشتن بە گۆڕەپانەکە، بەڵام رازیم کرد. بەرەو شار ڕۆیشتین، بینیمان چوار دەوری هۆڵی شار بە خەڵک گیراوە، بەڵام ئاپۆرەکە کەمتر ببۆوە، شوفێرەکە توانی بگاتە دەروازەی پشتەوەی هۆڵەکە، بۆ نهۆمی سەرەوە سەرکەوتم، لەو باڵەخانە گەورەدا ژوورەکانی پڕ فەرمانبەری سپی بوون، خۆر لەسەر ئاوابوون بوو. کە گەیشتمە باڵکۆنەکە، دەریای پانی خەڵکم بینی، لافیتە بە دەست و بە زەوق و بە پێکەنین و رووخۆش بوون. دەستم بەرزکردەوە، جەماوەرەکە بەهوتافێکی بەهێز وەڵامیان دامەوە، هوتافەکەیان گیانی خەباتی لە هەناومدا بە گڕترکردو هاوارم کرد:

– ئەماندلا: هێز!

– ئەنغاویتو: هێز بۆ ئێمەیە!

– ئەیافریکا: ئەی خودا ئەفریقیا بپارێزە!

–مایوبوی: با ئەفریقیامان بۆ بگەڕێتەوە!

جەماوەرەکە هێور بوونەوەو کاغەزێکم لە گیرفانم دەرهێنا، لە چاویلکەکەم گەڕام دیارنەبوو، دیاربوو لە فیکتور فیرستر لەبیرم چوبوو. چاویلکەی وینیم خواست، دەمزانی بۆ چاوم دەبێت و دەستم بە خوێندنەوەی وتارەکەم کرد:

هاوڕێیەکانم، هەڤاڵەکانم، هاوولاتییانی خوارووی ئەفریقیا، بە ناوی ئاشتی و دیموکرات و ئازادی بۆ هەمومان سلاوتان لێ بێ، من ئێستا وەک پێغەمبەرێک لەبەردەمتان نەوەستاوم، بەڵکو وەک خزمەتکارێکی گوێڕایەڵ بۆ خزمەتی ئێوەو هاوولاتیانی میللەتەکەم خۆم دەبینم، خەباتی بەردەوامی پڕ شانازی ئێوەیە وای کرد کەوا من ئێستا لە پێشتان راوەستم بۆیە ئەو چەن ساڵەی تەمەنم کەماوە لەنێوان دەستتان دادەنێم.

لەناخەوە بۆیان دوام و ویستم بۆیان روون بکەمەوە کەوا من مەسیح نیم، من مرۆڤێکی ئاساییم و بە هاتنی چەندین بارو کەشی نائاسایی بوومە رابەرێک. هەر زوو سوپاسی هەمموو ئەو کەسانەم لە هەموو جیهاندا کرد کەوا دەوریان بینی لە ئازادکردنم، سوپاسی هاوولاتیانی کیپ تاون و حییت و ئولیڤەر تامبۆ و حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی و بزاڤی ئومخونتو وی سیزوی «ئەمکا» و حیزبی شیوعی لە خوارووی ئەفریقیاو بەرەی یەکگرتووی دیموکراتی و کۆنگرەی گەنجان لە خوارووی ئەفریقیا و یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی خوارووی ئەفریقیاو بزاڤی دیتراش



میللی و یەکێتی گشتی خوێندکارانی خوارووی ئەفریقیا ودەستەی ساشی رەش کە بزاڤێکی ژنانەیە کە هەر دەنگی ویژدانی خەبات بوون. هەروەها لە پێش خەڵکەکە سوپاسی ژنەکەم و خێزانەکەم کردو وتم: ژان و ناسۆریان لە ژان وناسۆری خۆم یادتربوو، ئەوەم دەزانی.

لە وتارەکەمدا وتم، دواڕۆژی رژێمی نەژادپەرستی و جیاوازی نەژادی لە خوارووی ئەفریقیا شوێنی نەما، بۆیە پێویستە میللەت دریغی نەکات لە دژایەتیکردنی ئەم رژێمە، ئەو ئازادیەی لە ئاسۆوە لێمان دیارە وامان لێدەکات ئەرک و خەباتی بۆ زۆرتر بکەین. ئەوەم بە باش زانی لێرە ئەوە بڵێم کەوا دانوستانم لەگەڵ حکومەت بۆ ئاسایی کردنەوەی وەزعە سیاسیەکان بووە لە وڵاتدا. پێویستە ئەوە بڵێم کەوا هیچ کاتێ من دانوستان بۆ دواڕۆژی وڵات کردبێت، ویستوومە دیدارەکە لەنێوان حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی و حکومەت بێت.

ئەوەشم راگەیاند کەوا هیواخوازین دانوستانەکەمان کەش و هەوایەکی چاکی بۆ برەخسێت و بگاتە ئامانج و پێویستیمان بە شەڕی چەکداری نەبێت.

هەروەها باسی هێڵە پێویستیەکانی جێبەجێ کردنی ئەم کەشوهەوایەم کرد کە دەبێتە مایەی سەرکەوتن بە پێی جاڕنامەی دیاریکراو لە هەراری ساڵی ١٩٨٩ . ئەوەشم ئاماژە پێدا کەوا هۆکارەکانی سەرکەوتنی دانوستان ئەوەیە کەوا حکومەت باری نالەبار لەسەر وڵات هەڵگرێت و گشت گیراوە سیاسییەکان ئازاد بکات. بە جەماوەری ئامادەبووی گۆڕەپانەکەم راگەیاند کەوا دوکلیرک لە هەموو سەرکردەکانی تری حیزبی نەتەوەیی زۆرتر بۆ ئاسایی کردنەوەی وەزعەکە دوور رۆیشتبوو. ئەوەشم بەبیرهێنانەوە کەوا چەندین جار دوکلێرکم بە پیاوێکی شەریف ناوبردووەو زۆریشم بە بیردێتەوە کە دەبینم ئەو پیاوە بە راست شیاوی ئەم نازناوە نەبووە.

پێویست بوو من لەم کاتەدا بۆ گەلەکەم و بۆ حکومەت نیشان بدەم کەوا من نە لاواز و نە بەزیوم و لەسەر خەباتدا بەردەوامم و سەرنوێ دەست بە خەباتی تازە دەکەمەوەو دووپاتم کردەوە کەوا من ئەندامێکی دڵسۆزو گوێڕایەڵی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقیم و داوام لە جەماوەرە بگەڕێنەوە سەنگەرەکان و کۆششی زۆر بکەین تا دوا میلی کاروانی خەبات ببڕین.

وتارەکەم کۆتایی هات و سواربووین بۆ بارەگای قەشە توتو، کە چووینە ژوورێ لەم حەرەمە ئەمینەدا سەدان دەم و چاو رەش لە پێشوازیماندا بوون. بە دیتنی ئێمە قورگیان بە گۆرانی تەقینەوە. سلاوم لە قەشە توتو کردو بە گەرمی لە ئامێزم گرت. ئەو پیاوە مەزنە، ئازایانە دڵی میللەتی مشت هیوا کردو وشەکانی هیوا دەبەخشێ و رێگای رووناکی لە رۆژانی تاریکیدا دیار

دەکرد. لە ماڵەکەدا خەڵکێکی زۆری دۆست و خزم و ناسیاو ئامادەبوون، بەڵام خۆشترین ساتم ئەوەبوو کە بە تەلەفۆن گوێم لە دەنگی ئۆلیڤەر تامبو بوو لە ستۆکهۆڵمەوە زەنگی دا، یەکسەر دەنگیم ناسیەوە، پاش چەندین ساڵی دوور کە ئەو دەنگەم بیست دڵشادیم بێ سنووربوو، ئەو لەبەر جەلتەی مێشکی و بۆ هەواگۆڕین لە ئۆگستۆی ١٩٨٩ رووی لە ستۆکهۆڵم کردبوو و بەڵێنماندا بە زووترین کات دیدارمان هەبێ.

خەونم ئەوەبوو کە لە زیندان ئازادبم، سواری سەیارەیەک بم و بگەڕێمەوە زێدی خۆم ترانیسکای، سەردانی چیاکان و جۆگەکان و جۆبارەکان بکەمەوە، ئەو زێدەی لێی پەروەردەبووم، هەروەها خەونم ئەوەبوو سەردانی گۆڕی دایکم بکەم، ئەم گۆڕەی بوارم نەبووە هێشتا سەردانی بکەم. بەڵام بەداخەوە بەرنامەکانی حیزب کە بۆم داڕێژرابوون شتی وایان تێدانەبوو، کاری حیزب بواری نەدا جارێ روو لە سەردان و پشوودانێ بکەمەوە لە ترانسکای.

بۆ بەیانی دیدارم لەگەڵ چەند هاورێ کرد بۆ گفتوگۆ لەسەر بەرنامەو ستراتیژەکان.

بە پێی خشتەی کارم دەبێ کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەری هەر ئەو رۆژە ساز بکەم.

باوەشێک بروسکە و پیرۆزباییم وەرگرت، ویستم چاو بە زۆربیاندا بخشێنم، بروسکەی هەموو جیهانی تێدا بوو، ئەوەی لە بیرمە بروسکەی ژنێکی سپی بوو لە کیپ تاون ئەوەی تێدابوو:

من دڵشادم بە ئازاد کردنت و بە گەڕانەوەت بۆ برادەرەکانت و خێزانەکەت، بەڵام وتارەکەی دوێنێت هەتا بڵێیت بێ تام بوو.

لە کۆنگرەی رۆژنامەگەری ئاوادا بەشدارنەببووم، پێش گیرانم، کامێرای تەلەفزیۆنیم نەدیبوو، چونکە زۆربەی دیدارەکانمان بە نهێنی بوو، بەڵام ئەمجارە ژمارەیەکی زۆری رۆژنامەنووسانی جیهان هاتبوون، نەمدەزانی لەگەڵ کامیان قسە بکەم. بە ئامادەبوونی ژمارەیەک لە رۆژنامەنووسی رەش دڵشادبووم. دوانی سەرەکی دیدارەکەم هەر لەو بازنەیە سوڕامەوە کەوا من ئەندامێکی دڵسۆزو پابەندی حیزبم، چونکە چاکم دەزانی ئەندامانی زۆری حیزب لە دەرەوەی وڵات چاویان بڕیبووە هەنگاوەکان و دەیانویست چاک حاڵی بن کەوا من هەر دڵسۆزو خەمخۆری حیزبم. ئەوەشم چاک دەزانی ئەوان پڕوپاگەندەی زۆریان لەسەر رێکخستن بیستبوو، هەروەها بیستبوویان کەوا من ئەگەری وازهێنانم لە خەبات هەیە بۆیە ویستم بە هەموو جۆرێک ئاگاداریان بکەمەوە، کە پرسیاری ئەوەیان لێ کردم، حەز دەکەیت لە کام پایەی حیزبیدا کاربکەیت، من لە وەڵامدا وتم، هە پایەک



حیزب بە شیاوی بزانێ من پابەندی دەبم.

بە رۆژنامەنووسانم راگەیاند کەوا من هیچ دژایەتی بۆ هاوکاری خەباتی چەکدارو دانوستان ناکەم. چونکە ئەو راستییە ناشاردرێتەوە کەوا ئەنجامی خەباتی چەکداری بوو، حکومەتی هێنایە سەرمێزی گفتوگۆ، ئەوەشم وت، ئەوکاتەی حکومەت وازی لە توندوتیژی هێنا، حیزبیش بە ئاشتی وەڵامی دەداتەوە. بۆ هەڵگرتنی ئابڵۆقەی نێونەتەوەیی چەسپاو لەسەر خوارووی ئەفریقیا کە لەبەر چەوساندنەوەو پێشێلکردنی مافی رەوای سیاسی رەشەکان و ئەوەش هێشتا ماوە بۆیە کەمکردنەوەو سووککردنەوەی ئەم ئابڵۆقەیە جارێ بە رەوا نازانین، وتم، راستە من لە بەندیخانە ئازادکرام، بەڵام ئازاد نیم.

لە مەترسی سپییەکان پرسیاریان کرد، دەمزانی ئەوان هەست دەکەن رقم لە سپییەکانە، بەڵام من رقم بەرامبەریان هەرگیز نەبووە، رقم بەرامبەریان لە زیندانا کەم بۆوە، بەڵام رقم بەرامبەر نەژادپەرستی و جیاخوازی زۆرتر بوو، من سووربووم لەسەر ئەوەی خوارووی ئەفریقیا تێبگات کە من دوژمنی خۆشم خۆش دەوێت و رقیشم لە رژێمە کە ئەو دوژمنارییەی لەنێوانماندا دروستکرد.

بە رۆژنامەنووسانم راگەیاند کە سپییەکان دەتوانن دەور لە نوێکارییەکان ببینن کە لە داهاتوودا دێنە پێش، ئەوەشم چاک لە هزر و بیری خۆمدا ئاخنیبوو. ئێمە ناخوازین وڵات کاول بکەین، بەڵکو گەرەکمانە ئازادی بکەین، ناخوازین سپییەکان دوورەپەرێز راگرین و جیایان بکەینەوە چونکە ئەوەیان وڵات بەرەو هەڵدێر دەبات، ئاماژەم بەوە کرد کەوا لەنێوان مەترسی سپییەکان و هیوای رەشەکان ناوچەی ناوەند هەیە، ئێمەش لە حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی خوارووی ئەفریقیدا ئەم ناوچەمان دەست نیشانکردووەو هەروەها وتم سپییەکان هاووڵاتین لە خوارووی ئەفریقیادا، دەخوازین هەست بە هێمنی و دڵشادی بکەن و کار بۆ گەشەی وڵات بکەن. هەرکەسێ، چ ژن، چ پیاو دژایەتی رژێمی نەژادپەرست بکات لە ئامێزی دەگرین بۆ خەبات لە پێناوی وڵاتێکی دیموکراتخوازی یەکسان لە خوارووی ئەفریقیادا، دەبێ هەموو کۆششێک بکەین کەوا براکانی سپی رازی بکەین کەوا خوارووی ئەفریقیای بێ نەژادپەرستی دەبێتە وڵاتێکی باشتر بۆ هەموومان.

لە یەکەم دیداری رۆژنامەگەریدا زانیم دەیانەوێت و سوورن لەسەر ئەوەی هەست و پەیوەندییە کەسایەتییەکانم بزانن و لە بۆچوونە سیاسییەکانم بگەن. ئەوەش بۆ من شتێکی تازە بوو. کە چوومە زیندان ئەوەم بەبیردا نەدەهات رۆژنامەنووسێ پرسیار لەسەر ژنەکەم و خێزانەکەم و سۆزو ساتە تایبەتییەکانم بکات، لەوەش دەگەیشتم کەوا ئێشیان بە زانینی ئەو نهێنیانەیە بۆیە زەحمەت

بوو بتوانم رازییان بکەم و لاشم ئاسان نەبوو بتوانم هەستە تایبەتییەکانم بدرکێنم. زۆرجار پرسیارم لێ دەکرا شعورم چی دەبێت ئەگەر ئازادبم، دەمویست پێناسەیەکی وا بکەم نەکرابێت جا ئەوەش بە من نەدەکرا. رۆژێ نەبوو من بتوانم پێناسەیەکی ویستی تایبەتی خۆم ئاشکرا بکەم و پرسیاریشم لێ دەکرا ئەگەر رۆژێ ئازادبم دەتوانم ئەمە بکەم و بۆ ئەوەش زۆر جار دەسەلاتم نەبووە.

ژنی قەشە توتو لە جۆهانسبێرگ پاش کۆنگرە رۆژنامەگەرییەکە تەلەفۆنی کردو وتی هەر چەندی زووە خۆتان بگەیێنە ئێرە. من و وینی دەمانویست لە کیپ تاون کەمێ پشوو بدەین، بەلام بەپێی ئەو پەیامەی بەدەستمان گەیشت دەگوترێت کەوا میللەت نیگەرانەو کەشەکە بەرەو ئاژاوە دەچێت ئەگەر ئێوە نەگەینێ خراپ دەکەوێتەوە، ئێوارە بە فرۆکە بەرەو جۆهانسبێرگ فڕین وتیان هەزارەها کەس لە رەخ خانووی ژمارە ٨١١٥ ئورلاندو ویست چاوەڕێن، خانووەکە نوێ کرابۆوە، زۆر پەرۆشی ئەوەبووم شەوی دووەم ئازادانە لەگەڵ وینی لە خانووە تایبەتییەکەی خۆم بەسەر بەرم، زۆر حەزم دەکرد، بەلام ئەو شەوەش لە ماڵی هەڤاڵێکی حیزب بووم لە گەڕەکێکی باکووری شاردا.

بۆ بەیانی بە هەلیکۆپتەر بەرەو ئەستادفیرست ناشیونال بانک لە سوێتو فڕین، لەناو فڕۆکەوە شارەکە دیاربوو، قەرەباڵغ، خانووەکان بە قەپێلکی شقارتە دەچوون، خانووەکانی تەنکەو رێگاکانی خۆڵاوی. ئەو شارە دایکی شارەکانی خوارووی ئەفریقیایە. زێدی راستەقینەی من بوو، هەرچەندی شارەکە گەورەو گەشاوە ببوو، ئەوەندەش خەڵکەکەی برسی و رووت و بێ کارەباو ئاو و زێراب دەژیان، ژیانی ئەم خەڵکە شەرمەزاری بوو بۆ وڵاتێکی دەوڵەمەندی وەک خوارووی ئەفریقیا، خەڵک لێرە زۆر لە جاران رووت و برسیترن.

ئێمە لەسەرەوەی ئەستاد بووین، نزیکەی سەدوبیست هەزار کەس لە خوارەوە کۆببوونەوەو فرۆکەکە لەناوەندیان نیشت. ئای کە دڵشادبووم کە دووبارە هاتمەوە ناو کەسوکارو زێدەکەم و ئەوانەی تاڵی ژیان رووتی کردبوونەوە. وتم، دەبێ منداڵەکان بچنەوە بەرخوێندن و تاوان نەمێنێ، زانیبووم کەوا چەندین تاوانباری گەورە بە ناوی خەبات و شۆڕشگێڕی هەڕەشە لە لانەوازان دەکەن و ئاگر لە سەیارە بەردەدەن، ئەوانە لە گۆڕەپانی خەباتدا جێگایان نابێتەوە. ئازادی بێ یاساو ئازادی بێ ئاشتی و هێمنی ئازادی راستەقینە نییە، لە سوێتو وتم:

ئێمڕۆ کە گەڕاومەتەوە سوێتو دڵشادو بەختیارم، هاوکات هەست بە خەمێکی قووڵ و ژانیش دەکەم، بەداخەوە هێشتا لەژێر رکێفی رژێمێکی ستەمدار دەناڵێنن، تەنگژەتان زۆرە، بێ خانووبەرەن، بێ قوتابخانەن، بێ کارن و تاوانیش زۆرە. چەند هەست بە شانازی دەکەم کەوا من



هاووڵاتییەکی سوێتوم، ئەوەندەش دڵ بەژانم لەبەر بوونی زۆری تاوان، زۆرم لەسەر تاوان لێرە لە رۆژنامەکان خوێندەوەو رێژەی تاوان بەرزە. لەوە تێدەگەم کە کێشەکەتان زۆرەو پێویستیەکان بێ ژمارە، بەلام دەڵێم دەبێ رێژەی تاوان لەم شارەدا کەم بکرێتەوەو بە زووترین کات ئەم دیاردەیە بنبڕ بکرێت.

وتارەکەم بەوە کۆتایی پێ هانی باوەشم کردەوەو سینگم والاکرد بۆ کەسانی خێرخواز ونیەت چاک و ئەوانەی هاوکارمان دەبن لە خەبات بۆ دامەزراندنی وڵاتێکی دیموکراتی بێ نەژادپەرستی یەکگرتوو لە خوارووی ئەفریقیاو دان بە مافی هەڵبژاردنی گشتی بنێ بۆ ئەو کەسانەی ناویان لە لیستی دەنگدان هەیە. ئەمەیە گوتاری حیزبەکەمان، لەو چەند ساڵەی گیرانمدا ئەمەم لەبەرچاودا بوو، هەر بۆ ئەم مەبەستەش خەبات دەکەم و ژیانم لەپێناویدا درێژە پێدا.

ئەو خەونەم لە خەیاڵدا بوو کە گیرام، تەمەنم چل وچوار ساڵ بوو، ئێستا ئەو گەنجەی جاران نیم و تەمەنم حەفتاو یەک ساڵە و کاتی ئەوەم لە ژیاندا نەماوە بۆ خەیاڵ بە فیڕۆی بدەم.

ئەو شەوە لەگەڵ وینی گەڕامەوە ژمارە ٨١١٥ ئورلاندو ویست، لەوێ هەستم کرد کەوا بە راستی لە زیندانا نەماوم. ئەو ماڵە لە جیهاندا ناوەندی کێشم بوو، دڵی جیهانە لە جوگرافیای ژیانمدا، ئەگەر وا بگوترێت. کە ئاگر لە خانووەکە بەردرا، هەر چوار ژوورەکە نوێ کرایەوە، کە یەکەم جار چاوم پێ کەوت بچووکتر لە دیدو بۆچوونم بچووکتر هاتە پێش چاوانم، سادەتر بوون. رووبەرەکەی هەر هەندی بەشی خزمەتکارەکان بوو لەو زیندانەی فیکتور فیرستر کە تێدا دەژیام. بەلام ئەو خانووەی پیاو سەربەست و ئازاد تێدا بژی، کۆشکێکە بەرامبەر گەورەترین زیندانی جیهان.

هەرچەندە دڵشادبووم، بەلام هێشتا هەستم دەکرد وەک جاران ئازاد نیم، غەریبی ئەو ژیانەی جارانم دەکرد، کە گەنج بووم، سەرەتای ژیان و کارم بوو، کە بەیانیان بە زەوقەوە بۆ نووسینگەکەم دەچووم و ئێواران بە کامەرانییەوە دەگەڕامەوە ناو خێزانەکەم. کە لە ماڵەوە دەردەچووم و لە دەرمانخانەکە کرێمی ددان شوشتنم دەکڕی و هەتا درەنگانی شەو لەلای برادەران دەمامەوە، ئەو شتە سادانەی کە مرۆڤ لە زیندانا حەزیان لێ دەکات زۆرن و خەونی وایە ئەگەر ئازادبوو بگەڕێتەوە وایکات. واتازە دەزانم، ئەوان رۆیشتن و ناگەڕێنەوە، ئەم شەوەو سەدان شەوانی تر ماڵەکەم جمەی دەهات لە میوان لەوانەی بۆ پیرۆزبایی دەهاتن، گۆرانیان دەووت و سەمایان دەکردو ئاهەنگیان گەرم بوو و گەڕەکەکەیان بە جۆش خستبوو، ئەوان کەسوکارو خزم و میللەتەکەمن

ناتوانم لەو شادییە دووریان بخەمەوە، خۆ ئەگەر من خۆیان بۆ تەرخان بکەم ئەوا لە خێزانەکەم دەبم.

ئەو شەوە زۆر نەنووستین، هەتا بەیانی ئاهەنگ بوو، دوایی پیاوانی حیزب و بەرەی دیموکراتی یەکگرتوو کە پاسەوانی ماڵەکەیان دەکرد لە خەڵکەکە پاڕانەوەو وتیان، بەسە، کاتی پشوودان و خەوتنە، دۆستانی حیزب ئامۆژگارییان کرد بگوازمەوە ئەو خانووەی وینی لە پاش من لە دیکلوف دروستی کردبوو، خانووەکە کەمێ دوور بوو، لەچاو خانووەکانی سویتو خانوویێکی مەزن بوو. بەڵام ئەوەیان هیچی بۆ من نەدەگەیاندو یادگاری منی پێوە نەبوو.

گەورەیی و شکۆی خانووەکە بۆ سەرکردەیەکی میللی وەک من شیاو نەبوو، بۆیە ئامۆژگاریەکەم قەبووڵ نەکرد چونکە من هەر دەمویست لەنێو میللەتەکەمدا بژیم، دەمویست وەک میللەتەکەم بژیم.

* * *

کاری یەکەمم دەبوایە لەگەڵ سەرکردایەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی کۆبوونەوە بکەم، پاش دوو هەفتە فڕیم بۆ لۆساکا بۆ دیداری لیژنەی تەنفیزی گشتی حیزب، دیدارەکە خۆش بوو، لەگەڵ هەندێ هاوڕێ دیدارم بوو سی ساڵ بوو یەکترمان نەدیبوو. لە دیدارەکەدا چەند سەرۆکی وڵاتانی ئەفریقی ئامادەببوون، لەوانە رۆبرت مۆگابی لە زیمبابوێ و کینیث کاوندا لە زامبیاو بویت ماسیری لە بۆتسواناو یواگیم شیسانو لە مۆزەمبیق و هوسی ئەدواردو دو سانتوس لە ئەنگۆلاو یوبری موسیفینی لە ئۆگەندا.

چەندی هاوڕێیانی لیژنەکە بە ئازادکردنم دڵشادبوون، ئەوەندەش پەرۆشی ئەوە بوون منی ئازادکراو لە زیندانا هەڵسەنگێنن، ئەو مەزەندانەم لە چاویان بەدی دەکرد: ئایا ئەمە ئەو ماندێلایەیە کە پێش بیست و حەوت ساڵ خرایە زیندان؟ ئایا گۆڕاوە؟ لەسەر هەڵوێستەکەی خۆی ماوە یان گۆڕاوە؟

حەقیان بوو، وا پرسیارو مەزندە بکەن، زانیبوویان لەگەڵ حکومەتدا دیدارم بووە، حەقیان بوو، نیگەران بن.! من لە گۆڕەپانەکە دوورم، هەتا ساڵی ١٩٨٤ نەمدەتوانی لەگەڵ هاوڕێیانی ناو زیندانیش دا دیدارم هەبێت.

لەسەرخۆ و بە وردی وردەکاری دیدارەکەم لەگەڵ حکومەت بۆ باسکردن.

داواکاریەکانم بۆ ژماردن کە داوام کردوون، ئەوانەی جێبەجێ کراون. هەردوو راپۆرتەکەی پێشکەشی (بوتا)و (دوکلیرک)م کردبوو، نیشانم دان. کە بینیان زانیان لە هێڵی حیزب و



سیاسەتەکەی دەرنەچووم. دەمزانی هەندێ لەو گیراوانەی ئازادکرابوون چووبوونە لۆساکاو چرپاندبوویانە گوێیت گوایە «مادیبا شلی کردووەو لایەنگیری رژێمەو فێرە لەبەرکردنی جلی سێ پارچە بووەو دەخواتەوەو خواردنی بە تام و چاکیش دەخوات». ئەوانەم هەمووی دەزانی، بۆیە بە هەموو شێوەیەک دەمویست ئەم پروپاگەندانە پووچ بکەمەوە، ئەوەشم بە روون و ئاشکراو بێ پێچ و پەنا هەمووم بۆ گێڕانەوە، ئەوەی کردبووم و ئەوەی وتبووم.

لە دیدارەکەدا بە جێگری سەرۆکی حیزب هەڵبژێردرام و ئەلفرید ئەنزو سکرتێری گشتی بە سەرۆک بە وەکالەتی ئۆلیڤەر تامبو هەڵبژێردرا، لە کۆنگرەی رۆژنامەگەرییەکەی پاش دیدارەکە پرسیاری ئەوەم لێکرا، گوایە سەرۆکی زامبیا دکتۆر کاوندای هەڤاڵی دێرینی حیزب پێشنیاری کردووە:

کەوا من تازە ئازادکرام و ئەوەش ئەوە دەخوازێت با حیزب شەڕی چەکداری لەناو خوارووی ئەفریقیادا راگیرێت، ئێمەش لەگەڵ پێزانینمان بۆ زانیاری دکتۆر کاونداو هەڤاڵبەندی زۆری بۆ کێشەکەمان وەڵاممان دایەوە، هێشتا زووە، کاتی راگرتنی شەڕی چەکداری نەهاتووەو ئامانجەکانی کە چەکمان بۆیان هەڵگرت جێبەجێ نەکراون. هەروەها وتم لە بازنەی بەرپرسیدا نییە بە ناوی حیزب بەرێز دوکلیرک کۆشش بکات راستڕەوە هاوڕێیەکانی رازی بکات.

گەڕانێکم لەناو وڵاتانی ئەفریقیادا کرد، شەش مانگی یەکەمی ژیانی پاش بەربوونم لە دەرەوەی خوارووی ئەفریقیا بەسەربرد، لە هەموو شوێنەکان بە گەرمی لەلایەن جەماوەرەوە پێشوازی دەکرام، گەرمی ئەو پێشوازیانە بوو ماندووبوون و ئەرکەکانی سووک دەکردمەوە. لە دار السلام دا نیو ملیۆن کەس هاتنە پێشوازییم.

لە گەشتەکانمدا زێدە سەرفیراز بووم، ئارەزووم بوو کۆن و نوێ ببینم و تامی جۆرەها خواردن بکەم و لەگەڵ جورەها خەڵک دوان بکەم. دەبوایە خۆم لەگەڵ ئەو کەش و جیهانە تازە بگونجێنم کەوا جیاوازن لەگەڵ ئەو کەشەی پێش گیرانم هەبوون، جیهان گۆڕاوە، گۆڕان لە پەیوەندییەکانی راگەیاندن و گەیاندن بووەو شتەکان زۆر خێران و ئاسان نییە مرۆڤ بیانگاتێ. وینی دەیویست پێم بسەلمێنێ کەوا کارو فەرمانەکانم سووکتر بکەمەوە و سووربوو لەسەر ئەوەی سوود لەو کەشە باشانە وەرگیرێن کەوا هاتونەتە پێش و جۆرەها مەبەست و شێوە بەکاربهێنن.

پاش دیدارم بە سەرۆکی میسری حوسنی موبارەک لە قاهیرە لە شوێنێکی تری شارەکە وتارێکی گشتیم پێشکەش کرد. خەڵکێکی زۆر ئامادەببوون و پێویستییەکانی راگرتنی ئاسایش و

هێمنی کەم هەستی پێدەکرا، بۆیە بە پیاوێکی پۆلیسم وت وا باشە داوای یارمەتی بکەن،بەڵام ئەو شانی جووڵاندو بایەخی بە قسەکەم نەدا. لەگەڵ وینی لە ژوورێکی پشتەوە چاوەڕێ بووین و دوایی پۆلیسەکە ئیشارەتی کردین بۆ دەرچوونم بەرەو سەکۆکە، داوام کرد، وەفدەکە پێش من بێنەدەرەوە، نەوەک بکەومە بەر شاڵاوی خەڵکەکەو لە وەفدەکە دابڕێم، بەڵام ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی من پێشکەوم، منیش پێشکەوتم و ئەوەی هەستم پێدەکرد رووی دا.

کەوتمە ناو دەریایەک خەڵک، پاڵدانێک بوو بۆ هەموو لایەک، لەم ئاپۆڕەدا پێڵاوەکەشم گوم بوو. کە کەشەکە هێوربۆوە شوێنەواری ژنەکەم و پێڵاوەکەم دیارنەبوون، پاش نیو سەعات وینی لە تەنیشتم لەسەر سەکۆ پەیدابوو و لەبەر ئاژاوەکە تووڕە دیاربوو، لەبەر هاواری خەڵکەکە، کەوا پێکەوە هاواریان دەکرد «ماندێلا، ماندێلا» و بە بێ راوەستان قسەم پێ نەدەکرا. ناچار بەبێ پێشکەشکردنی وتارەکەم هۆڵەکەم جێهێشت و خۆم و تاکێک پێڵاوو ژنێکی سەرسام و بێدەنگ هاتمە دەرێ.

لە قاهیرەدا کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریم سازکرد، لەوێ رامگەیاند کەوا حیزب ئامادەیە چاو بە شەڕی چەکداریدا بخشێنێتەوە، ئەوەش ئیشارەت بوو بۆ حکومەت. هەردوولا ئیشیان بۆ خولقاندنی کەشێک بۆ سەرگرتنی دانوستانی سەرکەوتوو دەکرد. حیزب داوای ئاسایی کردنەوەی وەزعەکانیان لە وڵاتدا دەکرد وەک هەڵگرتنی باری نالەباری و ئازادکردنی گیراوە سیاسییەکان و هەڵگرتنی هەموو بڕیارەکانی رژێمی نەژادپەرستی. حکومەتیش سووربوو لەسەر ئەوەی حیزب واز لەشەڕی چەکداری بێنێ. گەرچی ئامادەیی خۆمان بۆ راگرتنی شەڕ نیشان نەدابوو، بەڵام بەرێز دوکلیرکمان هان دەدا بۆ هەنگاوی چاکسازی و گۆڕان، ئەوەشمان لا روون بوو کەوا دەبێ ئێمە واز لەم شەڕە بهێنین و ئەوەش رابگەیێنین، تا رێگای دانوستان خۆش بکەین و نیازپاکی خۆمان ئاشکرا بکەین و بۆ ئەوەی بەرێز دوکلیرک بتوانێ سەلماندنی مادی نیشانی لایەنگیرە سپییەکان بۆ دەنگ پەیداکردن بدات لە خوارووی ئەفریقیادا بۆ سەرکەوتنی سیاسەتەکانی.

لە ئەفریقیاوە بەرەو ستۆکهۆڵم بۆ سەردانی ئۆلیڤێر بەڕێکەوتم، بۆ دیدار و دیتنی دۆستی دێرین و شەریکی نووسینگەی پارێزەریم زۆر عەوداڵ و پەرۆش بووم و لە هەموو دیدارەکانم لا خۆشتربوو، ئەو تەندروستی باش نەبوو، لەم دیدارەدا هەردووکمان بووینە منداڵ و خۆشەویستی قووڵی نێوانمان ئێمەی خستە باخچەیەکی سەرفرازی، گەڕاینەوە بیرەوەریەکانی زەمانی کۆن، بەڵام کە بواری بۆ هات هاتە سەر باسی سەرکردایەتی حیزب و وتی: نێلسۆن، بێویستە ئێستا سەرکردایەتی حیزب



وەرگریت و هەتا ئێمرۆ بە فەرمانی خۆم هەڵسام و کورسییەکەم پاراست و چاوەڕێی تۆ بووم.

بەرپەرچم دایەوەو وتم تۆ رێکخستن لە دەرەوە لە من جوانتر بەرێوەبردووەو وەرگرتنی سەرۆکایەتی بەم شێوەیە نە راستی و نە دیموکراتیشە.

– رێکخستن تۆی بە سەرۆک هەڵبژاردووە، واز بێنە هەتا کاتی هەڵبژاردن دێت و رێکخستن کێ هەڵدەبژێرێت ئەو شیاوە.

ئۆلیڤەر قسەکانی منی بە دڵ نەبوو و منیش سووربووم لەسەر بۆچوونەکەم، ئەم کە منی دەست نیشان دەکرد لەبەر سادەیی و خۆشحاڵی خۆی بوو بۆ دوورکەوتنەوە لە خەبات، بەڵام ئەوەیان لە بنچینەو راستییەکانی حیزب نەدەوەشایەوە.

لە ئەپریلی ١٩٩٠ چوومە لەندەن بۆ بەشداربوون لەو ئاهەنگەی بۆ رێزلێنانم لە ئەستادویمبلی ناودار کە لەسەر شەرەفی من سازکرابوو، لەم ئاهەنگەدا ژمارەیەکی زۆری هونەرمەندان بەشداربوون کە من زۆریانم نەدەناسی، ئاهەنگەکە بە تەلەفزیۆن لە زۆر بەشی جیهان پەخش کرا، لەوێش ئەوەم بە هەڵ زانی سوپاسی بێ پایانی ئەو لایەن و هێزانە بکەم کە هاوکاری نەمانی دژایەتی نەژدان و کاریان کرد بۆ چەسپاندنی ئابلۆقە لەسەر حکومەتی خوارووی ئەفریقیاو داواکاربوون بۆ رزگاربوونم لە زیندانا و کۆششیان بۆ ئازادی زیندانی سیاسی بەردەوام بوو و هەروەها یارمەتی و کۆمەکیان بۆ خەڵکی زەحمەتکێشی وڵاتەکەم نارد.

* * *

کە من لە زیندانا دەرچووم، پێشەوا مانگوسوتو بوتیلیزی سەرۆکی حیزبی ئازادی ئەنکاتاو سەرۆک وەزیرانی کوازولو یەکێک لە کەسایەتییە گەورەکانی گۆڕەپانی سیاسی بوو لە خوارووی ئەفریقیا. بەڵام لەناو رێکخستنەکانی حیزبی کۆنگرەی ئەفریقی جەماوەری زۆری نەبوو، پێشەوا بوتیلیزی لە بنەماڵەی مەلیک زولوی مەزن سیتیوایوە کە لە شەڕی ئەساندلواناى ساڵی ١٨٧٩ ئینگلیزەکانی شکاند. خوێندنی لە کۆلێژی فورت هیر تەواو کردبوو و دوایی هاتبووە ناو کۆمەڵەی خوێندکارانی سەر بە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، وەک سەرکردەیەکی دیاری کۆمەڵەم دەزانی، بە رەزامەندی نهێنی حیزب کرایە سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوازولو.

حیزب گازاندەی نەبوو لەسەر دامەزراندنی حیزبی ئەنکاتا وەک رێکخراوێکی رۆشنبیری بۆ زولو، بەڵام دوایی هێدی هێدی پێشەوا بوتیلیزی لە حیزبی کۆنگرە دوورکەوتەوە. گەرچی دژایەتی زۆری رژێمی نەژادپەرستی دەکردو دژی جاڕنامەی کوازولوە وەک هەرێمێکی سەربەخۆ لەلایەن

حکومەتەوە، بەڵام ئەو، واتە بوتیلیزی هەر درکێک بوو لە جەستەی بزاڤی دیموکراتی، دژی شۆڕشی چەکداری بوو و رەخنەشی لە سەرهەڵدانی سویتوی ساڵی ١٩٧٦ دەگرت و هەڵمەتێکی فراوانیشی دژ بە نێونەتەوەییەکانیش بەرپاکردبوو.

پێشەوا بوتیلیزی یەکێک لەوانەبوو هەر زوو بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کردو سوپاسی هاوکاریم کرد، هیوادار بووم بە زووترین کات دیدارمان هەبێ بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کێشەکان و دۆزینەوەی چارەسەر. کە سەفەری لۆساکام کرد باسی دیدارەکەم کرد، بەڵام قەبووڵ نەکرا. لە بیرمە کە لە زینداندابووم ولتر لەلایەن مەلیک زولو گودویل زویلیتینی داوەتکرابوو بۆ سەردانی ئولاندی پایتەختی هەرێمی کوازولو من هانم دا و ئەویش داوەتەکەی قەبووڵ کرد، ئەوەم بە چاک زانی کەوا سۆزی گەورەترین خێزانی مەلەکییەت بۆ کێشەی خواروی ئەفریقیا راکێشین و بە هەڵێکی سوودبەخشم زانی. لیژنەی تەنفیزی گشتی حیزبیش وەک هەڵوێست رازی بوو بە مەرجێک ولتر دیداری مەلیک لە کۆشکی شا لە نونگوما بکات، لیژنەکە بەوە دڵنیادەبوو چونکە ئەگەر دیدارەکە لە ئولوندی بوایە بە دانپێنانی رەسمی دەسەڵاتی هەرێم دەزانرا.

کە لە لۆساکا گەڕامەوە تەلەفۆنم بۆ پێشەوا بوتیلیزی و مەلیک کردو پێم راگەیاند کەوا ولتر دێتە سەردانی مەلیک لە نونگوما نەک لە ئولوندی، بەڵام مەلیک سووربوو لەسەر ئەوەی دیدارەکە لە پایتەخت بێ و وتی:

– من مەلیکم، منیش داوەتم کردووە بۆ سەردانم لە ئولوندی، مافی ئەو نییە شوێن و کاتی دیدارەکە دەست نیشان بکات.

– خاوەن شکۆ، ئێمە تووشی شەپۆلێک بەرهەڵستی لەلایەن ئەندامەکانمان هاتووین کەوا بەم سەردانە ناڕازین و نایانەوێت ولتر بێتە هەرێمی کوازولو، بەڵام بە کۆششی زۆر توانرا بگەینە چارەسەریەکی مام ناوەندی، بۆیە منیش دڵنیام تۆش دەتوانی کەمێک لە مەرجەکانت دابەزیت.

بەڵام رازی نەبوو و دیدارەکەشی هەڵوەشاندەوە.

پەیوەندیمان ئاڵۆزبوو، لە مایۆ توانیم حیزب بەوە رازی بکەم، هەفتەیەک پێش دیدارەکە نامەیەکی گەیشتە دەستم و تێدا داواکارم من تەنیا بچم بۆ دیدارەکە، ئەمەیان دوا پوش بوو لە دەستمدا مابوو، بۆیە بەمە لیژنەی تەنفیزی گشتی حیزب ئەم داوایەی رەتکردەوە، داوام لە مەلیک کرد کەوا من دەتوانم بە هاوڕێیەتی برادەران بێم، ئەویش، ئەمەی بەکەم زانی و دیدارەکەی هەڵوەشاندەوە. دانانی دۆستایەتیەک لەگەڵ مەلیکدا، جیاوازی زۆری هەبوو لەگەڵ پەیوەندیم



لەگەڵ پێشەوا بوتیلیزی، مەلیک میراتگری شەرعی فەرمانڕەوایەتی زولوە خەڵکەکەشی خۆشیان دەوێت و رێزی دەگرن.

هەروەها دڵسۆزی بۆ مەلیک لە کوازولو بە هێزو قووڵترە لە دڵسۆزی بۆ حیزبی ئەنکاتا.

لەو کاتانەدا ناتال بووە گۆڕەپانی رژانی خوێن، لایەنگیران و چەکدارانی حیزبی ئەنکاتا شەڕیان دژ بە بارەگاکانی حیزب هەڵگیرساند، گوندیان سوتاند سەدان کەس کوژراو بریندار هەبوون و هەزارەها کەسیش ئاوارەبوو، لەمارسی ١٩٩٠دا دوو سەدوکەس لە شەڕی ناوەخۆدا کوژران. لە ناتال زولو زولوی لەبەر جیاوازی بۆچوونی حیزبی دەکوشت، یەکێکیان لە حیزبی ئەنکاتاو ئەوی تریان لە حزبی کۆنگرەی نیشتمانی بوون، لە فێبرایەرو دوو هەفتە پاش بەربوونم وتارێکم لە باخچەی مەلەکی پێشکەش کرد، دوو سەد هەزار کەس ئامادەبوون، زۆربەیان زۆلۆ بوون، لەوێ لێیان پاڕامەوە، چەکیان فرێ بدەن و دەست لەناو دەستی یەکتر بنێن و بۆ ئاشتی هاوکار بن، ئەو رۆژە وتم «تفەنگ و چەقۆ و تیرەکانتان فرێ بدەنە ناو دەریا، دەروازەی کارگەکانی مردن داخەن. یەکسەر ئەم شەڕە راگرن. ! بەڵام بۆ کێ قسە دەکەیت، بانگی زیندوان دەکەیت،شەڕ هەر بەردەوام بوو قوربانیش بێ ژمار.

لەبەر نیگەرانیم لەو وەزعە، ئامادەبووم بچمە هەرشوێنێک بۆ دیداری پێشەوا بوتیلیزی. لە مارسدا، پاش تێپەڕبوونی کوشندە ترین و سامناکترین رۆژگاری شەڕدا، بە تەنیا و یەک لایەنە، بڕیاری دیدارم لە نزیک شاخی بیتر ماریتزگ دا، وەک کەسێ، پەیوەندیمان بە هێز بوو، رێزگرتنمان لەنێواندا پتەوبوو، هیواشم زۆربوو دیدارەکەمان بەرەو ئاشتیمان ببات، بەڵام بۆم دەرکەوت کەوا سەرکردەکانی حیزب لە ناتال رقیان لەم دیدارە هەیەو بەکارێکی ترسناکیان زانی و بۆ جێبەجێ نەبوونی ئیشیان کرد. چوومە بیترماریتزبیرگ و سەردانی گۆڕی قوربانیانی حیزبم کرد کە لەوێ کوژرابوون و سەرەخۆشیم پێشکەشی خانەوادەیان کردو دیدارم لەگەڵ پێشەوا بوتیلیزی نەکرد.

* * *

پاش گفتوگۆیەکی درێژ لەنێوان حیزبی ئێمە و حیزبی دەسەڵاتدار، مارسی ١٩٩٠ مان دانا بۆ دیداری راستەوخۆ لە نێوان ئێمەو دوکلیرک و حکومەت. مەبەستیش لە دیدارەکە «گفتوگۆ لەسەر گفتوگۆکان» بوو، کاتیش سەرەتای ئەپریلمان دانا، بەڵام لە ٢٦ی مارسدا هێزەکانی پۆلیس و بە

بێ ئاگادارکردنەوە تەقەیان لە خۆپیشاندانی ئەندامانی حیزبمان لە ناوچەی سیبوکینگ لە دووری نزیکەی سی میل خوارووی جۆهانسبێرگ، کە بووە مایەی کوشتنی دوازدە کەس و سەدانیش برینداربوون و زۆربەیانیش لە پشتەوە پێیان کەوتبوو کە لە دەست پۆلیس رایانکردبوو، پۆلیس گوللەی راستی بەرامبەر خۆپیشاندەران بەکارهێناو ئەوەش کارێکی گاڵتە نییەو ناکرێ لێی بێ دەنگ بین، پۆلیس دەڵێت گوایە بەرگرییان لەگیانی خۆیان کردووە. بەڵام زۆربەیان کە لە پشتەوە لێدرابوون کەسیان چەکدارنەبوون و روو لە هەڵاتن بوون، خۆ مافی خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەربڕین لەلایەن حکومەتەوە خەڵات نەکراوین، ئەوەیان مافی رەوای خۆمانە، ئەم کوشتارەی دوایی حکومەت دژ بە ئەندامانی حیزبمان زۆر تووڕەی کردم و بە ئاژانسەکانی دەنگوباسم راگەیاند کەوا پۆلیسی سپی مرۆڤی رەش بە خاڵێکی سەربازی و ئامانجی رەوا دەزانێ، پاش گفتوگۆم لەگەڵ لیژنەی تەنفیزی گشتی بڕیارمان دا دانوستانمان لەگەڵ حکومەت راگرت و بەڕێز دوکلیرکم ئاگادارکردەوە کەوا نابێ و ناتوانێ لەلایەک باسی دانوستان بکات و لەلایەکی تر هاوولاتییانمان بکوژن، بەڵام بۆ پاراستنی پرۆسەی دانوستانەکە من وەک کەس لە کیپ تاون لەگەڵ بەڕێز دوکلیرک دانیشتم، چونکە سەرکردایەتی حیزب دانوستانەکەی راگرتبوو. خاڵی سەرەکی گفتوگۆکەمان لەسەر دانانی کاتێکی تازەبوو بۆ دەست پێ کردنەوەی دانوستان و رێکەوتین لەسەر سەرەتای مایۆ. هەڵسوکەوتی پۆلیس دەرحەق بە رەشەکان و بەکارهێنانی چەک و تەقەمەنی دژیان لە خۆپێشاندانەکان و بێدەنگی و هەتا هەڵنەکێشانی چەکەکانیشیان بۆ کپکردنەوەی خۆپیشاندانی راسترەوە سپییەکان، روون و ئاشکرا بوو کەوا پۆلیس بێلایەن نییە.

حکومەت بۆ دانوستانەکە گەرم نەبوو، دەیویست ئەو خۆشی و گەشبینییەی پاش دەرچوونی من لە زیندانا ببێتە هەڵم. هەروەها حکومەت ئەوەشی دەیویست خەڵکەکە لە زیندانا چاوەڕێی منیان دەکرد، وا من نیشان بدات، کەوا من کەسێکی لاوازو بێ دەسەڵاتم و بەرگەی ئەم رەوشە تازەیە ناگرم.

گەرچی هەندێ دیاردەی پێشکەتنخوازی لە کارەکانی دوکلیرک بەدی دەکرا، بەڵام هێشتا ئەو دڵسۆز و مەزنە نەبوو، بەڵکو پیاوێکی براگماتی بوو بڕوای بە هەنگاو بە هەنگاوی هەبوو، ئەو ئەو چاکسازیانەی دەکرد تا دەسەڵاتی بە هێزتر بکات و دەسەڵات لەژێر چاودێری ئەفریکەکان بهێڵێتەوە، جا هەر کەسێک بێت، ئەو هەرگیز دانوستانی بۆ ئەوە نەدەکرد کەوا دەسەڵاتی وڵات لەژێر رکێفی سپیەکان دەربهێنێ.



پاش سێ رۆژ دانوستان، بڕیارمان دا هەردوولا پابەندی ئاشتی بین وجاڕنامەکەش بە ناوی گروت شو ناسرا. حکومەت بڕیاری دا حاڵەتی نائاسایی هەڵگرێت، ئەوەش پاش ماوەیەکی کورت جێبەجێکرا، تەنیا لە هەرێمی ناتال نەبێ کەوا دیاردەی ترس و شەڕی زۆر تێدا بوو. هەردوولا کۆک بووین لەسەر دانانی چەندین دەستە بۆ بەدواچوونەوەو لابردنی تەگەرەکانی رێگاکەمان.

بۆ مەسەلەی دەستوور، بە حکومەتمان راگەیاند کەوا داواکارین کۆمەڵەیەک دابنرێت بۆ دانانی دەستوورێک بۆ وڵات و کۆمەڵەکەش گشتی بێت و ئەندامانی بە هەڵبژاردن دەست نیشان بکرێن. بەڵام پێش ئەم پرۆسەیە دەبێ حکومەتێکی ئینتیقالی هەبێ و سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکە بکات، تا حکومەتە راستەقینە هەڵبژاردراوەکە دێتە سەرکار، بۆیە داوامان کرد کۆنگرەیەک هەبێ بۆ دانوستان لەگەڵ حیزبەکان بۆ دانانی حکومەتە کاتیەکەو بنچینە گشتییەکانی دانانی ئەم کۆمەڵەیەی کە دەستوور دادەڕێژێت.

* * *

ئارەزووم بوو هەرکە لە زیندانا بەربم، یەکسەر سەفەرێ بۆ قونو بکەم، بەڵام تا ئەبریل رێکنەکەوت. ئاسان نەبوو، جانتاکەم هەڵگرم و کەی ویستم بڕۆم و کێندەرێ حەزم کرد رووی تێبکەم، وام لێ هات، سەفەرم دەبوایە دابینکردنی ئاسایشی بۆ دابینبکرێت و وتاریشی دەویست. لە ئەبریلدا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و ژەنراڵ بانتو هولومیسای سەرکردەی سەربازی لە ترانسکای و دۆستێکی حیزبمان پێویستییەکانی سەردانەکەیان رێکخست، لە هەموو ئیش و ئەرکەکانی کە زۆر هۆش و دڵمی سەرقاڵ کردبوو، سەردانی گۆڕی دایکم بوو.

یەکسەر لە قونو رووم لەو پارچە زەوییە کرد کەوا دایکمی تێدا نێژرابوو، گۆڕەکەی زۆر سادەبوو، هیچ نیشانەی لەسەر نەبوو، بە چەند وردە بەرد و کەرپووچ داپۆشرابوو، جیاوازی لەگەڵ گۆڕەکانی تر نەبوو. زەحمەتە ئێستا بتوانم هەست و نەستم تۆماربکەم، دڵتەنگ بووم کە لە کاتی مردنیدا نەمتوانی ئامادەبم. پەشیمانم کەوا نەمتوانی کە لە ژیاندابوو خزمەتی بکەم، ئەوانەی پێویست بوون دەکرا و ئاسایی بوو، گەر لە کاتی خۆیدا رێگایەکی ترم هەڵبژاردبایە، نەک ئەو رێگایەی لە سەری بووم.

شاگەشکەبووم بەو شتانەی کە زۆر لە گوندەکەمدا گۆڕابوون و بەوانەی کە نەگۆڕابوون، لە سەردەمی منالّیمدا لە گودنی قونو سیاسەت هێزی سەرەکی نەبوون، ئاگاداری خەباتیشی نەبوون بۆ مافەکانی ئەفریقییەکان، جاران هەموویان بە ژیانەیان رازی بوون و چاویان لە شتی تر نەبوو و خەونیان بە گۆڕان نەدەدیت. ئیمڕۆ دەبینم منالّەکان سروود و چەپلە بۆ ئولیڤەر تامبو و ئەمخوتووی سیزوی دەلّێنەوە. سەرسامم کە دەبینم ئەدەبیاتی خەبات گەیشتیتە ناو هەموو گۆشەیەکی ژیانی ئەفریقییەکان.

هەستم کرد وەک سەردەمی منالّیم هێشتا خەلّکەکە سادەو گەرم دەژین. ئەوەی بێزاریشی کردم وەک چۆن بینیبووم هەروا هەژارو نەداربوون یان هەژارتریش ببوون. زۆربەیان لە کەپراندا دەژیان، کەپری خۆلّ و بێ ئاوو بێ کارەبا، کە گچکەبووم گوندەکەمان رێکبوو، ئاوی خاوێن و یەکپارچە کەسک بوو، کەپرەکانمان خاوێن دەکردەوەو زەوییەکان جوان پارچە پارچە کرابوون، بەلاّم ! ئیمڕۆ گوندەکە پیسەو چلّکاوی زۆرەو زەوییەکەی هەموو پارچە نایلۆن و پیسایی یە. کە منالّ بووین، هیچمان لە پلاستیک نەدەزانی، راستە ئاستی ژیان بەرزبوویتەوە، بەلاّم لێرە، لە قونو ئەمەیان بوویتە کارەسات و کارەساتێکی ترسناک، دیاریشە شکۆو کەرامەت لەناو کۆمەلّدا باوی نەماوە.

هەر لەم مانگەدا سەفەرێکی ترم کرد، بەلاّم لە جۆرێکی تایبەت، گەڕامەوە دوورگەی روبین بۆ رازی کردنی ئەم بیست و پێنج گیراوەی ئەندامانی بزاڤی ئەمکا کەوا لێبووردنی حکومەت قبولّ بکەن و لە دوورگەکە بڕۆن. هەشت سالّە ئەم دوورگەیەم جێهێشتووە، بەلاّم هێشتا بیرەوەرییەکانیم لە لا تەڕو تازەن، وا بە سەردانیش دەچمەوە ئەم دوورگەیە کە چەندین سالّ من لێرە پێشوازیم لە مێوانان دەکرد.

ئەمجارە کاتم نەبوو کەمێ لەناو دوورگەکە بگەڕێم، یەکسەر چوومە دیداری گیراوەکان، ئەوانەی سوورن لەسەر ئەوەی دوورگەکە چۆلّ ناکەن تا لە سەنگەرەکانی شەڕدا سەرنەکەون، واتە سەرکەوتن، نەک هاتنەوە بە گفتوگۆ و لێبووردن، بە توندی دژی داواکەم بوون و حیزبی کۆنگرەیان بەوە تاوانبار کرد کەوا وازی لە داواکانی جاڕنامەی هراری هێناوە، کە تێدا داوای لێبوردنی گشتی دەکات بەبێ هیچ مەرج بۆ گیراوەکان و ئاوارەکان، یەکێکیان پێی وتم:

– مادیبا، بە درێژایی تەمەنم شەڕم دژی حکومەت کردووەو ئێستاش تۆ دەتەوێت من داوای لێبووردنیان لێ بکەم؟

من هەلّوێستم لەگەلّیان بوو بەلاّم دەمزانی کەوا ئەوان شتەکانیان واقیعی نییە، هەموو



سەربازێ هیواداره دوژمنەکەی لە مەیدانی جەنگدا ببەزێنێ، بەلاّم لەم حالّەتەدا سەرکەوتن ئەستەمە، خەبات گۆڕا و گواسترایەوە سەرمێزی دانوستان، پێم وتن، مانەوەتان لە زیندان هیچ خزمەتی کێشەکە ناکات، دەتوانن لە دەرەوە زۆرترو باشتر خەبات بکەن و لە دەرەوە قازانجتان زۆرترە، لە دواییدا بە داواکەی حکومەت رازی بوون.

لە سەرەتاکانی یۆلیۆ پێویستییەکانی سەفەرێکی شەش هەفتەیی بۆ ئەوروپاو ئەمریکای باکوور سازکرا، پێش بەرێکەوتنم دیدارێکی تایبەتیم لەگەلّ بەرێز دوکلیرک سازکرد، حەزی دەکرد گفتوگۆ لەسەر کێشەی سزاکان بکەین، داوای لێکردم لە هەلّوێستی خۆم لەمەڕ مانەوەی سزاکان لەسەر خوارووی ئەفریقیا پاش گۆڕانکاریە هەنووکەییەکانی حکومەت بێمەخوارێ، ئێمە وامان بە باش دەزانی مانەوەی سزا نێونەتەوەییەکان لەسەر خوارووی ئەفریقیا دەبێتە پالّەپەستۆی زۆرتر لەسەر دوکلیرک بۆ پێشکەش کردنی کاری زۆرتر، دەمزانی کەوا ئەوروپاو ئەمریکا دەخوازن کەوا سزاکان لەبەر رۆشنایی گۆڕانەکان سووک بکرێتەوە، من پێم وت، ئێمە ناتوانین داوا لە دۆستەکانمان بکەین کەوا سزاکان سووک بکەنەوە هەتا بە یەکجاری رژێمی نەژادپەرستی هەلّنەوەشێتەوەو حکومەتێکی کاتی جێگای نەگرێتەوە. ئەو لە هەلّوێستی من دەگەیشت، بەلاّم بە وەلاّمەکەم تووشی بێ هیوایی بوو.

یەکەم ئیستگەی گەشتەکەم پاریس بوو، لەوێ سەرۆک فرانسوا میتران پێشوازی کردم، هەروەها ژنە شیرینەکەی دانیال کە دۆستی دێرینی حیزبەکەمانە ئامادەبوو. ئەم گەشتەم یەکەم گەشت بوو بۆ کیشوەری ئەوروپاو وینی هاوڕێم بووو جوانی جیهانی کۆنم وەرگرت، ئەوەش وەنەبێ لە جوانی شاری رووناکی کەم دەکەمەوە، لەوێی بووم رووداوێکی گرنگ هاتەپێشی، ئەویش حکومەت بڕیاریدا باری نائاسایی هەلّگرێت و ئەمەش زۆر دلّشادی کردم. دیاریشە حکومەت بوونی منی لە دەرەوە بە هەل زانی تا بیانوومان نەمێنێ بۆ هەلّگرتنی گەمارۆی نێونەتەوەیی لەسەر ولاّت. لەوێشەوە لە پاریس بەرەو سویسراو دوایی بۆ ئیتالّیا و هۆلّەندا وئینگلتەراو دوو رۆژیشم بۆ سەردانی ئولیڤەرو ئەدیلیدی ژنی تەرخان کرد، ئیستگەی دوایی بەرەو ئەمریکاو لە رێگای گەڕانەوەشم دووبارە لە ئینگلتەرا لام داو دیدارم لەگەلّ خاتوو مارگرێت تاتچەر بوو. پێش گەڕانەوەشم بۆ مالّئاوایی تەلەفۆنم کردو هەر لەبەر دلّپاکی خۆیەوە زۆری لەسەر پاراستنی یاساو رژێم ئامۆژگاری کردم و وتی ئاگاداری رۆژانەی سەفەرەکەتم و چالاکیت رۆژانە زۆرەو وتی:

– ئەی ماندێلا، بەرنامەکە زۆر چڕەو گفتوگۆکانت زۆرە، من ئامۆژگاریت دەکەم نیوەیان کەم

بکەیتەوە باشترە، ئەم بەرنامەیە بۆ پیاوێکی لە تەمەنی تۆ زۆرەو ئەوانە لە تەمەنی پیاوێکی نیوەی تەمەنی تۆ دەوەشێتەوە، ئەگەر بە هەمان جۆر بەردەوام بی بە زیندوویی لە ئەمریکا ناگەڕێیتەوە، من ئامۆژگاریت دەکەم.

بە منداڵی زۆرم لەسەر نیویورک خوێندبۆوە، تەماشاکردنی باڵای بەرزی کۆنکریتی و شووشەیی و ملیۆنەها دەسترازەی جوانی کە لە ئاسمانا دەلەرینەوە سەمایان دەکرد، سەیرو تازەبوون لەلام. وتیان کاروانێکی ملیۆن کەسە هاتبوونە پێشوازیمان کە شەقەمەکانی شارەکەمان دەبڕی، سۆزو هەڵوێستە جوامێریەکانیان بۆ نەمانی نەژادپەرستی جۆش گەشە کردین. خوێندبوومەوە کەوا ئەم شارە شارێکی دژوار و ترسناکە، بەڵام ئیمرۆ کە یەکەم رۆژی مانەوەمە هەستم کرد وا نییە و بەپێچەوانەیە.

بۆ رۆژی دوایی چوومە هارلم، هارلم ئەو گەڕەکەیە کە لە پەنجاکان بە ئەفسانەم دەزانی کە پیاوانی سویتو لاسایی مۆدەی کەساییەتی هارلمیان دەکردەوە، ژنەکەم وتی، ئێرە سویتوی ئەمریکایە. لە پێش جەماوەرێکی زۆر لە ئەستادیانکی قسەم کردو وتم، لەنێوان رەشەکانی ئەفریقیای خوارو و رەشەکانی ئەمریکا گوریسێکی نهێنی هەیەو بە یەکیان گرێ دەدات چونکە هەمووومان رۆڵەکانی ئەفریقیاین، لەنێوانماندا، پەیوەندی پتەو و بە سۆز هەیە، ئەو پەیوەندییە مەزنەیە کە گەورە پیاوانی وەک دەبلیو ئای دوبواو مارکوس هارفی و مارتن لوسەر کینگ دروستیان کردووە. هەر لە منالیمەوە پالەوانی وەک براون بومبر و جولویس م خۆش دەویست، چونکە، نەک هەر لەناو گۆشەی زۆرانبازیدا دژی نەیاریان ئازا بوون، لە دژی نەژادپەرستیشدا ئازا بوون، لە زیندانا بە وردی سۆراخی خەباتی رەشەکانی ئەمریکام دەکرد کە دژی نەژادپەرستی و جیاوازی و ستەمی ئابووری خەباتیان دەکرد.

هارلم نیشانەی بەرگری و هێز و جوانی عیزەتی رەشەکانە، دوێنێ لەو راستییە گەیشتم کە بینیم لەسەر کراسی گەنجێکی رەش نووسرابوو:

هەر خۆم بە خۆرسکی رەشم و شانازیشی پێوە دەکەم. من وتم، خۆرسکی کۆمان دەکاتەوە و بەبێ ویستی و ئاگایی ئێمە بە یەکترمان گرێ دەدات.

دوایی رۆیشتین بۆ میمفیس و بۆستن و دواییش بۆ واشنتۆن بۆ دوانێک لە دانیشتنێکی هاوبەشی کۆنگرێس و کۆبوونەوەی سەرۆک جۆرج بۆش. سوپاسی کۆنگرێسم کرد بۆ دەرهێنانی ئەو یاسانەی دژ بە نەژادپەرستی و وتم، خوارووی ئەفریقیا دوارۆژ هیوادارە کە پارێزگاری لە نەریت و



هەڵوێستەکان بکەن کە بوویتە مایەی بەرهەمی ئەم شاکارە مەزنەی دیموکراسی کە منی تێدا راوەستاوە، هەروەها وتم، ئێمە وەک تێکۆشەرێک کە خەبات بۆ ئازادی دەکەین، ناوی پیاوانی وەک جۆرج واشنتۆن و ئەبراهام لینکۆڵن و تۆماس جیفرسۆنمان نەبیستبوو، دواییش ئێمە وەک ئەوان هەڵمەت بۆ خەبات نابەین. لەسەر ئابڵوقەکان بە توندی قسەم کرد دەمزانی سەرۆک بۆش وتوبەتی کەوا کاتی ئەوە هاتووە ئابڵوقەکان کەمێ سووک بکرێت، بۆیە شێلگیرانە داوام لە کۆنگرێس کرد کەوا لەسەر سووککردنی ئابڵوقەکان رەزامەند نەبن.

یەکەم سەرۆک دەوڵەت کە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کرد جۆرج بۆش بوو. هەرکە یەکەم جار بۆچوونی چاکم لەسەر دروستبوو و ئەوم لەسەرووی سەرکردەکان دانا بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کێشە چارەنووسسازەکان، بۆش پیاوێکی لەسەرخۆبوو، ورد گوێی رادەگرت، ئەگەرچی لەسەر خەباتی چەکداری و سزاکان کێشەی زۆرمان هەبوو، ئەو لەو پیاوانەیە گەر جیاوازی بۆچوونیشت لەگەڵی هەبێت، دەستت دەگوشێت.

لە ئەمریکا بەرەو کەنەدا بەرێکەوتم و دیدارم لەگەڵ سەرۆک وەزیران مالرونی هەبوو و وتاریشم لەبەردەم پەرلەمان پێشکەش کرد، لە رێگای چوونم بۆ ئیرلەندا، فرۆکە لە قوتبی باکوور لە ناوچەی گوس بای نیشت و دابەزیم و کەمێ لەسەر شەختە پیاسەم کردو هەندێ خەڵکم لە رۆخی فرۆکەخانەکە بینی، وتیان، ئەوانە ئەسکیمۆن. لە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵیمدا قەت نەمدیبوون، «داگیرکەرەکان ناویان ناون ئەسکیمۆ ناوی رەسەنی خۆیان نوتە. بڕواشم نەدەکرد، رۆژێ بێت بیانبینم، بەرەو رووی ئەو چەند کەسە چووم کە لە فرۆکەخانە بە دابەزینم هاتبوون بە گوێرەی نووسینی داگیرکەرەکان، ئەوانە میللەتێکی دواکەوتوون. کە قسەم لەگەڵ کردن، دیاربوو، هەر لە رۆژی بەربوونمداو بە هۆی هەواڵەکانی تەلەفزیۆندا زۆر شتیان لەسەرم دەزانی و دوا گۆڕانکارییەکانی باشووری ئەفریقیایان دەزانی و ئاگاداربوون، یەکێکیان هاواری کردو وتی:

«بژی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی!». نوتەکان میللەتێکی ئارومین و داگیرکەرەکان خراپەکارییان دەرحەق کردوون، مێژوویان زۆر لە مێژووی رەشەکانی باشووری ئەفریقیا دەکات. ئەو رۆژە بۆم روون بۆوە کەوا بە راستی لە کاتی گیرانمدا جیهان بوویتە گوندێکی بچووک. سەرسام بووم کە زانیم نوتەکان لە دوا خاڵی گۆی زەویدا ئازادکردنی گیراوێکی سیاسییان لە دوا خاڵی خوارووی گۆی زەوی دا بینیوە، راستەوخۆش بینیویانە. تەلەفزیۆن رێگا دوورەکان لوول دەدا و بوویتە چەکێکی کاریگەر بۆ قەڵاچۆکردنی نەزانی و ئامێرە بۆ پەخشی دیموکراسی بۆ هەموو گۆشەکانی جیهان.

له لەندەنیش سێ کاتژمێر لەگەڵ تاتچەر دانیشتم. کە لەگەڵ نوتەکان راوەستام و قسەم بۆ کردن سەرسام ببوو، رۆژی دیدارەکەم لەگەڵ تاتچەریش ساردو باران بوو، وینی ئامۆژگاری کردم پاڵتۆیەک لەبەر باران لەبەر بکەم، دەمویست، خێرابڕۆم و دوا نەکەوم، تا نەڵێن ئەفریقیایەکان ژوانیان تەواو نییەو پارێزگاری ناکەن. بۆ بەخێرهاتنی مێوانەکان و ئیمزاکردنم لە دەفتەری بیرەوەری مناڵەکان ناچار لەبەر بارانێ مامەوە، وام لێ هات، تا کاتی دیدارەکەم هات هەستم کرد سەرمام بووەو بێ هێز دیارم. وەنەبێ ئەوەش کار لە دیدارەکەم بکات، دانیشتین، هەتا تاتچەر وەکو بەڕێوەبەری قوتابخانەیەک نوقرچکی لێ دام و وتی،ها ناڵێیم بەرنامەی رۆژانەت کەم بکەوە. گەرچی تاتچەر لە مەسەلەکانی سزا هاوجووتمان نەبوو، بەڵام ژنێکی قسە لەروو و سەرنجی وردەکاریەکانی دەدا. هەرچەندی رووم لێ نا و کۆششم کرد نەمتوانی رای لەسەر سزاکان بە قەد نوکی دەرزییەک بگۆڕم.

* * *

کە گەڕامەوە چەند سەردانی خێرام بۆ وڵاتی ئۆگەنداو کینیاو مۆزەمبیق ئەنجام دا، پاشان یەکسەر داوام کرد سەرۆک دوکلیرک ببینم، توندوتیژی روو لە زیادبووندابوو، هەر لە ساڵی ١٩٩٠ دا، لە یەک ساڵدا هەزار و پێنج سەد کەس کوژران، رەوشی سیاسی لە پار ئاڵۆزترو ترسناکتربوو، بە پێویستم زانی بۆ ئاسایی کردنەوە خێراترو زۆرتر بکرێت، خوێن لە وڵاتدا زۆر دەڕژێت و هەنگاوی خێرای دەوێت. کۆتایی هێنانی باری نائاسایی لە یۆنیۆ کەشی دانوستانی خۆشتر کرد، بەڵام حکومەت لە یۆلیۆدا چل ئەندامی حیزبمانی گرت وەک، ماک ماهاراجاو برافن گوردان وسیبوی نیانداو بللی نایر بە تاوانی هاوکاری کردنی پلانێکی حزبی شیوعی گیران کە ویستبوویان بە کودتایەک حکومەت بڕووخێنن و پلانەکەش بە پڕۆسەی فولا ناسرابوو. دوکلیرک داوای دیتنی کردم و چەند بەڵگەنامەی بۆ خوێندمەوە گوایە لەلای تاوانبارە گیراوەکان بووە. بە مەیان سەرسام بووم، چونکە من ئاگام لە هیچ نەبوو.

پاش دیدارەکە بۆ پرسینەوە پەیوەندیم بە جوسلوفوکرد، لە وەڵامدا وتی، ئەم بەڵگەنامانە هیچ نین و پرۆسەی فولاش کۆنە و لە بیر کەس نەماوە و وتی، حکومەت دەیەوێت بەم کارە دەرزێک بخاتە نێوان حیزبی کۆنگرەو حیزبی شیوعی و دوورخستنەوەی جوسلوفو لە دانوستانەکان.

گەڕامەوە لای دوکلیرک و پێم وت، ئەمەیان تەونی شێواندنە کە لە لایەن پۆلیسەوە دانراوەتەوە



و ئێمەش هەرگیز نێوانمان لەگەڵ حیزبی شیوعی ناپچڕین و ناکرێ ناوی جوسلوفوش لە دەستەی دانوستان دابگیرێت.

لە ناوەندی یۆلیۆدا لە پێش بەستنی کۆبوونەوەی لیژنەی تەنفیزی گشتی حیزب، جوسلوفو پێشنیارێکی پێشکەش کردم، ناوەڕۆکەکەی راگرتنی خەباتی چەکداری بوو، ئەوەش بۆ خولقاندنی کەشێکی چاک بۆ چوونەپێشەوەی پرۆسەکانی دانوستان بۆ پێشەوە، هەروەها وتی، دوکلیرک پێویستی بەوە هەیە بە هاوکارانی رابگەیەنێ کەوا هەنگاوی چاک هەیە و شتی وا بۆ وڵات چاکە دەبەخشێت، بەڵام! وەڵامی من دژی ئەو بیرۆکەبوو و وتم، هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە. بەڵام، کە زۆرتر بیرم کردەوەو بۆ ئاشکرابوو بۆم من باشە ئەگەر پەسەندی بکەم و جڵەوەکەی بگرمە دەست و هەستیشم کرد کەوا جوسلوفو پێشنیاری وا بکات ئەمە زۆر باشە چونکە ئەو تۆماری رادیکالی هەیەو کەسیش ناتوانێ بە بەزیوو سادەی بەرامبەر بە حکومەتی لەقەڵەم بدات و بۆ رۆژی دوایی پێم وت: من بۆچوونەکەتم لا باشەو لە لیژنەی تەنفیزی گشتیدا باسی دەکەم.

پێشنیارەکە بە زۆرینەی دەنگ قەبووڵ کرا، ئەوانەی دژی بوون وایان دەزانی خەڵاتی هاوڕێیانی دوکلیرک دەکەین. بەڵام من داکۆکیم لە پێشنیارەکە کردو وتم، خەباتی چەکداریمان بۆ ئەوەبوو، وا لە حکومەت بکەن لەسەرمێزی دانوستان دانیشن وا دانیشتن، هەر گاڤێکی ویستمان خەبات نوژەن بکەینەوە، ئەوا دەتوانین، گرنگ ئەوەیە نیازپاکی خۆمان دیاربکەین. پاش گفتوگۆیەکی چەند کاتژمێری، پێشنیارەکە سەرکەوت.

ئەم هەنگاوە تازەیە لەناو حیزبدا بووە قسەو باس. ئەگەرچی بزاڤی «ئەمکا» ئەوەندە چالاک نەبوو، بەڵام کەشی خەباتی چەکداری و دژایەتی کردن زۆرشتی دەگەیاند بۆ سەرجەم خەڵکەکە، چونکە دیاردەی چەکداری و بەرەنگاری دوژمن نیشانەو هێمای بوون و مان بوو، ئەگەر وەک مەجازێک، نەک راستیش بوایە، چونکە بوونی خەباتی چەکداری ئەگەر بەرهەمیشی نەبوایە ویست و خەڵکی زۆری هەبوو.

لە ٦ی ئۆگستۆس رێککەوتننامەی بریتۆریا لە بریتۆریا لەنێوان حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی مۆرکرا، بە پێی ئەم دەقە کۆتایی بە خەباتی چەکداری هات. منیش زۆرجار و لە زۆر بۆنەدا بە هاوڕێیانی خۆم وت، ئەوەیان مانای ئەوە نییە خەباتی چەکداری نەما و لە بەرنامەماندا رەش کرایەوە، حکومەتیش لەلای خۆیەوە کاتی بەردانی زیندانە سیاسییەکانی داناو لێبووردنی گشتی راگەیاندو پێش مایۆی ١٩٩١ رێکەوتین لەسەر تەواوکردنی پێویستییەکانی

لێبووردنەکە و حکومەتیش ڕازی بوو لەسەر چاوپێداخشان بەسەر یاسای ئاسایشی ناوەخۆ.

پرۆسەی ئاشتی و قۆناغەکانی بە زۆربوونی دیاردەی توندوتیژی شێوا، هیوامان وابوو، دەستپێکردنی دانوستان شەپۆلی توندوتیژی کەم بکاتەوە، بەڵام! لە واقیعدا بە پێچەوانە هات. پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش، هەڵمەتێکی فراوانی خەڵک گرتنیان دەست پێکرد و ئەوەش زۆرتر خەڵکی هارکردو بۆم ئاشکرابوو کەوا پۆلیس ئاگرەکە خۆشتر دەکات، نەک ئاگرەکە بکوژێنێتەوە.

سەردانی گەڕەکەکانی ناوچەی ڤال تراینگلی خوارووی جۆهانسبێرگ ئاواسیم کرد، کە توندوتیژییەکە زیانی بە دانیشتوانی گەیاندبوو، برینداەکان و خێزانی قوربانییەکانم بەسەر کردەوە، لەوێ یەک چیرۆکم بیست، هەموو وتیان پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش کۆشش دەکات کەشەکە بشێوێنی، وتیان پۆلیس ناوچەیەکیان چەککرد، بۆ بەیانی هێزەکانی ئەنکاتا بە هەمان چەکەکان هێرشیان هێناو چەکە دزراوەکانیان بەکارهێنایەوە.

هەروەها وتیان: پۆلیس ئەندامانی ئەنکاتا دەپارێزێت و لە کاتی هێرشەکانیاندا چاویان لێیانە.

لە وتارەکەی وتم: دەستی شاراوە لە پشتی توندوتیژیەکە هەیە، ئەمانە، هێزی سێیەمن و کەسانی لادەری پۆلیسن و ئیش دەکەن دانوستانەکان سەرنەگرێت، نەمدەتوانی دەست نیشانیان بکەم و ئەندامەکانم نەدەناسی، بەڵام دڵنیابووم کەوا دەستی وا هەیەو خراپەکاری دژ بە حیزبمان و بزاڤی ڕزگاری دەکات، ئەمەشم بە دوو ڕووداو بۆم ئاشکرابوو، کە من خۆم ئاگاداری وردو درشتیان بووم، لە یۆلیۆی ١٩٩٠دا هەواڵ گەیشتە حیزبمان کەوا زانیاری هەیە لەسەر پلانێک لەلایەن دەستەیەکی حیزبی ئازادی ئەنکاتا بۆ هێرشێکی گەورە بۆ سەر ئەندامانمان لە ناوچەی سیبوکینگ لە ڤال تراینگل لە ڕۆژی ٢٢ی یۆلیۆ، ئەوەش وەزیری یاساو ڕژێم و سەرکردەی هێزەکانی پۆلیس و مفەوەزی ناوەخۆ ئاگاداری پارێزەرەکانیان کردبووینەوە، ئێمەش ئەندامانمان هۆشیارکردنەوەو داوامان کرد هەموو هەنگاوێک بهاوێژن بۆ کاروباری پێویست، هەروەها داوامان لە پۆلیس کرد کەوا ئەندامانی چەکداری حیزبی ئەنکاتا بوار نەدرێن بێنە ناوچەکە بڕیاربوو ناوچەی حیزبیان لە ناوچەی کۆبوونەوەی گشتیان هەبوو.

لە ڕۆژی ٢٢ی یۆلیۆ، لە ناوچەی سیبوکینگ و بە نوێژی نیوەڕۆ چەندین لۆری چەکداری حیزبی ئەنکاتا بە هاوکاری سەیارەی پۆلیس بینرا، کە کۆبوونەوەکەیان تەواوبوو هاتنە دەرێ و چەکدارەکان دەستیان بە تەقە کردنی کوێرانە کردو لە کارێکی شێتانەی کوشتاریدا، سی کەسیان



کوشت، بۆ بەیانی چوومە ناوچەکە شتی ترسناکم بە چاوی خۆم بینی، هیوام وایە دووبارە دیمەنی وا نەبینمەوە، لە نەخۆشخانەدا لاشەی هەنجن هەنجکراوم بینی، لاشەی ژنێکم بینی بە چەقۆ مەمکیان بڕیبوو، کاری وا هەر لە مرۆڤی دڕندە دەوەشێتەوە.

تووڕەبووم و داوای دیدارم لەگەڵ دوکلیرک کردو ڕوونکردنەوەم لێی ویست و وتم: پێشتر ئاگادارمان کردنەوە و بێ دەنگ هیچتان نەکرد، هۆیەکان چین؟! بۆ کەسێ نەگیرا؟ بۆ پۆلیس دەستەوەستان ڕاوەستاوە؟ بە دوکلیرکم وت، لەهەر شوێنێک بە کارەساتێک سی کەس بکوژرێت، سەرۆک دەوڵەت دەچێتە شوێنەکە و بەشداری پرسەیان دەکات و سەرەخۆشی لە خزم و کەسیان دەکات.

هیچی نەوت، بێ دەنگ بوو، هیچی پێ نەبوو بیڵێت، بێدەنگ و بێ وەڵام بوو.

بەڵام ڕووداوی دووەم، ئەوەیان لە نۆڤێمبەر بوو، چەند چەکداری حیزبی ئەنکاتا چوونە ناو ئۆردووگایەکی ئاواران، کە بە زونکیزیزوی ناسراوە، کە بە زمانی زۆلۆ مانای شوێنی کراوە بۆ هەموو کەسێک، کە دەکەوێتە چواردەوری شاری جیرمانستون خۆرهەڵاتی جۆهانسبێرگ، کەوتنە سەر گیانی خەڵکەکە و ئەوەی ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی بوون دەریان کردن و ژمارەیەکیشیان لێ کوشتن و خانووەکانیان داگیرکردن و دەستیان بەسەر کەلوپەلەکانیشیان داهێنان، خەڵکی ئۆردووگاکە وتیان، چەکدارەکانی ئەنکاتا هێزی پۆلیسان لەگەڵ بوو. دووبارە حکومەت، یان پۆلیس دەرحەق ئەم ڕووداوەش هیچی نەکرد، کە گیان و ڕۆحی ڕەشەکانی خوارووی ئەفریقیا بەرەو زەڵکاو برد.

دووبارە دیدارم لەگەڵ دوکلیرک و وەزیری یاساو ڕژێم ئەدریان فولک بەست، دیسان پرسیارم کرد، بۆ چی پۆلیس، لەم ڕووانە بێدەنگە؟ وتم، بکوژو تاوانبارەکان دیارن، چونکە وا لەناو خانووە داگیرکراوەکان دانیشتوون، دوکلیرک، داوای لە بەڕێز فولک کرد بۆ وەڵامدانەوە، ئەویش بە ڕقی پرسی، بە چ مافێک ئەوانە لەم کەپرانەدا دەژین، زەوییەکان هی خۆیان نییە. منیش وتم، لە ڕاستیدا، حکومەتی ناوخۆی ناوچەکە، ئەرزەکەی پێداون، بەڵام ئەویش وەک زۆربەی ئەفریکەکان وابوو، کەوا شتەکە تازە نییە، ڕەشەکان یەکتری دەکوژن، ئەوەیان کۆنە، دوکلیرک بەڵێنی دا کە لە مەسەلەکە بپێچێتەوەو ئاگاداریشم بکاتەوە، بەڵام، پاش ئەو ڕۆژە هیچم نەبیست.

لەو کاتانەدابوو حکومەت ئاگرەکەی خۆشکرد، ئەویش بە دەرکردنی بڕیارێک بۆ زۆلۆەکان کەوا دەتوانن لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا چەک هەڵگرن، ئەو چەکانەش، تیر و ڕم و دارو قەمەبوو، کە لە

ناوچەی ناتال و ناوچەکانی تردا بەم چەکانە زۆر دۆستانی ئەنکاتا پێشتر ئەندامانی حیزبی ئێمەیان پێ کوشتوون. بە بۆچوونی من گومان لە هەنگاوەکانی ئاشتی دوکلیرک دروستبوو.

ئەوانەی دانوستانیان نەدەویست لەم رووداوە ترسناکانە سوودیان دەبینی، رووداوەکانیش توندتر دەبوون کە دانوستانمان لەگەڵ حکومەتدا دەگەیشتە ئاستی باش. هێزەکانی نەیار، کۆششیان دەکرد بۆ هەڵگیرسانی ئاژاوەی نێوان حیزب و ئەنکاتا بە بۆچوونی من زۆربەیان بۆ ئەندامانی ئەنکاتا شلیان دەکرد. لە ناو حکومەتیشدا، دوکلیرک و ئەوانی تر، راستییەکانیان دەزانی و لایەنەکەیان تاوانبار نەدەکرد. گومانیشمان لەوەدا نەبوو کەوا -هێزی سێیەم- هاوکاری و پاڵپشتیان لە کەسایەتی بەرزو دەسەڵاتداری ناو پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش وەردەگرت، ئەوەشمان لە چەندین راپۆرتی رۆژنامەگەری بۆ روونبۆوە کەوا هێزەکانی پۆلیس بە نهێنی یارمەتی ئەنکاتایان داوە.

کە توندوتیژی گەشەی سەند، ئەوەم بە بیرداهات، ئەدی راگرتنی خەباتی چەکداری سوودی چی بوو. زۆری ئەندامانی حیزب گەرم ببوون، لە سپتێمبەردا و لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریدا وتم، بەردەوامی کاری توندوتیژی وامان لێ دەکات دووبارە دەست بدەینەوە چەک، وێنەکە لە پێشمدا تاریک بوو، وام بۆ دیاردەبوو کەوا ئەوەی لەگەڵ حکومەت کردمان، هەمووی بووە هەڵم.

* * *

لە دێسەمبەری ١٩٩٠دا ئولیڤەر تامبو پاش ئاوارەیی سی ساڵ گەڕایەوە خوارووی ئەفریقیا، بە هاتنەوەی دڵشادبووم، ئەو بۆ بەشداری لە کۆنگرەی راوێژکاری حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی گەڕابۆوە، ئەم کۆنگرەیە لە جۆهانسبێرگ بەسترا، زۆرتر لە پەنجا نوێنەر بەشداربوون، نوێنەری چل و پێنج هەرێمی خوارووی ئەفریقیاو دەرەوەبوون.

لە کۆنگرەکەدا باسی بەهرەکانی ئۆلیڤەرم کرد، ئەو حیزبی لەسەردەمی تاریکدا بەرەو هەنگاوی خەبات بردو بڵێسەی حیزبی هەر بە گەشاوەیی هێشتەوە، ئێستاش بەرەو دوارۆژی گەشی بە هیوامان دەبات، ئۆلیڤەر لەو بیست و حەوت ساڵەی لە زیندانابووم رزگارکەری حیزب بوو، ئەو حیزبی کردە رێکخراوێکی جیهانی و هێزو تەوژمی پێ بەخشی، ئەو سەرکردایەتی حیزبی خستە ئەستۆی کە زۆربەیان لە زیندان و ئاوارەییدا بوون، بەراستی ئۆلیڤەر، سەربازو دیپلۆماس و پیاوی دەوڵەتە. رەخنەی توندم لەو هەڵمەتە دژە گرت، گلەییم لە شۆڕشە چەواشەکەی حکومەت گرت کە



لە دژمان بەرپایانکردووە، بەڵام وتارەکەی ئۆلیڤەر جۆشی گەرمی بەخشی، وتارەکەی بە بانگەوازێک دەستپێکرد بۆ چاوپێداخشان بە سزاکان و وتی، حیزب دووچاری بایەخ پێ نەدانێکی نێونەتەوەیی هاتووە، بۆیە دەبێ داوابکەین سزاکان لەسەر خوارووی ئەفریقیا سووک بکرێتەوە، وڵاتانی ئەوروپی بە راستی سزاکانیان سووک کردووە، وڵاتانی خۆرئاوا بە تایبەتی ئینگلتەراو ئەمریکا دەیانەوێ پاداشتی دوکلیرک بکەن و وا دەزانن لە بواری گۆڕانکاری هەنگاوی ناوە و هانی دەدەن زۆرتر بکات، هەروەها وتی: ئێمە وامان هەست دەکرد ئەم ستراتیژییە هەڵەیە، بەڵام بۆمان دەرکەوت کەوا ناچارین دان بە راستییەکانی واقیعی دەولی بنێین، سەرەڕای ئەوەی وتارەکەی ئولیڤێر لەناو لیژنەی تەنفیزی گفتوگۆی لەسەر کرابوو و رەزامەندیشی لەسەر کرابوو، ئینجا توندڕۆکانی ناو حیزب تووڕە بوون و سوور بوون لەسەر مانەوەی سزاکان و هەر ئەوەش کۆنگرە پەسەندی کرد.

دووچاری گلەیی و گازاندەی زۆر هاتم، قسەی زۆرم هاتە سەر و گوایە ئەوانە پشتی دانوستان دەگرن، لەناو میللەتا دوورە پەرێزن و بنکەی جەماوەرییان نەماوەو ئەوەندەی لەگەڵ سەرکردەکانی حیزبی نەتەوەیی دەسەڵاتدارن، ئەوەندە لە نێو کۆمەڵانی خەڵک نین. رەخنەی ئەوەشم لێگیرا گوایە رێبازی دیپلۆماسی کەسی پەیڕەو دەکەم و ئاگاداری کادیرانی حیزب بە ناوەڕۆکی دانوستانەکان ناکەمەوە. ئەرکی سەرکردەکانی مەیدانی ئەوەیە گوێڕایەڵی جەماوەربن. دانم بەوەنا کەوا کەمتەرخەمی کراوە لە ئاگادار نەکردنەوەی هێڵە وردەکانی دانوستانەکان، دیارە ئەوەش هەر لەبەر ناسکی رەوشەکەیە و نهێنی مەسەلەکان لە خزمەتی دانوستانەکان بووە. رەخنەکانم وەرگرت و سووریش بووم لەسەر ئەوەی لەسەر هەمان رێباز بڕۆین و هیچ بژاری تر بەدی ناکەین. راستە، دەبێ زۆرترین ژمارەی خەڵک ئاگادار بێ و بازنەی هۆشیاری بەرین بکرێت، بۆیە بەرەو هەمان خاڵ و ئاسۆ رۆیشتین.

رۆژانە لە رۆژنامەکاندا هەواڵی گەشەسەندنی توندوتیژی لە شارەکان بڵاودەکردەوەو بووە مەسەلەی یەکەم لە وڵاتدا. ژیان لە جۆهانسبێرگ و دەوروپشتی لەبەر زۆری تاوان و خەمساردی پۆلیس و چەتە چەکدارەکان نەما. ئەوەش هەنگاوی ئازایانەی دەویست بۆ ئەوەی وڵات بەرەو رژێمێکی سیاسی نوێ ببات و بە پێچەوانەش وڵات هەروا لە ناو بارێکی ترسناک و نادیار دەهەژێت و پێشکەوتن بەدی ناکرێت.

بۆ چارەسەرکردنی رەوشی توندوتیژی داوای دیدارم لەگەڵ سەرکردە بوتیلیزی کردو لە ئوتێلی

(رۆیال) لە دیریان لە ینایری ١٩٩١دا دانیشتین، پێش دیدارەکە ئەو بۆ وەفدەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن قسەی کرد، بەڵام لەجیاتی تیمارکردنی برینەکان ژانی کوشندەتر کرد. شەڕەجنێوەکانی حیزبی کۆنگرەی ژمارد و ڕەخنەشی لە داواکاریەکانی حیزب گرت لە دانوستانەکاندا، کە نۆرەی منیش هات، لەجیاتی ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، سوپاسی کۆششەکانیم کرد بۆ ئازادکردنم و باسی پەیوەندییە باشەکانی نێوان حیزبی ئێمە و حیزبی ئەوانم کردو سووربووم لەسەر هەڤاڵبەندی پتەوی نێوانمان.

لە دانوستانەکەماندا کەمێ پێشکەوتین و بەڵگەنامەی شەرەفمان ئیمزاکرد کەوا هەڵسوکەوتی هەردوو حیزبمان چاودێری بکەین وا هەست دەکەم بۆ هەموو لایەک خێردەداتەوەو سنوورێک بۆ خوێن ڕشتنەکە دادەنێت. بەڵام -بە مەزندەی من- حیزبی ئەنکاتا ئیش بۆ جێبەجێ کردنی بەڵگەنامەکە ناکات، هەروەها لە لایەنی ئێمەشەوە سەرپێچی هەبوو.

مانگانە سەدان کەس دەبوونە قوربانی شەڕەکان، لە مارسی ١٩٩١دا ئەندامانی حیزبی ئەنکاتا هێرشیان کردە سەر گەڕەکی ئەلیکساندرای باکووری جۆهانسبێرگ و هێرشەکەیان سێ ڕۆژی خایاند و تێیدا چل و پێنج کەس کوژرا، حکومەت یەک کەسیشی نەگرت.

ئەوەش وای کرد جارێکی تر دیداری سەرکردە بوتیلیزی بکەم، لە ئەپریلدا لە دیریاندا دیدارمان بوو و دوانی توندمان داو ڕێککەوتننامەیەکی ترمان مۆرکرد، بەڵام مەرەکەبەکەی هەر تەڕبوو کە ئاوێتەی خوێنی ڕژاوی قوربانییەکان بوو، دڵنیابووم و هیچ گومانم نەما، کە حکومەت ڕاستەوخۆ لە پشتی ڕووداوەکانەو ئەوەشە تەگەرەی گەورەی سیاسی لە ڕێگای دانوستانەکانمان، لەبەر زۆری دیاردەکانی توندوتیژی و چارەسەرنەکردنی لەلایەن حکومەتەوە، نێوانمان ئاڵۆزبوو.

لە دوو ڕۆژی کۆبوونەوەی لیژنەی تەنفیزی گشتی کە لە ئەپریلدا بەسترا بە چڕی گفتوگۆمان لەسەر گومان پەیدا کردنم لە دوکلیرک بوو، لیژنەی تەنفیزی دڵنیابوو کەوا حکومەت دەستی هەیە لە بەگەڕخستنی ئاژاوەو توندوتیژی، ئەوەش هەر بۆ شێلوکردنی کەشی دانوستان بوو. نامەیەکمان ئاراستەی حکومەت کردو تێیدا داوامان کرد وەزیری بەرگری ماگنس مالان و وەزیری یاساو ڕژێم ئەدریان فولک واز لەکاربێنن، هەروەها قەدەغەکردنی دیاردەی چەکداری لەناو شەقامەکاندا، هەروەها داوامان کرد سیاسەتێکی هەنگاو بەهەنگاو پەیڕەو بکرێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی خانووی کرێکارانی ئاوارە کە زۆربەیان ئەندامانی ئەنکاتان لە دەوروبەری گەڕەکی ڕەشەکانی چواردەوری جۆهانسبێرگ و نەمانی دەستەکانی قەلاچۆکردنی یاخیبوونی نهێنی حکومەت و دامەزراندنی



دامەزراوێکی سەربەخۆ بۆ بەدواداچوونەوەی سکاڵای نالەباری بەکارهێنانی پاراستنی هێمنی و ئاسایش. مۆڵەتیشمان تا مانگی مایۆ دایە حکومەت بۆ وەڵامێک لەسەر داواکانمان، بەڕێز دوکلیرک وەڵامی ئەوەی داینەوە کەوا کۆنگرەیەکی بەرەی حیزبەکان لە مانگی مایۆ سازبکرێت بۆ شرۆڤەکردنی دیاردەی توندوتیژی لە وڵاتدا، وەڵامم دایەوە، کەوا ئەمەیان سوودی نابێ، چونکە حکومەت دەزانێ کام هەنگاو باشە بۆ ڕاگرتنی ئەم ئاژاوەیە.

هەر لە مانگی مایۆدا ڕامانگەیاند کەوا دانوستان لەگەڵ حکومەت ڕابگیرێت.

لە یۆلیۆی ١٩٩١دا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی یەکەم کۆنگرەی گشتی لەناوخوارووی ئەفریقیا لە ماوەی سی ساڵدا بەستا. بە هەڵبژاردنێکی دیموکراسی ئازادا، دوو هەزار و دوو سەد و چل و چوار ئەندام هەڵبژێردران لەناو وڵات و دەرەوەی وڵات بۆ بەشداربوونیان لە کۆنگرەدا. بە تەزکیە هەڵبژێردرام بە سەرۆکی حیزب و سیریل ڕامافوزاش بە سکرتێری گشتی، ئەوەش نیشانەی گواستنەوەی بڵێسەی خەبات بوو، لە نەوەی کۆن بۆ سەرکردایەتی نەوەی نوێ. سیریلم پاش دەرچوونم لە زیندانا ناسی، جێگرێکی لێهاتوو بوو بۆ کاروانێکی درێژ لە سەرکردە ناسراوەکانی حیزب. سیریل باشترین ئەندامی دەستەی دانوستان بوو لەناو ڕیزەکانی حیزبدا. ئەوەش ئیشکردنی وەک سکرتێری گشتی سەندیکاکانی کرێکارانی کانزاکان بواری بۆ خۆش کردبوو تا لەم بوارەدا کارامەیی پەیدا بکات.

لە وتارەکەمدا، سوپاسی کۆنگرەم کرد بۆ ڕێزگرتن و بەخشینی ئەم شەرەفە بە من و وتم، ئاسان نییە بتوانم کاروانی زەحمەتی پێش خۆم ئولیڤەر تامبو تەواو بکەم، ئەگەرچی کێشەو ناکۆکیمان لەگەڵ حکومەتدا زۆرە، بەڵام بوونی گفتوگۆ خۆی لەخۆیدا سەرکەوتنە، تەنیا بەشداری کردنی حکومەت لەم دیدارانەدا، نیشانەی شلبوونیانە لە هاوکاریکردنیان لە نەژادپەرستی و ناتوانن لەم دیاردەیە پارێزگاری بکەن، هەروەها وتم، ئێمە لە قۆناغێکی ئەستەمداین ئەویش گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتێ کەوا پێڕەوی سیاسەتێ دەکات کەوا ناتوانێ قەبووڵی ئەوە بکات واز لە دەسەڵات بهێنێ و دەبێ چاک لەم قۆناغە حاڵی بین و بزانین کەوا خەبات بەردەوامەو تەواو نەبووەو گفتوگۆش جۆرێکی خەباتە ئێمەش سەرکەوتن و شکانمان لە پێشە.

دانوستان چۆن بەڕێوە بچێت، قازانج ئەوەیە ژانەکانی ڕژێمی نەژادپەرستی بەردەوام نەبێت و گرنگیش ئەوەیە حکومەتێکی ئینتیقالی دامەزرێت.

کۆنگرە کێشەی نهێنی کارکردنی لا گرنگ بوو، سووربوو لەسەر ئەوەی حیزب لە حیزبێکی

نهێنی بێ مۆڵەت، ببێتە حیزبێکی سیاسی میللی و بە شەرعی کاربکەن. ئەوە سی ساڵە حیزب بەرکی نهێنی کارکردنی گرتووە، بۆیە پێویستە حیزب لە رووی رێکخستنەوە دابمەزرێتەوەو لقەی ناوچە بچووکەکان هەتا لیژنەی تەنفیزی گشتی سەرلەنوێ نۆژەن بکاتەوە، دەبێ ئەوەش بە جۆشێکی مەزن و بەرنامەیەکی گەورەو لە ماوەی چەند مانگێکدا ئەنجام بدرێت.

ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی حیزبمان و حیزبی شیوعی لە ئاوارەییدا بوون، زۆربەیان بۆ کۆنگرەی یۆلیۆی ١٩٩١ ئامادەبوون، ئێمرۆ لە خوارووی ئەفریقیادا نامۆن و خاکەکە بە نوێ دەبینن و ئێمەش بە چاوی نامۆ سەیرمان دەکردن، بەڵام، نەوەی نوێ، ئەوانەی لەناو وڵاتابوون لە ئەندامانی بەرەی دیموکراتی یەکگرتوو و یەکێتی سەندیکاکانی کرێکاران لە ئێمە زۆرتر ئاگاداری وەزعی سیاسی بوون، ئەوانە دەکرا پێیان بلێین نمایەندەی حیزب لەناو خوارووی ئەفریقیادا لە هەشتاکاندا، بۆیە دەبوایە حیزب، ئەو پیاوو ژنانە لە ئامێز بگرێت و رێکیان بخات.

وەنەبێ هەر کێشەی پراکتیکمان لە پێش بووبێت، بەڵکو کێشەی فەلسەفیشمان لە پێش بوو، هەڤاڵبەندی و رووبەڕووبوونەوەی دوژمن کارێکی ئاسانە، بەڵام، وەزعی سیاسی لەسەر مێزی گفتوگۆدا جیاوازە، حیزبمان، یەکێتی تێڕوانینی دەویست، یەک سەکۆو یەک بڕیاری دەویست، پێویستمان بە رێکخستن و یەکێتی رامان هەبوو لەسەر دانوستان.

حیزبمان لە ماوەی هەڤدە مانگی کاری شەرعییەتی ئاشکرای توانی حەوت سەد ئەندامی نوێ ئامادە بکات، ئەمەیان دیاردەی گەشەو هەستکردنە بە رازیبوون، بەڵام گەشەی حیزب لە دەڤەرە لادێییەکان لاوازبوو، لەلایەکی تر حیزبی نەتەوەیی دەروازەی وەرگرتنی ئەندامی بێجگە لە سپی خستە سەر پشت و زۆری رەنگین و هیندییە بەرەڵڵایەکانی وەرگرت.

هەر لەو ساتەی لە زیندانا دەرچووم، حکومەت بۆ ریسواکردنی ناوی ژنەکەم ئیشی کرد. دەنگۆی ئەوە پەیدابوو گوایە چوار گەنجی رفاندووە و یەکێکیان مردووە، ئەوەیان یەکەم جار چرپە بوو، دوایی چوار تاوانی خرایە پاڵ، تاوانی رفاندن و شەڕپێفرۆشتن، ئەو هەڵمەتە گومانی خستەسەر کەسایەتی وینی و ئێمە بە پەرۆشەوە چاوەڕێی رۆژی دادگابووین تا تاوانەکانی لە کۆڵ بێتەوە.

لە دادگای راندی باڵا لە فێبرایەردا دادگاکەی دەستپێیکرد، رۆژی یەکەم و ئەوکاتانەی بواریشم هەبوایە دەچووم، هەروەها رۆژی یەکەمی دادگا کە گەورەپیاوانی حیزبی کۆنگرەش هاتن، لەبەر ئەوەی دڵنیابووم، کە بێتاوانە بۆیە پاڵپشتی بووم، پارێزەری ناودار جۆرج بیزۆس ویستی بەڵگەی



ورد بۆ بێ ئاگابونی لەو تاوانانەی کە خراونەتە ئەستۆی نیشان بدات.

پاش دادگاکردنی بە سێ مانگ، تاوانەکانی لەسەربووە ماڵ، بەڵام دادوەرەکە وتی، خودی خۆی بەشدارنەبووەو بڕیاریدا شەش ساڵ بگیرێت و بۆ ئیستینافەکەش بە کەفالەت بەردرا. بەڵام لە پێش چاوی مندا هەر بێتاوانەو با دادگا هەر وا بڵێ.

پاش ساڵێک و نیو دانوستان لە ٢٠ی دیسێمبەری ١٩٩١، دانوستانی راستەقینە لەژێر چەتری «لەپێناوی دیموکراسی خوارووی ئەفریقیادا».

Convention for a Democratic South Africa

کورتکراوەی بە ئینگلیزی (CODESA = کودیسا). کۆنگرەکە یەکەم سەکۆی دانوستانی رەسمی نێوان حکومەت و حیزبی کۆنگرە و حزبە سیاسییەکانی تر لە خوارووی ئەفریقیا. هەموو دانیشتنە دووقوولییەکان پێگەبوون بۆ ئەنجامدانی ئەم دانوستانە کە لە مەڵبەندی بازرگانی سازکرا، ئەو باڵاخانە تازەیە بۆ پێشانگا بازرگانییەکان دەکەوێتە رەخ فرۆکەخانەی یان سماتس لە جۆهانسبێرگ، لە کودیسا هەژدە ئەندامی حیزبەکانی هەموو لایەنە سیاسییەکان بەشداربوون، بێجگە لە چاودێرانی نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمەڵەی وڵاتانی کۆمنوێلس و کۆمەڵەی وڵاتانی ئەوروپی و رێکخراوی یەکێتی ئەفریقی، وەفدەکە فراوانترین بنکەی سیاسی هەموو لایەنە سیاسییەکانی لە مێژووی خوارووی ئەفریقیادا تێدا بوو.

بەستنی ئەو کۆنگرەیە باشترین کۆڕی دەستوورییە لەوەتی یەکێتی خوارووی ئەفریقیا لە ساڵی (١٩٠٩) دامەزرا، ئەم یەکێتیە لەلایەن داگیرکەرانی بەریتانی لە کیپ و ناتاڵ و هەردوو کۆماری بوریتی جاران لە ترانسفال و ئورینج فری ستایت دامەزرا.

راگەیاندنی ئەم یەکێتییە جاران دیموکراتیەتی نەدەگەیاند، چونکە رەشەکان تێیدا بەشدار نەبوون. بەڵام، لە ساڵی ١٩٩١ زۆرینەی ئامادەبوان رەشەکان بوون.

تیمی پلاندان بە سەرۆکایەتی سیریل رامافوساو ئەندامیەتی جولسوفو و والی موسێ گفتوگۆی هەفتانەیان لەسەر هەڵبژاردن و دەستوور و کۆمەڵەی دامەزراندن و حکومەتی ئینتیقالی کرد. هەروەها وەفدی بیست لایەنی سیاسی لەوانە نوێنەری حکومەتی ناوخۆکان بڕیاری هاووڵاتی نەژادیان لەسەر یاسا و پێداویستییەکان دا کە دەبێتە بەرنامەی کاری کۆنگرەکە.

سەرەتا هەندێ تەگەرە کە هاتنە پێش کارنامەکە کەشێکی نائومێدی دروستکرد، حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی بەشداری خۆی راگرت و رەخنەی لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و حیزبی

نەتەوەیی دەسەڵاتدار گرت، گوایە پلان دەکەن بۆ دانانی حکومەتێکی فرەڕەگەز. گەرچی پێش مانگێک بەرەی نەتەوەیی دامەزرابووو لەوێ کۆک بوون لەسەر ئامانجی هاوبەش لەنێوان حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی و ڕێکخراوی گەلی ئەزانیا. حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی لە هەڵبژاردندا دەترسا، چونکە دەیزانی جەماوەری چەندە، هەروەها سەرکردە بوتیلیزی بەشداری نەکرد بیانووشی ئەوەبوو گوایە ڕەزامەندی نەبووە لەسەر پێشوازی سێ وەفدی حیزبی ئەنکاتا و حکومەتی کوازولو و پاشا زویلیتینی، داواکاریش بوو کەوا شا لە سەرووی سیاسەتەوە بێ. ئەگەر بواری بەشداربوونی درابایە، ئەوا دەبوایە هەموو خێڵ و تیرەیەک لە خوارووی ئەفریقیادا مافیان هەبێ سەرۆکیان ڕەوانە بکەن.

لە مەڵبەندی بازرگانی گشتی دا هەر تەنیا هەستم بە بوونێکی مێژوویی لە بۆنەکەدا نەکرد و بەس، بەڵکو زۆرتر هەستم کرد وا لەسەر پێی خۆماندا ڕاوەستاوین، وەک هاووڵاتییەکی خوارووی ئەفریقیا کۆبووینەتەوەو کێشەو ناکۆکییەکانمان چارەسەر دەکەین بە پێچەوانەی ئەوەی لە زیمبابوێ وئەنگۆلا بە هاوکاری لایەنی سێیەم بۆ گۆڕینی بە ڕژێمێکی سیاسی تازە کرا. بەڕێز دوکلیرک وتی، پیویستیمان بە حکومەتێکی ئێنتیقالی لەسەر بناغەی بەشداری دیموکراسی لە دەسەڵات هەیە. هەروەها سەرۆکی وەفدی حیزبی نەتەوەیی داوی دو فیلیرز لێبووردنی لە ماوەی بوونی نەژاپەرستی خواست.

لە وتاری کردنەوەکەدا وتم، کودیسا کازێوەی پێشکەوتنە لە خوارووی ئەفریقیاو گەڕانەوەی بۆ نییە. حکومەت دەسەڵات و شەرعیەتی لە کۆی خەڵکدا وەردەگرێت، لێرە بۆ دانانی دەسەڵاتێکی شەرعی کۆبووینەتەوە، کودیسا سەرەتای ڕێگایە بۆ دامەزراندنی دەستەیەکی دامەزرێنەری هەڵبژێردراو بۆ ئامادەکردنی دەستوورێکی تازە بۆ وڵات. من وا دەبینم کەوا هیچ تەگەرە نییە تا لە ساڵی (١٩٩٢) کۆببێتەوە، داواشم لە حکومەت کرد بوار خۆش بکات و دەستی لەسەر ڕاگەیاندنی ڕەسمی و دامەزراوە سەربازییەکان هەبێ و چاودێری کاروباری ماوە کاتییەکە بکات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی تازەی بێ نەژادپەرستی.

حیزبە گەورەکانی بەشدار لەوانە حیزبی نەتەوەیی و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و هەر لە ڕۆژی یەکەمدا ڕازی بوون لەسەر «ڕاگەیاندنی ئامانجەکان»، کۆنگرەی بە پێی جاڕنامەکەی هەموانی ناچارکرد ئیمزای ئەوە بکەن لە خوارووی ئەفریقیادا حکومەتێکی دەستووری هەبێ و ڕژێمێکی یاسایی پاڵپشتی بکات، دادگا هەموان وەک یەک لەبەرامبەر یاسادا تەماشا بکات و یاسای



مافەکانی کەس دەربچێت بۆ پاراستنی ئازادییەکانی مەدەنییەت. بە کورتی، لە وڵاتدا دیموکراتییەت پەیڕەو بکرێت و هەموو کەس لە تەمەنی دیاریکراودا بەشداری هەڵبژاردن بکات، ئەوەش لە دیدی ئێمەدا کەمترین ویست بوو لە دەستووری خوارووی ئەفریقیای نوێ. حیزبی ئەنکاتا ڕازی نەبوو لەبەر زاراوەی دەوڵەتی -یەکگرتوو- ئیمزای بکات و بیانووشی ئەوەبوو کەوا ئەوەیان بیرۆکەی یەکێتی فیدرالی نامێنێ.

لە کۆنگرەدا پێنج لیژنە دانرا و لە سەرەتاکانی ١٩٩٢دا دەست بەکاربوون بۆ ئامادەکردنی خولی (کودیسا)ی دووەم لە مایۆی ١٩٩٢ .

لیژنەکان بۆ جۆرەها کاروبەرنامە دانرابوون وەک، دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەک بۆ خۆڵقاندنی کەشی سیاسی ئازاد و دواڕۆژی هاووڵاتی و نەژادەکەی و دروستکردنەوەی دامەزراوی ئێسگەی خوارووی ئەفریقیاو دیراسەتکردنی چەندین بنچینەی دەستووری وەک ڕژێمی یەکگرتوو (فیدرالی)و دامەزراندنی حکومەتی کاتی. لایەنەکان لەسەر ئەوە کۆک بوون کەوا بڕیارەکان پێویستی بە -زۆرینەی پێویست- هەیە و زۆر دیاریش نەکرا مەبەست چییە، بەڵام، لە ڕووی پراکتیکەوە هەڤاڵبەندی نێوان حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و زۆربەی لایەنەکانی دەویست.

بە هێمنی کاری ڕۆژی یەکەمی (کۆدیسا-١) هەتا دوا ساتی بەڕێوەچوو. من شەوی پێشوو تا کاتژمێری هەشتی ئێوارە لەگەڵ بەڕێز دوکلێرک لە دانوستاندابووم، داوای لێ کردم کەوا من دوا تێبینییەکانی کۆتایی بڵێم، بۆیە بەڵێنم پێدا کەوا پرسی لیژنەی تەنفیزی بکەم، گەرچی لیژنەکە هەندێ سەرنجی هەبوو بەڵام ڕازی بوو. من شتەکەم بە ڕۆتینی وەرگرت و بڕیارەکەم بە دوکلیرک ڕاگەیاند.

لەدوا دانیشتنەکانی ڕۆژی یەکەم باسی گرنگی گفتوگۆمان لەگەڵ حکومەت کردو دواییش بەڕێز دوکلیرک قسەی کردو وتی، ئەم کۆنگرەیە بایەخی گرنگی مێژوویی هەیە و پێویستە نەبوونی بڕوا لەنێوان لایەنەکان نەمێنێ، بەڵام لەناکاو، هاتە سەرگلەیی لە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی کەوا پابەندی ناکات و لە جێبەجێ کردنی ڕێککەوتننامەکان لەگەڵ حکومەتدا پێشێلی دەکات، ئوسلوبی وتارەکەی گۆڕا، وەک مامۆستایێ هاتە قسە کە چۆن ئامۆژگاری خوێندکارانی لاسار دەکات و هەروەها سەرکۆنەی حیزبی کرد کەوا جبەخانەکانی چەکێ ئاشکرا ناکات و ڕێکخراوی (ئەمکا)ی وەک «سوپایەکی تایبەت» هێشتیتەوەو پابەندی ڕێککەوتننامەی ئاشتی نەتەوەیی ئیمزاکراو لە

سێپتێمبەری ١٩٩١ ناکات، گومانیشی لە دەستپاکی و راستگۆیی لە ئەرکەکانی ڕێککەوتننامەکان کردو شێوەی ئاخاوتنی گۆڕی بە شێوەی گاڵتەجاڕی.

تاقەتی بیستنی وتاری وام نەبوو تاقەتی ئەوەشم نەبوو کەوا بڕیاربدەم ئەو خاوەنی دوا وتار بێ، بۆیە کەشەکەی ناو هۆڵەکەی شڵەژاندو بەرەو سەکۆی دوان چووم و بە دەنگێکی سوارەوە وتم:

من لەو رەوشتەی دوکلیرک ئەم ئێوارەیە زۆر نیگەرانم، بە راستی هێرشی کردە سەر حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و پابەندی سەراحەت نەبوو، ئێمە هەتا لە سەرکردەی رژێمێکی کەمینەی ناودەنگ خراپیش چاوەڕوانمان دەکرد هەندێ پابەندی رەوشت بەرزی بێت، لەبەر ئەوەی سەرکردەی رژێمێکە بۆیە بیانووی نییە کەوا پابەندی سەرەتاییەکانی رەوشت نەبێت، کاتێ پیاوێک وەک ئەو دێتە کۆنگرەیەکی وا و بەم جۆرە هەڵسوکەوت دەکات و ئوسلوبی سیاسی وایە، وەک بەڕێز دوکلیرک کەوا ئیمڕۆ کردی، وادەکات کەسانی کەم هەبن بتوانن و ئامادە بن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن. ئێمە رازی بووین دوا وتار هی نوێنەری حکومەت بێ، حکومەت زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی ئەو دوا وتە پێشکەش بکات، ئێستا بۆمان روون بۆوە کەوا لە پشت ئەوە نیازی چی بوو، بەڕێز دوکلیرک رێزگرتن و جوانی مێوانداریەکەی بە هەلزانی و ئەوەی ویستی وتی وای زانی من وەڵامی نادەمەوە، بەڵام زۆر هەڵەبوو وا من وەڵامی دەدەمەوە.

وتم، شێوەکەی بەرێز دوکلیرک جوان نەبوو، حیزب، حکومەت نییە و ئەو دەست پێشخەربوو لە دانوستانەکانی ئاشتی، حکومەت، حیزب نییەو ئەوانن لە جارێک زۆرتر لە بەڵێنەکانیان پەشیمان دەبنەوە و جێ بەجێی ناکەن، بەرێز دوکلیرکم ئاگادار کردبۆوە کەوا هێرش کردنە سەر حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی سوودی نییە، بەڵام بە قسەی نەکردم، ئاماژەم بە بڕیاری راگرتنی شەڕی چەکداریمان کردو ئەوەش هەر لە پێناوی ئاشتی بوو، لە بەرامبەریدا حکومەت خەمساردبوو و لە پشت بەردەوامی شەڕی ناوخۆ مانەوە، هەروەها وتم، ئێمە بە حکومەتمان وت، ئەگەر ئێمە ببینە لایەنێکی حکومەت ئەوە چەک فرێ دەدەیین و کۆی دەکەینەوە، نەک پێش ئەوە.

ئەوەشم وت کەوا حکومەت ستراتیژیەکی دوو جەمسەری هەیە، ئەو بۆ ئاشتی دانوستان ناکات، ئەو بۆ بەدی هێنانی ئامانجی سیاسی هەرزان بەشداری دانوستانی کردووە، نەک بۆ ئاشتی. ئەوەشم وت، کەوا ئاشکرابووە ئەنکاتا پاداشتی یەک ملیۆن راندیان لە حکومەت وەرگرتووە، ئەو وتی، من ئاگادارنیم، منیش وەڵامم دایەوە، ئەگەر پیاوێک لەم پایەدا بێت و ئاگای لەم پاداشتە نەبێ، وا باشە دەست لەکار بکێشێتەوەو ئەو سەرۆک دەوڵەت نییە. باشم



دەزانی قسەکانم دڕن و نەمدەویست کەشتی دانوستان بخنکێت واش کۆتاییم بە قسەکانم هێنا:

داواکارم بەرێز دوکلیرک لاپەڕەکانی ئاشکرا بێت و لە سەر مێزیان ریز بکات، داواکارم، هەردوولامان بە ئاشکرا کاربکەین، با هەردووکمان هەرچی ستراتیژی نهێنی هەیە فڕێیان بدەین، نەدەبوا ئەو داوای دوا وتار بکات تا هێرشمان بکاتە سەر، وای دەزانی وەڵامی نادەمەوە، ئێستاش و سەرەڕای هەموو هەڵەکانی بەرێز دوکلیرک ئامادەم کاری لەگەڵ بکەم.

دانیشتنەکانی «کودیسا» بۆ رۆژی دوایی بەردەوام بوو و من و بەرێز دوکلیرک کۆششمان کرد بۆ سەلماندنی ئەوەی رووی دا زیانێکی گونجاوبوو، لە کردنەوەی دانیشتنەکانی کۆتاییدا دەستی یەکترمان گوشی و بەڵێنمان دا هاوکاری یەکتربین، بەڵام بڕوا کردن بە یەکتری هەژاو دواڕۆژی دانوستانەکە نادیاربوو.

شەش هەفتە پاش «کودیسا-١» حیزبی نیشتمانی هەڵبژاردنی ناوچەیی گرنگی لە بوتشیفستروم کە شارێکە لە ترانسفال و یەکێکە لە پێگە گرنگەکانی ئەم حیزبە، لە ئەنجامدا دووچاری شکانێکی چاوەڕوان نەکراو هات و پاڵێوراوی حیزبی پارێزگارانی چەپ کورسیەکەی بردەوە، ئەویش یەکێکە لەوانەی زۆر دژی دانوستانن لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، ئەو حیزبە زۆرینەی ئەندامانی ئەفریکانە کەوا هەست دەکەن کە دوکلیرک هەموو وڵات دەدۆڕێنی، ئەم ئەنجامەش گومانی خستە سەر بەرنامەی سیاسی چاکسازیی دوکلیرک و ترس گەیشتە ناو حیزبی نیشتمانی کەوا ئەندامانی خودی ناوەوەی حیزبەکە سیاسەتی قەبووڵ ناکەن و بەرهەڵستی دەکەن.

دوکلیرک ئەو گرەوی کردو بڕیاری دا ئەوانەی تەمەنیان گەیشتیتە هەژدە ساڵ و رەگەزی سپین لە رۆژی ١٧ی مارسدا هەڵبژاردن بکەن لەسەر سیاسەتی چاکسازی و دانوستان لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و هەروەها وتی، ئەگەر سیاسەتەکەی نەباتەوە ئەو واز لە سەرۆکایەتی دەوڵەت دەهێنێ، پرسیارە ئاراستەکراوەکە سادە و راستەوخۆ بوو ئەویش:

ئایا لەگەڵ بەردەوامی چاکسازییەکەی سەرۆک دەوڵەتن کە لە ٢ی فێبرایەری ١٩٩٠ ئیشی بۆ دەکات لەپێناوی دانانی دەستوورێکی نوێ و بە دانوستان؟

حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لەبەر بەشدارنەبوونی رەشەکان لەم هەڵبژاردنەدا بەربەستی راگەیاند، هاوکاتیش ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نەبووین سپیەکان بەرنامەکانی دوکلیرک لە دانوستانا رەتبکەنەوە، لەسەر هەڵوێستی کارەکە قسەم هەبوو و هاوکاتیش سپیەکانم هان دەدا بەشدار بن و

بۆ سەرۆک دوکلیرک بڵێین بەڵێ، چونکە ئەوەیان بۆ پاڵپشتی دانوستان بوو نەک بۆ سەرۆک دوکلیرک. بە بایەخ و بە نیگەرانییەوە چاوەڕێی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بووین، هەڵمەتەکەی حیزبی نەتەوەیی زیرەکانەو ورد و جوان و چاوتێرانە بوو، لەسەر شێوەی ئەمریکی بوو، لەگەڵ هەڵمەتەکە پروپاگەندەی فراوانی دەزگاکانی راگەیاندن و رۆژنامەو تەلەفزیۆنەکان و پۆستەر و دیداری جەماوەری میللی لەگەڵ بوو، هەروەها ئەزموونەکەمان بەو چاوە تەماشا کرد کەوا چۆن لە دوارۆژا بەرێز دوکلیرک هەڵمەتمان دژ دەکات.

لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکەدا دەرکەوت کەوا لە سەدا شەست و نۆی دەنگیان بۆ دانوستان داوە و ئەوەش سەرکەوتنی چاک بوو بۆ سیاسەتی دوکلیرک و زۆرتر شۆخی بەخۆ هات و حیزبی نیشتمانی هەستی کرد کەوا بەرنامەکەی بە هێزە لە دانوستان و ئەمەش ستراتیژیەکی ترسناک بوو.

* * *

لە ١٣ی ئەپریلی ١٩٩٢دا و لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیدا لە جۆهانسبێرگ رامگەیاند کەوا لە وینی ژنم جیابوومەتەوە، لەوێ هەردوو هاوڕێی دێرین و خۆشەویستم ولتر سیسولو و ئولیڤەر تامبوم لە تەنیشت راوەستابوو، مەسەلەکان لە سنوور بەدەربوون و بۆیە جیابوونەوەم بە قازانجی حیزب و خێزان و وینی زانی، گەرچی کێشەکەمان پەیوەندی بە خودی خۆمان هەبوو ئینجا ئاگاداری حیزبیشم کردەوەو لە کۆنگرەکەدا ئەم دوانەم دا:

لەبەر ئەوەی نێوان من و ژنەکەم هاوڕێ نومزامو وینی ماندێلا بووە جێگای گومان و لە دەزگاکانی راگەیاندندا باسی لێوەکراو ئەم دوانەشم بۆ ئەوەیە کۆتایی بە گومانەکان بێت و هەڵوێستم ئاشکراو روون دیار بێ.

لە قۆناغێکی ناسکی خەبات لە پێناوی ئازادی وڵاتدا لەگەڵ هاوڕێ نومزامو بووینە هاوسەر، لەبەر ئەوەی هەردووکمان پابەندی خەبات بووین لەناو ریزەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی دا و هیوامان نەمانی نەژادپەرستی و خەبات بوو بۆیە بۆمان نەگونجا ژیانی خێزانی وەک پێویست بژین، بەڵام سەرەڕای ئەوەش و بوونی تەنگژەی زۆر خۆشەویستی لە نێوانماندا رووا و دڵسۆزی و وەفامان بۆ خێزانەکەمان و پەیوەندی ژن و مێردایەتیمان هەبوو.

وینی لەو ساڵانەی لە دوورگەی روبین مامەوە ئەستون و هاوکاری و نازم بوو، هەروەها هاوڕێ نومزامو ئەرکی پەروەردەی منالەکانیشی لە ئەستۆدابوو، بە ئازایەتی توانی باری گرانی چەوسانەوە هەڵگرێت و بەرگری ستەمەکانی حکومەتی کرد کەوا رووبەڕووی دەکرایەوە.



برواشی لە خەبات بۆ ئازادی نەگۆڕبوو، ئەوەش وای کرد لە پێش چاوی من خۆشەویست تر و گەورەتر بێ و جیهانیش هەموو شاهیدی بۆ دەدەن و خۆشەویستی و ئەڤینم بۆی هەر دەمێنێ.

لەو چەند مانگەی دواییدا، لە سەر چەندین بابەت ناکۆکیمان لا دروست بوو، بۆیە بە رەزامەندی هەردوولامان و بۆ چاکەی هەموو لایەک بڕیارماندا لە یەکتری جیاببینەوە، دیارە هەڵوێستی من بەرامبەر ئەو لەبەر ئەو هێرشانە نەبوو کە لە لایەن دەزگاکانی راگەیاندن ئاراستەی دەکرا، ئێستاش من هەموو پشتیوانی و کۆمەکێکی بۆ دەنوێنم، ئەگەر لە هەر لایەنێکی نالەباری ژیاندا دووچاری هات.

من لە ژیان لەگەڵیادا پەشیمان نیم، بەڵام هەندێ زرووفی دوور لە دەسەڵاتی ئێمەوە ناچاربووین، ئەوەی حەزمان نەدەکرد رووی دا، من ماڵئاوایی لە ژنەکەم دەکەم و بە هیچ شتێ تاوانباری ناکەم. بە هەموو ئەڤینەوە لە باوەشی دەگرم و سۆزی راستگۆییم لەناو زیندان و لە دەرەوەی و لە یەکەم دیدارمان هەر هەیە، داواکارم هەموو کەسێ لە ژان و خەمی رۆژانەم بگەن.

ژانی ئەوە کوێراییم دەداتێ، کە من وەک مێردو باوک بە ئەرکی سەرشانم هەڵنەستاوم. دەزانم ژنەکەم لە ژیانی زیندانی مندا زیاتر ئازاری چێشتووە، هەروەها ئازادبوونیشم هەر بۆ ئەو ژان بوو، ئەو مێردی بە پیاوێک کرد کەم لەگەڵیا ژیا، دوایی بووە ئەفسانە وا ئەفسانەکە دووبارە هاتەوە ناو ماڵی و دوایی دووبارە بووە بە پیاوەکەی جاران.

لە رۆژی بووکێنی زیندزی کیژمدا وتم، چارەنووسی تێکۆشەران وایە دەبێ ژیانیان هەر ئاڵۆز بێ. کە خەبات دەبێتە ژیان -وەک من ئێستا- جێگای ژیانی خێزانی تێدا نامێنێتەوە، زۆرماوە لە ژیانم کە لێی پەشیمانم، من گەورەترین سەرچاوەی ژان و مەترسیم لە ژیاندا هەڵبژارد. هەروەها وتم:

منالەکانم وا گەورەبوون و هیچم ئامۆژگاری نەکردن، کە لە زیندانا بووم منالەکانم دەیانووت باوکمان لە زیندانە و ئازاد دەبێ، بەداخەوە، وا ئازادیش بووم، ئێستاش دەڵێن، وازی لە باوکایەتی ئێمە هێناو بووە باوکی میللەتێ، پیاو ببێتە باوکی نەتەوەیەک شانازیەکی گەورەیە، بەڵام کامەرانی راستەقینە لەوەدایە پیاو ببێتە باوکی خێزانێک، من ئەوە بە کامەرانی دەزانم کە من تامی زۆر کەمم لێی وەرگرت.

* * *

پاش راوەستانی چوار مانگ لە مایۆی ١٩٩٢دا خولی دووەمی کۆنگرەی حیزبەکان لە مەڵبەندی بازرگانی بەسترا، ئەم کۆنگرەیە ناونرا بە «کودیسا-٢» پێش کۆنگرەکەش دیداری نهێنی لەنێوان حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و حکومەت و هەروەها نێوان حیزبمان و رێکخراوەکان هەبوو. دیدارەکان بە کۆبوونەوەیەکی نهێنی نێوان من و بەرێز دوکلیرک یەک رۆژ پێش بەستنی (کودیسا-٢) کۆتایی پێ هات، ئەوەش یەکەم دیدارمان بوو پاش (کودیسا -١).

رۆژانی پێش بەستنی (کودیسا-٢) حکومەت تووشی دوو نسکۆی سیاسی بوو یەکەم، سەبارەت بەئاشکرابوونی گەندەڵی و پارە خواردن لەناو وەزارەتی گەشەپێدان و یارمەتیەکانی بەرپرسی لە بەرزکردنی ئاستی ژیانی هاوولاتیانی رەشدا. دووەمیشیان ئاشکرابوونی دەست بەرپرسانی ئاسایشی لە ساڵی ١٩٨٥دا بۆ کوشتنی چوار ئەندامی بەرەی دیموکراتی یەکگرتوو وەک مانیو گونیوی. ئەوەش هاوشان هاتە ئاشکرابوون لە دەستی حکومەت لە تاوانەکانی پۆلیس لە ناتال و کارە نهێنییەکانی بەشی ئیستیخباراتی سەربازی دژ بە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی، ئەم دوو رووداوە حکومەتی هەژاندو راستگۆییان شێلو بوو و لە بەرامبەریشدا هەڵوێستی ئێمە لە دانوستانەکەدا بە هێزتربوو.

پێش چەند مانگێ و بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی حکومەت پێشنیاریان کرد کەوا سەرۆکایەتی وڵات بکرێتە نۆرە. هەروەها هەردوولا گەیشتنە رەشنووسی رێککەوتننامەیەک بۆ دانانی ماوەی کاتی بۆ گواستنەوەی دەسەڵات تا تەواوی خوارووی ئەفریقیا بەرەو رژێمێکی دیموکراسی ببات. لە هەنگاوی یەکەمدا «جڤاتی تەنفیزی کاتی» دابنرێت و حیزبەکانی ئەندام لە (کۆدیسا) بە وەکالەت کاروباری حکومەت بەرێوەبەرن و بەرنامەیان دانان و خۆشکردنی پێگەیەکی سیاسی بۆ حیزبەکان و هەروەها دانانی دەستوورێکی کاتی.

هەنگاوی دووەمیش قۆناغی هەڵبژاردنی کۆمەڵەی دامەزرێنەرو دەستەی تەشریعی و هەر حیزبێک لەم هەڵبژاردنەدا لە سەدا پێنجی دەنگەکان بێنێ حەقی دەبێ بەشداری لە حکومەتدا بکات، نیوەی ئەندامانی کۆمەڵەکە بە هەڵبژاردنی گشتی و نیوەکەی تر بە هەڵبژاردنی ناوچەیی دەبێت و کۆمەڵەکەش دەسەڵاتی دانانی دەستوور و بڕیارە تەشریعییەکانی دەبێت و چاودێری پاکی و چوانی هەڵبژاردنەکان لەلایەن دەستەیەکی بێلایەن دەبێت.

لەگەڵ ئەوەش لە زۆر مەسەلەدا نەگەیشتینە رێککەوتن وەک رێژەی دەنگی پێویست بۆ گەیشتن بە کۆمەڵەی دامەزرێنەر بۆ یەکلاکردنی بابەتە دەستوورییەکان و پرۆژەی یاسای مافەکانی کەس،



پێش (کودیسا - ٢) بە چەند رۆژێک حکومەت بیرۆکەی دامەزراندنی جڤاتی پیرانی خستەڕوو، جڤاتەکە لە نوێنەری هەرێمەکان بێ و بتوانن کەمینە مافی ڤیتۆیان هەبێ، هەروەها پێشنیاری ئەوەشی کرد کەوا (کودیسا -٢) رەزامەندی لەسەر دەستووری کاتی بکات و ئەوەش ئامادەکردنی چەند مانگ دەخایێنێ.

هەموو ئەو شلکردن و سەقفانە لە پشت پەردەوە دەکران و لەگەڵ هاتنی کاتی (کودیسا - ٢) لە ١٥ی مایۆی ١٩٩٢ ئەگەری رێکەوتن لاوازو نادیاربوو، ئەو شتانەی لەسەری کێشەمان هەبوو، چارەسەر نەکرا، لەگەڵ بەرێز دوکلیرک لەسەر زۆر بابەتی هەڵپەسراو نەگەیشتینە یەک، حکومەت ئامادەی چاوەڕوانی بوو، چونکە ئەو وای دەزانی چاوەڕوانی هەتا دوایی بە قازانجی ئەوان دەبێ چونکە ئەگەری ساردبوونەوەی پشتیوانی کۆمەکمان دێتەپێش.

لە رۆژی یەکەمی کۆنگرەدا گەیشتینە کۆڵانێکی داخراو و هەردوو دادوەرەکان داوایان لە من و دوکلیرک کرد ئێوارێ دانیشین و لە رێگاو چارەسەرێک دووان بکەن بۆ گەیشتن بە چارەیەکی گونجاو، دانیشتین و لەسەر ئەوە رێککەوتین کەوا دانوستانەکان بەربەستی نێتە پێش، بەڵام بۆ دەربازبوون لە کێشەکان هیچمان نەکرد، بە دوکلیرکم وت:

چاوەکانی هەموو خوارووی ئەفریقیا و جیهانیش روویان لە من و تۆیە، بۆیە با شتێ بکەین، با پرۆسەی ئاشتی رزگار بکەین و رێککەوین لەسەر شتێ، ئەگەر هەرنا، با کاتی دیدارێکی تر دیار بکەین. هەردوولا رێکەوتین کەوا هەردووکمان بەیانی بە گیانێکی بنیاتنێنەرانەو بۆ رازی کردنی هەموولایەک قسەبکەین.

لە پاش نیوەڕۆی رۆژی دوای بە پێچەوانەی ریزبەندییەکەی (کودیسا-١) قسەمان کرد، دوکلیرک سووربوو لەسەر ئەوەی کەوا حیزبی نیشتمانی نایەوێت مافی ڤیتۆی کەمینە - وەرگرێت. بەڵکو نیازی وایە رژێمێک بەرقەراربێ کە لەسەر پێوانەو بڕیارەکان بڕوات و مافی زۆرینەی خەڵک زەوت نەکات لە کاتی وەرگرتنی دەستەڵاتدا. سەرەڕای ئەوانەش لە قسەکانیدا شکۆی دەسەڵاتی زۆرینەی کەم راگرت، منیش لەوەی کەوا پێویستی بەرێز دوکلیرک کەشی دانوستانەکان ئارام بکات و بەگیانێکی خێرخوازانە ئیش بکات، زیاتر قسەم نەکرد.

هەرچەندی کۆششم کرد ئەنجامی گفتوگۆکانی رۆژی دووەمی کۆنگرەکە باش و گەشبین بێت، بەلام، وانەبوو و لە کوێرە رێی داخراو تەواوبوو. هۆیەکەش بە بۆچوونی من دوودڵی حیزبی نیشتمانی بوو بۆ پێدانی دەسەڵات بە ئیرادەی زۆرینە، حیزبەکە هەر نەیتوانی ئەم هەنگاوە ببەزێنێ.

کۆنگرە دانیشتنەکانی تەواوبوون و لەچوار بواردا هیچی نەکرد، وەک؛ سووربوونی بۆ مۆڵەتی دەستوور بە دەنگی زۆر «ئەوەش لە راستیدا بەکارهێنانی مافی ڤیتۆیە». دەسەڵاتداری هەرێمی پارێزراو بەندە بە دەستووری تازە. جڤاتی پیرانی هەڵنەبژاردراو و نادیموکراسی حەقی هەیە یاساکانی پەرلەمانی سەرەکی هەڵوەشێنێتەوە. پێداگرتن لەسەر کردنی دەستووری کاتی بە دەستووری هەمیشەیی بە رێگای دانوستانی ناو کۆنگرەکە.

هەموویان کێشەی ئاڵۆزبوون، بەڵام دەکرا چارەسەر بکرێت، من پەرۆشی ئەوەبووم کەوا سەرنەگرتنی (کودیسا -٢) نەبێتە هۆی نەمانی دانوستانەکان. حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی رێکەوتن لەسەر بەردەوامی دانوستانە دوو قۆڵییەکان بۆ گەیشتن بە چارەسەرییەک، بەڵام دروستبوونی کێشەی تر وای کرد ئەمەیان ئاستەم بێ.

لەگەڵ سڕبوونی دانوستانەکان، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی و هاوپەیمانەکان رێکەوتن لەسەر سیاسەتی «کاری جەماوەری بەردەوام» تا بۆ حکومەت بسەلمێنن کەوا حیزب چەند پاڵپشتی جەماوەری هەیەو میللەتیش روون بکاتەوە کەوا چی تر ئامادە نییە چاوەڕێ بێ بۆ وەرگرتنی ئازادی.

بەرنامەی کاری جەماوەریەکە بریتی بوو لە خۆپیشاندان و یاخیبوون و نارەزایی نیشان دان و رۆژی ١٦ی یۆنیۆی ١٩٩٢ ساڵرۆژی راپەڕینی سویتوی ساڵی ١٩٧٦ دانرا بۆ دەستپێکردنی هەڵمەتەکە و بە دوو رۆژی مانگرتن لە رۆژانی ٣ و٤ ئۆگستۆس تەواو بێ.

بەڵام پێش ئەوە رووداوێک هاتەپێش و درزی نێوان حیزب و حکومەتی فراوانتر کرد، ئەویش لە شەوی ١٧ی یۆنیۆی ١٩٩٢دا هێزێکی چەکداری زۆری هەوادارانی حیزبی ئەنکاتا هێرشێکی نهێنییان کردە سەر گەڕەکی بویباتونگ لە ناوچەی فال ترایەنگل و لە ئەنجامدا چل و شەش کەسیان کوشت کەوا زۆربەیان ژن و منداڵ بوون. ئەوەش چوارەم کۆمەڵکوژی بوو بۆ دۆستانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی لە ماوەی یەک هەفتەدا، بەم کارەساتە هاوولاتیان لە هەموو گۆشەیەکی ولات هەڵپرۆکان و حکومەتیان تاوانبار کرد کەوا دەستی لەم تاوانەدا هەیە. پۆلیس بێدەنگ و جولەیەک ناکات و توانباران ناگرێت و بەدوای بکوژاندا ناگەڕێت و بەرێز دوکلیرک دەنگی لێوەنەهات، ئەوەیان دوا پوش بوو، لە وزەمدا نەما، هەر حکومەتە و تەگەرە بۆ سەرکەوتنی دانوستانەکان دادەنێت و هاوکاتیش شەڕ دژی هاوولاتیانی خۆی بەرپادەکات، هیچ نەما تا دیدارمان لەگەڵیان بمێنێ.؟



چوار رۆژ پاش کۆمەڵکوژییەکە لەپێش بیست هەزار دۆستی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقیدا قسەم کردو وتم: من رێنماییم بۆ سکرتێری گشت حیزب سیریل رامافوسا دەرکردووە، کەوا هەموو جۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ حکومەت راگرن، هەروەها رامگەیاند کەوا دیدارێکی بەپەلەی لیژنەی تەنفیزی گشتی بۆ دوان لەسەر بژارو پێشهاتەکانی ئیمڕۆ ببەسترێت. شتەکان وا دەرکەوت کەوا ئێمە دووبارە دەگەڕێینەوە بۆ رۆژانی شار بفیلی رەش.کردەوەکانی حیزبی نیشتمانیم بەکردەوەکانی ئەرکانی نازی شوبهاند و لەپێش ئەو خەڵکەدا بەرێز دوکلیرکم هوشیارکردەوە نەوەک کاری توندوتیژی و بەرپەرچدانەوە دژ بە خۆپیشاندەران و دەربڕینی ئازاد بکات. بەپێچەوانەش حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هەڵمەتی فراوانی دژ دەکاتەوە و خۆشم یەکەم کەسم بەشداری دەکەم.

چەند لافیتەی وەک (ئەی ماندێلا چەکمان بدەرێ، سەرکەوتن بە شەڕ دێتە دەست نەک بە دانوستان) بەرزکرایەوە، بەوانە لە هەست و سۆزی خەڵک گەیشتم و زانیم بە راستی بێزارن و بەرگەی ناگرن، خەڵکەکە بە دانوستان هیچیان وەرنەگرت و بۆ بنبڕکردنی رژێمی نەژادپەرستی تەنیا بە لوولەی تۆپەکان دەکرێت، پاش رووداوە جەرگبڕەکەی بویباتونگ دەنگۆی ئەوە لە ناو لیژنەی تەنفیزی پەیدابوو «بۆچی وازمان لە خەباتی چەکداری هێنا؟». «پێویستە واز لە دانوستان بهێنرێت چونکە نامانگەیەنێتە هیچ ئەنجامێ». دەنگەکان لە ناخمدا وەڵامدانەوەیەکیان ئەنجام داو ناخی هەژاندم، بەڵام دوایی هێدی هێدی ساردبوومەوە و بینیم بێجگە لە دانوستان بواری ترمان نییە. هەر ئەوە هەڵوێستم بووەو کۆششم بۆی کردووەو پشتی تێ ناکەم و کاتی ئەوە هاتووە کەشەکە هێمن بکەمەوە. کاری جەماوەری، خاڵی ناوەندی نێوان رێگای خەباتی چەکداری و دانوستانە. خەڵکەکە مافی خۆیەتی کوڵان و ژانیان دەربڕن و هەوایێ وەرگرن، کاری جەماوەریش باشترین هەنگاوە بۆ دەربڕین.

یاداشتنامەیەکمان پێشکەشی دوکلیرک کردو بۆمان روون کردەوە کەوا بۆچی لە دانوستاندا کشاینەوە، بێجگە لەوەی کێشەم لەسەر دەستوور لە رۆژانەی (کودیسا - ٢) هەبوو، داواشمان کرد بەرپرسانی توندوتیژی و کوشتارییەکان دەست نیشان بکەن و سزای رەوا وەرگرن و گەڕەکی کرێکارانی دەرەوەی شارەکان پارێزگاری بکرێن و چی تر کوشتار و تاوانی لێ روونەدات، دوکلیرک وەڵامی داینەوە کەوا من رووبەڕوو ببینێ، ئێمەش وەڵاممان دایەوە، کەوا ئیمڕۆ دانیشتنی وا هیچ ناکات و دیدار لەم رۆژەدا پێچەوانەی رووداوەکانە. هەڵمەتی کارە جەماوەرییەکە بە

مانگرتنی گشتی لە ڕۆژانی ٣ و٤ی ئۆگستۆس کۆتایی هات، هەڵمەتەکەش بۆ پاڵپشتی داواکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە دانوستان بوو، نارەزاییش بوو لە هاوکاریکردنی حکومەت بۆ تاوانباران و بکوژانی ڕووداوەکانی توندوتیژی. زیاتر لە چوار ملیۆن کرێکار ئیشیان ڕاگرت و ئەوەش گەورەترین مانگرتن بوو لە مێژووی خوارووی ئەفریقیادا، یەکێک لە چالاکییەکانی مانگرتنەکە خۆپیشاندانێکی سەد هەزار کەسی بوو بۆ پێش باڵەخانەی یەکێتی شکۆدار کە بارەگای ڕەسمی حکومەتە لە خوارووی ئەفریقیا لە بریتۆریاو لەوێش کۆبوونەوەیەکی میللیمان لە هەوادا سازکرد. لەوێ وتم: ڕۆژێ دادێ ئەم باڵاخانە دەکەینە شوێنی یەکەم حکومەتی دیموکراسی هەڵبژێردراو لە خوارووی ئەفریقیا.

لە گەرمەی هەڵمەتەکەدا، دوکلیرک وتی، حکومەت ناچارە ڕێگای ناخۆش بگرێتەبەر ئەگەر دۆستانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ڕەوشی وڵات بەرەو زیاتر نائارامی ببات. منیش دوکلیرکم ئاگادارکردەوە کەوا هەر کارێکی نادیموکرتی ڕووبدات ئەوا ئەنجامەکەی خراپ و دژوار دەکەوێتەوە، ئەو هەڕەشانەش وا دەخوازێ بە پەلە حکومەتی کاتی دامەزرێت.

لەگەڵ سەرگرتنی کارە جەماوەرییەکەدا، دەستەیەک لە دۆستانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بڕیاریان دا کاروانێک بۆ بیشو پایتەختی هەرێمی سیسکای نەژادی لە کیپی خۆرهەڵات کە لەژێر فەرمانڕەوایەتی عەمید ئەوبا گگوزو بوو بکەن. ئەم هەرێمە مێژوویەکی دیاری هەیە لە کپکردنەوەی چالاکییەکانی حیزبمان و هەر بەو بیانوویە عەمید گگوزو لە ساڵی ١٩٩١دا باری نائاسایی تێدا ڕاگەیاند و گوایە مەبەستی ڕاگرتنی پشتیوانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی لە کارە توندڕەوییەکان دا. کاروانەکە لە بەیانی ٧ی سێپتێمبەر بە ئامادەبوونی حەفتا هەزار کەس جوولا بەرەو ئەستادی سەرەکی لە بیشو. کە هەندێ لە خۆپیشاندەران ویستیان بەربەستەکان بۆ کورتکردنەوەی ڕێگای سەنتەری شار ببڕن، سەربازەکان تەقەیان لێکردن و لە ئەنجامدا بیست و نۆ کەس کوژران و زیاتر لە دوو سەد کەسیش برینداربوون، بەم جۆرە بیشو وەک بویباتونگی دەستەخوشکی تووشی کاری دڕندانە و خوێن ڕژان هات.

پەندێک هەیە دەڵێ: تاریکترین کاتی شەو پێش کازیوەیە، کارەساتی بیشو بواری لە پێش دانوستان سازکرد، لەگەڵ دوکلیرک دانیشتم و باسی کەش خولقاندنمان کرد تا کارەساتەکە دووبارە نەبێتەوە.

هەردوولا بە چڕی کەوتینە گفتوگۆی بەردەوام، هەردوولا بە نیازپاکی کۆششیان کرد بۆ



گەیشتنی دانوستانەکە بە پێگەیەکی ڕاست. لە ٢٦ی سێپتێمبەردا یەکەم دیداری لوتکەیی ڕەسمی لەنێوان من و دوکلیرک بەسترا. ئەم ڕۆژە «بەڵگەنامەی لە یەکگەیشتن»مان ئیمزا کرد و ئەوەش سنووری گشتی بۆ هەموو دانوستانەکان داڕشت، هەر لەم ڕێکەوتنەدا لیژنەیەکی سەربەخۆ دانرا بۆ بەدواچوونەوەی لێپرسینەوەی دەزگای پۆلیس، هەروەها ئالیەتێک دانرا بۆ پاراستنی ماڵی کرێکارەکان، هەڵگرتنی چەکی تەقلیدیش لە کۆبوونەوە گشتیەکانیش قەدەغەکرا، بەڵام گرنگترین بابەت کە لە «بەڵگەنامەی لە یەکگەیشتن»دا هاتبوو، شکاندنی گرێیە دەستووریەکە بوو کە لە (کودیسا -٢) سەری هەڵدا. لە کۆتاییدا حکومەت ڕازی بوو کۆمەڵەی دەستووری هەڵبژێردراو دانرێت و کاریش سازکردنی دەستووری تازە بێ کە ئەرکی جڤاتی یاسادانانی کاتی بێ بۆ حکومەتێکی تازە. کاروبەرنامەی دانوستانەکە هەر ئەوەندەی مابوو کەوا ڕۆژی هەڵبژاردنەکانی کۆمەڵەی دەستووری و دیارکردنی ڕێژەی زۆرینەی پێویست بۆ مۆڵەتی بڕیاردان دابنێ. ئەوەش هەمووی بەرەو ئەوە برد کەوا ڕامانی یەک کەسەو چوارچێوەکەش بردنی وڵاتە بەرەو وڵاتێکی دوارۆژی دیموکراتی.

ئەم بەڵگەنامەیە وای لە حیزبی ئەنکاتا کرد لە هەموو گفتوگۆکانی بەشدار لەگەڵ حکومەت و لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بکشێتەوە. هەروەها واشی لە سەرکردە بوتیلیزی کرد پەیوەندی لەگەڵ حیزبی دەسەڵاتدار بپچڕێنێ وهەڤاڵبەندی لەگەڵ چەند دەستەی دۆڕاوی ناوچە نەژادییەکان و هەندێ حیزبی سپییە ڕاسترەوەکانی دابمەزرێنێ کە یەک ئامانجیان هەبووە ئەویش دامەزراندنی وڵاتێک بۆ ئەفریکیەکان. سەرکردە بوتیلیزی داوای کرد بەڵگەنامەکە هەڵبوەشێتەوەو دیدارەکانی کودیساو بڕاقی ئومخونتو وی سیزوی «ئەمکا»ش نەمێنێ. دەستپێشخەری ڕاگرتنی کاری چەکداری وای لە جوسلوفو کرد کەوا دەستپێشخەریەکی شیاو باس بکات، ئەویش داواکردن بۆ ڕاگەیاندنی حکومەتێکی یەکێتی نیشتمانی، لە ئۆکتۆبەردا جوسلوفو کاغەزێکی بڵاوکردەوەو تێیدا وتی:

دانوستان لەگەڵ حکومەت دانوستانی ڕاگرتنی شەڕ نییەو چەسپاندن و داواکردنی مەرج نییە لەسەر دوژمنێکی بەزیو. هەروەها وتی، حیزب پێویستی بە ماوەیەکی درێژ هەیە بۆ وەرگرتنی دەسەڵات و حکومەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی هەتا پاش هەڵبژاردنەکانیش پێویستی بە کادیرەکانی ئێستای ئەم حکومەتە دەبێت بۆ وڵات بەڕێوەبردن، بۆیە پێشنیاری ئەوەی کرد ڕێکەوتن لەسەر «بڕگەی ئاوابوون» کە تێیدا داواکارە حکومەتی یەکێتی نیشتمانی دابمەزرێت

لەسەر بناغەی هاوبەشی لەگەڵ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی بۆ ماوەیەکی دیاریکراوو لێبووردنی گشتی سەبارەت بە پیاوانی ئاسایش بکرێت و پشت تەنیا بە فەرمانبەرانی حکومەتی «ڕاژەی مەدەنی» ببەسترێت. ڕامانی «بەشداربوون لە دەسەڵات» لەناو کادیرانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ناپەسند بینراو بە دەمامکیان زانی کەوا حکومەت بۆ کاری ڤیتۆی کەمینە بەکاری دەهێنێ. بەڵام لەم نیگایەوە ئەوە دەگەیەنێ کەوا حیزبی نیشتمانی هاوبەشە لە حکومەتی هەڵبژێردراو لەلایەن میللەتەوە بە مەرجێ ئەگەر دەنگی پێویستیان هێنا.

پاش گفتوگۆیەکی زۆر پێشنیارەکەی جوم پەسندکرد و لە ١٨ی نۆڤێمبەردا لیژنەی تەنفیزیش پەسندی کرد، بەڵام لیژنەی تەنفیزی لەگەڵ –بەشداری کردنی دەسەڵاتی لایەنەکانە– بە مەرجێک حیزبی کەمینەکان مافی بەکارهێنانی ڤیتۆیان نەبێت لە دەرکردنی بڕیارو یاساکان. لە خانوویەکی لاچەپی ناو دارستانێ لە دیسێمبەر خولێکی تری گفتوگۆی دووقۆڵی نهێنیان لەگەڵ حکومەت سازکرد و دانیشتنەکان پێنج ڕۆژی خایاند. دانیشتنەکە چونکە لەبەر ڕۆشنایی –بەڵگەنامەی لە یەکگەیشتن– بوو بۆیە دیدارەکە یەکلاکەرەوەبوو، هەروەها لەم دیدارە نهێنییەدا وەک هەڵوێست کۆک بووین لەسەر حکومەتێکی یەکێتی نیشتمانی بۆ ماوەی پێنج ساڵ و ئەو حیزبانەی پێنج لەسەدا دەنگیان هێناوە بەشدار بن، پاش ئەم پێنج ساڵەش ئەم حکومەتە نیشتمانییە دەبێتە حکومەتی زۆرینە. لە فێبرایەر ڕاگەیەندرا کەوا حکومەت و حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ڕێکەوتن لەسەر حکومەتێکی یەکێتی نیشتمانی و حکومەتی فرە حیزبی و دامەزراندنی جڤاتی تەنفیزی کاتی و هەروەها ڕێکەوتن لەسەر هەڵبژاردنی گشتی لە کۆتایی ساڵی **١٩٩٣**دا.

* * *

بە درێژایی ژیانم ئارەزووی هەبوونی خانووێکم لە نزیک زێدی خۆم هەبوو، هەر کە لە زیندانا بەربووم کۆششم کرد خانوویەکی لادێیی لە قونو دروست بکەم، لە پاییزی **١٩٩٣** دروستکرا. نەخشەی خانووەکەم لەسەر هەمان ئەو نەخشەیە دانا کە خانووی زیندانی فیکتور فیرستر هەیبوو، ئەوەش جێگای سەرنجی زۆری خەڵک بوو، وەڵامەکەشم ئاسان بوو، ئەویش، ئەو خانووە، گەورەترین و خۆشترین خانوو بوو، لەژیانما، زۆرم خۆش ویست، نەخشکەی کەوتبووە بەردڵم و دابەشکردنی ژوورەکانی و پێویستییەکانی چاک بوون.



بۆیە بەم جۆرە شەوان لە خانووەکەی قونو خواردنگەکە گوم ناکەم و شارەزام.

لە ئەپریل لە مۆڵەتێکی کورتدا بووم لە خانووەکەم لە ترانسکای، لە بەیانی ١٠ی ئەپریل لە دەرگادا پێشوازی دەستەیەک پۆلیسی ترانسکایم دەکرد لەناکاو بەڕێوەبەری ماڵەکەم بەدوامدا هات و بە گریانەوە وتی تەلەفۆنێکی بە پەلەت لەگەڵە. کە داوای لێبووردنم لە دەستەکە کرد چوومە لای تەلەفۆنەکە و هەواڵەکەم وەرگرت. هەواڵەکەش هاوڕێم کریس هانی سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی لە خوارووی ئەفریقیا و سەرکردەی گشتی بزاڤی «ئەمکا»ی جاران و گەورەترین سەرکردەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە وڵات لە پێش ماڵەکەی خۆی لە بوکسبێرگ تەقەی لێکراو کوژرا، ئەم گەڕەکە گەڕەکێکی کرێکارە سپییەکان بوو لە جۆهانسبێرگ و ئەو دەیویست ناوچەکە بکاتە ناوچەیەکی فرە نەژاد.

مردنی کریس کارەساتێکی گەورەبوو بۆ بزاڤەکە هەموو، سەربازێکی دڵسۆزی وڵات بوو، بۆ هیچ کارێ دوودڵ نەبوو، کریس پاڵەوانێک لە پێش چاوی نەوەی نوێ و ئەو لێیان تێدەگەیشت و ئەوان تێیدەگەیشتن، بە زمانی ئەوان دەدواو گوێیان لە بۆچوونەکانی رادەگرت، تەنیا بەو دەکرا بیرۆکەی دانوستان بە لاوەکان ئاشنا بکات، خوارووی ئەفریقیا یەکێک لە کەڵەپیاوەکانی لە کیس چوو، هەر بەو پیاوە دەکرا وەرچەرخانێک بە وڵات بکات بۆ بەدی هێنانی دەوڵەتێکی نوێ.

ڕەوشی وڵات ئاڵۆز دیاربوو، ترسی ئەوە هەبوو گەنجەکان تۆڵەی کریس بکەنەوەو کوشتار دروست بێ و شەڕی نەژادی هەڵبگرسێت و ئامادەییش هەبوو بۆ گیانی شەهیدەکەیان گیانفیدایی بکەن، بە فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەر بۆ پرسەی باوکی کریسی تەمەن هەشتاو دوو ساڵە چووم. پرسەکە لە شارۆچکەی سابالیلیی ناوچەی کوفیمفابا لە ترانسکای و شارەزای ناوچەکە بووم چونکە وڵاتی خێزانی ماتانزیما، کە ئەم گوندە بێ ئاو و کارەبایەم بینی، سەرسام بووم کەوا پیاوێکی وەک کریسی هانی لێ دەرچووە، ئەو پیاوەی توانی میللەتێک بە سۆزو تواناکانی بهەژێنێ. لەبەر منداڵی خۆی لەم گوندە هەژارەدا بووە بۆیە ڕەگ و ڕەچەڵەکی خۆی لە یادبووە و بایەخی بە چینی زەحمەتکێش داوە، باوکی بە سۆزەوە لە خەمی لە کیس چوونی کوڕەکەی دەربڕی و ڕازیش بوو کەوا لە پێناوی خەباتا کوژرا.

کە گەڕامەوە جۆهانسبێرگ زانیم پۆلیس پیاوێکی سپی پۆڵەندی نەژاد ئەندامی ڕێکخراوێکی ئەفریکانی ڕاستڕەوی توندڕەوی گرتووە، ئەوەش ژنێکی ئازای ئەفریکانی ژمارەی ئۆتۆمبێلەکەی داوەتە پۆلیس. تاوانەکە هەوڵێکی بێسوود بوو بۆ تەگەرەخستنی کاروانی ئاشتی. داوام لێکرا

ئەمشەوە بە رادیۆی خوارووی ئەفریقیا قسە بۆ نەتەوە بکەم، ئەمجارە نۆرەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقییە جۆشی خەڵک هێوربکاتەوە، نەک حکومەت.

وتم، ناکرێ کاروانی ئاشتی و گفتوگۆ راوەستێ، بە هەموو سۆزو کاریگەری لە جەستەمدایە قسەم کرد، داوام کرد ئارام بن و یادی کۆچکردوو کریس هانی بکەنەوە و هێزی پارێزگاری ئاشتی و ئاسایش و هێمنی بن، ئەمەی خوارەوە لە وتەکەمدا هەبوون:

«ئەمشەو دەستم بۆ رەش و سپیەکانی خوارووی ئەفریقیا پان دەکەمەوە، لەناخمەوە دەڵێم، ئەو پیاوە سپییە لە دەرەوەی وڵاتەوە هاتووەو دڵی پڕ رق و تووڕەییەو تاوان ئیمڕۆ میللەت دەخاتە سەر رۆخی رووخان، بەڵام ژنێکی سپی ئەفریکانی نەژاد گیانی خۆی خستە مەترسی کە ئاگاداری پۆلیسی کردەوەو داوای کرد تاوانبارەکە بدرێتە دادگا، ئیمڕۆ کاتی ئەوەیە هەموو هاووڵاتیەکی خوارووی ئەفریقیا کۆشش بکات و هاوکاری یەکتری بن بۆ رووبەڕووبوونی ئەو تەگەرەیەی دەیەوێت بناغەو کۆششی کریس هانی ئەوەی گیانی بۆ بەخت کرد برووخێنێ، ئەو بۆ ئازادی هەموومان قوربانی دا، بۆ هەموومان و بە جیاوازی ناسنامەکانیش».

تیرۆرکردنی کریس هانی هەوڵی نەژادپەرستە سپیەکان بۆ لەباربردنی ئەو چارەنووسە پێش هاتە، دەخوازن وڵات بەرەو شەڕی ناوەخۆ ببەن، نەک بەرەو دەسەڵاتی زۆرینە بە پرۆسەی ئاشتی.

ستراتیژییەتی ئەوەمان پەیڕەوکرد کە کاردانەوەی دژ نەبێ بۆ تۆڵەکردنەوە لەناو ریزەکانی حیزبدا. بۆ دەربڕینی نارەزاییان لە جیاتی توندی کۆبوونەوەی میللیمان لە سەرانسەری وڵاتدا رێکخست. لەگەڵ دوکلیرک قسەم کردو رێککەوتین لەسەر ئەوەی ئیش بۆ ئەوە بکەین، کوشتنی کریس هانی کارنەکاتە سەر دانوستانەکان.

پاش چەند رۆژێک زانرا کەوا کلایف لویس ئەندامی حیزبی پارێزگاران بە تۆمەتی تیرۆرکردن گیراوە، ئەمەش نیشانەیەکی تری بوونی «هێزی سێیەم»ـە. پێش کوشتنی کریس بە چەند هەفتەیەک رەخنەی لە دزینی چەکەکانی یەکێک لە بنکەکانی هێزی ئاسمانی گرتبوو.

لە راپۆرتە سەرەتاییەکانی پۆلیس دەرکەوت کەوا بە گوللەی چەکێکی دزراوی ئەم بنکەیە کوژراوە.

پاش دوو هەفتە لە رۆژی تیرۆرەکە، رووداوێکی جەرگبڕی تر روویدا، ئەمەیان کاری زۆری لە خەڵک نەکرد، بەڵام زۆر کاری لە من کرد. لە مێژبوو ئولیڤەر تامبو لەبەر نەخۆشی دەینالاندو ئەمجارە جەڵتەکەی بواری نەداو لەناکاو کوشتی، بەیانیەکەی زوو ژنەکەی تەلەفۆنی بۆ کردم و



ئاگاداری کردمەوەو منیش بەپەلە رۆیشتم بۆ ئەوەی لە تەنیشتی بم، بەڵام وەک دەمویست بگەمە سەری و ماڵئاوایی لێ بکەم نەکراو مرد.

فەیلەسووفی ئەغریقی ئەفلاتۆن پێکهاتەی خەڵک دەکاتە سێ بەش، زێڕ و زیو و ئاسن، پێکهاتەی ئولیڤەر زێڕی بێگەردبوو، لە رامان و کەسایەتی گەرمی و مرۆڤایەتی و پاکی خۆشی رفتاری و دڵسۆزی و دڵپاکی زێڕین بوو، سنووری نەبوو. وەک چۆن سەرکردەو پێشەوایەک رێزم دەگرت، ئەواش وەک پیاوو مرۆڤ رێزم دەگرت. ئەگەر زیندان لە منی دوورخستبۆوە، بەڵام ئەو لەبیرو هۆشم هەر نزیک بوو. لە هەموو ژیانیدا هەر پەیوەندیی بەردەوامان هەبوو، دووری لەیەکتری نەدەکردین، هەر ئەوەشە وام لێ دەکات دڵتەنگ و خەمگین بم. بڕوا ناکەم لەم دونیایەدا کەسێ هەبێ وەک من هەست بە وەحشیەت بکات، ئەوەی لەگەڵما کۆبۆوە، وا لە دەستم دەرچوو، کە بینیم لەناو دارەمەیتە، وام هەست دەکرد بەشێکی جەستەم لەگەڵیایە. گەرچی دەسەڵاتمان لەدەست نەبوو، بەڵام ویستم تەرمەکەی بە کاروانێکی رەسمی بنێژرێت، حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی وای کرد، رێزیان لە تەرمەکەی گرت، لە ئەستاد سویتو سەدان کەسایەتی ناوداری سیاسی و رەسمی لە حکومەتە بێگانەکان کۆبوونەوە، رێزو ستایشیان بۆ ئەو کەسە نواند کە لە ژیانیدا و لە ئاوارەییدا بۆ شکۆیی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی کۆششی کرد. هێزەکانی «ئەمکا» بەریز راوەستان و بیست و یەک گوللە تۆپی شانازییان بۆ هاویشت، ئولیڤەر ژیا تا ببینێ زیندانی و ئاوارەکان ئازاد بن و بگەڕێنەوە، بەڵام نەژیا تاببینێ و دەنگ بدا بۆ خوارووی ئەفریقیای ئازادو دیموکراسی، ئەو ئامانجەشی دەبێ لە هەنگاوی دادێ جێبەجێ بکرێت.

کەم کەس هەیە رۆژی **٣**ی یۆنیۆی ساڵی **١٩٩٣** لەبیر بێ، ئەو رۆژە لە مێژووی خوارووی ئەفریقیادا وەرچەرخانێکی گرنگ بوو. پاش دانوستانی چەند مانگ لە مەڵبەندی بازرگانی جیهانی کۆنگرەی فرە حیزبەکان بە دەنگدان رۆژی هەڵبژاردنی گشتی بێ نەژادپەرستیان بۆ دەنگدانی هەموو لایەک رۆژی **٢٧**ی ئەپریلی **١٩٩٤**دانا. یەکەم جارە زۆرینەی رەش لە خوارووی ئەفریقیادا رووی لە سەندوقەکانی هەڵبژاردن بکەن. بە پێی رێککەوتنەکە کۆمەڵەی دامەزرێنەر هەڵدەبژێردرێت و چوارسەد نوێنەری تێدا دەبێت و کار بۆ دانانی دەستووری نوێی وڵات دەکەن و جێگای پەرلەمان دەگرێتەوە. یەکەمین بڕگەی کاریش دانانی سەرۆکە.

لە ئەپریلدا گفتوگۆکان دەستی پێکرایەوەو حیزبی ئەنکاتاو حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی و حیزبی پارێزگاران لەو بیست و شەش حیزبە بەشداربوون. چەند مانگ خەریکی ئەوە بووین

حکومەت رازی بکەین بۆ دانانی رۆژێکی دیاریکراو بۆ گفتوگۆکان، ئەگەرچی زۆر خۆی خافلاند، بەڵام ناچار لە دواییدا ئەم رۆژەی دیاریکرد. ئەم رۆژە لەسەر بەرد نەقش دەکەین.

پاش مانگێک، واتە لە یۆلیۆی ١٩٩٣دا، کۆنگرەی فرە حیزبەکان رازی بوون لەسەر یەکەم رەشنووسی دەستووری کاتی، لە دەستوورەکەدا وا هاتووە، کەوا پەرلەمان دوو بەش بێ، جڤاتی نیشتمانی لە چوار سەد ئەندام بە رێگای نواندنی رێژەیی لە لیستەکانی گشتی و هەرێمیدا هەڵدەبژێریت، جڤاتی پیرانیش راستەوخۆ لەلایەن جڤاتە تەشریعیە هەرێمەکان هەڵدەبژێردرێن.

هەڵبژاردنەکانی تەشریعی هەرێمی لەگەڵ هەڵبژاردنەکانی گشتی بەیەکەوە دەبن. دەستە هەرێمییەکان دەستووری تایبەتی سازدەکەن، بە مەرجێک، تەریبی دەستووری نیشتمانی گشتی بێت.

سەرکردە بوتیلیزی داوای دانانی دەستووری کرد پێش هەڵبژاردن و وەک نارەزایی دەربرین لە کۆبوونەوەکە دەرچوو، کە چۆن رۆژی هەڵبژاردن دیار دەکرێت و هێشتا دەستوور نییە. لە ئۆگستۆس دا رەشنووسی دووەمی دەستووری کاتی دەرچوو، لەو دەستوورەدا، دەسەڵاتی هەرێمەکان زۆرکراوە، دووبارە سەرکردە بوتیلیزی و پارتی پارێزگاران گلەییان هەبوو گوایە، ئەمەیان دژی بەرژەوەندییەکانی ئەفریکانە. ئەم دەمە ژەنرال کونستاند فیلیون سەرکردەی هێزە بەرگرییەکانی خوارووی ئەفریقی جاران، دەستەیەکی تازەیان بە ناوی ئەفریکانا فولکسفرونت دامەزراند، ئەو دەستەیەش داواکارە رێکخراوە سپیەکان لە بیرۆکەی فولکستات، واتە وڵاتی سپی، کۆبکاتەوە.

لە نیوەی شەوی ١٨ی نۆڤەمبەر بە ئامادەبوونی هەموو ئەندامانی کۆنگرەی فرە حیزبەکان بریار لەسەر دەستووری کاتی درا. ئەمەش حیزی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و حکومەت هەموو تەگەرەکانی سەر رێگاکەیان هەڵگرت و حکومەتێک لەو حیزبانە دادەمەزرێت کە پێنج لە سەدایان هەیەو بریارەکان بە رەزامەندی زۆرینەی دەنگەکان دەبێ، نەک بە زۆرینەی سێ بەش وەک حکومەت پێشنیاری کردبوو. هەڵبژاردنی گشتیش لە ساڵی ١٩٩٩ دەبێ و ئەوکات حکومەتی نیشتمانی یەکگرتوو پێنج ساڵی تەمەنی بەرێ کردووە. هەروەها حکومەت پێشنیارەکەی ئێمەی پەسەند کرد بۆ دابەزاندنی یەک بەڵگەنامەی پێشنیاری لەجیاتی دوو بەڵگەنامەی جیاواز، یەکێکیان گشتی و ئەوی تریش تەشریعی هەرێمی. چونکە بوونی لیست و بەڵگەنامە زۆربەی خەڵکەکە کە یەکەم جارە دەنگ دەدەن لێیان ئاڵۆز دەبێ.

پێش ماوەیەکی کەم جڤاتی تەنفیزی پێکهاتوو لە هەموو حیزبەکان کەشی هەڵبژاردن



سازدەکەن. حکومەتی فیعلی لە ٢٢ی دیسیمبەر دەبێ و رۆژی هەڵبژاردنیش ٢٧ی ئەپریل و دەستەیەکی بێ لایەنی سەربەخۆ سەرپەرشتی بەرێوەبردنی هەڵبژاردنەکە دەکەن. بە راستی هەنگاو بۆ سەردەمێکی مێژوویی نوێ دەنێین.

زۆر پەرۆشی خەڵاتی تایبەتی نەبووم، مرۆڤ کە خەبات دەکات چاوی لە خەڵات نییە، بەڵام هەڵبژاردنم لەگەڵ بەرێز دوکلیرک لە ساڵی ١٩٩٣دا بۆ خەڵاتی نۆبل سۆزی قووڵی هەژاندم، خەڵاتی نۆبل بۆ ئاشتی لە خودی من مانایەکی تایبەتی هەیەو دەورێکی مێژوویشی لە خوارووی ئەفریقی دەبێ.

من سێیەم کەسایەتیم لەپاش شەری دووەمی جیهاندا لە خوارووی ئەفریقیا شەرەفی ئەم خەڵاتەم بەردەکەوێت. ئەم خەڵاتە لە ساڵی ١٩٦٠ دا دراوە بە پێشەوا ئەلبێرت لوتولی و لە ساڵی ١٩٨٤دا بە قەشە دیزموند توتو، ئەوەی گیانی بۆ دژایەتی نەژادپەرستی لە سەردەمە تاریکەکاندا تەرخانکرد.

ئەم خەڵاتە بۆ هەموو ئەو کەسانەیە کە لە خوارووی ئەفریقیادا خەباتیان کرد، منیش لەجیاتی هەموویان وەرمگرت، بە خەیاڵمدا نەدەهات کەوا ئەم خەڵاتەم بەرکەوێت، لە ساڵانی تاریکدا کە لە دوورگەی روبین بووم، رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی، لەبەر ئەوەی چەکمان هەڵگرتبوو، رازی نەبوو، ئاوێزانی کێشەکەمان بێ، دیارە ئەوان هاوکاری ئەو لایەنە ناکەن توندوتیژی پەیرەو بکەن، هەر لەبەر ئەو هۆیەشە ئەوەم لە لا گەڵاڵە بوو کەوا دامەزرێنەری بزاڤی ئومخونتو وی سیزوی (ئەمکا) بۆ ئەم خەڵاتە دەست نیشان ناکرێت.

بۆ هەردوو وڵاتی نەرویج و سوید رێزی بێ پایانم دانا، حکومەتە خۆرئاواییەکان هەموویان رازی نەبوون هاوکاری حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لە پەنجاکان و شێستەکان بکەن، بەڵام لە نەرویج و سوید گەرمترین رێزمان لێگیراو یارمەتیمان دراو کورسی و پاداشتی خوێندنمان بۆ تەرخانکراو پارەی کێشەکانی دادگایان بۆ دەداین و یارمەتی مرۆڤایەتیشی پێشکەشی زیندانە سیاسیەکان دەکرا.

ئەوە ماوەی لە نەرویج بووم بە هەلم زانی سوپاسیان بکەن، نەک لەبەر خەڵاتەکە و لێدوان لەسەر کێشەی خوارووی ئەفریقیاو بەس، بەڵکو بۆ ناوهێنانی هاورێ و هاوبەشی خەڵاتەکەم بەرێز ئێیف دەبلیۆ دوکلیرک و وتم:

ئەو پیاوە ئازایەتی ئەوەی هەبوو دان بە تاوان و ستەمی زۆر بەسەر وڵات و میللەتەکەم بە هۆی

رژێمی نەژادپەرستی بنێ. پیاوێکی دووربینەو دەزانێ کەوا هاوولاتیان هەموو وەک یەک مافی چارەنووسیان هەیە خەباتی دانوستان و یەکسانی لا پەسند بوو.

زۆرجار پرسیاری ئەوەم لێ دەکرێت، کەوا من چۆن هاوبەشی خەلاتەکە لەگەڵ دوکلیرک دەکەم، گەرچی زۆرجار و بە توندیش رەخنەت لێگرتووە، گەرچی من پەشیمان نیم کە رەخنەم هەبووە و قسەم لەسەر بۆچوونەکانی هەبووە، بەلام دەڵێم هاوکاری راستگۆیانەو بەنرخی لە پرۆسەی ئاشتیدا هەبووە. هیچ رۆژێ من خۆم دەستخەرۆ نەداوە لە هەڵوێستەکانی و سارد رۆیشتنی پرۆسەی ئاشتی لەبەر ساردی دوکلیرک، بەلام مرۆڤ ئەگەر بیەوێت لەگەڵ دوژمنی کاربکات، دەبێ هاوشانی بێت هەتا دەبێتە هاوبەشی.

پاش هەڵمەتی رەسمی لە فێبرایەری ١٩٩٤ و پاش پەسەندکردنی دەستووری نوێ خۆمان بۆ هەڵبژاردنی جڤاتی نیشتمانی سازکرد، سەرەڕای ئەوەش، حیزبی نیشتمانی پێش ئێمە و هەر کە من لە زیندانا بەربووم، دەستیان بە هەڵمەتی هەڵبژاردن کردبوو.

ئەگەرچی لە ئەنجامی راوەرگرتنەکاندا دەرکەوتبوو کەوا حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی رێژەی پشتیوانی جەماوەری گەشەکردووە، بەلام مەسەلەکەمان بە ئاسانی وەرنەگرت. ئامۆژگاری هەموو ئەندامانی هەڵمەتی پروپاگەندەم کرد زۆر گەشبین نەبن. زۆرمان خوێندیتەوە سەدان حیزب لەسەر بردنەوەی هەڵبژاردن بوون و دوایی دۆڕاون، دوایی ئێمە لە بەرامبەر نەیارێکی زۆر بە هێزو بە ئەزموونین لە رێکخستن و بەخشنەدەیی.

لبوبو مولیفی و پاتریک لیکوتا و کیتو گوردون سەرپەرشتی هەڵمەتی پروپاگەندەی حیزبیان کرد، ئەوانە کادێری دێرینی بزاڤی بەرەی دیموکراتی یەککرتووبوون، خاوەن وزەو شارەزاییەکی زۆربوون لە جۆشدان و سازکردنی جەماوەر، کارەکەیان گران بوو، مەزندەی ئەوەمان کرد ژمارەی دەنگدەران دەگاتە بیست ملیۆن و زۆربەیان یەکەم جارە دەنگ دەدەن، زۆربەی دۆستەکانمان نەخوێندەواربوون و لە دەنگدان هەڵە دەکەن. دەستەی هەڵبژاردنی سەربەخۆ رایگەیاند کەوا مەڵبەندی دەنگدان لە ولات دەگاتە دە هەزار مەڵبەند، بۆیە پێویستمان بە سازکردن و راهێنانی زیاتر لە سەد هەزار کەس هەبوو بۆ هوشیارکردنەوەو راهێنانی دەنگدەران.

هەنگاوی یەکەمی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکە، بەستنی کۆڕی میللی و جەماوەری بوو، پاڵێوراوەکان دەبوایە بچنە هەموو دەڤەرێکی ولات و کۆڕی گشتی لە شارو گوندەکان ببەستن و لە ترس وراز و هیواکانی خەڵک بگەن و گوێ لە بیروبۆچوون و گلەییەکانیان راگرن. کۆڕە



میللییەکانمان لە کۆبوونەوەی شارەکانی ئەمریکا دەچوو کە بیل کلینتۆن لە هەڵمەتەکەیدا سازی دەکرد، کۆڕەکان لە پەرلەمانی میللی دەچوون و جیاوازیش نەبوو لەگەڵ کۆبوونەوەکانی سەرۆک عەشیرەتەکان، کە لە سەردەمی منالیمدا لە «شوێنە مەزنەکەدا» ئامادەی دەبووم.

تامی زۆرم لەو کۆڕانە وەردەگرت، لە نۆڤێمبەر لە ناتال دەستی پێکردو بۆ ترانسفال لە باکوور و دوایی بۆ ئورینج فری ستایت. رۆژانە ئامادەی سێ چوار کۆڕ دەبووم، هەروەها ئامادەبوانیش زەوقیان وەردەگرت و شادومان بوون کە بۆ یەکەم جارە پرسیاریان لێ دەکرێت و لە دوارۆژی ولاتا ئاگادار و پرسیاریان ئاراستە دەکرێت.

کە گوێبیستی رامانەکانی جەماوەر دەبووین، سیاسەت و بەرنامەکانمان ئاراستە دەکردن، هەندێک رایان وابوو هەڵمەتەکەمان- هەڵمەتی رزگاری بێ و داوا لە خەڵک بکەین بۆ رزگاری ولات دەنگمان بدەنێ، بەلام وامان بە باش زانی لەجیاتی ئەوە با بە جەماوەر وێنەی راستی خوارووی ئەفریقیا رابگەیێنین و هیوای سەرلەنوێی لەدایکبوونی بخوازین، هیوامان بە دەنگی جەماوەر هەبوو بۆ حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، نەک لەبەر ئەوەی ئەوا هەشتا ساڵە خەبات دژ بە نەژادپەرستی دەکات، بەڵکو بۆ ئەوەش، کەوا ئەم حیزبە دەتوانێ و شیاوی گۆڕینی کۆمەڵگایە و دەتوانێ گوزەرانی خەڵک خۆشتر بکات.

من وام دەبینی، کەوا چوارچێوەی هەڵمەتەکەمان لەبەر رۆشنایی سبەو دوارۆژ بێ نەک سەروەرییەکان بگێڕێتەوە.

حیزب بەڵگەی بەرنامەی گەشەسەندن و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی بە سەدو پەنجا لاپەڕە ئامادەکرد، تێدا بەرنامە و پلانمان بۆ بوار رەخساندنی زۆرترو باشتری پێویستیەکان و تێگەیاندنی پارێزگارییە بنچینەکانی تەندروستی و دابینکردنی خوێندنی خۆڕایی بۆ دە ساڵی خوێندنی هەموو هاوولاتییەکی خواروو و دابەشکردنی زەوییەکان بە دادگای تایبەتی و هەڵگرتنی باج لەسەر خواردەمەنیە سەرەکییەکان و هەروەها حیزب بەڵێنی دا کاری چاک و فراوان بۆ کەرتی گشتی و تایبەتیەکان بکات. بەڵگەنامەکە بە بەیانێک کورت کرابۆوە، ناونیشانی بەیانەکەش «لەپێناوی ژیانی باشتر بۆ هەموومان» بوو، کە لە دواییدا کرا بە بەرنامەی حیزب لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا.

پاش ئەوەی بە خەڵکمان راگەیاند چیمان لە بەرنامەدایەو چی جێبەجی دەکرێت، حەزم کرد ئەوانەی پێمان جێبەجێش ناکرێن پێیان رابگەیێنم. زۆر هەبوون، وایان دەزانی هەڵبژاردنی

دیموکراسی دەبێتە مایەی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی، ئەوەش بە ئاسانی دەستەبەر دەکرێت، بەڵام لەراستیدا، ئەوەیان وا ئاسان نییە. بۆیە حەزم کرد ئاماژەی پێ بدەم. لە کۆڕەکاندا دەمووت: وا نەزانن. پاش هەڵبژاردن هەر یەکێک لە ئێوە دەبێتە خاوەن مارسیدسێک و لە پشتماڵەکەیان حەوزی مەلەوانی دەبێ. رەوشەکان بە شێوەیەکی درامی ناگۆڕێن، بەڵام رێز و پایەتان بڵندتر دەبێ و لەسەر خاکی خۆتان شکۆدارو رێزدارتر دەبن. گومان نییە کەوا پێنج ساڵە چاوەڕێینە تا وەک پێویست وەزعەکان بگۆڕێین. بەرپەرچم دانەوە، بەڵام نەک بە گەورەیی و خۆزلزانین و وتم: ئەوەی دەخوازی بە برسیەتی و رووتی بژی، با کاتەکانی لە بارِ و نادییەکان بباتە سەر، بەڵام، ئەوەی دەیەوێ ژیانی بگۆڕێت و باشتر بژیت، دەبێ زۆرتر کاربکات و کۆشش بکات، چونکە ئێمە ناتوانین ئەوەی دەخوازین جێبەجێی بکەین، پێویستە ئەوەی دەتانەوێت خۆتان کۆششی بۆ بکەن.

هەروەها بە هاوولاتیانی سپیم وت، ئێمە پێویستمان بە ئێوە هەیەو ئێوەش هاوولاتی خوارووی ئەفریقیان و نابێ لێرە بڕۆن، لە باسکردنی تاوانەکانی رژێمی نەژادپەرستی دوودڵ و دوورەپەرێز نەبووم، بەڵام زۆرجار وتم، پێویستە رابردوومان لەبیربچێ و هەموومان پێکەوە بۆ دوارۆژی باشتر ئیش بکەین.

هەروەها دیداریشم بۆ هوشیارکردنەوەی جەماوەر کرد سەبارەت بە هەڵبژاردن و شێوەی دەنگدان. پسوولەی دەنگدان، پارچە کاغەزێکی درێژبوو و ناوی حیزبەکان بەرەو خوارەوە نووسرابوو، لە بەرامبەر هەر حیزبێک ئارمێکی تایبەتی و لە سەرووی چەپیشەوە وێنەی سەرکردەی حیزبەکە دانرابوو، دەبوایە هەر کەسێک دەنگی دەدا هیمای (×) لەبەرامبەر ناوی حیزبەکە لێ بدات کە دەنگی دەداتێ. ئامۆژگاری دەنگدەرانم کرد کەوا رۆژی هەڵبژاردنەکە چاک دیقەت بدەنە پسوولەکە و هێمای جاران لە بەرامبەر وێنەی گەنجە جوانەکە بدەن.

***

رێگا بەرەو ئازادی سووک ئاسان نەبوو، سەرەڕای ئەوەی جڤاتی تەنفیزی کاتی لەگەڵ ساڵی نوێ کارەکانی وەرگرت، چەندین حیزب کشانەوە. حیزبی ئەنکاتا رایگەیاند کەوا بەشداری هەڵبژاردن ناکات و سیاسەتی بەرگری پەیڕەو دەکات. بە پاڵپشتی سەرکردە بوتیلیزی، شا زویلتینی ئۆتۆنۆمی و دەسەڵاتی سەربەخۆی بۆ هەرێمی کوازولو داواکرد وهانی جەماوەریان دا



بەشداری هەڵبژاردنەکان نەکەن، هەروەها راستڕەوە سپیەکانیش پرۆسەی هەڵبژاردنیان بە خیانەت لەقەڵەم دا و داوای وڵاتێکی تایبەتی سەربەخۆیان بۆ سپیەکان کرد، بەڵام کات و شوێن و چۆنیەتییان دیار و دەستنیشان نەدەکرد، چونکە لە هیچ هەرێمێک سپیەکان زۆرینەی دانیشتوان نین.

رۆژی ۱۲ی فێبرایەر، دوارۆژی ناونووسکردنی حیزبەکان دانرا، بۆ ناونووسکردن حیزبی ئەنکاتا و حیزبی پارێزگاران و حیزبی ئەفریکانا فولکسفرونت ئامادەنەبوون. هەروەها حکومەتی بوتاتسواناش بەشدارنەکردنی راگەیاندو دژی بەشدارکردنی لە وڵاتێکی یەکگرتووش لە خوارووی ئەفریقیا راگەیاند. بە راگەیاندنی بەشدارنەکردنی ئەو هەموو لایەنە گرنگانە نیگەران بووم، پێشنیاری چارەسەری مامناوەندیمان کرد. لەسەر دانانی پسوولەی دوولاپەڕەیی لە هەڵبژارنەکانی تەشریعی گشتی و هەرێمی دابینکردنی زۆرترین دەسەڵات بۆ هەرێمەکان رێکەوتین. هەروەها گۆڕینی ناوی هەرێمی ناتال بۆ کوازولو ناتال و مسۆگەرکردنی بوونی چەند بڕگەیەک لە دەستوور بۆ مافی چارەنووسین «لە ناوەوە» بۆ ئەو کۆمەڵە نەژادییانەی لە کەلتووروزمان هاوبەشن.

لەگەڵ سەرکردە بوتیلیزی لە ۱ی مارس لە دێربان دیدارێکم سازکردو لە پێش ئامادەبوونێکی میللیدا وتم: من لەسەر چۆک دەنووشتێمەوە لە پێش ئەوانەی دەخوازن وڵات بەرەو دەریای خوێن رشتن بەرن» . لە بەرامبەر نیشاندانی کێشە دەستووریەکان بۆ ناوبژیوانانی دەولی لەبەردەم بووتیلیزی بە شادومانییەوە قەبووڵم کرد پاڵێوراوەکانی هەرێمەکان ناونووس بکرێن. هەروەها ژەنرال فیلیونیش رازی بوو پاڵێوراوانی لە ژێر ناوی حیزبێکی نوێدا، حیزبی بەرەی ئازادی ناونووس بکات.

ئەگەرچی سەرۆکی بوتاتسوانا بەرێز لوکاس مانگوبی بەشدارنەبوونی هەرێمەکەی لە هەڵبژاردن راگەیاندبوو، بەلام رووداوەکان وای کرد هەڵوێستی خۆی بگۆڕێت، چەندجار قسەم لەگەڵ کردو بێم وت، لێ گەرێی با میللەت خۆی بڕیاری بەشدارکردن بدات، بەڵام ئەو دژبوو، ئەوانەی ئارەزووی بەشداربوونیان هەبوو، رێپێوانی گەورەیان سازکردو مانگرتنەکان گەیشتە نێو فەرمانبەرانی راژەی مەدەنی لە بتاتسواناو پەخشی رادیۆ و تەلەفزیۆنیش نەما. لە شەقامەکانی مافیکینک لە پایتەختدا، شەڕ لەنێوان پۆلیسی ناوخۆ و کرێکاران و خوێندکاران روویدا. مانگوبی لە هاوپەیمانە سپیەکان داوای یارمەتی سەربازی کرد. بەڵام هێزەکانی لە سەرەتاکانی مارسداو بە کودتایەکی سەربازی رووخاندیان و پاش چەند هەفتەیەک عەمید گقوزو لە سیسکای خۆی دا بە دەستەوەو

داوای لە حکومەتی خوارووی ئەفریقیا کرد دەسەڵاتی هەرێمەکە بگرێتە دەست. کاری توندوتیژی لە ناتال پەرەی سەندو دۆستانی ئەنکاتا لە ناتال بەریان لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنمان گرت و لە کاتی هەڵسوانی لافیتەدا پازدە ئەندامی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بە گوللەو تەورداس لە شەقامەکاندا کوژران. لە مارسدا دادوەر جوهان ئاگاداری من و بەرێز دوکلیرکی کردەوە کەوا ئەگەر حکومەت بە پاڵپشتی پۆلیس هاوکاری نەکات زەحمەتە پرۆسەی هەڵبژاردنی ئازاد لە کوازولو سەربگرێت. بۆ ناسینی جەماوەر و هێزمان لە ناتال حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی رێپێوانێکی جەماوەری لە سەنتەری دوربان سازکرد. هەروەها حیزبی ئەنکاتا ویستی بەهەمان شێوە رێپێوانێک لە جۆهانسبێرگ ساز بکات، بەڵام دەرەنجامەکانی ترسناک بوو.

لە ٢٨ی مارسدا، هەزارەها لایەنگیرانی حیزبی ئەنکاتا دڕیان بە شەقامەکانی جۆهانسبێرگدا بۆ سازکردنی کۆبوونەوەیەکی جەماوەری و هەموویان ڕم بە دەست و چەکداربوون بە چەکە ئاساییەکانیان، هەروەها چەند چەکدارێکی ئەنکاتا ویستیان باڵاخانەی کۆمپانیای «شیل» بگرن کە بارەگای سەرەکی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی لێیە، بەڵام پاسەوانە چەکدارەکان رێگایان نەدان، لە سەنتەری شار دەنگی تەقە هات لەم رۆژەدا سی و پێنج کەس کوژرا. رووداوەکان ترسناک بوون، ئەم رۆژە بۆنی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ دەهات. حیزبی ئەنکاتا دەیویست هەڵبژاردنەکان دوابخرێت، بەڵام من و بەرێز دوکلیرک بواری ئەوەمان نەدەداو ئەم رۆژەمان بە رۆژێکی پیرۆز دەناسی.

بە ناوبژیوانی نێونەتەوەیی رازی بووم، لە ١٣ی ئەپریلدا شاندێک بە سەرۆکایەتی لۆرد کارینگتۆن وەزیری بەرگری بەریتانی پێشوو و هینری کیسینجەر وەزیری دەرەوەی ئەمریکی پێشوو گەیشتن، بەڵام کە ئاگاداری حیزبی ئەنکاتا کرایەوە کەوا رۆژی دیاریکراوی هەڵبژاردنەکە ناکرێت قسەی لەسەر بکرێت، شاندەکە یەکسەر گەڕایەوەو دیداری لەگەڵ هیچ لایەنێ نەکرد، ئەوەش وای لەسەرکردە بوتیلیزی کرد کەوا هەڵبژاردنەکە هیچ ئەگەری دواخستنی لە پێش نییەو لە کاتی دیاریکراویدا دەکرێت. لە ١٩ی ئەپریلدا، سەرکردە قەبووڵی کرد هەرچی دەستوور بۆ مەملەکەتی زولو دابینێ و رازیش بوو بەشداری لە هەڵبژاردنەکاندا بکات.

پێش دە رۆژ لە هەڵبژاردنەکەو بۆ یەکەم جار لەگەڵ دوکلیرک لە دیدارێکی رووبەڕووی تەلەفزیۆنی دەرچووم. لە رۆژانی فۆرت هیر قسەکەرێکی چاک بووم، بەدرێژایی کاری حیزبیم بەشداری زۆر دیدار و رووبەڕووبوونەوەی زۆر توند ببووم.



ئەو رۆژانەی لە دوورگەی روبێن قیرمان هەڵدەکۆڵی ئەوەندەمان دیدارو قسە کردبوو، شارەزاببووم، بۆیە بڕوام بەخۆم هەبوو، رۆژی پێشی رووبەڕووبوونەکە دیدارێکی ئەزموونیمان سازکردو رۆژنامەنووسی بەتوانا ئەلیستر سبارکس دەوری دوکلیرکی بینی و ئەویش دەورەکەی چاک بینی و راوێژکارانی هەڵمەتەکەش بە توندی هوشیاریان کردمەوە، کەوا دەبێ لە بەرامبەر نەیارەکەم هێمن و لەسەرخۆ بم.

لە رووبەڕووبوونەکەدا، بە توندی هێرشم کردە سەر حیزبی نیشتمانی و تاوانبارم کرد کەوا رقی نەژادپەرستی خۆش دەکات و لە ناوچەی کیپ نێوان رەنگینەکان و ئەفریقیەکان دژواردەکات و نامیلکەی گاڵتەجاڕی لەسەر بەرنامەی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی دابەش دەکات کە تیایدا هاتووە «رەنگینێک بکوژە، وەزیرێک بکوژە»» . بۆیە وتم: لە وڵاتدا بە هێزترین رێکخراو داوای دووبەرەکی و ناکۆکی بکات حیزبی نیشتمانی نوێیە. کە دوکلیرک رەخنەی لە بەرنامەی حیزبمان گرت بۆ تەرخان کردنی چەندین ملیارد دۆلار بۆ نیشتەجێیی و بەرنامەی کۆمەڵایەتی، من هەژاندم و وتم، ئەوە هەڕەشەیە، ئێمە زۆربەی داهاتمان بۆ رەشەکان دادەنێین.

لە کۆتایی رووبەڕووبوونەکەماندا هەستم کرد کەوا بەرامبەر ئەو پیاوە زێدە توند بووم، ئەو پیاوەی دەبێتە هاوبەشی دەستەڵاتم لە حکومەتی یەکگرتووی نیشتمانی، بۆیە دیدارەکەم بەوە کۆتایی هانی: ئەوەی ئەمشەو لەنێوان من و بەرێز دوکلیرک کرا، بۆ هەموو لایەک ئاشکرایە کەوا ئیمڕۆ راستیەکەی روونە بۆ هەموو میللەتانی سەر رووی ئەم زەمینە، ئەو میللەتانەی لە چەندین تیرەو نەتەوە پێکهاتوون و هەموویان بۆ یەک وڵات خەبات دەکەن و دڵسۆزن بۆی، سەرەڕای رەخنەکردنم رووم لە بەرێز دوکلیرک کردو وتم: بەرێزەکەم، تۆی پشتیوانیم بڕوات پێ دەکەم و هەدووکمان ئەرکی قورسی ئەم وڵاتەمان دەکەوێتە سەر ئەستۆ، دواییش دەستم بۆی درێژکردو دەستیم کوشی و وتم: من سەربەرزم کەوا دەستم لەناو دەستی تۆ دایە و پێکەوە بۆ پێشەوە روو دەکەین. ئەمە سەرسامی کرد و دڵشاد بوو.

* * *

رۆژی **٢٧**ی ئەپریل دەنگم دا، ئەو رۆژە دووەم رۆژی دەنگدانەکەبوو کە چوار رۆژی خایاند «رێگا درا چەند توێژی وەک، پیرو پەککەتووەکان و ئەوانەی لە دەرەوەی وڵاتدا دەژین رۆژی **٢٦**ی

ئەپریل دەنگ بدەن». لە ناتال، لەو هەرێمــە ناكــۆكی و دووبەرەكی تێــدا زۆرە، دەنگم دا، تا هاووڵاتیان تێ بگەن دەنگدان و چوونە مەڵبەندەكان هیچ مەترسی لەسەر نییە، لە خوێندنگایەكی دواناوەندی لە ئەناندا، لە گەرەكێكی بچووكی سەوزی سەرووی دیربان دەنگم دا، لەو شوێنەدا، یەكەم سەرۆك حیزبی كۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی جۆن دوبی نێژراوە، ئەو دەوری سەرەكی هەبووە لە ساڵی ١٩١٢ بۆ دامــەزراندنی حیــزب. كـە لەوێ دەنگم دا، واتە بازنەكـە تەواو بوو، دەورە مێژوویەكە لە لای خواڵێخۆشبوو دەستی پێكرد وا پاش هەشتاو دوو ساڵ هەر لێرە تەواو بوو.

لە نزیک خوێندنگاكە، لەسەر گۆڕی راوەستام و ئیمرۆم لەبیرچوو و بیرەوەریەكان بۆ دوێنێی بردمەوە، كـە رووم لە مەڵبەندی دەنگدان بوو، ئەوانەم بە بیرهاتەوە كـە لە رێگای خەبات و بۆ ئیمرۆی كە منی تێدایە قوربانیان دا ئەوانە، ئەو پیاو و ژنانەی بە نرخترین قوربانیان دا بۆ سەركەوتنی ئەم رۆژە. ئولیڤەر تامبو و كریس هانی و سەركردە لیتولی و برام فیشرم بە بیرهاتەوە، پاڵەوانە ئەفریقیایەكانم بەبیرهاتەوە كە گیانیان بەخت كرد تا ئیمرۆ و ملیۆنەها ئەفریقی بتوانن دەنگ بدەن. جوسیا گومیدی و دجی. ئێم. نایكرو دكتۆر عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان ولیلیان انگوی و هێلین جۆزیف و یوسف دادۆ و موسا كوتانیم بە بیرهاتەوە، كە چووم بۆ دەنگدان، تەنیا نەبووم، هەموویان لەگەڵم بوون و ئەوانیش لەگەڵمدا دەنگیان دا.

پێش ئەوەی بگەمە ناو مەڵبەندی دەنگدان، رۆژنامەنووسێكی بێ زەوق پرسیاری كردو وتی: بەرێز مــاندێلا، ئیمــرۆ بۆ بەرژەوەندی كێ دەنگ دەدەیت؟!. پێكەنیم و وتم: ئایا دەزانی ئەم پرسیارە ئیمرۆ پەرێشانی كردبووم؟.هێمایەكم لە بەرامبەر حیزبی كۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی داناو پسوولەكەم لەناو دەرزە بچووكەكەی سەندووقە دارەكە دانا، ئەوەش بۆ من یەكەم جارە دەنگ دەدەم.

دیدی ئەم رۆژەی هاووڵاتیــانم لە رامــانا هەتا هەتایێ دەمــێنێ كـە ریزیان بەســتــبــوو لە مەڵبەندەكانی دەنگدان، بە درێژایی رێگاكان، لە گوندو شەقامی شارەكان بە هێمنی و بێدەنگی ریزبەوون و چاوەڕێیان دەكرد، پیرم بینی ئەوە چارەگـە سەدەیەكە چاوەڕێیە دەنگ بدات و ئەو پیرەژنانە دەیانووت، ئەوە یەكەم جارە هەست بە مافی مرۆڤایەتی خۆمان دەكەین، ژن و پیاوانی سپی شانازییان راگەیاند كەوا لە خوارووی ئەفریقیادا ئازادانە دەژین، ئەم رۆژە ورەی نەتەوەو گیانیان بەرزبوو، توندوتیژی و تەقینەوە راوەستابوو، بووینە نەتەوەیەک و سەرلەنوێ لە دایک بووینەوە. ئەو سەركەوتنەی هەڵبژاردنە كە بۆ دیموكراسی و راستی بە دەستی خست بە كێشەكان و



ئاڵۆزی و بوونی چەند بنكەی ساختە و پروپاگەندەكان نەشێوا پۆلكردنی دەنگەكان چەند رۆژی خایاند، دەركەوت حیزبی كۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی ٦٢,٦٪ دەنگی هێنا، ئەم رێژەیە زۆر كەمی دەویست بگاتە دوو لە سێ بەشی پێویست بۆ مۆڵەتی پەسندكردنی دەستوور ئەگەر بخوازین بێ هەڤاڵبەندی هیچ حیزبی تر. ئەم رێژەیە دووسەد و پەنجاو دوو كورسی لە كۆی چوارسەد كورسی بۆ رەخساندین لە جڤاتی نیشتمانی. حیزب دەڤەرەكانی باكوورو خۆرهەڵاتی ترانسفال و خۆرئاوای باكوورو كیپی خۆرهەڵات و ئورینج فری ستایت چاک تەنی بوو، هەروەها ٣٣٪ دەنگمان لە كیپی خۆرئاوا هێنا، لەوێ حیزبی نیشتمانی زۆرینەی هێناو زۆرینەكەش دەنگی رەنگینەكان بوو. لە دەڤەری كوازولو ناتال كە حیزبی ئەنكاتی تێدا سەركەوت، حیزبمان ٣٢٪ دەنگی هێنابوو، بەڵام لە دەڤەری ناتال لەبەر ترس و توندوتیژی و تەنگژەكان دۆستەكانمان بۆیان نەكرا زۆر دەنگ بدەن. قسەو گلەیی لە بوونی ساختەو تەزویر هەبوو، بەڵام كاریگەری لەسەر رەوشە گشتیەكە نەبوو. مەزندەی هێزی ئەنكاتا لە كوازولو هەڵە دەرچوو و حیزبمان سەلماندی كەوا لە ناوچەكە بەهێزە.

هەندێ لە سەركردەكانی حیزبمان هەستیان بە رەشبینی كرد كە حیزبمان دوو لە سێ بەشی دەنگەكانی نەهێنا، بەڵام من یەكێک نەبووم لەوان. من بە ئەنجامەكەی دڵگەش بووم، خۆ ئەگەر ئێمە دەنگی دوو لە سێمان هێنابایەو دەستوورمان بێ هاوكاری و هەڤاڵبەندی حیزبی تر پەسەند كردبایە، دەیانووت، دەستوورەكە، دەستووی یەک حیزبییە و دەستووری خوارووی ئەفریقیا نییە. من لەگەڵ حكومەتی یەكێتی نیشتمانی راستەقینەدام.

* * *

لە ئێوارەی ٢ی مایۆدا دوكلیرک وتاری دەست لەكاركێشانەوەی بەرێزو بە ئەدەبەوە خوێندەوە، پاش سێ سەدەی دەسەڵاتی كەمینەی سپی شكستی خوارد و دەسەڵاتی دایە دەست زۆرینەی رەش. لە كاتی ئەوەی حیزبمان خەریكی ئاهەنگی سەركەوتن بوو لە ئوتێلی كارلتون لە سەنتەری جۆهانسبێرگ، من سەرمام بوو و دكتۆرەكان وتیان دەبێ پشوو بدەیت. بەڵام شتێ نەبوو ئاستەنگ بێ بۆ ئامادەبوونم لە ئاهەنگەكەدا، لە كاتژمێری نۆی ئێوارە لەسەر سەكۆكە بووم و ئاكاری بە خەندەو بە زەوقم دەدیت، بە ئامادەبوانم راگەیاند بۆچی دەنگم نووساوەو وتم دكتۆریش ئاگاداری كردمەوە دەرنەكەوم «بە دكتۆر نەڵێن كەوا سەرپێچی ئەوم كردووە» پیرۆزباییم لە دوكلیرک كرد بە

بۆنەی سەرکەوتنی حیزبەکەیان و سوپاسی کارکەران حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی و بزاڤی دیموکراسیم کرد بۆ ئەو کارە دڵسۆزانەی ئەنجامیان دا. یەکێک لە ئامادەبوانی ئاهەنگ خاتوو کوریتا سکوت کینگ خێزانی خەباتکەر مارتن لۆسەر کینگ بوو، رووم لەم خاتوونە کردو چەند قسەی مێردەکەییم کردە نموونەو وتم:

ئەو ساتانە گرنگترین و مەزنترین ساتن لە ژیانی ئەم وڵاتە، کە لە بەرامبەرتان راوەستام لە ناخەوە هەست بە شانازی و دڵشادی و سەربەرزی دەکەم. من شانازی بەو گەلە سادەو خۆنەویستە دەکەم، رێکخستنێکی هێمنانەو وردانەتان بۆ وەرگرتنەوەی وڵاتەکە بەکارهێنا، ئێستاش لە هەموو شوێنێ راگەیێنین، ئێمە ئازادین! بۆ ئازایەتیتان بەرێزەوە رادەوستم، بە دڵێکی پڕ لە ئەڤین لە بەرامبەرتان رادەوستم. بۆ من جێگای شەرەف و شانازییەکی مەزنە کە لە سەرۆکایەتی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی دام و من خزمەتکارتانم، کەس بە تەنیا وەک کۆمەڵ بەهای نییە، ئەوساتە، کاتی سارێژکردنی برینە کۆنەکان و دروستکردنی خوارووی ئەفریقیای نوێ.

لەو کاتەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە رایگەیاند کە حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی دامەزراندنی حکومەتی نوێی کەوتۆتە ئەستۆ، هەست دەکەم پەیامی ئاشتبوونەوەو سارێژی برینەکان و دامەزراندنی بڕواکردن و ئارامیم پێیە، دەزانم زۆری هاووڵاتییان بە تایبەتی کەمینەکانی سپی و رەنگینەکان و هیندییەکان لە دوارۆژ دەترسێن، بۆیە دەمەوێ بزانن کەوا هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی بکەن. زۆرتر لە جارێک کۆمەڵانی خەڵک رایانگەیاندووە، کەوا خەباتیان دژ بە دەستەیەک، یان دژ بە نەژادێک نەبووە، بە پێچەوانە خەباتی رزگاری دژی رژێمی تاوان و تواندنەوەبوو. لە زۆر بۆنەدا وتوومە، پێویستە هەموو هاووڵاتییانی خوارووی ئەفریقیا دەست لەناو دەست بن و یەک بن و پشتی یەکتری بگرن و هاوار بکەن بۆ یەک وڵاتی و یەک نەتەوەیی و یەک میللەتی و یەک ریز بەرەو دوارۆژ بڕۆن.

***

رۆژی ١٠ی مایۆ، رۆژێکی سامالی بێگەردبوو، لە رۆژانی رابردوودا بە کەسایەتی رەسمی و سەرۆک وڵاتانی جیهان خەریک بووم، لە هەموو لایەک بۆ پیرۆزبایی و بەشداربوونیان لە دامەزراندنم وەک سەرۆک دەوڵەت هاتبوون، ئاهەنگەکە، گەورەترین کۆبوونەوەی سەرکردەکانی



جیهانی یە کە لە خاکی خوارووی ئەفریقیا ئامادە دەبن.

ئاهەنگەکە لە سەکۆیە قومە بەردینە جوانەکەی هەڵکەوتوو لە باڵەخانەی یەکێتی (یۆنیۆن بیلدینگ) لە بریتۆریای پایتەخت ساز کرا، ئەوەی چەندین سەدەیە لەژێر کۆنترۆڵی سپییەکاندا بووە. بەڵام، ئیمرۆ دەبێتە لانکەی کۆلکەزێرینەی رەنگ و نەتەوەو نەژادەکان. ئەوانەی ئامادەی دانانی یەکەم حکومەتی دیموکراتی لە خوارووی ئەفریقیای بێ نەژاد پەرستی.

لەم رۆژە پایزە خۆشەدا زینانی کچم هاورێم بوو، هەر لەسەر سەکۆکەدا بەرێز دوکلیرک بۆ سوێندخواردنی دووەم جێگری سەرۆک کۆمار ئامادەببوو، پاش ئەو تابو ئەمبیکی بۆ سوێندخواردنی جێگری یەکەمی سەرۆک هات، پاشان نۆرەی من هات، سوێندم خوارد کەوا رێزی دەستوور بگرم و پارێزگاری لێ بکەم و خۆم بۆ خێری کۆمارو میللەتەکەی تەرخان بکەم، ئەمەی خوارەوەش لە وتارەکەمدا هاتبوو:

ئێمە هەموومان لێرە شکۆ و هیوا لەبەر ئەم ئازادییە تازەیە دەکەین، لە مندالدانی ئەم کارەساتە مرۆڤایەتیە مەزنەی کە ماوەیەکی درێژی خایاند رۆژێک لەدایک دەبێت کەوا هەموو مرۆڤایەتی شانازی پێوە بکات.

چەندین ساڵ لەلایەن یاساوە راونرابووین، ئیمرۆش شەرەفی ئەوەمان هەیە کەوا نوێنەری چەندین نەتەوەمان بانگهێشتی سەر خاکی وڵاتەکەمان کردووە. ئێمە لێرە، سوپاس و رێزمان ئاراستەی هەموو مێوانە بەرێزەکان دەکەین کە هاتوون بەشداری سەرکەوتنی راستی وئاشتی و کەرامەتی مرۆڤایەتی بکەن.

دەرەنجامی ئازاد بەدەست هێنا و ئێستاش بەڵێن دەدەین هاووڵاتییان لە برسیەتی و ئازار و ناخۆشی و جۆرەکانی نەژادپەرستی و توندڕەوی رزگار بکەین. ئەم خاکە جوانە چیتر ستەمکاری قەبووڵ ناکات و لێی روونادات، تیشکی خۆریش لەسەر ئەم سەرکەوتنە شکۆدارە ئاوا نابێ، بژی ئازادی، خودا ئەفریقیا بپارێزێت!.

پاش دەمێ لە نیشاندانێکی سەربازی جواندا، کۆمەڵە فڕۆکەیەکی سەربازی و هەلیکۆپتەر لە ئاسمانا دەرکەوتن، ئەوەش هەر بۆ وردەکاری و هێزی سەربازی نەبوو و بەس، بەڵکو بۆ نیشاندانی دڵسۆزی بوو بۆ دیموکراتیەت و ئەو حکومەتە نوێیەی بە هەڵبژاردنی ئازادی پاک هاتە کایەوە. پێش ئەوەش ژەنراڵە گەورەکانی هێزی بەرگری خوارووی ئەفریقیاش بە مەدالیا ونیشانەکانیانەوە هاتبوون بۆ رێزگرتن و سڵاو و نیشاندانی دڵسۆزی خۆیان. ئەو دەمە ئەوەم بە بیرداهات، کەوا ئەو

پیاوانە چەند ساڵ بەر لە ئێستا، نەک بۆ سلاوم نەدەهاتن، بەڵکو بۆ گرتنم دەهاتن. نیشاندانە ئاسمانیەکە بەدوا نیشانی فرۆکەکانی ئەمبالا کۆتایی هات، کە بە دووکەڵەکەیان ئالای خوارووی ئەفریقیای نوێیان بە رەنگی رەش و سوور و کەسک و شین و زێرین دەنەخشاند.

ئەم رۆژە وێنەی تیپە مۆسیقایەکەم لە مێشکدا چەسپا کە هەردوو سروودی نیشتمانی خوارووی ئەفریقیایان دەووتەوە، سپییەکان «خودایە ئەفریقیا بپارێزیت»و رەشەکانیش سروودی نیشتمانی کۆماری کۆنیان «دای ستیم» دەووتەوە، هەردوولا سروودی لاکەی تریان چاک لەبەر نەبوو و زەمانێکی زۆریش رقیان لێ دەبۆوە. بەڵام لە دوارۆژێکی نزیکدا هەموویان هەڵبەستەکەی لەبەردەکەن.

رۆژی دانانم هەستم بە رەوشت و مانای مێژوویی زۆرکرد. لە دە ساڵەی چەرخی بیستەم و لە پاش شەڕی بەریتانیا و بویری گەرم و بەرلەدایکبوونی من هاوولاتییانی خوارووی ئەفریقیا خەڵکی پێست سپییان لێ پەیدابوو، هاتبوون رقی خۆیان دارێژن و رژێمی نەژداپەرستی پەیرەو بکەن بۆ کۆلۆنیکردنی میللەتانی ئەسمەر لەسەر خاکی خۆیان.

ئەم داگیرکردن و ئەم رژێمە درندەترین کۆمەڵگای دوور لە رەوشتی مرۆڤایەتیان خوڵقاند. ئیمرۆش لە دە ساڵەی دوایی ئەم سەدەیەو منی تەمەن هەشتا ساڵە ئەم رژێمە دەڕووخێنم و لەجیاتی ئەو رژێمێکی یەکسان و ئازادی بێ جیاکردنەوەو بێ رەچاوکردنی رەنگی پیستەیان، دادەنێم..

ئەم رۆژە بە قوربانی بێ ژمارەی هەزارها کەس هاتیتەدی. ناکرێ و ناتوانرێت ژان و بەرگری و قەرەبوویان بژمێردرێت، ئیمرۆ و رۆژانی تریش هەستم کردووە کەوا من ئەنجامی دەستکەوتی ئەو پاڵەوانە ئەفریقیایانەم کە پێش من بوون. ئەو نەوەیە، رۆیشتن، تا نەوەیەکی تر بێتە پێشەوەو منیش لەو نەوەی دواییم. ئەوەی خەمگینم دەکات، ئەوەیە، کەوا من ناتوانم یەکە یەکە سوپاسیان بکەم و ئەوانیش بۆیان ناکرێت ئەم سەرکەوتنە مەزنەی ئەوان بە قوربانیەکانیان بەدەستیان هێنا ببیینن

سیاسەتی رژێمی نەژادپەرستی برینێکی قووڵ و بە ژانیان لە گیانی ولات و میللەتەکەم جێهێشت و بۆ زالبوون بەسەری چەندین ساڵی دەوێت، بەڵام ساڵانی ستەم و درندەیی بەرهەمی چاوەڕوان نەکراوی وەک پیاوانی ئولیڤەر تامبۆ و ولتر سیسولو و سەکردە لوتولی و یوسف دادۆ و برام فیشەر و رۆبرت سوبوکوی لێ پەیدابوو. بە راستی ئەو پیاوانە جوامێرو ئازا و زانابوون،



نەوەی وان دووبارە نابێتەوە، لە دایکبوونی نەوەی وا لە رۆژانی تاریک و چەوسانەوەو زۆرداری دەبێت. ولاتەکەم میتال و بەردی بە نرخی لە ژێردایە، بەڵام سامانی ولاتەکەم کە لە زێڕو ئەڵماس گرانترە، میللەتەکەیەتی، کە نرخ و رەسەنایەتی تەواو نابێ.

من ئازایەتی و خۆڕاگری لەو پیاوانە فێربووم. زۆر پیاو و ژنم بینی بۆ هەڵوێستەکەی گیانی خستە مەترسی، پیاوانی زۆرم بینی ئازارو ئەشکەنجە ورەی بەرنەدان و هێزو بەرگرییان بێ وێنەبوو. من فێربووم کەوا ئازایەتی لە نەترسان پەیدا نابێ، بەڵکو لە سەرکەوتن بە سەریدا دروست دەبێ.

زۆرجار هەستەم بە ترس کردووە، بەڵام بە قەناعەتی ئازایەتیم شاردوومەتەوە. ئازایەتی، ئەوە نییە نەترسێت، ئازایەتی شکاندنی ترسە.

بۆ گەیشتن بە هیواکان هەرگیز رەشبین نەبووم. ئەوەش لەبەر ئازایەتی ئەو پاڵەوانانە نەبوو کە ناوم هێنان و بەس، بەڵکو بە ئازایەتی خەڵکی سادەی ولاتەکەم بوو، بڕوام بەوە هەیە کەوا لە ناخی دڵی هەموو ئادەمیزادێک سەرمایەی دلۆڤانی و لێبووردن هەیە، کەس لە دایک نابێ و لە هەناویدا رق بەرامبەر کەسانی تری لەبەر رەنگی پێستی هەبێ، یان رقی هەبێ لەبەر جیاوازی ئایینی، یان نەژادی. رق پەیدا دەبێ. کە مرۆڤ دەتوانێ فێرە رق بێ، دەکرێت فێری خۆشەویستیش بکرێت، چونکە خۆشەویستی لە رق ئاسانترو زووترو خۆشتر دەچێتە بەردڵان، لە رۆژانی تاریکدا لە نێوچەوانی پاسەوانەکانی زیندانا مرۆڤایەتی و لێبووردنم هەست پێ دەکرد. گەرچی ئەو ساتانە کەم و دەگمەنیش بوون، بەڵام، ورەی بەرز دەکردم، خێرو چاکە لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا سەرهەڵدەداو کز دەبێتەوە، بەڵام هەرگیز ناکوژێتەوە.

کە بەشداری کۆڕی خەباتمان کرد، خۆمان هەڵنەدەخەڵەتاند چاک دەمانزانی رێگاکەی تەختکراو و ئاسان نییە. بینیم کەوا چۆن هاوڕێیانی کۆڕی خەباتمان چۆن قوربانییان دا کە هاتنە ریزی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی، قوربانیەکانیش زۆر گران بوون. بەڵام، هیچ رۆژێ پەشیمان نەبووم و هەر ئامادەبووم رووبەڕووی ناخۆشی و ئازارەکان ببمەوە، خێزانەکەم ئەوانیش ئازاری بەشداربوونم لە خەباتیان چێشت.

مرۆڤ لە ژیاندا دوو ئەرکی لەسەر شانە، یەکەمیان، بەرامبەر خێزان و دایک و باوک ژن و منداڵەکانیەتی. دووەمیشیان، بەرامبەر کۆمەڵ و میللەت و ولاتەکەیەتی. لە کۆمەڵگای یەکسان، هەر چۆنێک بێ مرۆڤ دەتوانێ بە پێی توانین و گونجان هاوسەنگی نێوانیان بکات. بەڵام لە

وڵاتێک، وەک خوارووی ئەفریقیا مرۆڤێک لە نەژادو رەنگی ئێمە بێت بۆی ناکرێت هەموو ئەرکەکان دەستەبەر بکات. مرۆڤی رەنگین لە خوارووی ئەفریقیا، ئەگەر بیەوێت وەک ئادەمیزاد بژین، سزا دەدرێت و لێی دەدرێت. ئەگەر بیەوێت ئەرکی سەرشانی بەرامبەر وڵاتەکەی جێبەجێ بکات، ئەوا دەربەدەر دەبێت و لە خاو و خێزانی دووردەکەوێتەوەو دەکەوێتە کاری نهێنی و یاخیبوون. یەکەمجار میللەتەکەم لە پێش بنەماڵەکەم داناو کە ویستم خزمەتی مللەتەکەم بکەم لە پێشکەشکردنی دلۆڤانی و ئەرکی پێویست بۆ خێزانەکەم، کوڕەکەم، براکەم، باوکم، ژنم بێبەش بووم.

وای لێ هات، پابەندی ملیۆنەها کەس بووم، ئەوانەم نەدەناسین و ئاشنا نەبووم ... لە بری ئەوانەی دەمناسین و خۆشم دەویستن. سادەیی هەڵوێست و نهێنییەکان لە پرسیاری منداڵێکی بێتاوان لە باوکی دەردەکەوێت کە دەپرسێ: بۆچی لەگەڵمان ناژی؟ وەڵامی باوکی بەو چەند وشە ترسناکەیە: "چونکە لەم جیهانەدا منالٚ زۆرن، زۆربەیان ...."، دوایی وشەکان پاشگەز دەبنەوەو قسەی تری بۆ نایێت.

کە لەدایکبووم، ئارەزووم نەبوو سەربەست بم، بەڵام سەربەستانە لە دایکبووم ئازاد بووم و لە کێڵگەکانی نزیک کەپرەکەی دایکم، سەربەستانە لە جۆگەکانی ناو گوندی مەلەم دەکرد. ئازاد بووم و گەنمەشامیم لەبەر ئەستێرەکانی ئاسمانا دەبرژاندو سواری پشتی مانگا دەبووم. کە رێزی باوکم و نەریتەکانی خێڵم دەگرت، هیچ یاسایێ نەبوو ئازادیم پێشێل بکات.

کە گەورە بووم، زانیم ئازادییەکەی منالّیم سەراب بوو، کە خوێندکاربووم سروودی ئازادیم لەبەر خۆم دەووتەوە. ئازادی، ئەوەیە شەوان درەنگ بگەڕێمەوە ماڵەوە، کەی ویستم بخوێنمەوە، بە ئارەزووی خۆم بۆ کێندەرێ بچم، ئازادی ئەوەیە، لە جۆهانسبێرگ، شەیدای ئازادی بووم، ئارەزووم بوو پارە پەیدا بکەم و ژن بهێنم و ببمە باوک و ژیانێکی کامەران بژیم و هیچ تەگەرەیەک نەهێتە پێشم.

دوایی، هێدی هێدی تێگەیشتم، نە من و نە خوشک و براکانم و ئەوانەی لە چواردەورم دەژین، ئازادن. زانیم، هەر من نیم ئازادیم پێشێل کراوە، هەموو ئەوانەی رەنگیان لە رەنگی منە و ئاکاریان لە من دەچێ، سەربەست نین. کە چوومە ناو ریزەکانی حیزبی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، لەوێ شەیدا بوونم بۆ ئازادی میللەتەکەم لا گەلاڵە بوو، کە پەرۆشی ژیانی خۆشی و سەربەستی و کەرامەتی میللەتەکەم لا دروست بوو، هەموو رێڕەوی ژیانم گۆڕاو ترسم گۆڕا بە



ئازایەتی، بۆیە کە رێزی یاسام دەگرت وای لێ دەهات یاسا راوم دەنێ، بێواربووم، وەک قەشەیەکم لێ هات، منی باوک و شەیدای ژیان و منالّ، وام لێ هات. تێگەیشتم، منی سەودای ئازادی میللەتەکەم، هەر دەبێ ئازادنەبم. ئازادی بەش بەش ناکرێت. کۆتی یەک کەس، کۆتە بۆ هەموومان، کۆتی گەردەنی میللەتەکەم، لە گەردەنی منیشە.

لە ساڵە بە ئەشکەنجە درێژەکاندا، لە شەیدابیم بۆ ئازادی میللەتەکەم، شەیدای ئازادی هەموو خەڵک بووم، خەڵکی سپی و رەش، چاکم دەزانی ئازادی بۆ ستەمکاریش پێویستە، ئەوەی زۆرداره، ئەویش ئەسیری دەستی رق و کینەیە. لە پشت شیشبەندی توندڕەوی و تەنگەبەری ئاسۆیە. چۆن هەست بە راستی ئازادی بکەم، کە مرۆڤێکی ترم لە ئازادی بێبەش کردووە؟ ستەم، ئازادی لە هەردووکیان، ستەمکارو ستەملێکراو زەوت دەکات.

کە پێم هاویشتە سەکۆی زیندان، بەرنامەم رزگارکردنی ستەمکار و ستەملێکراو بووە. هەیە دەڵێن، ئەوەیان هاتە دی، بەڵام چاک دەزانم شتەکە وا نییە، لە راستیدا، ئێمە هێشتا ئازاد نەبووین، ئەگەر سەربەست بووین، واتە مافی خۆمانە جارێکی تر زوڵمان لێ نەکرێت، ئێمە دوا هەنگاومان نەهاویشتووە، بەڵکو یەکەم هەنگاومان لە رێگای دووری ئازادی هاویشتووە. ئازادی ئەوە نییە کۆتمان لە دەست نەماوە، بەڵکو ئازادی ئەوەیە مرۆڤ کە دەژیت رێزی خەڵکی تر بگرێت، ئێمە لە سەرەتایی تاقیکردنەوەی راستی دڵسۆزیمانە بۆ ئازادی.

لە رێگای دووری ئازادیدا رۆیشتم کۆششم زۆرکرد، هەڵەنەکەم و نەکەوم و هەنگاوەکانم نەشێوێت، ئەوەشم بۆ ئاشکرابوو: مرۆڤی ئازاد هەرچەند بەسەر شاخی مەزن بکەوێت، شاخی تری لە پشتەو دەبێ سەرکەوێت. ئێستا من پشوودەدەم، پشوودانی شەڕکەرێک، ئارەزوو وەرگرتنە لە سەروەرییەکان و نیگای پشتەوەو تێڕامانی رێگاکەیەتی. پشوودانی شەڕکەر کورتە، چونکە ئازادی پاشکۆی زۆرە، ناکرێ چاوەڕێ بم، چونکە رێگاکەم دوورەو هێشتا تەواو نەبووە.